# ڕۆڵی

# مستەفا بارزانی

## لە پێشەوایەتیکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیدا (١٩٤٣-١٩٧٩)

د. قارەمان حەیدەر ڕەحمان

هەولێر- کوردستان

٢٠٢٤

❖ ناوی کتێب : **ڕۆڵی مستەفا بارزانی لە پێشەوایەتیکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیدا (١٩٤٣-١٩٧٩)**
❖ نووسینی: د. **قارەمان حەیدەر ڕەحمان**
❖ بابـــەت: **توێژینەوەی مێژوویی**

❖ دیزاینی ناوەڕۆک و بەرگ: **خەلیل هیدایەت مام شێخ**
❖ تیراژ : **١٠٠٠ دانە**
❖ چاپ: یەکەم: **٢٠٢٤**
❖ شوێنی چاپ: **چاپخانەی رۆژهەلات-هەولێر**

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان /هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (١٩٠) ی ساڵی ٢٠٢٤/ پێدراوە

پێشکەشە بە

ڕێبەری نەتەوەیی و هەڵگری ئاڵای کوردستان

سەرۆک مەسعود بارزانی

**ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا تێزێکی دکتۆرایە**

**لە مێژووی نوێ و هاوچەرخ، ساڵی ٢٠٢٣**

**پێشکەشی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین کراوە.**

# پێشەکی

بزاڤی ڕزگـاریخوازیی نەتەوەیی کورد، بە درێژایی مێژووی خۆی، چەنـدین سـەرکردەی دیاری بەخۆیەوە بینیوە، بەڵام هیچ یەکێک لەمانە، ئەوەندەی مسـتەفا بارزانی، لە ڕێبەرایەتیکردنی ئەو بزاڤە بەردەوام نەبووە. هۆکارەکەشـی دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی هەوڵەکانی ئەم ڕێبەرە لە خەباتی نەتەوەییدا، بۆ بەدیهێنانی ئامانج و داخوازییە سـیاسـی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، بەشـێوەیەکی لۆژیکی و ڕاستینەیی، کە لەگەڵ هەلومەرجی سیاسی و واقیعی ناوچەکەدا بگونجێت. لەڕووی سـیاسـی، داخوازییە نەتەوەییەکانی، لە فۆرمی ئۆتۆنۆمی لەچوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتیدا چڕکردەوە، بۆ مسۆگەرکردنی بەشداری کارای نەتەوەی کورد لە جومگە سەرەکییەکانی دەسەڵاتی سیاسی، و لەڕووی ئابوورییشەوە، وێڕای جەختکردنەوەی، بۆ دیاریکردنی پشکی کورد لە داهاتی نەوت و سەرچاوە سروشتییەکان، کاریکرد بۆ سـوودمەندبوونی خەڵکی کوردسـتان لە موڵکی گشـتی، بە پشـتگیریکردن لە جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی. لەڕووی کۆمەڵایەتییشەوە، خەباتیکرد بۆ کـاڵکردنەوەی جیـاوازیی چینـایەتی و پـاراسـتنی زمـان و ئەدەب و کەلتوور و وەرچەرخانی کۆمەڵگەی کوردی، لە کۆمەڵگەیەکی کشتیاریی گۆشەگیر لە بازنەیەکی تەسکی ناوچەیی و هۆزایەتی، بۆ کۆمەڵگەیەکی هۆشیار بە بیری نەتەوایەتی.

ئەم کتێبە بەناوونیشـانی (ڕۆڵی مسـتەفا بارزانی لە پێشـەوایەتیکردنی بزاڤی ڕزگـاریخوازی کوردییـدا ١٩٤٣-١٩٧٩)، لە بنجـدا هەوڵێکی زانسـتییە بۆ بەرجەستەکردنی کۆششەکانی ئەم ڕێبەرە و دیاریکردنی کاریگەرییەکانیەتی لەسەر بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد، ئەمەش بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشـاییەی کە لە بواری نووسینی لایەنی شـارستانی و هزری نەتەوەیی و ئاراستەی نیشتمانی ئەم ڕێبەرە کورددەدا هەیە.

کارێکی لەمجۆرە بەرپرسـیارێتی زۆری تێدایە، بۆیە لەلایەن توێژەران، کەمتر لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەیەکی زانسـتی مێژووییدا کاری لەسـەر کراوە. زۆربەی ئەو لێکۆڵینەوانەی تا ئێسـتا لەبارەی ئەم سـەرکردەیە و تەنانەت شـۆڕشـی کورد لەم ماوەیەدا ئەنجام دراون، زیاتر دەچنە چوارچێوەی گێڕانەوەی ڕووداوەکان و کەمتر پەرژاونەتە سەر لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی بنەماکانی هزری سیاسی ئەم ڕێبەرە و دیاریکردنی شـوێنپەنجەی ئەو بەسـەر بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیدا لە هەموو بوارەکاندا.

ئەم کتێبە دابەشی سەر پێنج بەش کراوە، کە هەریەکێک لەم بەشانە، چەند تەوەر و باسێکیان لەخۆ گرتووە. بەشی یەکەم، بەناونیشانی (ژیان و کەسایەتی مستەفا بارزانی) هاتووە، لە دوو تەوەر پێکدێت ، هەر تەوەرێکیشیان بۆ سەر چەند باسێک دابەشکراوە. لە تەوەری یەکەمدا، بەپوختی باسی قۆناغەکانی ژیانی مستەفا بارزانی کراوە، لە ساتی لەدایکبوونی لە (١٤ی ئاداری ١٩٠٣) تا مردنی لە (١ی ئاداری ١٩٧٩). لەو ماوەیەدا بارزانی سەرباری ژیانی ئالۆزی بەهۆی ڕاگواستنی زۆرەملێ و دوورخرانەوەی لەزێدی خۆی لە سەرەتاکانی تەمەنی خۆیدا، بەڵام هیچ کات دەستبەرداری ئەو بنەمایانە نەبوو، کە لەبیر و بزووتنەوەی چاکسازیخوازی شێخانی بارزان سەرچاوەی گرتبوو. لەتەوەری دووەمیشدا دەچینە سەر باسکردنی لایەنە جیاواز و تایبەتمەندییە کەسێتییەکانی ئەم ڕێبەرە. بە شێوەیەکی گشتی لەم بەشەدا سوودمان لە بیروڕای یار و نەیارانی ئەم سەرکردەیە وەرگرتووە.

لەبەشی دووەمی کتێبەکەدا، کە بەناونیشانی (ڕۆڵی مستەفا بارزانی لەگەشەپێدانی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیدا) هاتووە، بە دوو تەوەر باس لە ڕۆڵی ئەم ڕێبەرە کراوە لە گەشەپێدانی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی، وەک باسکردنی ڕۆڵیان لە دامەزراندنی پارت و ڕێکخراوی سیاسی، سەرباری تەرخانکردنی تەوەرێکی دیکە، بۆ باسکردنی کۆششەکانیان بۆ دامەزراندنی هێزی سەربازی ڕێکخراوی نیشتمانی. لەهەر یەکێک لەم باسانەدا، تیشک خراوەتە سەر ئەم وەرچەرخانە مێژووییەی، کە لە ئەنجامی هەوڵەکانی بارزانی، بە هاوکاری هێزە نیشتمانپەروەرە کوردەکانی باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کوردستان هاتوونەتە کایەوە. لە ڕاستیدا بارزانی لە قۆناغی نوێی سیاسی دوای جەنگی دووەمی جیهانی، بۆ ئەوەی بناغەیەکی نوێ بۆ بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کوردی دابنێ، لەسەری پێویست بوو لەگەڵ کەسایەتی و پارت و ڕێکخراوە کوردییەکان هاوکاربێ، بۆ ئەوەی بزاڤەکە لە سنووری بەرتەسکی ناوچەیی دەربهێنێ و کاربکات بۆ ئەوەی ڕێبەرایەتی ئەم بزاڤە بخاتە ئەستۆی پارتێکی سیاسی، جیاواز لەو جووڵانەوانەی پێشتر ڕێبەرانی ئایینی و سەرۆک هۆزەکان پێشڕەوییان دەکرد، بە ئامانجی یەکخستنی خەباتی نەتەوەیی.

بزاڤی نەتەوەیی کوردی و قۆناغەکانی گەشەکردنی لەسەردەمی پێشەوایەتی مستەفا بارزانی و هەوڵدان بۆ هەڵگرتنی ئاستەنگ و ئاریشەکانی بەردەمی، بەشی سێیەمی کتێبەکەی بەناونیشانی (ڕۆڵی مستەفا بارزانی لە گەشەپێدانی هزری نەتەوەیی) پێکهێناوە. کە ڕەنگە بابەتی لەم شێوە، زیادبوونێک بێت لە نووسینەوەی ژیانی ئەم کەسایەتییەدا. لەم بەشەدا، کە دابەشی سەر سێ تەوەر بووە، باس لە هەوڵەکانی مستەفا بارزانی کراوە بۆ یەکخستنی کۆمەڵگەی کوردی، لە ڕێگای ئامراز

و میکانیزمەکانی، وەک پاراستنی زمان و ئەدەب و شوناسی کوردی، کە دواجار لەڕێککەوتنامەی (١١ی ئاداری ١٩٧٠) بەتەواوی چەسپێنرا.

بابەتێکی دیکەی کتێبەکە، کە لە بەشی چوارەم بەناوونیشانی (هەڵوێستی مستەفا بارزانی بەرامبەر سیاسەتەکانی دەسەڵاتدارانی عێراق) هاتووە، سێ تەوەری جیا جیا لەخۆ دەگرێ. لەتەوەری یەکەمدا، تیشک خراوەتە سەر سیاسەتەکانی حکومەتی عێراق بەرامبەر دۆزی کورد و دابەشی سەر چوار قۆناغ کراوە، چونکە لەم ماوەیەدا، واتە لە ماوەی سالانی (١٩٥٨-١٩٧٥)دا، چەند حکومەتێک بەدواییەکدا هاتوون. کە هەریەکیان بە شێوازێکی سیاسی جیاواز، ڕووبەڕووی داخوازییە نەتەوەییەکانی گەلی کورد بوونەوە، ئەگەرچی هەموویان لە هێڵی گشتیدا هاوشێوەن، لە تەوەری دواتردا کە باسی دووەمە، تیشک خراوەتە سەر سیاسەتی پەرتکە و زاڵبەی حکومەتی عێراق. لەم سۆنگەوە سەرەتا باس لە ڕۆڵی مستەفا بارزانی کراوە، لە پارێزگارییکردن لە تەبایی و برایەتی نێوان کورد و عەرەب لە عێراقدا. پاشان لە باسێکی دیکەدا، ڕۆشنایی خراوەتە سەر ڕۆڵی بارزانی لە کاڵکردنەوەی کاریگەرییەکانی سیاسەتی حکومەتی عێراق بۆ لێکترازاندنی نێوماڵی کورد، لە ڕێگای تەیارکردنی هۆزە کوردییەکان، لەدژی یەکتری و لە دژی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد. لە باسی دواتردا، ئاماژە بە ڕۆڵی بارزانی کراوە لە شکستپێهێنانی سیاسەتی حکومەتە عێراقییەکان و پشتگیری کردنیان لە هەڵوەشاندنەوە و لێکترازاندنی ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان. هەر لەم بەشەدا، تەوەرێک تەرخانکراوە، بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕۆڵی مستەفا بارزانی لە ڕووبەڕووبوونەوەی سیاسەتەکانی حکومەتی عێراق بەرامبەر بە گەلی کورد لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری.

دوا بەشی کتێبەکە، کە بەشی پێنجەمە، بەناوونیشانی (بارزانی و پەیوەندییە دەرەکییەکانی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد) ، تەرخانکراوە بۆ باسکردنی پەیوەندییە دەرەکییەکانی مستەفا بارزانی و شۆڕشی کورد، لەگەڵ هەریەک لە وڵاتانی وەک ئێران و میسر و سۆڤیەت و ئەمریکا و ئیسرائیل. دیارە مستەفا بارزانی لەماوەی پێشەوایەتیکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی، زیاتر لەگەڵ ئەم وڵاتانە لە پەیوەندی ڕاستەوخۆی سیاسی و سەربازیدا بوو، بەهۆی بەرژەوەندی ئەم وڵاتانە لەگەڵ کورد، بۆ لاوازکردنی پێگەی سیاسی و سنووردارکردنی توانا سەربازییەکانی حکومەتی عێراق.

دواجار لە ڕێگای خستنەڕووی چەند ئەنجامێک، هەوڵ دراوە زانیاری نوێ سەبارەت بە کاریگەریی ڕۆڵی مستەفا بارزانی و کۆششەکانی لەپێناو سەرخستنی دۆزی کورد بەچەند خاڵێک بخرێتەڕوو.

لەم کتێبەدا سود لە چەندین سەرچاوەی جۆراوجۆر وەرگیراوە، بەڵام لە ڕووی گرنگی و بایەخەوە، زۆرترین سـوود لە بەڵگەنامە بڵاونەکراوەکانی حکومەتی عێراق سـەردەمی پادشـایەتی بینراوە، کە زانیاری ووردی نەبینراویان تێدابوو. ئەم بەڵگەنامانە نووسـراوی فەرمی فەرمانگەکانی پۆلیسـی عێراق و لیواکانی هەولێر و سـلێمانی و موسـڵ و ڕێپیدراوی عێراق لە تاران بوون. ئەمە وێرای بەکارهێنانی ژمارەیەکی زۆر لە بەڵگەنامەکانی حکومەتی ئەمریکا، کە بەشـێکیان دەگەڕێنەوە بۆ باڵیۆزخانەکانی ئەم دەوڵەتە لە ئێران و عێراق، بەشـێکی دیکەیان، لە ئاژانسـی هەواڵگری و وەزارەتی دەرەوەی ئەم وڵاتەدا دەرچوونە. لەگەڵ چەندین بەڵگەنامەی دیکەی وەزارەتی دەرەوەی حکومەتەکانی بریتانیا و ئوسـترالیا و فەرەنسـا، کە چەندین لایەنی شـاراوەی بابەتەکەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە، بەشـێکی ئەم بەڵگەنامانە لە خانەی کتێب و بەڵگەنامەی نیشـتمانی لە شـاری بەغدا و لە ڕێگای پێگەی ناوەندە سـیاسـییەکانی ئەم وڵاتانە و بەشـێکی دیکە لە ڕێگەی کتێبە بەڵگەنامەییەکانەوە بەدەسـت کەوتوون. وەک کتێبی (ڕاپەڕینەکانی بارزان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی هەردوو حکومەتی فەرەنسـا و بریتانیا ١٩٣١-١٩٤٩)، کە (د. نەجاتی عەبدوڵڵا) ئامادەی کردووە. لەگەڵ کتێبی (کورد و کوردستان لەبەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی فەرەنسـا و بریتانیادا ١٨٧٩-١٩٦٣)، ئەمیش لەلایەن (د. نەجاتی عەبدوڵڵا) لە زمانی فەرەنسـییەوە وەرگێڕاوەتە سـەر زمانی کوردی. هەروەها بەشـی دووەمی کتێبی (الكورد في وثائق الارشـيف الوطني البريطاني ١٩٥٨-١٩٦٩)، کە (شـێرکۆ حەبیب) وەریگێڕاوەتە سـەر زمانی عەرەبی و کتێبەکەی (محمد علي سـلطاني) بەناوونیشـانی(اوضـاع سـياسـي اجتماعي تاريخي ايل بارزان) ، ئەمانیش بەڕادەی خۆیان دوو سـەرچاوەی دیکەی گرنگ بوون، چونکە زانیاری بایەخداریان لەسـەر خەباتی سیاسی و سەربازی مستەفا بارزانی خستۆتەڕوو.

بەشـێکی دیکەی ئەم سـەرچاوانەی سـوودیان لێوەرگیراوە، چاپکراوە حکومی و حزبییەکانن، کە هاوشـێوەی بەڵگەنامەکان، بەهایەکی زانسـتی بەرزیان هەیە بۆ هەر توێژینەوەیەکی ئەکادیمی. سـەبارەت بە چاپکراوە حکومییەکان، کە بەشـێوەیەکی سەرەکی لە یاسا و مەرسومەکانی حکومەتی عێراق پێکهاتوون، بریتین لە بڕیارەکانی ئەنجومەنی سـەرکردایەتی شـۆڕشـی عێراق، لەماوەی نێوان سـاڵانی (١٩٦٨-١٩٧٧). وێرای سـوود وەرگرتن لە یاسـای خۆماڵیکردنی نەوت لە سـاڵی ١٩٧٢ و پەسـەندی پەیماننامەی دۆستایەتی و هەماهەنگی نێوان عێراق و سۆڤیەت ساڵی ١٩٧٢ و یاسای ژمارە(١١٧)ی چاکسـازی کشـتوکاڵی سـاڵی ١٩٧٠ و یاسـای ژمارە(٣٣)ی سـاڵی ١٩٧٤ی ناوچەی ئۆتۆنۆمی لە کوردسـتان . لە چاپکراوە حزبییەکانیش سـوود لە یاداشـتی بارزانی بۆ کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان وەرگیراوە، کە لە تشـرینی

یەکەمی ساڵی ١٩٦٩دا ئاڕاستەی سکرتێری ڕێکخراوەکەی کردووە و لەلایەن بەشی ڕاگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان بڵاوکراوەتەوە. هەروەها کێشەی زەوییە کشتوکاڵییەکان لە کوردستانی عێراقدا، کە لێکۆڵینەوەیەکە لەلایەن مەکتەبی ناوەندیی دیراسات و توێژینەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان ئەنجامدراوە. سەرباری سوود وەرگرتن لە بڵاوکراوەیەکی حزبی دیکەی بەناونیشانی(طريق الحركة التحررية الكردية، التقرير السياسي المصادق عليه من قبل كونفرانس الحزب المنعقد في اب ١٩٧٦)، ئەمەش ڕاپۆرتێکی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانە، کە لە کۆنگرەی نۆیەمی پارتەکە پەسەندکرا، دوای ئەوەی لە تشرینی دووەمی ١٩٧٩ بەسترا.

گۆڤار و ڕۆژنامە هاوسەردەمەکانی ئەم ماوە مێژووییەش، کە لەم کتێبەدا بەکارهاتوون، بایەخێکی زۆریان هەبوو بۆ ئەم بابەتە، ئەوانیش بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی و عیبری و فارسی و ئینگلیزی و فەرەنسی و ڕووسی سوودیان لێوەرگیراوە، بەتایبەت ڕۆژنامەکانی (نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی و (لۆمۆند)ی فەڕەنسی و (پراڤدا)ی سۆڤیەتی و (داڤار) و (مەعاریف)ی ئیسرائیلی و (الاهرام) ی میسری و (النهار)ی لوبنانی و (الدستور)ی ئوردنی و ڕۆژنامەکانی وەک (اطلاعات) و (کیهان) و گۆڤارەکانی (کوهستان) و (اسیای جوان) و (تهران مصور) و (خواندنیها) و (سپیدة و سیاه)ی ئێرانی. لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری ڕۆژنامەکانی عێراق وەک (الزمان) و (الثورة) و (الجماهير) و (الجمهورية)و (الحرية) و (الشعب) و (الفجر الجديد) و (المنار)، لەگەڵ بەشێکی گوڤار و ڕۆژنامەکانی شۆڕشی کورد لە نمونەی ڕۆژنامەکانی (ڕزگاری) و (خەبات) و (التاخي) و ( خەباتی کوردستان) و (برایی) و (برایەتی) و (دەنگی پێشمەرگە) و (صوت کردستان) و گۆڤارەکانی(برایەتی) و (دەنگی کوردستان) و (ڕزگاری)، کە بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی لەم کتێبەدا سوودیان لێ وەرگیراوە. شیاوی باسە ڕۆژنامە ئێرانییەکان، بەگشتی لە ڕێگەی کتێبی (برتارک توفان) کە (بارام وەلید بەگی)ی ئامادەی کردووە، سوودیان لێ وەرگیراوە. لەگەڵ ئەوەشدا سوود لەو کتێبانە وەرگیراوە، کە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیان لە بەرگێک یان چەند بەرگێکدا کۆکردووەتەوە، هەروەها لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووە و ئیندێکسیان بۆ دروست کردووە، لەوانەش: (خەبات ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان (نیسانی ١٩٦٢_ کانونی دووەمی ١٩٦٤)ی نەوزاد عەلی ئەحمەد و (١١ ژمارەی دەگمەنی ڕۆژنامەی خەبات ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستانی یە)ی جەمال خەزنەدار و کتێبی (صوت الأكراد-دەنگی کورد یەکەمین ڕۆژنامەی سیاسیی کوردیی سەربەخۆیە) و هەروەها (ڕزگاری گۆڤاری برایەتی کورد و عەرەبە یانی چی؟) لە ئامادەکردنی عەبدوڵڵا زەنگەنە و کتێبی (برایەتی

١٩٧٠-١٩٧١/ دووەمین گۆڤاری سیاسی ئاشکرای پارتی دیموکراتی کوردستان) لە ئامادەکردنی ئاری نانەکەلی.

هەر لەم تێزەدا یادداشـــت و بیرەوەرییەکانی کەســـایەتییە ســـیاســـی و پلەدارە ســـەربازی و هەواڵگرییەکانی کورد و عێراق و ئێران و ســـۆڤیەت و ئیســـرائیل، بە زمانی جۆراوجۆر ســـوودیان لێ وەرگیراوە. بۆ نمونە بە زمانی کوردی ســـوود لە یاداشـــتەکانی عزەت ســـلێمان بەگ، بەناوونیشـــانی(شـــانێک بەبنباری نیشـــتمانەوە/ ژینواری عزەت ســـلێمـــان بەگ دەرگەلەیی) وەرگیراوە. هەروەهـــا ســـوود لە (بیرەوەرییەکانی زرار ســـلێمان بەگ دەرگەلەیی) و ( وێســـتگەکانی ژیانی محســـن دزەیی) و (دیـداری تەمەنی جەلال تـاڵەبـانی) وەرگیراوە، ئەگەرچی ئەمەی دواییـان لەلایەن خودی تاڵەبانی نەنووســـراوە، بەڵام ئامادەکاری کتێبەکە (ســـەلاح ڕەشـــید) دەڵێت چاوپێکەوتنێکی درێژە لەگەڵیدا، کە دواتر چاپی کردووە و تیایدا هەرچەندە ناوبراو زۆر لایەنی گرنگی ئەم سەرکردەی باسکردووە، بەڵام بەگشتی بەشێوەیەکی نەیارانە باســـی بارزانی کردووە. بۆیە هەوڵمانداوە ئەو نووســـینانەی لایەنی نەرێنی بارزانیان باسکردووە لەڕووی زانستییەوە شـەنوکەویان بکەین، هەروەکو کتێبەکەی (فاضـــل البراک) یش، کە بەناوونیشـــانی (مصـــطفی البارزاني الاســـطورة والحقیقة) نووسراوە. هاوکات بە زمانی عەرەبی سوود لە کتێبی (أیام لا تنسی) وەرگیراوە، کە یادداشـــتەکانی ســـەرۆکی ئەرکانی پێشـــتری لە شـــکری عێراقی(أبراهیم فیصـــل الانصاري)یە، هەروەها بیرەوەری جێگری سوپا سالاری پێشووی عێراق (أسماعیل تایە النعیمي) بەناوونیشـــانی (تجربتي في القیادة) . بەشـــێوەیەکی گشـــتی یاداشـــتی فەرماندە سەربازییەکانی حکومەتی عێراق، لەبەرئەوەی لەسەردەمی حزبی بەعس لە عێراقدا نووســـراون، هەموو زانیارییەکانیان وەک خۆیان نەخســـتووەتەڕوو، بەڵکو کەموکوڕی زۆریان تێدایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا ســـەرچاوەیەکی مێژوویی ســـوود بەخش بوون، بەتایبەتی لە ڕووی ســەربازییەوە. لەبەرئەوەی وێنایەکی نزیکی دۆخی شۆڕشی کوردیان کردووە.

هەر لە نێو ئەم یادداشتانەی وەک سـەرچاوەی ڕەسـەن سـوودیان لێوەرگیراوە، پێویســتە ئاماژە بە یادداشــتەکانی(عصــمت شــریف وانلی) بکەین، بەناوونیشــانی(من مذکرات عصـــمت شـــریف وانلي). لەبەرئەوەی نووســـەر لە ماوەی نێوان ســـاڵانی (١٩٦٤-١٩٦٦) وەک باڵیۆزی شـــۆڕش بووە لە ڕۆژئاوای ئەوروپا و نزیک بووە لە ســـەرچاوەی بڕیاری ســـیاســـی کورد. بەو هۆیەوە لە کتێبەکەیدا ژمارەیەکی زۆری بەڵگەنامە و ڕاســتی مێژوویی خســتۆتەڕوو. ســەرباری ســوود وەرگرتن لە بەرگی ســێیەمی یادداشــتەکانی وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (هنری کسنجەر) بە ناوونیشانی(سنوات التجدید). نووسـەری ئەم کتێبە بە پشت بەسـتن بە

بەڵگەنامەکانی ژێر دەســـتی، زانیاری ووردی لەســـەر پەیوەندی حکومەتەکەی بە شۆڕشی کورد و مستەفا بارزانی باسکردووە .

وێڕای ئەوانە، سودی زۆر لە یادداشتەکانی ئەفسەری هەواڵگری سۆڤیەت (پاڤێل سـودوپلاتۆڤ) بە ناوونیشـانی (بیرەوەریی شـاهیدێکی مەترسـیدار) وەرگیراوە. ئەم سـەرچاوەیە زانیاری پڕ بایەخی لەسـەر پەیوەندیەکانی سـۆڤیەت و بارزانی لەماوەی نێوان سـاڵانی (١٩٤٧-١٩٦٣) لەخۆ گرتووە. بە تایبەتی کە نووسـەر لەم کتێبەدا جگە لەم زانیارییانەی لەســـەر مســـتەفا بارزانی و بارزانییەکانی یاوەری خســـتووەتەڕوو، تـایبەتمەنـدییە کەســـییەکـانی بـارزانی بە ووردی لە چەنـد لاپەڕەیەکی کتێبەکەیـدا باسکردووە.

لە کۆششە زانستیەکانیش، بەزمانی ئینگلیزی سوود لە تێزی دکتۆرای مایکل ج. لورتز(Michael G. Lortz) بەناوونیشـانی ( willing to Face Death: A History of Kurdish Military Forces- the Peshmerga - From the Ottoman Empire to Present-Day-Iraq) وەرگیراوە، کە لە ساڵی ٢٠٠٥ پێشکەشی زانکۆی فلۆریدای لە ئەمریکـا کراوە. ئەم توێژەرە، لەم تێزە بـاس لە مێژووی هێزی پێشـــمەرگەی کوردســـتان دەکات، کە وەک کولتورێکی ســـەد ســـاڵەی ڕابردووی ئەم میللەتە ناسـاندوویەتی. هەروەها ئاماژەی بە ڕۆڵی مسـتەفا بارزانی کردووە، لە دامەزراندنی هێزی سـەربازی ڕێکخراوی نیشـتمانی کوردی لە سـاڵی ١٩٤٣، سـەرباری ئەوەی تیشـکی خسـتووەتە سـەر کۆشـشـەکانی ئەم ڕێبەرە، بۆ پێشـخسـتنی ئەم پێکهاتە سەربازییە لەماوەی خەباتی چەکداری خۆیدا.

لە دوای هەموو ئەمانە، پێویســـتە ئاماژە بە کتێبە چاپکراوەکان بکەین، لە نێو ئەوانەش کتێبی مەســـعود بـارزانی بە نـاوونیشـــانی ( بـارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی)، بەهەردوو زمانی کوردی و عەرەبی و لە چەند چاپکراوێکی جیاواز لەیەکتری سـوودی لێوەرگیراوە. کە بەگشـتی ژمارەیەکی زۆری بەڵگەنامە و ڕاستی مێژووییان تێدایە. هەروەها دەبێ ئەوەش بڵێین، ئەم کتێبە یەکێکە سەرچاوەی مێژوویيە بایەخدارەکانی، بەشـێکی زۆری ســـەربوردەی ژیانی ئەم ڕێبەرەی لەخۆ گرتووە. سـەرباری سـوود وەرگرتن لە بەشـێکی بەرچاوی بەرهەمی مێژوونووسـی کورد (د.عەبدولفەتاح بۆتانی)، بەتایبەتی کتێبەکانی (وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية)، (الحركة القومية الكوردية التحررية/ دراسات ووثائق)، لەگەڵ چەندین کتێبی دیکەیان، کە بەناوونیشـانی جۆراوجۆر هاتوون وەک: (دراســات و مباحث في تاريخ الكورد والعراق المعاصر) و (الملامح الاساسية لشخصية مصطفى البارزاني القيادية والانســانية) و (التطورات الســياســية الداخلية في العراق ١٤ تموز ١٩٥٨- ٨ شــباط

١٩٦٣) و (ملا مصـــــطفى البارزاني قائد الثورة الكوردية و ملهمها) و هەردوو بەرگی کتێبی (منطقة بادينان ١٩٢٥-١٩٧٠ دراسة في الوقائع والتطورات السياسية).

یەکێکی دیکە لەم کتێبانەی ســــوودی زۆری لێوەرگیراوە، کتێبی (ژیگالینا ئولگا إيفانوفنا)ی ڕووسی بوو بەناونیشانی (مەلا مستەفا بارزانی، وێنەیەکی مێژوویی). لەم کتێبەدا نووســــەر چەند وێســــتگەیەکی مێژوویی لە ژیانی ئەم ڕێبەرەی لە چل و حەفتاکانی سـەدەی ڕابردوو باسکردووە. لەمانەش خەباتی بارزانی بۆ سـەربەخۆیی کوردســــتانی عێراق، کە تیایدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، ئەم ڕێبەرە بەهۆی ئەم خەباتەی ئەنجامیدا، نەک هەر لە نێو کوردەکان، بەڵکو لە دەرەوەی وڵاتیش ناوبانگی پەیدا کرد. نووســــەر بارزانی وەک تێکۆشـــەرێک بۆ بەدەســــتهێنانی ئۆتۆنۆمی لە کوردســـتانی عێراق دەناسـێنی. هاوکات تیشـکی خســـتووەتە سـەر تایبەتمەندییە کەسـییەکانی ئەم ڕێبەرە و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە ئەم تایبەتمەندییە کەسـییانەی بارزانی، هاوکاربوون بۆ ئەوەی وەک سەرکردە پێشکەوتنخوازەکان دەربکەوێ .

بەشـــێکی دیکەی ســــەرچاوەکان، ووتار و بابەتە ڕۆژنامەوانییەکانن، کە بە زمـانەکـانی کوردی و عەرەبی و عیبری و تورکی، لە گۆڤـار و ڕۆژنـامەکـان بڵاوکراونەتەوە و بۆ ئەم کتێبە ســـوودیان لێ وەرگیراوە. هەندێ لەم بابەتـانەش بەڵگەی گرنگ و پڕ بایەخیان لەخۆ گرتووە، بەتایبەتی ئەوانەی لە گۆڤارە کوردییەکانی ( پەیـامی ئەیلول) و (هەرێمی کوردســــتـان) و (هیزل) و (K21) بڵاوکراونەتەوە، هەروەها گۆڤاری (Kürt Tarihi)، کە یەکەمین چاپەمەنی ڕۆژنامەوانییە، دوو هەفتە جارێک بە زمانی تورکی لەســـەر مێژووی کورد لە ئەســـتەمبوڵ بڵاودەبێتەوە. لە یەکێک لە ژمارەکانی ئەم گۆڤارە بەڵگەنامەی دانســـقە و زانیاری وردمان لەســـەر خەباتی سیاسی و چەکداری بارزانی بەدەستهێنا.

گێڕانەوەی زارەکیش وەک پێداویستییەکی گرنگی توێژینەوەی زانستی سوودی زۆریان بۆ کتێبەکە هەبوو، ئەویش لە ڕێگای ئەنجامدانی چەند دیدارێک لەگەڵ ســـێ لە کەسـایەتییە ناسـراوەکانی نێوخۆیی و دەرەکی، کە ئەوانیش (د. ئێدمۆند غەریب و د. مەحمود عوسمان و شێخ حوسێنی کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی شێخ ڕەشیدی لۆلان) بوون. لەبەرئەوەی هەریەکێک لەمانە بەهۆی پێگە زانســـتی و ســـیاســـی و کۆمەڵایەتییەکانیان، پەیوەندی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی هەبووە.

ماوەتەوە بڵێین، هیچ کارێک لە کەموکوڕی بەدەر نییە. بۆیە ئەم کۆشـشـە وەک هەر کـارێکی دیکە، بێگومـان هەڵە و کەموکوڕی تێدایە، بەڵام ئومێد دەکەین، ببێتە هەوێنێک بۆ هەوڵی زانستی بەرهەمدارتر لەداهاتوو.

# بەشی یەکەم: ژیان و کەسایەتی مەلا مستەفا بارزانی

مســتەفا بارزانی، ئەو ڕێبەرە مێژووییەی ســەرکردایەتی ڕاپەڕین و شــۆڕشــێکی نەتەوەیی کرد. لەســەدەی بیســتەمدا، ناوەکەی هاوواتای دۆزی کورد بووە. کارلێکی ئەم کەسایەتییە لەگەڵ مێژووی کورد بەجۆرێک بووە، ڕووداوگەلی سەدەی ڕابردوو، کاریان لە ڕەوتی ژیان و پێگەیشــتنی هەبووە و لەگەڵ زۆر هۆکاری تری خودی و بابەتی ئەو تایبەتمەندییانەیان پێبەخشــیوە، کە دواتر بەهۆیانەوە بووەتە کاراکتەری دیــار و بزوێنەری ڕووداوە گرنگەکــان. لێرەدا بە دوو تەوەر بــاس لەژیــان و تایبەتمەندییە کەسێتییەکانی ئەم ڕێبەرە دەکەین، بەم شێوەی خوارەوە:

## تەوەری یەکەم: ژیانی مەلا مستەفا بارزانی

ژیانی مەلا مســتەفا بارزانی بە چەند قۆناغێک تێپەڕیوە، کە هەریەک لەو قۆناغانە تایبەتمەندی خۆیان هەیە و بەیەکەوە مێژوویەکی پڕ ڕووداویان تۆمارکردووە، هەر ئەو قۆناغانەش کەســایەتی بارزانییان ڕەنگرێژ کردووە، لەم ســۆنگەوە هەوڵئەدەین بەباسکردنی ئەو قۆناغانە، ژیانی ئەو بخەینەڕوو:

### باسی یەکەم : سەرەتاکانی ژیانی بارزانی و پێگەیشتنی:

مستەفا بارزانی، کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەبدوڵسەلامی کوڕی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی شـێخ عەبدولڕەحمانی کوڕی شـێخ تاجەددینە[1]. لەبنجدا پێش ناوی (مەلا)ی هەیە، وەک خۆی لە دیمانەیەکی ڕۆژنامەوانیدا باســـی کردووە، ناوی مەلا ناوی ڕاســتەقینەی خۆیەتی و نازناوێکی ئاینی نییە[2]. پاشــگری ناوەکەشــی، لەناوی (گونـدی بـارزان)[3]ەوە هــاتووە. وەک شـــێخ عەبـدوڵســـەلامی یەکەمی بـارزان

---

١ - لەبارەی ڕەچەڵەکی بنەماڵەی بارزان، بڕوانە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ١٩٣١-١٩٥٨، چاپخانەی خەبات، دهۆک، ١٩٩٨، ل١٦.

2 - Dana Adams Schmidt, Kurdish Chief Follows Policy of Strength, The New York Times, September 11, 1962, p.14.

٣ - بارزان: وەکو ناوچە، کەوتۆتە ئەوپەڕی باکووری کوردستانی عێراق، لەناو سنووری پارێزگای هەولێرە. سەر بەقەزای مێرگەسوور بوو، کە بۆ سێ ناحیە دابەش کراوە، مێرگەسوور، بارزان، شێروان. سنووری ڕۆژهەڵاتی قەزای ڕەواندزە، لای ڕۆژئاوای قەزای ئامێدیە، باشووری قەزای ئاکرێیە، باکووریشی سنووری تورکیایە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مسعود بارزانی، س.پ، ل١٧.

لەقەســـــیدەیەکدا دەڵێت:" خالدیمە بە تەریقەت، زێباریمە بە عەشـــــیرەت، بارزانیمە بە مەسـکەن قەریەت"[٤]. مسـتەفا بارزانی لە (١٤ ی ئاداری١٩٠٣) لەدوای مردنی باوکی، لەو گوندە لەدایک بووە. دایکی کچی سـوڵتان ئاغای کوڕی حەسـەن بەگی بێرسـیاقی سەرۆکی (هۆزی شێروانی)[٥] بوو[٦].

شـێخ تاجەددینی باپیرە گەورەی مســـتەفا بارزانی، زانایەکی ئایینی ناوداربووە، گەلێک موریدی لە دەور کۆبوونەتەوە، بۆیە تەکییەی(بارزان)ی دامەزراند. شـــێخ محەمەدی باوکی مەلا مسـتەفا لەماوەی نێوان سـالانی (١٨٧٢_ ١٩٠٣) شـێخی ئەو تەکییە بووە[٧]. بێجگە لەم کوڕەی، چوار کوڕی دیکەی بەناوەکانی (عەبدولسـلام، ئەحمەد، محەمەد سـدیق، بابۆ )هەبووە[٨]. شـــێخ محەمەد بارزانی دوای ئەوەی لەسـاڵی(١٩٠٣) کۆچی دوایی کرد، کوڕەکەی بەناوی شـێخ عەبدولسـلامی دووەمی بارزان(١٩٠٣-١٩١٤) شـوێنی گرتەوە و بووە میراتگری ئەو ڕێبازە سـۆفیگەرییەی، شێخانی بارزان هێنابویانە ناوچەکە[٩].

لەئەنجامی ئەم وەچەرخانەی لەسـاڵی(١٩٠٨) لە سـیاسـەتی دەوڵەتی عوسـمانی بەرامبەر بەکەمایەتییە نەتەوەییەکان هاتە پێشـــەوە، شـــێخ عەبدولسـلامی دووەمی

---

٤ – دیدار عوسمان، مێژووی بارزان لەشێخ عەبدولسلامی یەکەمەوە تا کۆتایی ژیانی شێخ عەبدولسلامی دووەم لەژێر ڕۆشنایی بەڵگەنامەکانی دەوڵەتی عوسمانی دا، پ: نعمەت شەهاب کەوانی، دەزگای فەرهەنگی هونەری و ڕاگەیاندنی ڕێژیار، هەولێر، ٢٠٢١، ل٢٠؛ مسعود بارزانی، س.پ، ل١٦.

٥ – شێروانییەکان یەکێک بوونە لەو هۆزە گەورانەی ڕووبەڕووی بارزانییەکان بوونەوە، بەڵام دوای ئەوەی شێخ عەبدولسلامی بارزانی لە ساڵی(١٩٠٦) دا بەسەریاندا زاڵ بوو، بوونە هێزی سەربازی شێخی بارزان. د. كاوس قفطان، الانتفاضات البارزانية، دار ئاراس للطباعة والنشر، أربيل،٢٠٠٣،ص١٧.

٦ – سوارە قامشلی، سەرنجێک لە پاڵەوانێتی و پاڵەوانانی مێژوو و ڕابەری مەزن بارزانی، کۆنگرەی یادەوەریی سەد ساڵەی بارزانی نەمر، ب٢، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی ، هەولێر، ٢٠٠٣، ل١٠٠٩.

٧ – بەپێی زانیارییەکانی مسعود بارزانی لەکاتی گەشتەکەیدا بەناوچەی بادینان، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، سەری لە تەکیەی بارزانداوە و شێخ عەبدولسلامی یەکەمی بارزانی کردۆتە خەلیفەی خۆی. دوای ئەوەی شێخ عەبدولسلامی یەکەمی بارزان لە (١٨٧٢)کۆچی دوایی دەکات، شێخ محەمەدی کوڕی بووە شێخی بارزان. مسعود بارزانی، س.پ، ل١٦.

8- О.л. Жигалина. Мулла Мустафа Барзани (историческое фото), Институт востоковедения, Москва, 2013, С.18.

٩ – مسعود بارزانی، س.پ، ل١٧.

بارزانی یاداشتێکی پێشکەشی دەسەڵاتدارانی عوسمانی کرد، کە چەند داخوازییەکی نەتەوەیی و ئایینی تێدا هاتبوو[10]، بەڵام ئەوان ئەو هەوڵەیان بەهەڵگەڕانەوە و یاخیبوون و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی روسیا دانا[11]. دواتریش لە (١٧ی ئەیلولی١٩٠٩) هەڵمەتێکی سەربازییان بەفەرماندەیی والی موسڵ محەمەد فازل پاشای داغستانی(١٩٠٨-١٩١٠) بەمەبەستی دەستگیرکردنی شێخی بارزان، بۆ سەر ناوچەکە ئەنجامدا[12]. بەڵام شێخ عەبدوڵسەلام و بەشێک لە موریدەکانی ناوچەکەیان بەجێهێشت[13]. لەبەرامبەردا هێزەکەی محەمەد فازل پاشای داغستانی، کەوتنە بەر ڕووخاندن وێرانکردنی بەشی زۆری ئاوەدانییەکانی ناوچەکە. بەگوێرەی بەڵگەنامەکانی دەوڵەتی عوسمانی، (١٣٢٧) ماڵ و (٤٤) مزگەوت و کلێسایان لەو پرۆسەیەدا خاپوورکرد[14]. وێڕای دەستگیرکردنی ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکەکەی، کە (١٧) یان لەخزم و کەسوکاری نزیکی شێخی بارزان بوون[15]، تەنانەت دایک و برای بچووکیشی، کە مستەفا بارزانی بوو بەدیلی دەگرن[16]و دەیانگوازنەوە بۆ دیوانی

---

١٠ – صديق الدملوجي، امارة بهدينان الكردية أو امارة العمادية، تقديم و مراجعة: الدكتور عبدالفتاح علي بوتاني،ط٢، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل،١٩٩٩،ص٨٧ هەرچەندە ئەم نووسەرە باسی لە ڕێککەوتی پێشکەشکردنی یاداشتەکە نەکردووە، بەڵام بەپێی ئەو شیکارییەی دکتۆر عوسمان عەلی لە کتێبی (الحركة الكردية المعاصرة) بۆ بابەتەکەی کردووە، ڕێککەوتی پێشکەشکردنی یاداشتەکە، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٠٨. بروانە: د.عثمان علي، الحركة الكردية المعاصرة ، دراسة تاريخية وثائقية ١٨٣٣-١٩٤٦،ط٣، التفسير للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠١١، ص٢٥٦.

١١ – دیدار عوسمان، س.پ، ل١٨٠.

١٢ – بروانە: دەقی نووسراوی سەدری ئەعزەم بە ژمارە (٢٥٥٢) لە (١٨ شەوال ١٣٢٧ک) بۆ بابی عالی، لە: بارزان و زێبار لەبەڵگەنامەکانی عوسمانی دا ١٢٦٧-١٣٣٨ک/١٨٥١-١٩١٩ز، بگ٤، ئا: دکتۆر نەوزاد یەحیا باجگر، و: ئاشتی رەحمان، بڵاوکراوەکانی زانکۆی جیهان(خانەی بەڵگەنامەکان)، هەولێر، ٢٠١٨، ل١٦٢؛ دیدار عوسمان، س.پ، ل١٨٠.

١٣ – بروانە: نووسراوی قوماندانی والی موسڵ و دەوروبەری بۆ بابی عالی و نەزارەتی ناوەخۆ لە: بارزان و زێبار لەبەڵگەنامەکانی عوسمانیدا، ل١٦٧؛ دبليو.اي.ويگرام، ادگار.تي.أي. ويگرام، مهد ألبشرية/ الحياة في شرق كردستان، ت: جرجيس فتح الله، ط٤، دار أراس للطباعة والنشر، أربيل، ٢٠١٠،ص١١٧.

١٤ – بروانە دەقی بەڵگەنامەکە لە: بارزان و زێبار لەبەڵگەنامەکانی عوسمانیدا، ل١٩١.

١٥ – دیدار عوسمان، س.پ، ل١٨٠.

١٦ – محمد علی سلطانی، اوضاع سیاسي اجتماعی تاريخی ایل بارزان، به انضمام دكتر اسماعیل اردلان، اسرار بارزان ١٣٢٥ شمسی، سازمان اسناد و كتابخانه ملی جمهوري اسلامی ایران، تهران،

جەنگی عورفی لەموسڵ[١٧]. دواتر لەئەنجامی ڕێککەوتنێکی شـێخ عەبدولسـەلام لەگەڵ بەرپرســـانی عوســـمانی لە (١٥ی حوزەیرانی١٩١٠)، پاش مانەوەیان بۆ ماوەی نۆ مانگ و دوو ڕۆژ لەبەندیخانە، ئازادکران[١٨].

دوای ماوەیەکی کەم لە ئازادکردنی مســـتەفا بارزانی، دایکی مرد. بەم شـــێوەیە بارزانی لە ســـەرەتاکانی تەمەنیدا، بێ دایک و باوک مایەوە، بەڵام شـــێخ ئەحمەد (١٨٩٦_١٩٦٩)ی برا گەورەی، پەروەردەکردنی خستە ئەستۆی خۆی و تاڕادەیەکی زۆر، ڕۆڵی لە پێگەیاندنی بینی[١٩]. کاتێک تەمەنی گەیشـــتە (١١) ســـاڵ، شـــێخ عەبدولســـەلامی دووەمی بارزانی لە (١ی کانونی یەکەمی١٩١٤) لەبەردەم ســـەرای حکومەت لەموسڵ، بەتۆمەتی وروژاندنی بیری جوداخوازی و هەڵگەڕانەوە لەدەوڵەت، لەلایەن عوسـمانییەکان لەسـێدارە درا[٢٠]. دوای ئەم ڕووداوە شـێخ ئەحمەدی بارزانی لەنـاوچەکە خۆی وون کرد، لەبەرئەوەی هێزێکی عوســـمـانی بەدوایەوە بوون دەســـتگیری بکەن. بۆیە مەلا مســـتەفا چووە لای (ئەحمەد ئاغای شـــێروانی) خاڵی لەگوندی بێرسیاڤ. ئەمیش ڕۆڵی بینی لەپێگەیاندنی کەسایەتییەکەیدا[٢١].

ئەو ڕووداوانەی لەپێشـــەوە باســـکرا، بەگشـــتی پاڵنەربوون بۆ ئەوەی بیری کوردایەتی و هەوڵدان بۆ بەدەســـتهێنانی مافەکانی کورد لەژیانی مســـتەفا بارزانیدا ڕەنگبداتەوە. لەگەڵ ئەمـانەش کاریگەری هەوڵی براگەورەکەیان لەپەروەردەکردنیدا نابێ لەیادبکرێ، کە لە پەروەردەکردنی هەوڵیدەدا بۆ بونیادنانی کەســـایەتییەکی بەهێزی سەربازی و سیاسی جۆشدراو بەبیری نەتەوەیی و نیشتمانپەروەری[٢٢]، بەتایبەت لەڕێگای ڕۆڵ پێدانی هەر لەتەمەنی(١٥) ساڵییەوە، وەکو ڕەوانەکردنی بۆ باکووری کوردسـتان لەپێناو گواسـتنەوەی بیروڕاکانی شـێخی بارزان سـەبارەت

---

١٣٨٣، ص٢١؛ أيوب بابو البارزاني، بارزان و حركة الوعي القومي الكردي(١٨٢٦-١٩١٤)،(د.م)، ١٩٨٠، ص١١٣؛ دبليو.اى.ويگرام، ادگار.تى.أي. ويگرام، م.س،ص١١٧.

١٧ – بروانە: بـارزان و زێبار لەبەڵگەنامەکانی عوسمانیدا، ل١٨٧.

١٨ – دیدار عوسمان، س.پ، ل٢٢٨؛ دبليو.اى.ويگرام، ادگار.تى.أي. ويگرام، م.س،ص١١٨.

١٩ – سوارە قامشلی، س.پ، ل ل١٠١٣،١٠٠٩.

٢٠ – صديق الدملوجي، م.س، ص٨٩.

٢١ – أيوب بارزاني، المقاومة الكردية للاحتلال ١٩١٤-١٩٥٨، دار نشر حقائق المشرق، لبنان، ٢٠٠٢، ص٤١.

22- O.I. Zhigalina. Предыдущий источник, с.9.

بەدۆزی کورد و سەربەخۆیی کوردستان بۆ کەسایەتییە سیاسی و کۆمەڵایەتییە کوردییەکانی ئەو ناوچەیە[٢٣]. هەروەها ڕەوانەکردنی بۆ هاوکاریکردنی ڕاپەڕینی شێخ مەحمودی حەفید لەساڵی ١٩١٩ لەسلێمانی[٢٤]، دواتریش بەدەنگەوە هاتنی داخوازی سەرکردەی ئەرمەنی ئەنترانیک(١٨٦٥-١٩٢٧) بۆ ڕزگارکردنی خۆی و خێزانەکەی لەژێر دەستی تورکەکان و گواستنەوەیان بۆ ناو خاکی سوریا لەساڵی ١٩٢٠[٢٥]. بارزانی سەرکردایەتی هێزێکی بارزانییەکانیشی کرد بۆ پاڵپشتیکردنی شۆڕشی ئارارات[٢٦]. پاشان لە (٢١ی تەمموزی ١٩٣٠) سەرکردایەتی هێزێکی دیکەی کرد، بۆ هاریکاری کوردەکانی ناوچەی ئۆرامار[٢٧] لە باکووری کوردستان[٢٨]. بێگومان هەموو ئەمانە لەتوانا سەربازییەکانیان بەرزکردەوە.

شیاوی باسە شێخ ئەحمەد لەتەک ڕۆڵی سەربازی، لەچەندین بۆنەدا ڕۆڵی سیاسیشی بە مستەفا بارزانی بەخشی. بۆ نمونە ڕەوانەکردنی وەک نوێنەری خۆی بۆ گفتوگۆی بارزانییەکان لەگەڵ موتەسەڕیفی موسڵ عەبدولعەزیز بەگ ئەلمزەفەر (١٩٣١/٤/١٨-١٩٣١/٩/٣) لەئاکرێ، سەبارەت بە هاوکاریکردنی حکومەت لەپێناو دەرکردنی بریتانییەکان لەبنکەی پۆلیسی بلێ و شوێنگرتنەوەیان بەهێزێکی پۆلیسی

---

٢٣ -د. عبدالفتاح علي البوتاني، ملا مصطفى البارزاني قائد الثورة الكوردية و ملهمها، مركز الابحاث العلمية والدراسات الكوردية، دهوک، ٢٠١٢، ص١٦.

٢٤ - لەبارەی ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحمود بروانە: عبدالرحمن أدريس صالح البياتي، الشيخ محمود الحفيد(البرزنجي)و النفوذ البريطاني في كردستان ، دار الحكمة ، لندن، ٢٠٠٧.

٢٥ - مسعود بارزانی، س.پ، ل٢٤؛ سەبارەت بەکێشەی ئەندرانیک لەگەڵ تورکەکان، بگەڕێوە بۆ: جون كيراكوسيان، الاتراك الشباب أمام محكمة التاريخ، ت: د. أسماعيل محمد حصاف، مطبعة جامعة صلاح الدين، أربيل، ٢٠٢٠، ص١٦٥.

٢٦ _ سەبارەت بە شۆڕشی ئاگری داغ (ئارارات) بگەڕێوە بۆ: بیرەوەرییەکانی ئیحسان نوری پاشا، و: وریا قانع،دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریان،هەولێر، ٢٠٠١،ل ٨٠-٩٣.

٢٧ - شێخ ئەحمەد لەسەر داوای یەکێک لەکوڕەکانی (سیتو ئاغا ئۆرامارى) ئەو هێزە بۆ هاریکاری هۆزی (ئۆرامار) کە هۆزێکی کوردی نیشتمانپەروەری دانیشتووی ناوچەیەکن نزیک لەبارزان، لەسنووری باکووری کوردستان ڕەوانە دەکات. بروانە: عثمان علي، م.س، ص٦٤٩.

٢٨ - کریس کۆچێرا، کورد لەسەدەی نۆزدە و بیستدا، و: حەمە کەریم عارف، چ٤، هەولێر،٢٠٠٧، ل١٢٢.

عێراقی لەســـەر داخوازی ئەوەی یەکەم[٢٩]، کە دواتر بـارزانییەکـان لە (٢٨ی تەمموزی١٩٣١) داواکارییەکەیان جێبەجێکرد[٣٠]. پاشـان بەشـداریکردنی بەنوێنەرایەتی شـــێخی بـارزان لە دانوســـتـانەکـانیـان لە(٢٨ی ئەیلولی١٩٣١) لەگەڵ بریکـاری موتەسەریفی موسڵ و قائیمقامی ئامێدی ماجد مستەفا (١٨٩٦_١٩٧٤) و فەرماندەی ناوچەی باکوور عەقید برقی ســدقی لە یانەی عەســکەر لەموســڵ، بە مەبەســتی هەماهەنگیکردن بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوچەی بارزان[٣١]، وێڕای ئەمانە، بارزانی بۆ جارێکی دیکە وەک نوێنەری شێخی بارزان لەکۆبوونەوەی (تشرینی دووەمی١٩٣١) بەشـــداریکرد، لەگەڵ هەردوو موتەســـەڕیفی موســـڵ و هەولێر و قائیمقامەکانی ڕەواندوز و زێبار و نوێنەری شـــێخ ڕەشـــیدی لۆلان، کۆبوونەوەکە لەئاکرێ ئەنجامدرا، بۆ قسەکردن لەسەر چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەی نێوان بارزانییەکان و برادۆستییەکان، کە بەگشتی ئەنجامی پێچەوانەی لێکەوتەوە سەبارەت بەخواستی بارزانییەکان بۆ لێکتێگەیشـتن لەگەڵ حکومەتی عێراقی، بەو هۆیەوە ڕاپەڕینی یەکەمی بـارزان لەمـاوەی نـێوان (٩ی کـانـونـی یەکەمـی ١٩٣١_٢٢ ی حـوزەیـرانـی ١٩٣٢)هەڵگیرسا[٣٢].

لەوماوەیەدا بارزانییەکان لەناوچەکانی خۆیاندا ڕووبەڕووی هێزی حکومەتی عێراق و هەروەها بریتانیا بوونەوە[٣٣]. ئەم ڕاپەڕینە بۆ یەکەمجار دەرفەتێکی بۆ مســـتەفا بارزانی ڕەخســـاند، وەک ســـەرکردەیەکی ســـەربازی ناوبانگ دەربکات، هەرچەندە تەمەنی(٢٨) ساڵ بوو[٣٤]. بەڵام لەکۆتاییدا بەهۆی نەبوونی هاوسەنگی هێز لەنێوان هەردوولا، مســتەفا بارزانی لەگەڵ شــێخی بارزان و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون،

---

٢٩ - بروانە: مجید احمد ئاسنگەر، کارەساتی بارزان چۆن دەستی پێکرد و چۆن کۆتایی هات، هەتاو(گۆڤار)، ژ(١٤٧)، ١٥ی کانونی دووەم ١٩٥٨، ل١-٥.

٣٠ - د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩).

٣١ - سەبارەت بە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی کێشەی بارزان، بروانە: عثمان علي، م.س، ص٦٣٧-٦٣٩.

٣٢ - کریس کۆچێرا، س.پ، ل١٤٧.

٣٣ - بروانە: مهند علي فرحان الجبوري، الشيخ أحمد البارزاني وأثره الاجتماعي والسياسي في كردستان العراق ١٨٩٦-١٩٦٩، دار سپيرێز، دهوك، ٢٠١٧،ص١٢١_١٦٨.

٣٤ - عەبدولخالق ناسر ئەلعامری، بارزانی مستەفا و دۆزی کورد لەعیراق١٩٣١-١٩٧٥، و: ئەرکان شارباژێری، ئینسکلۆپیدیا پارتی دیموکراتی کوردستان و زانکۆیا دهۆک،دهۆک، ٢٠٢١، ل٦٢.

ناچاربوون له (٢٢ی حوزەیرانی١٩٣٢) لەناوچەکەدا پاشەکشە بکەن و لەسنووری عێراق بپەڕنەوە بۆ تورکیا[٣٥].

دوای پەڕینەوەی بارزانییەکان له گوندی (زیت)[٣٦]ەوە بۆ نێو سنووری تورکیا، هۆزی گەردی،کە ئەمانیش بەشێک بوون لەموریدانی تەکییەی بارزان[٣٧]، لەو دیوی سنووری عێراق و لەناو خاکی تورکیا لەگوندی (گرانه)[٣٨] لەناوچەی شەمدینان، هەموو هاوکارییەکیان پێشکەشی بارزانییەکان کرد[٣٩]. ئەو کاته دەسەڵاتدارانی تورکیا مەترسیان له دۆخەکه دروستکرد، بۆیه فەرمانده‌ی تیپی حەوت لەدیاربەکر بەبروسکەی ژماره(١٨٣١) له (٢٤ی حوزەیرانی١٩٣٢)، داوای له پشکێنەری فەیلەقی (سێ) کرد، بارزانییەکان بگوازنەوە ناوچەیەکی دیکه[٤٠].

لەدوای ئەم داواکارییەی فەرمانده سەربازییەکانی دیاربەکر، دەسەڵاتدارانی ئەنقەره به بروسکەی ژماره(١/٧٤٩) لەڕێککەوتی (٢٢ی تەمموزی١٩٣٢)، فەرمانیان دەرکرد بۆ گواستنەوەی بارزانییەکان له ناوچەی (وان)ەوە بۆ (ئەرزەرۆم)، که بەگشتی(٦٣٠) کەس بوون و له (١٦٨) پیاو و (١٥٦) ئافرەت و ( ١٣٥) منداڵی کچ و

---

٣٥ – د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)؛ سەبارەت به دەقی بروسکەی ژماره(١٨٣١) ی فەرماندەی تیپی حەوت لەدیاربەکر بۆ پشکێنەری فەیلەقی سێ لەدەستەی ئەرکانی گشتی تورکی، ئاماژه به پەڕینەوەی شێخ ئەحمەد و برایەکانی مەلا مستەفا و محەمەد سدیق و ئەوانەی لەگەڵیانن دەکات بۆ ژێر فەرماندەیی حکومەتی تورکیا، بەپێی بروسکەکه بارزانیەکان لەڕۆژی(٢٢ی حوزەیران ١٩٣٢) چەکەکانیان ڕادەستی کەتیبەی شەشەمی سنوور کردووه. له پاشکۆی ژماره(١) بروانه:.GNKUR. ArŞivi, A.1733/ D.139/ F. 1 – 21

٣٦ – گوندی زیت: له خۆرئاوای شێروانه و لەنزیک سنووری تورکیا دایه، پشتەوەی دۆلێکی تەنگەبەره، تا دەگاته سنوور. مسعود بارزانی، س.پ، ل٥٦.

٣٧ – گەردییەکان بەر لەدامەزراندنی(تەکییەی بارزان) نزیک بوونه له تەکییەی نەهری، بەڵام له دوای دامەزراندنی تەکییەی بارزان لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم، زۆرێک لەگەردییەکان لەتەکییەی نەهری دووردەکەونەوه و خۆیان دەدەنه پاڵ تەکییەی بارزان. کامەران دەسکۆ حەجی بیرۆخی، پێشمەرگەیەک له خزمەتی ڕێبازی بارزانی دا (حەجی بیرۆخی)، ترکیا، ٢٠٢١،ل٢٥.

٣٨ – گوندی گرانه: گوندی گەردییانه، کەوتۆته باکووری کوردستان، چونکه کاتی دابەشکردنی کوردستان، دوای جەنگی یەکەمی جیهانی هۆزی گەردی کرایه دوو بەش لەنێوان تورکیا و عیراق. مسعود بارزانی، س.پ، ل٥٦.

٣٩ – هـس، ل٤٣.

40 -GNKUR. ArŞivi, A.1733/ D.139/ F. 1 – 21.

(١٧١) منداڵی کوڕ پێکهاتبوون[٤١]. هەرچی شـێخ ئەحمەدی بارزانی بوو لە ڕۆژئاوای ئەنادۆل نیشـــتەجێکرا[٤٢]. مســـتەفا بارزانی ئەو زانیاریانەی لەگێڕانەوەکانی خۆیدا پشتڕاستکردۆتەوە و ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، کە دوای ئەوەی چوونە ناو سنووری تورکیا، تورکەکان شـێخ ئەحمەدیان بەڕێگای (گەڤەر_ وان) گواسـتەوە بۆ ئەرزەرۆم پاشان گواستیانەتەوە بۆ ئەنقەرە، ئەویش لەگەڵ خاوخێزانی هەریەک لە شێخ ئەحمەد و براکانی دیکەی، واتە محەمەد سـەدیق و بابۆ و منداڵەکانی شـێخ عەبدولسـەلامی براگەورەیان، ڕەوانەی ئەرزەرۆم کران، دوای مانگێک گوازرانەوە بۆ ئەرزنجان[٤٣].

مستەفا بارزانی لەو ماوەیەدا دوای ئەوەی لەناوچەی شەمدینان دوورخرایەوە، تەقەلایەکی زۆری لەگەڵ تورکەکان دا، تا توانی ڕازییان بکات بۆئەوەی بیانگوازنەوە ناو گەردییەکان لە شەمدینان[٤٤]. پاشان لەپێناو دروستکردنی فشار لەسەر حکومەتی عێراقی بۆ دەرکردنی بڕیاری لێبوردنی گشـتی بۆ ئەو بارزانییانەی لە تورکیا دەژیان، پشـــتیوانی لە خەلیل خۆشـــەوی(١٩٠٦-١٩٣٦) کرد، بۆ بەرپاکردنی جوڵانەوەیەکی چەکداری لەدەڤەری بارزان. ئەو جوڵانەوەیە دوای هەڵگیرســـانی، بۆ ماوەی (ســـێ) ساڵ(١٩٣٣-١٩٣٦) بەردەوام بوو[٤٥]. هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی جوڵانەوەکە، حکومەتی عێراق وەک هەوڵێک بۆ ئارامکردنەوەی دۆخەکە، یاســای ژمارە(١٥)ی ســاڵی ١٩٣٣ ی تایبەت بەلێبوردنی گشـــتی لە(١٥ی ئایاری١٩٣٣) بۆ هەموو بارزانییەکان دەرکرد، تەنها خەلیل خۆشەوی نەگرتەوە[٤٦].

---

41 -GNKUR. ArȘivi, A.1733/D.139/ F.1 – 35.

٤٢ – بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە(٩٩)ی سەرکردایەتی ئەرکانی سوپای بریتانیا( بێرۆی دووەم) لە(٢٨ی ئەیلوولی١٩٣٢) بەناونیشانی بزووتنەوەی کورد لەعیراق لە: کوردو کوردستان لەبەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی فەرەنسا و بریتانیادا ١٨٧٩-١٩٦٣، و: نەجاتی عەبدوڵڵا، هەولێر، ٢٠٢١، ل٢٦٦.

٤٣ – مسعود بارزانی، س.پ، ل٤٢.

٤٤ – مسعود بارزانی، س.پ، ل٤٢.

٤٥ – بڕوانە: عەبدولخالد صابر کەریم، بیری نەتەوەیی لەپێڕەو و پرۆگرامەکانی کۆمەڵە(جەمعیەت) و حیزبە کوردییەکان و کاریگەرییان لەجوڵانەوەی رزگاریخوازیی نەتەوەیی کوردییدا (١٩١٩-١٩٤٥) لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە، نامەی ماستەر، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر، ٢٠٠٨، ل٢٣٩.

٤٦ – د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)،وزارةالداخلية(شعبة الحدود)،البارزانيون، م.ع/٤٩،٦/١/١٩٤٩؛ د. عبدالفتاح علي يحيى البوتاني، وثائق عن الحركة القومية

زانیارییە هەواڵگرییەکانی حکومەتی بریتانیا، کە لەلایەن دەزگای ئاسایشی گشتی سەرکردایەتی ئەرکانی سوپا خراونەتەڕوو، لە باسکردنی چالاکییەکی سەربازی (ئێل)[47]ی بارزان بەسەرۆکایەتی مستەفا بارزانی و خەلیل خۆشەوی کە لە ڕۆژی(١١ی حوزەیرانی ١٩٣٣) لەدژی بەتالیۆنی دووەمی هێزی پیادەی عێراقی ئەنجام دراوە، دەرخەری ئەوەن، کە مستەفا بارزانی دوای دەرچوونی بڕیاری لێبوردنی گشتی، ڕاستەوخۆ گەڕاوەتەوە ناوچەی بارزان و بەشداری کردە سەربازییەکانی جوڵانەوەی خەلیل خۆشەوی کردووە[48].

بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی لەبەڵگەنامە عێراقییەکاندا هەیە، دوای ئەوەی حکومەتی عێراقی لە (٢ی حوزەیرانی١٩٣٣) ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر گەڕانەوەی بارزانییەکان[49]، شێخ ئەحمەد بارزانی لە(١٥ی حوزەیرانی١٩٣٣) لەتورکیاوە گوازرایەوە بۆ شاری بەغدا، دواتر مەلا مستەفا و مەلا سەدیق و ئۆلۆبەگ لەگەڵ (٢٠٠) کەس لە لایەنگرانیان لە(٢٩ی حوزەیرانی ١٩٣٣) گەڕانەوە (شێروان مەزن)[50]. پاشان بەپێی بروسکەی وەزارەتی ناوەخۆ کە لە ڕۆژی(٣٠ی تەمموزی ١٩٣٣) بۆ موتەسەرفیەتی لیوای موسڵ نێردراوە، شێخ ئەحمەد بارزانی بەهۆی بێزاری لە کەش وهەوای شاری بەغدا، داوای کردووە بیگوازنەوە بۆ شاری موسڵ. ئەوەبوو لەڕۆژی(٦ی ئابی١٩٣٣) دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی وەزارەتی ناوەخۆ، حکومەتی عێراقی بڕیاریدا لە شاری موسڵ نیشتەجێی بکات، پاشان لە (کانونی یەکەمی١٩٣٣)

---

الكردية التحررية(ملاحظات تاريخية و دراسات أولية)، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، أربيل، ٢٠٠١، ص٥٣٤.

٤٧ – زاراوەی (ئێل): لە زمانی تورکی مەغۆلی و لە وشەی ئیل هاتووە. لە تێکستە کۆنەکانی تورکی و فارسی بە زۆر مانا بەکارهێنراوە، وەک: ویلایەت، ئاشتی و برادەرایەتی، گرووپی کۆمەڵایەتی و یەکریز. د. حبیب مصطفی ابراهیم، ڕۆڵی ڕێساکانی داب و نەریت لە ژیانی بارزانییەکان، هەولێر،٢٠٢٠، ل٤٤.

٤٨ – بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە (١٠٤) لە: کوردو کوردستان لەبەڵگەنامە نهێنییەکانی...،ل٢٧١.

٤٩ – صلاح الخرسان، التيارات السياسية في كردستان العراق(قراءة في ملفات الحركات والاحزاب الكردية في العراق ١٩٤٦-٢٠٠١)، مؤسسة البلاغ للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت، ٢٠٠١، ص٣٩.

٥٠ – حسن مصطفى، البارزانيون و حركات بارزان(١٩٣٢_١٩٤٧)، ط٢، بغداد،١٩٨٣،ص٤٨.

مســـتەفا بارزانیش گوازرایەوە ئەو شـــارە و دوای ئەوەی بڕیاری نیشـــتەجێکردنی زۆرەملێیان بۆ دەرچوو. خرانە ژێر چاودێری دەزگا ئەمنییەکانی حکومەت[51].

**باسی دووەم: ژیانی بارزانی دوور لە زێدی خۆی**

دوای گواســـتنەوەی مســـتەفا بارزانی بۆ شـــاری موســـڵ، لەگەڵ بنەماڵەکەی لەگەڕەکی (راس الكور)، کە یەکێکە لەگەڕەکە کۆنەکانی ئەو شارە، نیشتەجێکران. ئەو گەڕەکە دەکەوێتە کۆتایی ڕێگای (ســـوق الشـــعارین) لەشـــەقامی ســـەرەکی نەبی جەرجیس. ئەو خانووەشی تێیدا نیشتەجێبوون، کەوتبووە تەنیشت مزگەوتی(عەبدوڵڵا نەشئەت)[52]. لە(٢٤ی شوباتی١٩٣٤) لەسەر پێشنیازی ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوەخۆ، بڕێک یارمەتی داراییان بۆ خەرجکرا بۆ بەڕێوەبردنی ژیان و گوزەرانیان. بۆ نمونە هەریەکە لە مســـتەفا بارزانی و برایەکەی شـــێخ محەمەد ســـەدیق، مانگانە بڕی (٥) دیناریان وەک هاوکاری پێدەدرا[53].

مستەفا بارزانی لە سەرەتاکانی تەمەنیدا شەش ساڵ وانەی ئایینی لەسەر دەستی (مەلا مەحمود) لەگونـدی بـارزان خوێنـدبوو، دوای ئەوەی شـــێخ ئەحمەدی برا گەورەیان بەمەبەستی ڕۆشنبیرکردنی خستییە ژێر چاودێری و سەرپەرشتیکردنی، لەبەرئەوەی مەلای ناوبراو جێی متمانەی ئەو بوو[54]. پاشـــان بۆ ماوەی چوار ســـاڵ (شـــەریعەت و فیقهی ئیســـلامی) هەر لەبارزان خوێند[55]. بەڵام بەهۆی ئەو بارودۆخە سیاسییەی لەسالانی دواتر ڕووبەڕووی ناوچەکەیان بوویەوە، لەخوێندنەکەی دابڕا. بۆیە لەماوەی دوورخرانەوەکەی بۆ موســـڵ، هەوڵدەدات بەردەوامی بەخوێندنەکەی بدات، بە ئامانجی پەرەپێدانی توانا زانســـتی و ڕۆشـــنبیرییەکەی. بۆ ئەم مەبەســـتەش

---

٥١ - د.ك.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)،الحركات البارزانية الأولى من ١٩٣٢/٦/٢٢ ألى ١٩٣٢/٧/١٥.

٥٢ - د. عبدالفتاح علي البوتاني، منطقة بادينان ١٩٢٥-١٩٧٠ دراسة في الوقائع والتطورات السياسية، ج١(١٩٢٥-١٩٥٨)، اربيل، ٢٠١٧، ص٢٤١.

٥٣ - د.ك.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)،الحركات البارزانية الاولى من ١٩٣٢/٦/٢٢ ألى ١٩٣٢/٧/١٥.

٥٤ - أيوب بارزاني، المقاومة الكردية للاحتلال ١٩١٤-١٩٥٨، ص٦٦.

٥٥ - دانا ئادامز شمیدت، سەفەرێک بۆ ناو پیاوە ئازاکان لە کوردستان، و: ئەبوبەکر ساڵح ئیسماعیل، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٩، ل١٨٤.

سەردانی هەندێ لە مەلا و زاناکانی ئایینی ئەو سەردەمەی شارەکەی کرد، لەمانەش زانایەکی ئایینی بەناوی محەمەد عەلی، کە وانەی فقهی ئیسلامی لە مزگەوتی عەبدوڵا نەشئەت دەگوتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا وانەی دیکەی لە زمان و ئەدەبی فارسی لای مەلا عەلی یەحیای بۆتانی خوێندووە. هەروەها ئامادەی وانە ئایینیەکانی شێخ عەبدوڵڵا نیعمەتیش بووە[٥٦].

بارزانی سوودی لەهەندێ وانەی دیکە لە مزگەوتەکانی (النوري الكبير) و شێخ عەبدال و مزگەوتی ئیمام ئیبراهیم و قوتابخانەی فەیسەڵییەی ئایینی وەرگرتووە. وێڕای ئەوەی سەردانی کتێبخانەی میر غازی (کتێبخانەی گشتی ئێستا)ی کردووە، کە ئەو کاتە تەنها چوار ساڵ بەسەر دامەزراندنی کتێبخانەکەدا تێپەڕیبوو[٥٧].

لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە، هەوڵی تێکەڵاوبوون و نزیکبوونەوەی لەخەڵکی موسڵ داوە، ناوە ناوە سەردانی بەشێک لەو کوردانەی کردووە کە لەو شارە نیشتەجێبوونە. هەروەها سەردانی شوێنە گشتییەکانی وەک (چایخانەی باب الجسر)و قاوەخانەی قەڵای کردووە، کە دەکەوێتە بەری ڕاستی ڕووباری دیجلە، لەسەرەتای پردە ئاسنینەکەی موسڵ. ئەو کاتە ئەوانەی دەچوونە ئەو قاوەخانەیە، لە کەسایەتییە دیارەکانی ئەو شارەبوون، ڕێزی زۆریان لێگرتووە، زۆربەی کات بارزانی بە جلی (شال و شەبکی) کوردی و دانانی خەنجەرێکی دەسک سپی لەژێر پشتێنەکەیدا، سەردانی ئەو شوێنەی کردووە[٥٨].

هەر لە شاری موسڵ، بارزانی بەشێک لەکاتەکانی خۆی بۆ سەردانیکردنی مەزارگە ئایینییەکان تەرخانکردبوو. سەرباری بەسەرکردنەوەی ناوچە شوێنەوارییەکانی نزیک بوونە لەشوێنی نیشتەجێبوونی. لەگەڵ ئەوەی بەردەوام سەردانی مەزارگەی برایەکەی شێخ عەبدوڵسەلامی بارزانی لەگەڕەکی شێخ عومەر کردووە و لەناوچە شوێنەواریەکانیش لەبەری ڕاستی ڕووباری دیجلە، پاشماوەی قەڵای(باشتابیا) و(قەرە سەرای) بەسەرکردۆتەوە. هەندێکجاریش بەمەبەستی هەواڵپرسین و زانینی دەنگوباسی ناوچەکەی خۆیان لەو خەڵکانەی لەئاکرێ دەهاتنە

---

٥٦ – عەبدوڵڵا زەنگەنە، کاریزمای کورد(مستەفا بارزانی) لەدەربەدەری سلێمانییەوە تا پلەی زەعیمی، کۆنگرەی یادەوەریی سەد ساڵەی بارزانی نەمر، هەولێر، ٢٠٠٣، ل٢٤٣.

٥٧ – عبدالفتاح البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية، ص٥٢٨.

٥٨ – م.ن، ص٥٢٩.

شـارەکە، لە بازاری گومرگی موسـڵ، سـەردانی فرۆشـگای عیسـا چەچۆی هاوڕێی کردووە، کە یەکێک بووە لە مەسـیحییەکانی ئاکرێ و کاری فرۆشـتنی ڕایەخ و قوماشی شال و شەپکی کردووە[٥٩].

خەڵکی موسـڵ بەتایبەتی کەسـایەتییە دیارەکانی، لەو ماوەیەدا هاوکاری زۆریان پێشـکەش بە مسـتەفا بارزانی و ماڵباتەکەی کرد، لەنموونەی شـێخ عەجیل یاوەری سـەرۆکی هۆزی شـەممەر و بنەماڵەکانی کەشـموله و توحله(عەباوی). ئەوە جگە لە هاوکاریکردنیان لەلایەن بنەماڵە ئایینیەکانی وەک دیوەجی و ڕەزوانیە و ئالنعمە[٦٠].

هەر سەبارەت بە مانەوەی مستەفا بارزانی لە شاری موسڵ لە ژێدەرێکدا باسی ئەوە کراوە، کە بارزانی لەلایەن موتەسـەریفی شـارەکە ژەهرخوارد کراوە. ژێدەرەکە حوسامەدین جومعەی موتەسەریفی بە ئەنجامدەری ئەو کردە داناوە، گوایە ناوبراو دوای ئەوەی لە (٥ی تشـرینی دووەمی١٩٣٥) دەبێتە موتەسـەریفی شـارەکە، مسـتەفا بارزانی بانگهێشـتی بارەگای موتەسـەرفییەت دەکات و لەڕێگای پێشـکەشـکردنی فنجانێکی قاوە ژەهرخواردی کردووە[٦١]. بەڵام بەگەڕانەوە بۆ ئەو بارودۆخەی سـاڵی (١٩٣٥) بەسـەر بارزانییەکان ڕاگوزەراوە و بەپشـت بەسـتن بەبەڵگەنامە فەرمییەکانی حکومەتی عێراقی، دەتوانین بڵێین ئەو ڕێککەوتەی لەو ژێدەرەی پێشـوو ئاماژەی پێکراوە وورد نیە، لەبەرئەوەی لەبەڵگەنامە فەرمییەکانی حکومەتی عێراقیدا هاتووە، کە بەهۆی پەیوەندییەکانی شـێخی بارزان بە جوڵانەوەکەی خەلیل خۆشـەوی، حکومەتی عێراق لە (١٥ی تشـرینی دووەمی١٩٣٤) بڕیـاردەدات بـارزانییەکـان لەنێویشـیاندا مستەفا بارزانی لەشـاری موسڵەوە بگوازنەوە بۆ ناسـریە لە خوارووی عێراق[٦٢]. کەواتە لە سـاڵی(١٩٣٥) بارزانی و کەسـوکارەکەی لە موسـڵ نەبوون. بۆیە دەکرێ بلێین ئەم ژێدەرە تەنها لە دیاریکردنی ڕێککەوتی ڕووداوەکە وورد نەبووە، سـەبارەت بە ڕووداوەکە، هیچ تێبینییەکی زانسـتی لەسـەر نیە و گومان لە ڕووداوی ژەهرپێدانەکەی موتەسەریفی موسڵ بە بارزانی نیە. چونکە لە دواتردا بارزانی لەسەر زاری خۆی، باسی ئەم ڕووداوەی کردووە.

---

٥٩ – عبدالفتاح البوتاني، منطقة بادينان ١٩٢٥–١٩٧٠، ص٢٤٢.

٦٠ – عبدالفتاح البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية، ص٥٢٨.

٦١ – م.ن، ص٥٢٩–٥٣١.

٦٢ – د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣–١٩٤٩)،الحركات البارزانية الاولى من ١٩٣٢/٧/١٥ ألى ١٩٣٢/٦/٢٢. بروانە پاشکۆی ژمارە (٢).

شیاوی باسە بارزانییەکان لەو کاتەی لە لیوای مونتەفیک[٦٣](ناسریە) نیشتەجێ بوون، بەهۆی کەش و هەوای گەرمی شارەکە و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و کەمی بڕی یارمەتییە داراییەکانی مانگانە، کە لە (٢٢ی تشرینی دووەمی١٩٣٤) بۆ خەرجی ژیان و گوزەرانیان دابینکرا و بڕەکەی (٥٠) دینار و نیو بوو، نارەزایی زۆریان هەبوو. دیارە موتەسەریفی لیوایەکە لە (٢٩ی شوباتی١٩٣٥) سکاڵای بارزانییەکانی بۆ وەزارەتی ناوەخۆ بەرز کردەوە، بەئامانجی دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەکی گونجاوتر، لە مامەڵەکردن لەگەڵیاندا. ئەمە سەرەڕای ئەوەی حکومەتی عێراقی هەر لەو ماوەیەدا بەردەوام بوو لە فشارە دەروونییەکانی خۆی بۆ سەر ڕاگوێزراوەکان، وەک گواستنەوەی منداڵەکانیان بەو جلوبەرگەی لەبەریانبوو بۆ شاری ناسرییە[٦٤]. کەچی سەرباری ئەم دۆخەش، بارزانی لەم شارە بەردەوام بوو لە هەوڵەکانی بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی لەلای موفتی (عبدالرزاق الفتیانی)[٦٥].

دوای ماوەیەکی کەم، وەزارەتی ناوەخۆ نارەزایی و سکاڵای بارزانییەکانی بەهەند وەرگرت، بۆیە بە بڕیارێک لەڕۆژی (٢٠ی نیسانی١٩٣٥) هەمووانی بۆ شاری بەغدا گواستەوە. بەڵام بەهێزبوونی بەرەی شەڕ لە بارزان بەهۆی ڕاپەڕینەکەی خەلیل خۆشەوی، جارێکی دیکە کاربەدەستانی عێراقی خستەوە بەردەم بژاردەی دوورخستنەوەی زیاتری شێخی بارزان و برایەکانی لەناوچەکەیان. بۆیە دوای چاوخشاندنەوە بەبڕیاری گواستنەوەیان، لەڕۆژی(٧ی ئەیلولی١٩٣٥) جاریکی دیکە مستەفا بارزانی و برایەکانی کە شێخی بارزانیشیان لەگەڵدابوو، دووبارە گوازرانەوە بۆ خوارووی عێراق و لە لیوای مونتەفیک نیشتەجێکران[٦٦].

ئەمجارەش وەک جاری پێشوو، بارزانییەکان ڕووبەڕووی هەمان دۆخی خراپی کەش و هەوا و بەرزی پلەی گەرما و نەخۆشییەکان بوونەوە. ئەمەش مەترسییەکی

---

٦٣ - بۆ زانیاری زیاتر لەسەر لیوای مونتەفیک، بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، العراق قديما و حديثا، ط٣، مطبعة العرفان، صيدا، ١٩٥٨، ص١٦٤-١٧٢.

٦٤ - د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)،الحركات البارزانية الاولى من ١٩٣٢/٧/١٥ ألى ١٩٣٢/٦/٢٢. بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٢).

٦٥ - ڕەفیق ڕەحمان مام خول، مستەفا بارزانی ڕۆڵ و هەڵوێستی لە پێشهاتە سیاسییەکاندا ١٩٥٨-١٩٧٠، چ٢، هەولێر، ٢٠١٣، ل٤٠.

٦٦ - د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)،الحركات البارزانية الاولى من ١٩٣٢/٧/١٥ ألى ١٩٣٢/٦/٢٢.

زۆری لەسەر ژیانییان دروستکرد، تەنانەت بەگوێرەی نوسراوی موتەسەریفی مونتەفک لە (٢٢ی ئاداری١٩٣٦)، هەندێک لەبارزانییە ڕاگوێزراوەکان، بۆ ڕزگاربوون لەو دۆخەی تێیدا گوزەریان دەکرد، هەڕەشەی خۆکوشتنیان کرد[٦٧]. ئەو نوسراوە کە داوای دۆزینەوەی ژینگەیەکی لەبارتری بۆ ژیانی بارزانییە ڕاگوێزراوەکان کرد، لەگەڵ کۆتاییهاتنی جوڵانەوەکەی خەلیل خۆشەوی، کاربەدەستانی حکومەتی عێراقی هێنایە سەر ئەو باوەڕەی، گواستنەوەی بارزانییەکان بۆ ناوچەکانی کوردستان، هیچ مەترسییەکی لەپێشدا نەماوە. بۆیە وەزارەتی ناوەخۆ لە (٥ی ئابی١٩٣٦) بڕیاریدا بیانگوازێتەوە ناحیەی ئاڵتون کۆپری (پردێ) و یارمەتییەکی مانگانەی جێگیریشی بۆ هەریەکەیان بڕیەوە، بەشێوەیەک شێخ ئەحمەدی بارزانی (٢٠) دینار و شێخ محەمەد سدیق(٥) دینار و مستەفا بارزانی(٨) دینار و هەموو ئەوانەی لەگەڵ شێخ ئەحمەد بوون لەموریدەکانی(١٠) دینار و بۆ کرێی خانووش مانگانە(٥) دیناریان خەرج کرد[٦٨]. ئەم بارودۆخە گونجاو بوو بۆ مەلا مستەفا، لە ئاڵتون کۆپری( پردێ)، لەلای ئیمام و وتارخوێنی مزگەوتی گەورەی شارەکە، کە ( مەلا سەعید مەلا ساڵح ) بوو، جارێکی دیکە دەست بە خوێندنی ئایینی بکاتەوە[٦٩].

دوای ئەو گۆڕانکارییە سیاسییەی لەئەنجامی کودەتای سەربازی بەکر سدقی(٢٩ی تشرینی یەکەمی١٩٣٦) لەعێراق ڕوویدا[٧٠]، هەوڵی بەشێک لە کەسایەتییەکانی نزیک لە شێخی بارزان و برایەکانی بۆ گەڕانەوەیان بۆ کوردستان بەئەنجام گەیشت، لەوانە هەمزە عەبدوڵڵا(١٩١٥-١٩٩٨)[٧١]، دوای ئەوەی سەردانی

---

٦٧ - د.ك.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)،مقدمات هروب الملا مصطفى البارزاني من السليمانية.

٦٨ - د.ك.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)،الحركات البارزانية الاولى من ١٩٣٢/٧/١٥ ألى ١٩٣٢/٦/٢٢.

٦٩ - ڕەفیق ڕەحمان مام خول، س. پ، ل٤٠.

٧٠ - لەبارەی کودەتای بەکر سدقی بڕوانە: محمد عبدالفتاح الباقي، العراق بين أنقلابين، منشورات المكشوف، بيروت، ١٩٣٨، ص٢٢.

٧١ - هەمزە عەبدوڵڵا عومەر لەساڵی ١٩١٥ لەگوندی ڕاژان لەناوچەی مەرگەوەر لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەدایکبووە. سەر خێڵی ( شەرەفخان ) ی هۆزی (ئەرتوش)ە، کە لەناوچەکانی نێوان عێراق و ئێران و تورکیا بڵاوبوونەتەوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئاشنا عەلی محەمەد ئەمین، هەمزە عەبدوڵا و ڕۆڵی لەبزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستاندا، نامەی ماستەر، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین-هەولێر، ٢٠١٤، ل٢٧.

سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی عێراق حیکمەت سلێمان (٣٠ تشرینی یەکەم ١٩٣٦-١٧ی ئابی ١٩٣٧)ی کرد، بۆ ئەوەی بارزانییەکان بگەڕێنێتەوە زێدی خۆیان، یان لە شوێنێکی گونجاو نیشتەجێ بکرێن[٧٢]. ئەوەبوو وەزارەتی ناوەخۆ لە(١٠ی نیسانی١٩٣٧) بڕیاریدا لەسەر گواستنەوەی شێخ ئەحمەد و مستەفا بارزانی و برا و خزم و کەسوکارەکانیان، کە بەگشتی (١٣٠) خێزان بوون، بۆ شاری سلێمانی[٧٣].

کاتێک بارزانییەکان گەیشتنە شاری سلێمانی، خەڵکی دیار و ساماندارى شارەکە، لەبنەماڵەی شێخان و هەندێک لە دڵسۆزانی کوردایەتی لەوانەی کە درکیان بە کێشەکە کردبوو، هاوکاری و کۆمەکیان کردن[٧٤]. مستەفا بارزانی لەو کاتە لەماڵی (سەید نووری نەقیب) بەرامبەر ماڵی شێخ قادری حەفید نیشتەجێ بوو. دواتر ماوەیەک لەگەڕەکی (سەر چیمەن)[٧٥]، لەخانووەکەی (کەریم بەگ) دابوو. خێزانە بارزانییەکانی دیکەش کە لەگەڵیاندا بوون، هەندێکیان لە خانووەکەی ( شێخ رەشیدی حەمزە) دا بوون و ژمارەیەکیشیان لە حەوشی گەورە دا نیشتەجێ بوون[٧٦].

ژیان و گوزەرانی مستەفا بارزانی و بنەماڵەکەی، بەو پارەمەتییە کەمەی مانگانە لەلایەن حکومەتەوە بۆیان خەرج دەکرا، زەحمەت و دژواربوو[٧٧]. سەرەڕای ئەمەش بارزانی دەستبەرداری هەوڵەکانی بۆ خۆرۆشنبیرکردن نەبوو، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەبووە بە بەردەوامبوون لەسەر تەواوکردنی خوێندنی ئایینی. سەبارەت بەو بابەتە هەر خۆی باسی کردووە و دەڵێت:" لەماوەی سالانی مەنفادا تا سالی ١٩٤٣ دەستم کرد بە خوێندن و خۆفێرکردن، تا توانیم بڕێکی باش زانیاری بەدەست بهێنم و ئاستی رۆشنبیریم بەرزبکەمەوە"[٧٨].

---

٧٢ - بڕوانە: هەمزە عەبدوڵڵا، بەڵگەنامەیەکی سیاسی نەتەوەیی دەست نووس، K21 ( گۆڤار )، ژ (٢-٣)، ٢٠٠٨، ل١٨.

٧٣ - د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩).

٧٤ - غەفوری میرزا کەریم، ڕاستیەکان چەواشە ناکەم، چاپخانەی رەهەند، سلێمانی، ٢٠٠٢،ل٣١.

٧٥ - محەمەد رەسول هاوار، نامە، کۆنگرەی یادەوەریی سەد ساڵەی بارزانی نەمر،هەولێر، ٢٠٠٣، ل١٠٦٧.

٧٦ - د. ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی، شاری سلیمانی ١٩٣٢-١٩٤٥، لێکۆلینەوەیەکی مێژوویی-سیاسییە، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل ٧٠-٧٢.

٧٧ - د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩).

٧٨ - ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی، س.پ،ل٧٣.

مستەفا بارزانی لە سلێمانی مۆڵەتی زانستی لە تەفسیر و فەرموودەدا لەسەر دەستی زانای ئایینی عەبدوڵڵای چروستانی(١٨٩٧-١٩٨٨) لە مزگەوتی مەولانا خالید وەرگرت[٧٩]. هاوکات ڕۆژانە سەردانی مزگەوتی مەلا حوسەینی پیسکەندی(١٨٦٦-١٩٤٧) کردووە و وەک گوێگرێک لەدوای موستەعیدەکانەوە دانیشتووە[٨٠]. هەروەها شەرحی تەفتازانی لەزانستی ڕەوانبێژی[٨١] لەلای مەلا سەفوەتی شاعیر(١٩٠٦-١٩٦٣)ی کوڕی حاجی مەلا رەسوڵی دیلێژی و شێخ محەمەدی خاڵ(١٩٠٤-١٩٨٩)[٨٢] خوێندووە[٨٣]. هەندی جاریش لای مەلا سەید عەبدوڵڵای ئیمامی مزگەوتی گەورە و لە مزگەوتی شێخ سەلامیش وانەی دیکەی ئایینی خوێندووە، جاروباریش بۆ پرس و باسی ئایینی سەردانی شێخ نوری شێخ بابە عەلی لە مزگەوتی بابە عەلی لە گەڕەکی سەرچیمەن کردووە[٨٤].

بەهۆی کەسایەتییە کۆمەڵایەتییەکەی، بارزانی لەم ماوەی لە سلێمانی ژیاوە، هاوشێوەی موسڵ، تێکەڵاوی خەڵکی ناوچەکە بووە. سەردانی بەشێکی ئەو ماڵ و

---

٧٩ - غەفوری میرزا کەریم، س.پ، ل٣٦.

٨٠ - ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی، س.پ،ل٧٤.

٨١ - ئەم کتێبە بەناونیشانی(دروس في البلاغة- شرح مختصر المعاني للتفتازاني) نووسەرەکەی شیخ محمد البامیانیە. لە چوار بەرگ پێکهاتووە. لە ناوەڕۆکەکەیدا باس لە چەند بابەتێکی زانستی دەکات، لەمانەش(قورئان و زانستەکانی، ژیاننامەی پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ ئەهلی بەیت(سڵاوی خوایان لێ بێت)، بیروباوەڕ، فەرمودە و زانستەکانی، فقهی ئیسلامی، فەلسەفە و لۆژیک، ئەخلاق، مێژوو، زمان و زانستەکانی، شیعر و ئەدەب. بروانە: الشيخ محمدي الباميانى، دروس في البلاغة( شرح مختصر المعاني للتفتازاني) مؤسسة البلاغ، ٢٠٢٠.

٨٢ - شێخ محەمەدی خاڵ ڕۆڵێکی گەورەی لە جوولانەوەی ئەدەبی و ڕۆشنبیری کوردی گێراوە. لەساڵی ١٩٧٤ بەدواوە ئەندامی کۆری زانیاری کوردی بووە. یەکێک بووە لە نووسەرانی گۆڤاری (گەلاوێژ). چەندین بەرهەمی لەبواری ئایینی و زمانەوانی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی وەک کتێب پێشکەشی کتێبخانەی کوردی کردووە. لە کتێبە ئاینییەکانی مەولودنامە ١٩٣٨، فەلسەفەی ئاینی ئیسلام-١٩٣٨، تەفسیری سورەتی فاتیحە-١٩٥٥،، بێجگە لە کتێبەکانی زمانەوانی وەک، فەرهەنگی خاڵ- ١٩٦٠ کە سێ بەشە. هەروەها کتێبی مێژوویی وەک ( تاريخ الامارة الافراسيابية- ١٩٦١) و چەندین بابەتی دیکە. جمال بابان، أعلام كرد العراق، سليمانية،٢٠٠٦،ص٦٩٧.

٨٣ - د. عرفات كرم ستونی، أهمية الدين عند البارزاني الخالد لە www.gulan media.com/Arabic/articles - (تاريخ الزيارة١/ ٥/ ٢٠٢١).

٨٤ - ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی ،س.پ،ل٧٤.

دیوەخانانەی کردووە، کە لە شـــارەکەدا بەناوبانگ بوون، وەک ماڵەکانی حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا و ڕەمزی مەلا مارفی هۆنەر و شـێخ لەتیفی دانسـاز و میرزا تۆفیقی قەزاز و ســـەید نوری ڕەقیـب و تۆفیق ئـاغـای فەتحولا ئـاغـا و ئەســـعەدی مەحویی(١٨٩٨_١٩٧٦). لەهەمان کات لەگەڵ پیرەمێردی هۆنەریشـــدا (١٨٦٧_١٩٥٠) پەیوەندی هەبووە[٨٥].

مســـتەفا بـارزانی کـاتەکـانی دیکەی بەتـایبەتی ئێوارەکـانی، تەرخـانکردبوو بۆ دانیشـتن لەگەڵ ئەو کەسـایەتییە ڕۆشـنبیرانەی لەدوکانەکەی (حەمە سـەعید خەیات) کۆدەبوونەوە[٨٦]، یان ســـەردانیکردنی مام مەجیدی جگەرە و توتن فرۆش. مام مەجید دوکانەکەی لەناو بازاری سلێمانی، کەوتبووە بەر دەرگای سەرا، زۆرکات بارزانی کە ســـەردانی بازارەکەی دەکرد، دەمێک لای ئەو پیاوە دانیشـــتووە و هاوڕێیەتی باشـــی لەگەڵ دروســـتکردووە[٨٧]. هەندێکجاریش لە دەرمانخانەکەی ئەســـکەندەر، کە پیاوێکی ئەرمەنی بووە دانیشتووە و هەر لەو دەرمانخانەیە بەشێک لەدیدارەکانی خۆی لەگەڵ کەسایەتییە دیارەکانی ئەو شارە، وەک قانیع (١٨٩٨ – ١٩٦٥) و فائق بێکەس(١٩٠٥-١٩٤٨)، کە دوو شاعێری دیاری ئەو سەردەمە بوون، ئەنجامداوە[٨٨].

ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەی مســـتەفا بارزانی لەسـلێمانی دروســـتیکرد، دواتر بوونە ڕێگەخۆشـکەر بۆ بەسـتنی ڕایەڵەی پەیوەندی سـیاسـی، ئەگەر لە سـنوورێکی دیاریکراویشـــدا بێت. بۆ نمونە پەیوەندییە دۆســـتانەکەی بارزانی لەگەڵ شـــێخ لەتیفی حەفید، لە کۆمەڵەی (برایەتی)[٨٩] نزیکی کردەوە، لەبەرئەوەی ئەوەی دوایی یەکێک

---

٨٥ – هـس، ل٧٥.

٨٦ – غەفوری میرزا کەریم، س.پ، ل٣٦.

٨٧ – هـس.ل٣٩.

٨٨ – محسن دزەیی، أحداث عاصرتها، ج٣، مطبعة حاجي هاشم، کوردستان، ٢٠١٣، ص١٥١.

٨٩ – کۆمەڵەی برایەتی: بەهەوڵی هەندێک لە کەسایەتییە نیشتمانپەروەرەکانی کوردی خەڵکی سلێمانی وەک شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحمود بەرزنجی و چەند کەسێکی دیکە لە ئێوارەی ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی ١١ی ئاداری ١٩٣٧ دامەزرا. لەدیارترین ئامانجەکانی ئازادی کوردستان و بەدیهێنانی سەربەخۆییەکەی بوو. ئەو کۆمەڵەیە چەندین لقی لە شارەکانی بەغدا و کەرکوک و کۆیە هەبوو. چالاکیەکانی ئەو کۆمەڵەیە تا ساڵی ١٩٤٣ بەردەوام بووە. بۆ زانیاری زیاتر، بروانە: د.عبدالستار طاهر شریف، الجمعیات والمنظمات والاحزاب الکردیة في نصف قرن(١٩٠٨-١٩٥٨)، بغداد،١٩٨٩، ص٩٢؛ عزیز حسن عزیز البارزاني، الحرکة القومیة الکوردیة التحرریة، هولیر، ٢٠٠٢،ص٧٤.

بووه لە دەســـتەی ســـەرۆکایەتی ڕێکخراوەکە و هەندێک جاریش ســـەرۆکایەتی کردووە. بەڵام ئەو پەیوەندییانە نەگەیشـــتنە ڕادەی ئەندام بوون لە ڕێکخراوەکە. بارزانی خۆشـی جگە لەپەیوەندیەکانی، خواستی لەسـەر تێکەڵاوبوون هەبووە لەگەڵ کەسـایەتیە سـیاسـیەکانی ئەو شـارە، بەتایبەتی لەگەڵ ئەوانەی لەنێو پارتی (هیوا)[٩٠] بوون، لە نمونەی ڕەفیق حیلمی(١٨٩٨–١٩٦٠)سەرۆکی پارتەکە[٩١].

مستەفا بارزانی، دوای مانەوەی بۆ ماوەی شەش ساڵ و سێ مانگ لەسلێمانی، لەڕۆژی (١٢ی تەممووزی١٩٤٣) ، بەمەبەســـتی گەڕانەوە بۆ زێدی خۆی لە بارزان، بەنهێنی لەشـــارەکە دەرچوو. یەکێک لەســـەرچاوە مێژووییەکان هۆکاری ئەو هەڵوێســتەیان دەگەڕێنێتەوە بۆ خراپی باری گوزەران و ژیانی بارزانی لەشـارەکە[٩٢]، ئەمە وێڕای هەڵسوکەوتی خراپی موتەسەریفی سلێمانی مستەفا قەرەداغی لە گەڵیدا، کە ئەمیش هۆکارێکی دیکە بووە، کە هانیداوە بۆ ئەو کارە[٩٣]. لە باســـکردنی ئەو بـابەتەش، بـارزانی ئـامـاژەی بۆ ئەوە کردووە ، نـاوبراو لەو مـاوەیە ئـابلوقەیەکی ئابووری ئەوەندە توندی خستبووە سەریان[٩٤]، تەنانەت ڕێگای نەداوە هاوکاری خزم و کەســـوکارەکانیشـــیان پێ بگات، وەک خۆی باســـیکردووە لەو کاتەی بڕێک پارە قەرزاربوو، بەمەبەســـتی دانەوەی قەرزەکانی لە (١٣ی ئەیلولی١٩٣٩) نـامەیەک بۆ

---

٩٠ – حیزبی هیوا: بەر لەهەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی، چەند نیشتمانپەروەرێکی کورد لەبەهاری ساڵی ١٩٣٩ لە باشووری کوردستان بڕیاریاندا لەسەر پێکهێنانی بەرەیەکی یەکگرتوو، بەسەرۆکایەتی رەفیق حلمی(١٨٩٨_١٩٦٠). لەشوباتی ١٩٤٤ پارتەکە تووشی لێکتری هەڵوەشانەوە بوو، بوونە دوو باڵ. ئەم ڕێکخراوە سیاسییە لە بنجدا ناوی(کۆمەڵەی هیوا)یە. بەڵام لەبەرئەوەی بەڕاستی حیزبێکی سیاسی بوو بەهەموو ماناکانی، بۆیە ناوی حیزبمان بۆ بەکارهێناوە. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەو حیزبە و پشتیوانیکردنی لە ڕاپەرینی دووەمی بارزان. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم حیزبە بگەڕێوە بۆ: هلبین محمد أحمد المزوري، حیزب هیوا- الامل(١٩٣٩-١٩٤٦)،سپیرێز، دهوک،٢٠٠٨،ص ص١٥١-١٥٦. دواتر زانیاری زیاتری لەبارەیەوە دەخەینەڕوو.

٩١ – ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی، س.پ،ل٧٩.

٩٢ – Michael G. Lortz, willing to Face Death: A History of Kurdish Military Forces- the Peshmerga – From the Ottoman Empire to Present-Day-Iraq (Tallahassee, FL: Florida State University, 2005), p.21.

٩٣ – سەبارەت بە هۆکارەکانی دەرچوونی بارزانی لەسلێمانی، بڕوانە: معروف چیاووک، مأساة بارزان المظلومة، دار أراس للطباعة والنشر، ط٢، أربیل، ٢٠٠١ ،ص١١٦.

٩٤ _ بڕوانە: عثمان علي، م.س، ص٦٦٧.

ئۆلۆبەگی خاڵی نووســـــی و تیایدا داوای کردووە(١٠) دیناری بۆ کۆبکاتەوە و بۆی ڕەوانە بکات، موتەسەریف ڕێگری لەگەیشتنی تەنانەت نامەکەشی کرد[٩٥].

ولیەم ئیگلتن، کە باس لەبارودۆخی ژیان و گوزەرانی مســـتەفا بارزانی لەو ماوەیەدا دەکات، نووسیویەتی" لە ساڵی ١٩٤٣ بارودۆخی مستەفا بارزانی[مەبەستی ژیان و گوزەرانی تایبەتیەتی] گەیشتە ئەو ڕادەیەی نەتوانێ نانی ڕۆژانەی دەستەبەر بکات. دوای ئەوەی هەموو پارچە زێرەکانی لە کڵاوی ســەری خێزانەکەی فرۆشــت، هیچی پێ نەما پێی بژیت"، ئەوە سەرباری دۆخی خراپی کەسوکارەکەی[٩٦].

نارەحەتییەکانی بارزانی لە هەڵســوکەوت و ڕەفتارەکانی کاربەدەســتانی عێراق، تەنها خەمی ژیان و گوزەران نەبوو، ئەو هەمیشە لەژێر فشارێکی دەروونی گەورەدا بووە، بەهۆی ئەو دۆخەی بەناوی نیشــتەجێبوونی زۆرەملێیەوە لەدووری زێدی خۆیاندا، بەدرێژایی (٧) ســاڵ بۆیان دروســتکردبوو. بڕیارەکەی وەزارەتی ناوەخۆش لە (٢٥ی کانونی یەکەمی١٩٤١) ســـەبارەت بەڕێگادان بە گەڕانەوەی بەشـــێک لە بارزانیەکاندا بۆ زێدی خۆیان، جگە لە مســتەفا بارزانی و برا و هەندێ لە ئەندامەکانی دیکەی خێزانەکەی[٩٧]، زیاتر نارەحەتی کرد، پاشــان هەموو ئەمانە بەیەکەوە فشــاری زۆریان لەســەر دروســتکرد و هانیاندا بڕیاری دەرچوون لە سلێمانی و گەڕانەوە بۆ بارزان بدات[٩٨].

شیاوی باسە موتەسەریفی سلێمانی لەیەکێک لە ڕاپۆرتەکانیدا، کە لە ڕۆژی(١٢ی تەمموزی١٩٤٣) بۆ وەزارەتی ناوەخۆ بەرزیکردۆتەوە، بەرپرســـیاریەتی ڕووداوی دەرچوونی مستەفا بارزانی لە سلێمانی و گەڕانەوەی بۆ ناوچەی بارزان، لە ئەستۆی خۆی هەڵگرتووە و بەشـــێوەیەکی ناڕاســـتەوخۆ دەیخاتە ئەســـتۆی وەزارەت. ئەو لەنوسراوەکەیدا کەمی داهات و خراپی گوزەرانی بارزانییەکان، بەهۆکاری ڕووداوەکە دادەنێت و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، ســـەرەڕای بارودۆخی خراپی ژیانی بارزانی، وەزارەتی نـاوەخۆ لە ڕۆژی(٧ی حوزەیرانی١٩٣٧) یـارمەتییە مـانگـانەکەی لە (٨)

---

٩٥ – عبدالفتاح البوتاني، وثائق عن الحركة القومية ....،ص٥٣٣.

٩٦ – وليم أيغلتن الابن، جمهورية مهاباد( جمهورية ١٩٤٦ الكردية)، دار ئاراس للطباعة والنشر، مطبعة وزارة التربية، ط٢، أربيل،١٩٩٩، ص٩٩.

٩٧ – د.ك.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي،أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)، مقدمات هروب الملا مصطفى البارزاني من السليمانية.

٩٨ – بروانە: معروف چیاووک، م.س، ص١١٦.

دینارەوە کەم کردەوە بۆ (٦) دینار و نیو، پاشـــان لە (٢٧ی شـــوباتی١٩٤٣) دوای شـەش سـاڵ و چەندین جار سکاڵاکردن، ئەو کات، بڕی یارمەتییەکەی بۆ (٢٠) دینار و نیو زیادکرد[٩٩].

مسـتەفا بارزانی لە سـلێمانی پەیوەندی باشـی لەگەڵ شـێخ لەتیفی کوڕی شـێخ مەحمودی حەفید هەبووە. هەر بەپاڵپشـــتی ئەوان و چەند کەســـایەتییەکی دیکەی شـارەکە، وەک مەلا ئەسـعەدی مەحوی، توانی بەنهێنی لەسـلێمانی دەربچێ و ڕێگای گەڕانەوە بۆ بـارزان بگرێتەبەر[١٠٠]. بەر لەوەی بنەمـاڵەکەی بەجێبهێڵێ لەکـاتی ماڵئاواییکردن، شـێخ ئەحمەدی برا گەورەی ڕێنوێنی کرد و پێی گوت:"ئاگاداری هەق و ڕاســتی بە لەکاتی هەڵســوکەوتت لەگەڵ خەڵکدا، هەرگیز لەخۆبایی بوون نەچێتە دڵتەوە، تـا بۆت دەکرێ خۆت لە لێکدان لەگەڵ حکومەت بپـارێزە، تـا دڵنیـانەبی لە سەرکەوتن. ئەگەر کەوتیە بەردەستیشیان، دانوستانیان لەگەڵدا مەکە"[١٠١].

دەســـەڵاتدارێتی حکومەتی عێراق هەر زوو لەم پێشـــهاتە ئاگاداربویەوە، چونکە مسـتەفا قەرەداغی(١٨٩٢_١٩٧٣)موتەسـەریفی سـلێمانی لە ڕۆژی(١٢تەمموزی١٩٤٣) لەبروسکەیەکدا بۆ وەزارەتی ناوەخۆ ڕایگەیاند، مستەفا بارزانی بەیاوەری دوو کەس، بەناوەکانی (سلێمان موسی) و (مستەفا عەبدوڵلا)، کە هەردووکیان خەڵکی (ئاکرێ)ن، لە ســـلێمانی دەرچووە[١٠٢]. کاتێک بارزانی ســـلێمانی بەجێهێشـــت، دوای هەفتەیەک گەیشتە مەهاباد و بووە میوانی (عەلی حاجی بابە شێخ)[١٠٣]. پاشـان لەگەڵ هاوەڵەکانی بەردەوام بوو لە ڕۆیشـتن تا گەیشـتە گوندی(ئاخجە زێوە) لە نەغەدە و بووە میوانی ماڵی (مامەند مەســـیح)، کە یەکێک بوو لە هەڤاڵەکانی بارزانی و لە ئێران نیشـــتەجێ بوو. شـــەوێک لەم ماڵەدا مایەوە و بۆ بەیانی چووە گوندی (کولیج) و بووە میوانی

---

٩٩ – د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي،أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣–١٩٤٩)، مقدمات هروب الملا مصطفى البارزاني من السليمانية.

١٠٠ – عەبدوڵلا زەنگەنە، س.پ، ل٢٥٢.

١٠١ – بروانە: مسعود بارزانی، س.پ، ل٥٠.

١٠٢ – د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣–١٩٤٩)، مقدمات هروب الملا مصطفى البارزاني من السليمانية.

١٠٣ – لە خانەوادەیەکی ئایینی دیار بووە لەناوچەی بۆکان. لە ساڵی ١٩٦٤ سەرۆک وەزیران بووە لە کۆماری کوردستان لە مەهاباد. مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج١، ط٢، كاوا للثقافة الكردية، بيروت، ١٩٩٧، ص١٤٣.

(مامەند ئاغای کولیجی) سەرۆکی تەریقەتی قادری لە هۆزی مامش. ئەوەی دوایی بە گەرمی پێشــوازی لە بارزانی کرد و لەگەڵ یەکێک لە خزمەکانی، کە (عەبدوڵڵا ئاغای جلدیان) بوو، ئاسانکاری و یارمەتی زۆریان پێشکەشکرد[١٠٤].

ئەو کاتە ژمارەیەک لە بارزانییەکان لە گوندی(کانی ڕەش) لە نزیک شــنۆ نیشــتەجێ بوون، کە( حەســەن ئەحمەد ناز، میرزاغا ڕەشــۆ، محەمەد عیســا، خان ئاڤدەل محەمەد، عەبدوڵڵا کورەیی، ســـاڵح کورەیی، محەمەد مامەند، محەمەد ئاغا بوکر)بوون. بارزانی هەواڵی بۆ ناردن دەیەوێ چاوی پێیان بکەوێ، ئەمانیش راســـتەوخۆ بەدەم داوایەکەی بارزانی چوون. دوای ئەوەی شـــەوێک لە میوانداری(مامەند ئاغا) مانەوە، بۆ بەیانی بڕیاریاندا بگەڕێنەوە عێراق. (مامەند ئاغا) هانی بارزانییەکانیدا یاوەری بارزانی بکەن و لەگەڵیدا بگەڕێنەوە بارزان و بەڵێنی ئەوەی پێدان، کە خۆی ئەرکی دابینکردنی بژێوی و گوزەرانی خێزانەکانیان دەگرێتە ئەستۆ تا دەگەڕێنەوە و تفەنگێکی(برنۆ)شی بەدیاری بە بارزانی بەخشی[١٠٥].

لە بەری عێراقدا، بەشـــێک لەموریدانی شـــێخی بارزان لەنمونەی عومەر ئاغا و کوڕەکانی عەبدوڵڵا لە گوندی (شـێتنە) و حەمەد میرخان و حەمەد عەبدوڵڵا و عەدۆ سلێمان لە (میرکە) و شەریف لەشکری لە (زبدا) و نەبی حەسەن و مەلا ئەحمەد لە (باویلیان)، بەیەکەوە ڕوویانکردە چیای برادۆســـت و پەیوەندییان بەهەریەک لە قادر مەلو و ڕەشـــۆ مەلا کرد، کە لەلایەنگرانی مســـتەفا بارزانی بوون، بەمەبەســـتی ئامادەسازی بۆ پێشوازیکردن لە بارزانی[١٠٦]. بەم شێوەیە دوای هەفتەیەک بە ڕێگای پێنجوێن، بانە، سەردەشت، پەسوێ، لاهیجان، شنۆ، ناودەشت، سیلکە، سرێشمە، بارزانی گەیشتەوە زێدی خۆی لەبارزان[١٠٧].

---

١٠٤ – م. ن، ص٧٩.

١٠٥ – م. ن، ص ٨٠.

١٠٦ – د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)،مقدمات هروب الملا مصطفى البارزاني من السليمانية.

١٠٧ – معروف چیاووک، م.س ،ص١١٨.

## باسی سێیەم: دەرکەوتنی بارزانی وەک ڕێبەری کورد لە باشووری کوردستان

هەواڵی گەڕانەوەی مستەفا بارزانی بۆ دەڤەری بارزان، بەخێرایی گەیشتە دەزگاکانی ئاسایشی حکومەتی عێراق، بەتایبەتی ئەوانەی لەناوچەکەدا بوون. لەسەر ئەو بنەمایە بەڕێوەبەری پۆلیسی زێبار، جوولەی بەهێزەکانی کرد بۆ دەستگیرکردنی بارزانی و ئەوانەی لە گەڵیدا بوون. دوای ئەوەی قائیمقامی ڕەواندوز لە (٢٥ی تەممووزی١٩٤٣) موتەسەریفی هەولێری ئاگادار کردەوە، کە مستەفا بارزانی لەگەڵ چەکدارانی (مامەند مەسیح)، گەیشتونەتە ناوچەی مێرگەسۆر لە خاڵی ( بەردەسپی و شێخ سیدە)[١٠٨].

لەلایەکی دیکە موتەسەریفی موسڵ لەڕۆژی(٢٨ی تەممووزی١٩٤٣) وەزارەتی ناوەخۆی ئاگادار کردەوە، کە قائیمقامی زێبار داوای لەمستەفا بارزانی کردووە، ئارامی و سەقامگیری لەناوچەکە بپارێزێ و بچێتە زێبار بۆ ئەوەی چاوی بە موتەسەریفی موسڵ بکەوێ، بەڵکو داوای چارەسەرێکی لێ بکات، بەڵام ئەوەی دوایی پێشنیازی چوونە زێباری ڕەتکردۆتەوە، لەگەڵیشیدا ئامادەیی ئەوەی نیشانداوە ئەگەر شوێنێکی دیکە دیاری بکەن، دەتوانێ ئەو دیدارە ئەنجام بدات. ئەو هەڵوێستەی بارزانی، قائیمقامی زێباری گەیاندە ئەو باوەڕەی زەحمەتە لەگەڵیدا بگاتە ڕێککەوتن، تەنها لەڕێگای بەکارهێنانی هێزەوە نەبێ، ئەو سەرنجەشی بە حکومەتەکەی خۆی گەیاند[١٠٩].

بەم هۆیەوە بەڕێوەبەری پۆلیسی زێبار چوار مەفرەزەی پۆلیس بۆ دەستگیرکردنی دەرکرد، هەروەها (٢٠) پۆلیسی ڕەوانەی بنکەی پۆلیسی شێتنە کرد. لەلایەکی دیکە بەڕێوەبەری پۆلیسی موسڵ لەڕۆژی(٣١ی تەممووزی١٩٤٣) لەڕێگای ناردنی هێزی زیادە بۆ بنکەکانی پۆلیس لە دێرێ و ئەرگوش و میروز و تیلی و شنکیل و زینێ و کانی بۆت و شێروان مەزن و هۆستان، دەستی بە ئەنجامدانی ڕێکاری خۆپارێزی کرد. بەشێوەیەک لە هەر بنکەیەکی پۆلیس، (١٠) پۆلیسی زیادەی جێگیرکرد، بۆ هاریکاریکردنی هێزی پۆلیسی زێبار لەناوچەکە، کە ژمارەیان (١٨)

---

١٠٨ – د.ك.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣–١٩٤٩)،مقدمات هروب الملا مصطفى البارزاني من السليمانية.

١٠٩ – د.ك.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣–١٩٤٩)،مقدمات هروب الملا مصطفى البارزاني من السليمانية

پۆلیسی پیادە و (٢٧) سوارە بوون، ئەوە جگە لەوەی دواتر هێزەکەی زێباریش(٤٨) پۆلیسی دیکەیان بۆ زیادکرا[110]. پاشان بەهۆی زیادبوونی مەترسییەکانی حکومەت، لە جموجۆڵەکانی بارزانی لەناوچەکە، وەزارەتی ناوەخۆ لە(١٠ی ئابی١٩٤٣) ئەرک و بڕیاری دەستگیرکردنی مستەفا بارزانی، بە فەرمی بە موتەسەریفی موسڵ سپارد. لەم ماوەیەدا هێزەکانی بارزانی ڕۆژبەڕۆژ ڕوو لەزیادبوون بوون. بەم جۆرە دەستگیرکردنی زەحمەتتر دەبوو. بۆ وێنەش موتەسەریفی هەولێر لە(١٢ی ئابی١٩٤٣) ڕوونی کردەوە، کە ژمارەی ئەوانەی لەگەڵ مستەفا بارزانین(٢٠) کەسن و نیوەیان چەکدارن. دوای ماوەیەکی کەم بەپێی زانیارییەکانی هەمان سەرچاوە لە(١٥ی ئەیلولی١٩٤٣) ئەو ژمارەیە زیاد بوون و گەیشتنە (١٠٠) کەس. بەڵگەنامەکانی وەزارەتی ناوەخۆی عێراق، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە لە ئەنجامی ڕێکنەکەوتنی مستەفا بارزانی لەگەڵ کاربەدەستانی ناوچەکە، بەریەککەوتنە سەربازییەکان لە(٢١ی ئەیلولی١٩٤٣) لەنێوان هەردوولا دەستیان پێکرد[111].

بەهەڵکشانی هەژموونی سیاسی و سەربازی مستەفا بارزانی، بەهۆی پشتگیری بەهێزی زۆرینەی هۆزەکانی دەوروبەری بارزان و پارت و ڕێکخراوە کوردییەکانی باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کوردستان لە جوڵانەوەکە[112]، لەقۆناغی یەکەمی ئەو شەڕەدا، کە تا سەردانیکردنی ماجید مستەفا(١٨٩٦_ ١٩٧٤)[113]ی وەزیری دەوڵەت بۆ حامییەی مێرگەسۆر لە (٧ی کانونی دووەمی ١٩٤٤) بەردەوام بوو، بارزانی توانی لە ڕووی سەربازییەوە سەرکەوتن بەدەست بێنێ و پاشان دوای ئەنجامدانی دانوستاندن لەگەڵ وەزیرەکەی حکومەتی عێراق و خستنەڕووی چەندین داواکاری نەتەوەیی، توانی بەیەکێک لە داواکارییەکانی ڕازییان بکات و لە (٣٠ ی

١١٠ – د.ك.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)،مقدمات هروب الملا مصطفى البارزاني من السليمانية.

١١١ – د.ك.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)،مقدمات هروب الملا مصطفى البارزاني من السليمانية.

١١٢ – بڕوانە: عزيز حسن عزيز البارزاني، م.س، ص١٣٩.

١١٣ – ماجد مستەفا مەحمود عوسمان، ئەندامی پەرلەمان و وەزیری حکومەت بووە لەسەردەمی پادشایەتی. سەر بە بنەماڵەی (مرادلەلە) ی بەناوبانگ بووە لە سلێمانی. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ماجد مستەفا بڕوانە: محمد علي الصويركي الكردي، الموسوعة الكبرى لمشاهير الكرد عبر التاريخ، مج٤، الدار العربية للموسوعات،بيروت، ٢٠٠٨، ص٥.

کانونی دووەمی ١٩٤٤) شـــێخ ئەحمەد بارزانی و ئەوانەی لەگەڵیدابوون، بگەڕێننەوە بۆ زێدی خۆیان لەبارزان[١١٤].

مستەفا بارزانی دوای ئاسـاییبوونەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ حکومەتی عێراق، لە (٢٢ی شـــوباتی١٩٤٤) بە مەبەســـتی ئەنجامدانی ڕێککەوتنی کۆتایی، ســـەردانی بەغدای پایتەختی کرد. بەڵام ئەو پێشـــهاتە ســـیاســـییانەی لەئەنجامی دەســـت لە کارکێشـانەوەی حکومەتی نوری سـەعید لە (١٩ی نیسـانی١٩٤٤)، هاتنە پێشـەوە[١١٥]، دانوســـتانەکانی گەیاندە بنبەســـت، بەم شـێوەیە قۆناغێکی دیکە لە شـەڕ و پێکدادان لەنێوان هێزە کوردییەکان، کە بارزانی سـەرکردایەتی دەکرد، لەگەڵ حکومەتی عێراقدا دەستپێیکرد[١١٦].

لەقۆناغی دووەمی ڕاپەڕینەکەدا، حکومەتی عێراق بە پاڵپشـــتی و هاوکاری هێزە ســـەربازییەکانی بریتانیا لە (٨ی ئابی١٩٤٥) بڕیاری هێرشـــکردنی بۆ ســـەر نـاوچەکەدا[١١٧]و لەڕۆژی (٤ی ئەیلولی١٩٤٥) ڕووبەڕووی هێزەکانی بارزانی بوونەوە[١١٨]، دوای دەســـت بەســـەرداگرتنی ناوچەی بارزان، لەڕۆژی(٦ی تشـــرینی یەکەمی١٩٤٥ ) هێزەکانی بارزانی لەســـنووری عێراق پەڕینەوە بۆ ئێران[١١٩]. مســـتەفا بارزانی لەو کۆچەیدا نزیکەی (٣) هەزار خێزانی لەگەڵدا بوو، کە نزیکەی(٣) هەزاریان چەکداربوون، هەموویـان لەژێر فشـــارەکانی هێزەکانی بەرامبەریـان، پەڕینەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردســـتان، دوای ئەوەی خەڵکی ناوچەکانی خانە و شـــنۆ، کۆمەکی و

---

١١٤- د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)، وزارة الداخلية(شعبة الحدود)،م.ع/٤٩٠٦/١/١٩٤٩.

١١٥ - بروانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج٦، مطبعة العرفان، صيدا، ١٩٥٣، ص١٦٣،١٨٣.

١١٦ - وليم أيغلتن الابن، م.س، ص١٠٣.

١١٧ - عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ص٢٩٢.

١١٨ -د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون، وزارة الداخلية(شعبة الحدود)،م.ع/٤٩٠٦/١/١٩٤٩.

١١٩ - د.ک.و، (٣١١/٤٣٣٣)،البلاط الملكي، اوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)، تقرير عام و موجز عن حركات بارزان سنة ١٩٤٥، كتاب رقم (د/١٥/١/٢٠٥) في ١١ كانون الثاني ١٩٤٦، الحكومة العراقية، وزارة الدفاع، دائرة أركان العامة(شعبة الحركات)، ص٢.

هاوكاری زۆریان له خواردن و جلوبەرگ و شـوێنی حەوانەوە پێشـكەشـكردن[١٢٠]. بارزانی لەگەڵ ژمارەیەک له سـەربازەكانی له دوای پەڕینەوەیان له سـنوور، له گوندی(میراوا) لەناوچەی سـەردەشـت گیرسـانەوە، بۆ ماوەی مانگێک لەو گوندە بوون. هەموو هەفتەیەک بارزانی ڕۆژێک سـەردانی شـاری مەهابادی دەكرد[١٢١]. كەسـوكارەكەی له (قومقوله) بوون، دواتر گوازرانەوە بۆ شـاری مەهاباد و له خانی سـەید عەلی نیشـتەجێ بوون[١٢٢]. بەپێی هەواڵەكانی ڕۆژنامەی كوردسـتانی زمانحاڵی حزبی دیموكراتی كوردسـتان، بارزانی لەگەڵ ئەو (٣) هەزار چەكدارەكەی لەگەڵیدا بوون، لەكاتژمێر(٥)ی ئێوارەی ڕۆژی(٩ی كانونی دووەمی١٩٤٦) گەیشـتنە شـاری مەهاباد و لەلایەن ئەندامانی كۆمیتەی ناوەندی حزبی ناوبراو پێشوازیان لێكرا[١٢٣].

دوای ماوەیەكی كەم له گەیشـتنیان بۆ شـاری مەهاباد، بارزانی و هێزەكەی، له(٢٢ی كانونی دووەمی١٩٤٦)، بەشـداریانكرد لەڕێوڕەسـمی ڕاگەیاندنی دامەزرادنی كۆماری كوردسـتان و لەلایەن قـازی محەمەدی سـەرۆكی كۆمـار، ئەرك و بەرپرسیارەتی پاراستنی كۆمارەكەی پێ ڕاسپێردرا، دوای ئەوەی پلەی ژەنەراڵی له سوپای شۆڕشگێڕی كوردستان پێ بەخشرا[١٢٤].

له سەرەتای نیشتەجێ بوونیان له مەهاباد، بارزانی و خەڵكەكەی لەگەڵیدا بوون، له دۆخێكی خراپ گوزەریان دەكرد. لەم سـۆنگەوە یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشـتی پۆلیسـی حكومەتی عێراق له نوسـراوێكی نهێنی، كه له ڕۆژی(٨ ی نیسـانی١٩٤٦) سەبارەت به دۆخی بارزانی و كەسوكارەكەی لەم شارە، بۆ بەڕێوەبەرەكەی ڕەوانە كرد، ئاماژە بۆ ئەوە دەكات، مسـتەفا بارزانی لەو ماوەیەدا له دۆخێكی دارایی خراپ بووە، ئەمەش وایكرد بەشێک لەو چەكانەی لایانبووە بیانفرۆشێ و بەشێكی پارەكەی بداتە ئەو كەسـانەی لەگەڵیدابوون و بەشـێكی دیكەشـی بكاتە ئالیک بۆ ئەو مەڕ و

---

١٢٠ – أغا أحسان نوري، ياداش كرد العراق، كوهستان(هفتگی نامه)، ش (٤٣٥) ، دوشنبه، ١ بهمن ١٣٢٤، ٢١ ژانويه ١٩٣٤ ، ص ١.

١٢١ – جان دوست ، مهاباد وطن من ضباب، مقام للنشر والتوزيع، ديار بكر ، ٢٠١٤، ص٢٠١.

١٢٢ – م . ن، ص٧٢.

١٢٣ –كوردستان(ڕۆژنامە)،ژ(٢١)،٢یمارسی١٩٤٦،ل٥؛وەرگیراوەلە:ڕۆژنامەی كوردستان، (مەهاباد١٣٢٤–١٣٢٥هـ/ ١٩٤٦ز)،دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، چ٢، هەولێر،٢٠١١، ل٨١.

124 – Nagel Joane, the Conditions of Ethnic Separatism: The Kurds in Turkey, Iran, and Iraq, California, May 1978,p.20.

ماڵاتەی ئەو کاتە پێیان بوو. ئەمە ســــەرڕای ئەوەی وەک لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە، بارزانی لەلایەن خەڵکی ناوچەکانی هەڵەبجە و سـلێمانی هەندێک هاوکاری وکۆمەکی کراوە. بەڵام وێڕای ئەوەش نزیکەی(٨٠) کەس لەوانەی لەگەڵیـدابوون بەهـۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشــــی و کەمی خۆراک مردوون، ئەوە بێجگە لە مرداربوونی ژمارەیەکی زۆر لەمەڕ و ماڵاتەکانیان، بەهۆی کەمی ئالیک. بەو هۆیەوە بارزانی لە( ئاداری ١٩٤٦ ) شاری مەهابادی جێبهێشت و ڕوویکردە ناوچەی هۆزی شکاک[١٢٥].

دوای ڕووخانی کۆماری کوردسـتان[١٢٦]، مسـتەفا بارزانی لەڕۆژی(٢٨ی کانونی یەکەمی ١٩٤٦) بەســــەرۆکایەتی شـــاندێکی بارزانییەکان، چووە تارانی پایتەخت و لەیانەی عەسـکەر لەتیپی دووەمی سـوپا، لەگەڵ کاربەدەسـتانی ئێرانی کۆبویەوە[١٢٧]، بەمەبەســـتی ڕێککەوتن لەگەڵیـانـدا، لەســــەر چۆنییەتی مـانەوە یـان دەرچوونی بارزانییەکان لەسـەر خاکی ئێران. دوای مانەوەی زیاتر لە مانگێک لە تاران و دیداری لەگەڵ شــــای ئێران و باڵیۆزی ئەمریکا، بەهۆی ڕازینەبوونی بەو پێشــــنیازانەی خرانەڕوو[١٢٨]، لە(٢٩ی کانونی دووەمی ١٩٤٧) گەڕایەوە نەغەدە[١٢٩].

دوای گەڕانەوەی، بەپێی ئەو پلانەی مســـتەفا بارزانی لەگەڵ شـــێخی بارزان لەسـەری ڕێککەوتن، بارزانییەکان بەرەو سـنووری عێراق پاشـەکشـەیان کرد. بەپێی زانیارییەکانی ڕۆژنامەی(نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی، کە لە ڕۆژی(٢٤ی ئاداری١٩٤٧) بڵاوکراوەتەوە، بارزانییەکان لە نزیک سـنوور ڕووبەڕووی هێزەکانی ئێران بوونەوە، وەک لە نێوەڕۆکی هەواڵی ڕۆژنـامەکەدا هـاتووە، لەم ڕووبەڕووبوونەوەدا زیـاتر لە

---

١٢٥ – د.ک.و، (٣١١/٤٣٣٣)،البلاط المالكي، أوراق متفرقة/ البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)، تقرير معاون مدير الشرطة العام، الادارة، الى مدير الشرطة العام. ٨ نيسان ١٩٤٦.

١٢٦ – لەبارەی ڕووخانی کۆماری کوردستان بروانە : وليم أيغلتن الابن، م.س، ص٢٠٠.

١٢٧ – د.ک.و، (٣١١/٧٣٧)، البلاط الملكي، المفوضية العراقية قي طهران،١٩٤٦-١٩٤٩، تسليم الملا مصطفى البارزاني، العدد(٦٥١)، ١٩٤٦/١٢/٣٠، ص٢٩٧.

١٢٨ – بۆ زانینی پێشنیازەکانی کە لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە بۆ بارزانی خرانەڕوو، بگەڕێوە بۆ: ابو حسن تفرشيان، البارزاني لن يستسلم لأحد، فی: البارزاني من مهاباد ألی أراس، ت(کردی): شوكت شيخ يزدين، ت(عربی): شاخوان كركوكي،دار اراس للطباعة والنشر،اربيل، ٢٠٠٣، ص٢٧٦.

١٢٩ – شانێک بەبنباری نیشتمانەوە(ژینواری عزەت سلێمان بەگ دەرگەلەیی)، ئا: کرمانج عزەت سلێمان بەگ، کۆمەڵگای فەرهەنگی ئەحمەدی خانێ، سۆران، ٢٠٢١، ل٥٤.

(١٠٠) سەربازی حکومەتی ئێران کوژران[١٣٠]. بەم شێوەیە هێزەکانی بارزانی توانییان خاوخێزانەکانیان لە سنوور رزگاربکەن و لەڕۆژی(١٣ی نیسانی ١٩٤٧)[١٣١]، شێخ ئەحمەد و ژمارەیەکی زۆر لە خێزانە بارزانییەکان، کە ژمارەیان (١٥٥٠) پیاو و (١٦٦٨) ئافرەت و (١٣٢٩) منداڵ بوون، خۆیان ڕادەستی حکومەتی عێراق کردەوە[١٣٢].

سەبارەت بە مستەفا بارزانی و پێشمەرگەکانی لەگەڵیدا بوون، دوای ئەوەی لە(٢٤ی نیسانی١٩٤٧) پەڕینەوە سنووری عێراق، بەهۆی ئامادەنەبوونیان بۆ خۆڕادەستکردن بەحکومەتی عێراق، لە(٢٣ی ئایاری١٩٤٧) پەڕینەوە سنووری تورکیا[١٣٣]، لەوێوە لەڕۆژی(٢٧ی ئایاری ١٩٤٧) گەڕانەوە ناو سنووری ئێران و دوای ئەوەی بۆ (٩) جار لەگەڵ هێزەکانی ئێران ڕووبەڕووبوونەوە، کە بەپێی زانیارییەکانی ڕۆژنامەی(نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی، دوا بەریەککەوتنی چەکدارییان لە ڕۆژی(١٥ی حوزەیرانی١٩٤٧) بوو[١٣٤]، و تیایدا حەوت پێشمەرگە کوژران و چواریان بریندار بوون ، دواتر بە کاروانێکی(٥٢) ڕۆژی[١٣٥]و بڕینی(٢٢٠) میل ڕێگا، گەیشتنە سەر ڕووباری ئاراس، بە مەبەستی پەڕینەوەیان بۆ ناو سنووری یەکێتی سۆڤیەت[١٣٦].

بەر لەوەی بارزانییەکان بپەڕنەوە نێو سنووری یەکێتی سۆڤیەت، لەڕۆژی(١٥ی حوزەیران) مستەفا بارزانی دوو نامەی بەزمانی عەرەبی بەدەستی (میرحاج ئەحمەد)[١٣٧] بۆ هەریەک لە جێگری یەکەمی وەزیری ناوەخۆ ئیڤان ئەلکسەندرڤیچ

---

130 -Border Clash In Iran; Kurdish Group Is Being Slowly Pushed Toward Frontier, The New York Times,March 24, 1947,pp.5,24.

١٣١ – د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣–١٩٤٩).

١٣٢ – محمود الدرة، القضية الكردية، ط٢، دار الطليعة، بيروت، ١٩٦٦، ص٢١٥؛ابو حسن تفرشيان، م.س، ص٢٧٦.

١٣٣ – د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣–١٩٤٩).

134 – IRANIANS ENCIRCLE BARZANI TRIBESMEN, New York Times, June 16, 1947, Page 8.

135–Michael M. Gunter, the Kurds of Iraq (Tragedy and Hope), New York, 1992, p.10.

136 –Derk Kinnane, The Kurds and Kurdistan, London,1964, p.57.

١٣٧ – میر حاج ئەحمەد تاهیر ئاکرەیی: ساڵی ١٩١١ لە ئاکرێ لەدایک بووە. ساڵی ١٩٣٦ لە کۆلێجی سەربازی لە بەغدا دەرچوە. ساڵی ١٩٣٩ چۆتە ڕیزی ڕێکخستنەکانی پارتی هیوا. ساڵی ١٩٤٤

سـيروف(١٩٤٧-١٩٥٣) و سـەرۆكی یەكێتی سـۆڤیەت جۆزیف سـتالین-Joseph.Stalin(١٩٤١-١٩٥٣) نووسـی، بەمەبەسـتی وەرگرتنی ڕەزامەندییان بۆ پەڕینەوەیـان بۆ نـاو سـنووری وڵاتەكەیـان[١٣٨]. لەكـاتژمێر (٨) ی ئێوارەی(١٦ی حوزەیران)، وەزارەتی نـاوەخۆی یەكێتی سـۆڤیەت ڕێگـاپێـدانی پەڕینەوەی بە بارزانییەكان بەخشـی، بەو شـێوەیە یەكەم كاروانی بارزانییەكان، كە ژمارەیان (١٦٠) پێشـمەرگە بوو بە (٤٠) تفەنگ و (٦٠) دەمانچە و (٤) دووربین و (١٦٢٠) گوللەی تفەنـگ، لەكـاتژمێر(٢٢) لە ڕێككەوتی(١٧ حوزەیرانی١٩٤٧) پەڕینەوە سـنووری نەخجەوان، لە كۆماری ئازەربایجانی میللی، كە یەكێك بوو لە كۆمارەكانی یەكێتی سـۆڤیەت. پاشـان لە ڕۆژی دواتر، كە دەكاتە (١٨ی حوزەیران)، ئەو پێشـمەرگانەی دیكەی لەو دیوی سـنوور مابوونەوە، لەگەڵ سـەركردەكەیان مسـتەفا بارزانی، كە ژمارەیان(٣٣٩) كەس بوو، بەپێی نوسـراوی جێگری وەزیری ناوەخۆی سـۆڤیەت بۆ هەریەك لە سـتالین و (فیتچیسـلاف میخائیلوڤیتچ مولوتوف)ی سـەرۆك وەزیران، ئەوانیش پەڕینەوە، لەگەڵ خۆشـیاندا (٣٠٣) تفەنگ و (٥) تفەنگی تۆماتیك و (٥٥) دەمانچە و (٥٤) نارنجۆك و (١٣)هەزار گوللەی تفەنگیان گواستەوە[١٣٩].

بارزانییەكان دوای ئەوەی پەڕینەوە، بەئۆتۆمۆبێلەكانی سـوپا گوازرانەوە بۆ شـاری نەخجەوان[١٤٠]. بەڵام مسـتەفا بارزانی بۆ ماوەی (٤٠) ڕۆژ لەو شـارە لە پێشـمەرگەكانی دوور خرایەوە و لەژوورێكی تەنها، وەك خۆی باسـیكردووە،

---

پەیوەندی بەبارزانی كردوە. ساڵی ١٩٨٨ كۆچی دوایی كردوە. هوژین مسعود سەرنی، شورەشا ئیلونێ ل دەڤەرا بەهدینان ١٩٦١- ١٩٧٥، زاخۆ ، ٢٠١٨، ل٣٩.

١٣٨ - بروانە: د. ئەفراسیاو هەورامی، مستەفا بارزانی لە هەندێك بەڵگەنامە و دۆكیومێنتی سۆڤیەتدا ١٩٤٥-١٩٥٨، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢، ل٩٥.

139 - FIRAT SÖZERİ ,BELGE VE MEKTUPLARLA MELA MUSTAFA VE SSCB İLİŞKİLERİ,Kürt Tarihi, , Sayı(38), Ekim-Kasım-Aralık 2019 ,S.25.

١٤٠ - شاری نەخجەوان، شارێكی گەورەیە، دەكەوێتە نزیك ڕووباری ئاراس. دانیشتوانەكەی بەزۆری ئازەری و هەروەها كورد و ئەرمەن و روس بوون. شارەكە كەوتۆتە خوار چیا بەرزەكانی قەفقاس. بروانە نەخشەی(٥٩) گواستنەوەی هەڤالان لەنێو خاكی یەكیەتی سۆڤیەت – حوزەیرانی(١٩٤٧) لە: سەردار محەمەد عەبدولڕەحمان، هوشیار محەمەدئەمین خۆشناو، ئەتلەسی مێژووی بزاڤی رزگاریخوازی كوردستان، بگ١، ب٢(١٩٤٥ هەتا شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١)، هەولێر، ٢٠١٢، ل٨٦؛ زرار سلێمان بەگ دەرگەلەیی، بیرەوەریەكانم لە سالانی ١٩٤٣-١٩٧٧ دا، هەولێر، ٢٠٠٢، ل١٥٣.

لەشـــێوەی زینـدان ژیـانی بەسـەربردووە[١٤١]. دواتر لە(٢٢ی تەممووزی١٩٤٧) بارزانییەکان بەگشـــتی لە نەخجەوان گوازرانەوە بۆ ناوچە کوردییەکان لە کۆماری ئازەربایجانی سـۆڤیەت، وەک (ئکدام، لاچین، ئیولاغ) لە ڕۆخی ڕووباری قەزوین، مسـتەفا بارزانیش جارێکی دیکە دوور لەهەڤاڵەکانی، دوای ئەوەی لە ڕۆژی(١ی ئابی١٩٤٧) لەگەڵ شێخ سلێمان و عەلی محەمەد صدیق و سەعید مەلا عەبدوڵڵا و زیاب دری، گوازرانەوە بۆ شاری (شوشی)، لەشوێنێکی هاوشێوەی ئەوەی پێشوو نیشتەجێکرا[١٤٢].

لەبەرامبەر ئەو مامەڵەیە، بارزانی لە(١٥ی تشـرینی دووەمی١٩٤٧) نامەیەکی بۆ جەعفەر باقرۆف (١٩٣٢-١٩٥٣)ی سـکرتێری کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی ئازەربیجانی بەلشـەڤی و سـەرۆکی ئازەربایجان نوسـی[١٤٣]، بارودۆخی خۆی و هەڤاڵەکانی لەیەکێتی سـۆڤیەت ڕوونکردەوە و ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە لە شـاری نەخچەوان (٤٠) ڕۆژ لە هەڤاڵەکانی دووریان خسـتووەتەوە و لەژوورێکدا بەتەنیایی وەک زیندانێک ژیانی بەسـەربردووە. پاشـان دوای گواسـتنەوەی بۆ شـووش، ئەم ڕەفتار و هەڵسـوکەوتەیان لەگەڵدا دووبارە کردۆتەوە[١٤٤]. دوای گەیشـتنی نامەکە، باقرۆف فەرمانی کرد بە ئامادەکردنی شـوێنێک بۆ بارزانی و هەڤاڵەکانی لەدەوروبەری ناوچەی (باکۆ)[١٤٥]. فەرمانەکە لەڕۆژی(١٠ی کانونی یەکەمی١٩٤٧) جێبەجێکرا و بارزانییەکان گوازرانەوە بۆ ئۆردوگایەک لەشـاری باکۆی پایتەختی کۆماری ئازەربیجان و بۆ ماوەیەکیش لەو شارەدا نیشتەجێبوون[١٤٦].

دواجار بەهۆی ڕێکنەکەوتنی بارزانی لەگەڵ باقرۆف[١٤٧]، بەفەرمانی ژمارە(١٢١-٢٩٤٣)ی ئەنجومەنی وەزیرانی یەکێتی سـۆڤیەت، وەزارەتی ناوخۆ لە ڕۆژی(٩ی ئابی ١٩٤٨) بڕیاریدا بە گواسـتنەوەی دەسـتەکانی بارزانی لە (باکۆ) وە بۆ

---

١٤١ – بروانە: ئەفراسیاو هەورامی، س.پ، ل١٠٥.

١٤٢ – زرار سلێمان بەگ دەرگەلەیی، س.پ، ل١٥٥.

143 -FIRAT SÖZERİ, Önceki Kaynak, S.27.

١٤٤ – ئەفراسیاو هەورامی. س.پ، ل١٠٥.

١٤٥ – زرار سلێمان بەگ دەرگەلەیی، س.پ، ل١٥٨.

146 -Önceki Kaynak, S.27.

147 - aynı kaynak, S.25.

ئۆزبەکستان[148]. لە(٢٧ی ئابی١٩٤٨) حکومەتی سۆڤیەت بڕیارەکەی جێبەجێکرد و لەڕۆژی(٢٩ی ئابی١٩٤٨) بارزانییەکانیان گواستەوە بۆ ئۆردوگای(چرچوک) لەنزیک (تاشقەند)ی پایتەختی ئۆزبکستان[149]. مستەفا بارزانی لە تاشقەند لە شوێنێکی تایبەت لەنێو سەربازگەی کۆنی وەزارەتی کاروباری ناوەخۆ، کە وێستگەی هێڵی ئاسنینی(سانت فرزوفنا یا کوسومولسکایا-Kusumulskaya) سەر بەهێڵی ئاسنین دانرا و بەشێکی پێداویستییەکانیشی بۆ ئامادەکرا[150].

جارێکی دیکە دەسەڵاتدارانی ئۆزبەکستان لەڕۆژی(١٣ی ئاداری١٩٤٩) مستەفا بارزانییان لەپێشمەرگەکانی دوورخستەوە و بەفرۆکەیەک گواستیانەوە بۆ شارۆچکەی (موینک) لە ڕۆخ دەریاچەی ئۆرال[151]. لەم شوێنە لەیەکێک لە سەفخوزەکان(کەرتی هەرەوەزی گشتی)، بارزانی دەستی بە کارکردن کرد[152]. لەکاتێکدا حکومەتی سۆڤیەت هەر لەو ساڵەدا ڕەزامەندی بۆ خەرجکردنی بڕێک یارمەتی دارایی دەربڕی بوو، وەک کۆمەکی بۆ دابینکردنی پێداویستی بارزانییە پەناهەندەکان[153].

مستەفا بارزانی لەو ناوچەیە لە (سۆڤخۆزەکان)[154]ی بەرهەمی پەمۆ لە( ئیناک) لەناوچەی (قەرەکەلپاک) کاریکرد[155]. بەڵام دوای ئەوەی داوای هاوکاری لە ستالینی سەرۆکی سۆڤیەت کرد، بەفەرمانی ئەوەی دوایی لە(١ی ئەیلولی١٩٥١) جارێکی دیکە

---

١٤٨ – ئەفراسیاو هەورامی، س.پ، ل٩٩.

149 -FIRAT SÖZERİ, Önceki Kaynak, S.29.

150- О.л. Жигалина. предыдущий источник, С.115.

151 -FIRAT SÖZERİ, Önceki Kaynak, S.29

١٥٢ – زرار سلێمان بەگ دەرگەلەیی، س.پ، ل١٦٩.

153- О.л. Жигалина. предыдущий источник, С.118.

١٥٤ – کوڵخۆز و سۆڤخۆز: دوو شێوازی سۆسیالیستی بوون لە یەکێتی سۆڤیەتدا بۆ سەرەوکارکردنی کێڵگەکان. (کوڵخۆز) کێڵگەی هەرەوەزی جوتیاران بوو، کە تیایدا جووتیاران بە شێوەیەکی هەرەوەزی بەرهەمیان دەهێنا لە زەوییەکانی خۆیاندا، پاش یەکخستنی زەوی و پێداویستییە کشتوکاڵییەکان لە هەرەوەزییەکاندا. هەرچی (سۆڤخۆزە) تایبەت بوو بە کێڵگە دەوڵەتییەکانەوە، کە جووتیاران وەک کرێکار لە کێڵگەکاندا کاریان دەکرد و بەرهەمەکەی بۆ دەوڵەت بووە. بەڵام جووتیار و ئەندامی سۆڤخۆز، بۆی هەبووە پارچەیەک زەوی بچووک بۆ خۆی بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ڕۆژانەی بەکاربێنێ. د. دلێر ئیسماعیل حەقی شاوەیس، پەیوەندییەکانی ڕووسیا و کورد(٣)، هەولێر(ڕۆژنامە)، ژ(٢١٦٩)، ٢٠١٥/٦/٣٠، ل١٨.

١٥٥ – ئەفراسیاو هەورامی،س.پ، ل١٩٥.

لەگەڵ هەڤاڵەکانی کۆکرانەوە و گوازرانەوە بۆ تاشقەند[١٥٦] و لەسۆڤخۆزێک لەناوچەی (چیناز) نیشـــتەجێکران، ئەو کاتە بارزانی لە ســـۆڤخۆزی ژمارە(٩)ی میوەجات نیشتەجێ کرا[١٥٧]، دواتر لەمانگی (نیسانی١٩٥٢) گوازرایەوە بۆ کۆڵخۆزێکی دیکە[١٥٨] و هەر لەو شـــوێنە خانووەکی گەورەیان پێدا، کە ســـەر بە ئەنجوومەنی وەزیرانی ئۆزبکستان بوو، بۆ ئەوەی وەک بارەگایەک سوودی لێ وەربگرێت. هاوکات دەوڵەت (٤) ملیۆن ڕۆبڵی بۆ گوزەران ومـانەوە و ژیـانی ئەوانەی لەگەڵیشـــیـدا بوون تەرخانکرد[١٥٩].

بـارزانی و هەڤـاڵەکـانی لە یەکێتی ســـۆڤیەت تـا مردنی جۆزیف ســـتـالین لە(ئاداری١٩٥٣)، لەدۆخێکی نارەحەت گوزەریان دەکرد. لەگەڵ ئەو گۆڕانە سیاسییەی لەدەســەڵاتی حوکمرانی یەکێتی سـۆڤیەت ڕوویدا، گۆڕانی ئەرێنی بەسـەر بارودۆخی بارزانییە پەناهەندەکانیش هات[١٦٠]. بەتایبەتی دوای ئەو هەوڵەی مســـتەفا بارزانی ئەنجامیدا بۆ گەیشتن بە کۆشکی کرملن لە مۆسکۆی پایتەخت و گواستنەوەی وێنای بارودۆخی نارەحەتیان، بەدەسەڵاتدارانی نوێی یەکێتی سۆڤیەت[١٦١].

دوای گوێگرتن لەداخوازییەکانی مستەفا بارزانی، بە فەرمانی سەرۆکی سۆڤیەت نیکیتـا خرۆتشـــوف(١٩٥٣- ١٩٦٤)، بـارزانی و هەڤـاڵەکـانی لەڕۆژی(٢٩ی کـانونی یەکەمی ١٩٥٣) گوازرانەوە بۆ مۆسکۆی پایتەخت. ئیتر بارزانی ماوەی ئەو سـاڵانەی لەیەکێتی سـۆڤیەت مایەوە تا سـاڵی ١٩٥٨ لە شـوقەیەکی بچووک بە ژمارە(١٢٥) لە نهۆمی پێنجەم، کە ڕووبەرەکەی تەنهـا (٣٦)م چوارگۆشـــە بوو، لە بلۆکی(٦٨) لەشـــەقامی (نوفوســـلوبودســـکایا)، کە بۆ پەناهەندە ســـیاســـییەکان تەرخانکرابوو، لەمۆسکۆی پایتەختی سۆڤیەت ژیانی بەسەر برد[١٦٢].

بەگوێرەی گێڕانەوەی جەلال تاڵەبانی(١٩٣٣-٢٠١٧)، مســـتەفا بارزانی ســـوودی لەماوەی مانەوەی خۆی لەو وڵاتە وەرگرتووە و لە ئەکادیمیای سـەربازی سـۆڤیەتی

---

156 -FIRAT SÖZERİ, Önceki Kaynak, S.29.

١٥٧ – زرار سلێمان بەگ دەرگەلەیی، س.پ، ل١٧٤.

158 - Павел Судоплатов, предыдущий источник، C.90.

١٥٩ – ئەفراسیاو هەورامی، س.پ، ل١٩٥.

١٦٠ – بڕوانە: مسعود بارزانی، س.پ، ل٢٠١.

١٦١ – بڕوانە: ئەفراسیاو هەورامی، س.پ، ل١١٦.

162 -FIRAT SÖZERİ, Önceki Kaynak, S.29

و ئەکادیمیای حزبی ئەو وڵاتە خوێندویەتی[١٦٣]. مستەفا بارزانیش لە دیدارێکیدا لەگەڵ پەیامنێری ڕۆژنامەی(براڤدا)ی روسی (یەڤگینی بریماکۆف)[١٦٤] کە لەساڵی ١٩٦٦ ئەنجامیانداوە، باس لەوە دەکات، (ج.م. مالینکوف) سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی سوڤیەتی(١٩٥٣-١٩٥٥) لە مۆسکۆ، ڕەوانەی قوتابخانەی حزبی باڵای کردووە[١٦٥].

سەربارى ئەوەی پاڤێل سودۆپلاتۆڤ(Pavel Sudoplatov) ئەفسەر لە دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت(KGB) لەسەردەمی جۆزیف ستالین، لە یاداشتەکانی خۆیدا، بەشێکی ئەو زانیارییانە پشتڕاست دەکاتەوە و باس لەوە دەکات، ئەو لە (بەهاری ١٩٥٣) لەهۆڵی وانە گوتنەوەی ئەکادیمیای سەربازی لە مۆسکۆ، چاوی بە مستەفا بارزانی کەوتووە، وەک ئەم ژێدەرە ئاماژەی پێکردووە، لەو کاتە بارزانی قوتابی بووە لە ئەکادیمیای سەربازی[١٦٦]. بەهەمان شێوەی سودۆپلاتۆڤ، (نووسەرێکی ڕوسی) باس لەوە دەکات، کە بارزانی دوای دیداری لەگەڵ (خرۆتشۆف)ی سەرۆکی سۆڤیت، چۆتە ئەکادیمیای سەربازی و لە ئەکادیمیای (فرونزی) خوێندویەتی[١٦٧]. ئەوە وێڕای ئەوەی بەڵگەنامەیەکی وەزارەتی دەرەوەی ئوسترالیا، ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە، بارزانی لەیەکێتی سۆڤیت، زانستە

---

١٦٣ – بروانە: مام جەلال دیداری تەمەن لەلاوێتییەوە بۆ کۆشکی کۆماری، ئا: سەلاح ڕەشید، ب١، چاپخانەی کاردۆ، سلێمانی،٢٠١٧، ل١١٤.

١٦٤ – یڤگینی ماکسیموفتش بریماکوف، لە ٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٩ لە شاری (کییف) لە ئۆکرانیا لەدایک بووە. شارەزایی لە بوارەکانی ( سیاسی، دیبلۆماسیەت، ڕۆژنامەگەری، ئابووری) هەبووە. لە ساڵی ١٩٥٣ بروانامەی دکتۆرای لە ئابووری لە زانکۆی مۆسکۆ بەدەستهێناوە. لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٩٦-١٩٩٨) وەزیری دەرەوە و لە(١٩٩٨-١٩٩٩) سەرۆک وەزیرانی روسیا بووە. لە(٢٦ی حوزەیرانی ٢٠١٥) مردووە. بۆ زانیاری زیاتر، بروانە:

Л. М. Млечин, ЕВГЕНИЙ ПРИМАКОВ, Москва ЦентрполиГРАФ, 1999

١٦٥ – يفجيني بريماكوف، الكواليس السرية للشرق الاوسط(النصف الثاني من القرن العشرين و بداية القرن الحادي والعشرين)، ت: نبيل رشوان، القاهرة، ٢٠١٦، ص٣٩١.

166 - Павел Судоплатов, предыдущий источник، С.90.

١٦٧ – د. دينيس كوماروف، البارزاني و نضال الاكراد الجنوبيين، البارزاني و شهادة التاريخ، ص٤٨.

سەربازییەکانی لە کۆلێژی ئەرکان خوێندووە[١٦٨]. هەروەها ژێدەرێکی دیکە باس لەوە دەکات، بارزانی لەو ماوەیەی لە مۆسکۆ ژیاوە، لە پەیمانگای زمانەوانی مۆسکۆ(Moscow Institute of Languages) بەمەبەستی فێربوونی زمانی روسی، کۆرسێکی ئەکادیمی وەرگرتووە[١٦٩].

سەبارەت بە خوێندنی حزبی، یەکێک لە بەڵگەنامە فەرمییەکانی ئەکادیمیای باڵای لێژنەی ناوەندی حزبی شیوعی سۆڤیەتی، ئاماژە بۆ ئەوە کردوە، مستەفا بارزانی بەناوی مەمەدۆڤ(Mammadov) لەماوەی نێوان(١ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٣-١ی ئابی ١٩٥٨) لەو پەیمانگایە قوتابی بووە، بەڵام خوێندنەکەی تەواونەکردووە، لەبەرئەوەی تاقیکردنەوەی کۆتایی دەرچوونی ئەنجام نەداوە، بۆیە هیچ بڕوانامەیەکی بەدەست نەهێناوە[١٧٠]. ئەو بەڵگەنامەیەی کە ناسنامەی قوتابییە بەناوی مەمەدۆڤ بەژمارە(٢٠٢) لەرێکەوتی(٣١ی کانونی یەکەم ١٩٥٦) دەرچووە و لە توێژینەوەیەکی زانستی لە گۆڤاری (Kürt Tarihi) بڵاوکراوەتەوە[١٧١]، ئەو زانیارییە پشتڕاستکراوەتەوە. سەبارەت بە هۆکاری تەواونەکردنی خوێندنەکەشی، ئاشکرایە پەیوەندی هەبووە بەگەڕانەوەی بارزانی بۆ عێراق لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی(١٤ی تەمموزی١٩٥٨). سەبارەت بە ناوەکەشی، سیاسەتمەداری روسی (یەڤگینی بریماکۆف) لە یەکێک لە کتێبەکانیدا، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، ئەو ماوەیەی بارزانی لە سۆڤییەت ژیاوە، نازناوی (مەمەدۆڤ) بووە[١٧٢].

وەچەرخانی مێژوویی گەورە بۆ بارزانییە پەناهەندەکان لە سۆڤیت، لەدوای ئەو شۆڕشە هاتەکایەوە. چونکە دەرگای بەڕووی بارزانی کردەوە بۆ گەڕانەوە بۆ نیشتمانەکەی. بۆیە ئەو کاتەی مستەفا بارزانی بەهەواڵی سەرکەوتنی شۆڕشەکە زانی، لەڕۆژی(٢١ی ئابی١٩٥٨) مۆسکۆی بەجێ هێشت و چووە بوخارستی

---

168-NAA: A1838,173/2/6/1, Part (1), Iraq–Political–States–Kurds, ResearchDepartment Memorandum, The Kurdish Problem in Iraq 1958–1963, August13, London, 1963 ،P280.

169 –Derk Kinnane, , op.cit, p.59.

١٧٠ – سەبارەت بە خوێندنی بارزانی لە ئەکادیمیای سیاسی سۆڤیەتی لە مۆسکو بروانە: پاشکۆی ژمارە (٣)

171 -FIRAT SÖZERİ, Önceki Kaynak, S.29 .

١٧٢ – يفجيني بريماكوف، م.س، ،ص ٣٩٠.

پایتەختی ڕۆمانیا[١٧٣]، پاشان ڕوودەکاتە کۆماری چیکۆسلۆفاکیای میللی[١٧٤]. لە(٢٩ی ئابی١٩٥٨) نامەیەکی بۆ سەرۆک وەزیرانی نوێی عێراق عەبدولکەریم قاسم(١٩٥٨-١٩٦٣) ڕەوانەکرد[١٧٥]، بەمەبەستی گەڕانەوەیان بۆ نیشتمان، داوای ڕێگاپێدانی لێکرد[١٧٦].

نامەکەی بارزانی لە(٢ی ئەیلولی١٩٥٨)، بووە هۆی دەرچوونی یاسای لێبووردنی گشتی لەلایەن حکومەتی عێراقی بۆ ئەو تۆمەتانەی خرابووە پاڵ مستەفا بارزانی و شێخ ئەحمەدی براگەورەیان و بارزانییەکانی لەگەڵیاندابوون، سەبارەت بەو کارانەی لەماوەی نێوان سالانی (١٩٤٥ تا ١٩٤٧) ئەنجامیاندابوو. یاساکە پشتی بە مادەی(١١) لەمەرسومی ئیدارەی عورفی ژمارە(١٨)ی ساڵی١٩٣٥ و مادەی(٨٠) لەیاسای سزادانی عێراقی بەست. پاشان هەر لەهەمان ڕۆژ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق عەبدولکەریم قاسم بە بروسکەیەک وەڵامی نامەکەی بارزانی دایەوە و تیایدا نوسی:"نامەکەی ئێوەمان بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە بەدەست گەیشت و ئێمە پێشوازی لەگەڕانەوەی هەمووتان دەکەین بۆ نیشتمان"[١٧٧]. هاوکات وەزیری دەرەوەی عێراق عبدالجبار الجومرد(١٩٠٩-١٩٧١)، ڕێنمایی بە باڵیۆزخانەی وڵاتەکەیاندا لە (براغ)، هەموو کارئاسانییەک پێشکەش بە مەلا مستەفا بارزانی بکەن، بەمەبەستی گەڕانەوەی بۆ عێراق[١٧٨].

دوای وەرگرتنەوەی وەڵامی سەرۆک وەزیرانی عێراق، مەلا مستەفا سەردانی باڵیۆزخانەی عێراقی لە (براغ)ی پایتەختی چیکۆسلۆفاکیا کرد. یەکێک لە پەیامنێرانی

---

173 - FIRAT SÖZERİ, Önceki Kaynak, S.31.

١٧٤ - بۆ دەقی نامەکەی بارزانی بڕوانە: ژین(ڕۆژنامە)، ژ(١٤١١)، ١٩٥٨/١٠/٢، ل٨؛ لە:زانیار سەردار قرگەیی، پارتی و بارزانی لە ئەرشیفی ڕۆژنامەی(ژین)ی سلێمانی، هەرێمی کوردستان، ٢٠٢٢، ل٦١.

١٧٥ - بۆ دەقی نامەکە بگەڕێوە بۆ: مسعود البارزاني،البارزاني والحركة التحررية الكردية(الكرد و ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨) ١٤/تموز١٩٥٨-١١/ايلول/١٩٦١،كردستان، ١٩٩١، ص٥٦.

176 -Alex Danilovich: Iraqi Kurdistan in Middle Eastern Politics, New York, 2017, p.17.

١٧٧ - د. نوري عبدالحميد العاني،د. علاء جاسم محمد الحربي، د. أحمد ساجر جاسم، د.محمد عويد الدليمي،د. جهاد مجيد محى الدين، كامل جواد عاشور، تاريخ الوزارات العراقية في العهد الجمهوري (١٤تموز ١٩٥٨- ٧ شباط ١٩٥٩)، ج ١، بغداد، ٢٠٠٠، ص٢٠٧.

178 -LE GOUVERNEMENT IRAKIEN amnistie un chef révolutionnaire kurde, Le Monde, 04 septembre 1958.

ڕۆژنامەی (مەعاریف)ی ئیسرائیلی بەناوی (یعازر بن موشیە) تەواوی ووردکارییەکانی ئەم دیداری بارزانی لەگەڵ باڵیۆزی عێراق لە ڕاپۆرتێکدا بەناونیشانی (مەلا مستەفا بارزانی بۆمبی سۆڤیەتی ئامادەکراوە) بڵاوکردۆتەوە و نووسیویەتی:" لەسەرەتای ئەیلولی ١٩٥٨ پیاوێک بەسەر پایەکانی تەلاری باڵیۆزخانەی عێراق لە براغ سەرکەوت، کە هاتە ناو بالیۆزخانە، خۆی بە سکرتێری باڵیۆزخانە ناساند، ئەمیش ڕاستەوخۆ چووە ژووری باڵیۆز، لەو کاتەدا باڵیۆزەکە بەپەلە هاتە دەرەوە و باوەشی لە پیاوەکە کرد و هەر زوو پێی گوت، ژەنەراڵ بارزانی فەرمانم پێکراوە پێتانی ڕابگەیەنم ، حکومەتەکەم دان بە بەرێزتان دەنێ وەک ڕێبەری کورد لە عێراق، وە بڕیارمانداوە ڕێگات پێ بدەین بگەڕێیتەوە بۆ وڵاتەکەت. ئەگەر ئێستا ڤیزات دەوێ، پاسەپۆرتەکەمان بۆ بەجێبهێلن، لەماوەی چەند کاتێکی کەم، هەموو شتێک ئامادە دەبێ بۆ گەشتەکەت. بارزانی پرسی، چی لەبارەی ئەوانەی لە گەڵمدان؟ باڵیۆزەکە گوتی هیچ ڕێنماییەکم سەبارەت بەو بابەتە پێ نەگەیشتووە، بەڵام ئامادەم سەبارەت بەو بابەتە، ئەمڕۆ پەیوەندی بە حکومەت بکەم و ئەوە بزانم. وەک ڕۆژنامەنووسەکە نووسیەتی، بارزانی بە تورەییەوە سەیری باڵیۆزەکەی کرد، دوای ڕاوەستانێکی کەم، بە ئاماژەیەکی توند گوتی( بە قاسم بڵێ من بەبێ پیاوەکانم ناگەڕێمەوە، ئەوانە تەنها پیاوی هۆزەکەی من نین، بەڵکو هاوڕێی منن لە خەبات، ڕازی نابم بەگەڕێمەوە بەبێ ئەوان). ئەو کات باڵیۆزەکەی عێراق وەڵامی بارزانی دایەوە و گوتی ئەمڕۆ داوا لە بەغدا دەکەم و بەپەلە وەڵامت دەدەمەوە، دوای چەند کاتژمێرێک، باڵیۆز دوا وەڵامی بارزانی دایەوە و پێی ڕاگەیاند کە ڕێنمایی پێگەیشتووە و ڕێگا دراوە بە گەڕانەوەی هەموو پیاوەکانی بارزانی، بەڵام وەک ئەوەی بۆ بارزانی باسیکرد، گەشتی هەموویان بەیەکەوە بۆ عێراق ئەنجام نادرێ، پێویستە هەمویان بە دوو قۆناغ بگەڕێنەوە، بەشێکیان ڕاستەوخۆ لەو کاتەدا دەتوانن بگەڕێنەوە، بەشێکی دیکەشیان لەدوای چەند مانگێکی دیکەی کەمی داهاتوو دەتوانن بگەڕێنەوە"[١٧٩].

بەم شێوەیە دوای تەواوکردنی ڕێکارەکانی پێویست بەگەڕانەوەیان، مستەفا بارزانی لە(٦ی تشرینی یەکەمی١٩٥٨) و پاشان هەڤاڵە بارزانییەکانی دیکەی، کە

---

١٧٩ – مەلا مستەفا بارزانی بۆمبی سۆڤیەتی ئامادەکراوە ، معاریف(ڕۆژنامە)، ژ (١٣٤٣)، ٢٤ی کانونی دووەم ١٩٥٩، ل٣.

بەگوێرەی هەواڵی ئێستگەی ڕادیۆیی بەغدا لە (٤٦٠) پیاو و (١٠٨) ئافرەت و (٢٥٢) منداڵ پێکهاتبوون ، لە(١٦ی نیسانی١٩٥٩) گەڕانەوە عێراق[١٨٠].

## باسی چوارەم: دوا وێستگەکانی ژیانی بارزانی

دوای گەڕانەوەی مستەفا بارزانی و هەڤاڵەکانی لە یەکێتی سۆڤیەت بۆ عێراق، حکومەتی عێراق خانووی سەباحی کوڕی (نووری ئەلسەعید)ی سیاسەتمەداری پێشووتری لەشاری بەغدا بۆ بارزانی تەرخانکرد، کە موڵکداریەتییەکەی بۆ بەڕێوەبەرایەتی هێلی ئاسنین دەگەڕایەوە. هەروەها ئۆتۆمۆبێلێکی تایبەتی بۆ بارزانی تەرخانکرد، ئەمیش موڵکداریەتییەکەی بۆ عەبدولئیلا(١٩١٣-١٩٥٨)ی وەسی عێراق دەگەڕایەوە. ئەوە جگە لە تەرخانکردنی موچەیەکی مانگانە بڕەکەی (٥٠٠) دینار بووە[١٨١]، لەگەڵ بەخشینی مینحەیەک بە نزیکەی (١-٢) هەزار دیناری ساڵانە وەک هاوکاری لەسەر موچەکەی. حکومەت موچەیەکی مانگانەشی بۆ شێخ ئەحمەدی براگەورەیان تەرخانکرد بڕەکەی (١٥٠) دینار بوو، بۆ کوڕەکانیشی عوبێدوڵلا(١٥٠) دینار و لوقمان (٥٠) دینار بڕایەوە[١٨٢]، هەروەها بۆ هەر پێشمەرگەیەکی هاوەڵی، کە سەڵت بوو (٣٥) دینار و ئەوەی خێزاندار بوو(٤٥) دینار و بۆ هەر پێشمەرگەیەکی خێزانداری خاوەن منداڵیش(٥٠) دینار دیاریکرا[١٨٣]. زیاتر لەوە حکومەت بڕیاریدا بەخەرجکردنی بڕی (٥٠) هەزار دینار بۆ دروستکردنی خانوو بۆ بارزانییەکانی لە کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەت گەڕابوونەوە عێراق[١٨٤].

سەرەڕای هەموو ئەمانە، تاکڕەوی سەرۆک وەزیران لە دەسەڵات و فەرامۆشکردنی داخوازیەکانی کورد بۆ دروستکردنی دەسەڵاتێکی هاوبەشی دیموکراتی و دۆزینەوەی میکانیزمێکی گونجاو بۆ بەڕێوەبردنی ناوچە کوردییەکان و پابەند نەبوون بەدەستوور وچەندین هۆکاری دیکە[١٨٥]. هیچ بژاردەیەکی لەبەردەم

---

١٨٠ - اطلاعات(روزنامه)، ش (٩٨٨٠)، ٩ فروردين ١٣٢٨، ص ۴.

١٨١ - نوري العاني و أخرون، م.س،ص٢٠٩؛ الزمان(جريدة)، ع(٧٣٤٠)، ٢٤ أيلول ١٩٦١،ص١.

١٨٢ - محمود الدرة،م.س، ص٢٨٠.

١٨٣ - م.ن، ص ٢٨٤؛ الزمان(جريدة)، ع(٧٣٤٠)، ٢٤ ايلول ١٩٦١.

١٨٤ - نوري عبدالحميد العاني و أخرون، م.س، ص٢٠٩.

١٨٥ - بروانە: بيان الحيزب الديمقراطي الكردستاني في ١٩٦١/١١/١٦ ألى الشعب العراقي، لە: لەبەڵگەنامەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان ١٩٤٦_١٩٦٣، ئامادەکردنی: سدیق ساڵح- رەفیق ساڵح،

ڕێبەری کورد مستەفا بارزانی نەهێشتەوە، ئەوە نەبێ بۆ دواجار بەغدای پایتەختی عێراق لە شوباتی ١٩٦١ بەجێبهێڵێ و بگەڕێتەوە کوردستان[١٨٦].

لەئەنجامی ئاڵۆزبوونی کێشەکانی نێوان حکومەتی عێراق و سەرکردایەتی کورد[١٨٧]، لە(١١ی ئەیلولی١٩٦١) شۆڕشێکی دیکە بەڕێبەرایەتی مستەفا بارزانی لە باشووری کوردستان هەڵگیرسا، بۆ ماوەی (١٤) ساڵان درێژەی کێشا[١٨٨]. شۆڕشەکە چەندین قۆناغی جیاوازی لە شەڕ و دانووستان و ڕێککەوتنی بەخۆیەوە بینی، دواجار لە (١١ی ئاداری١٩٧٠)، حکومەتی عێراقی بۆ یەکەمجار لە مێژووی دامەزراندنیەوە دانی بە بەشێک لە مافەکانی گەلی کورد دانا لەچوارچێوەی عێراقدا[١٨٩]. بەڵام پاشگەزبوونەوەی لەجێبەجێکردنی برگە و ماددەکانی ڕێککەوتنەکە و گۆڕینی نێوەڕۆکەکەی بەو شێوە حوکمڕانییە کارتۆنییەی پشتگیری لەمانەوە و بەردەوامبوونی دەسەڵاتەکەی دەکرد، پاشان دەرکردن و ڕاگەیاندنی یاسای ژمارە (٣٣)ی ئۆتۆنۆمی لە(١١ی ئاداری١٩٧٤)، بەبێ گەڕانەوە بۆ سەرکردایەتی کورد، جارێکی دیکە ئاگری شەڕی لەنێوان هەردوولا هەڵگیرساندەوە[١٩٠]، دواجار بەهۆی ئەنجامدانی ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە(٦ی ئاداری١٩٧٥) لەگەڵ ئێران، ئەوەی دوایی

---

زانکۆیا دهۆک و بنگەی بەڵگاندن و لێکۆڵینەوەی ژین، دهۆک،٢٠٢١، ل٤٦٠-٤٦١ ؛ مسعود البارزاني، م.س، ،ص١٤٩.

١٨٦ – الجمهورية العراقية، مديرية شرطة لواء اربيل(القلم السري)، العدد(٣١٨)، التاريخ:١٩٦١/٢/١٨.بروانە پاشکۆی ژمارە(٤)؛ موحسین دزەیی، وێستگەکانی ژیانم، ب٢، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٢٢.

١٨٧ – سەبارەت بە هۆکارەکانی هەلگیرسانی شۆڕشی ئەیلول، بروانە: حيدر نجم عبد مراد، الاستراتيجية العسكرية لثورة أيلول(١٩٦١–١٩٧٠) دراسة ركن، ر: د. أزاد سالم محمد، دهوك، ٢٠٢١، ص١٨–٢٣.

188 - Bryan R. Gibson: sold out? Us Foreign Policy, Iraq, the Kurds and the Cold war, New York, 2015, P.9.

189 - - NA, FCO17/1237, Problem of Kurds in Iraq, British Embassy Moscow, The Kurdish Problem, 25 March 1970, p.54.

١٩٠ – الجمهورية العراقية، منشورات وزارة الاعلام، قانون الحكم الذاتي لمنطقة كردستان، السلسلة الوثائقية(٣٣)، ١٩٧٤، قانون رقم (٣٣) لسنة ١٩٧٤، ص٨–٢٣.

دەســـتی لە پشـــتگیریکردنی شـــۆڕشـــی کورد هەڵگرت[191]. بەو هۆیەوە بارزانی بە ناچاری ڕایگەیاند" شەڕ لەعێراق کۆتایی هات"[192].

ئەم بڕیـارەی بـارزانی و ســـەرکردایەتی پـارتی، بووە هۆی ئـاوارەبوونی نزیکەی(١٠٠-٢٠٠) هەزار کورد و پەڕینەوەیان بۆ ناوخاکی ئێران[193]، لەگەڵیشـــیاندا مســـتەفا بارزانی لە ئێوارەی(٢٥ی ئاداری١٩٧٥) بارەگای خۆی لەحاجی ئۆمەران لە باشـووری کوردســـتان بەجێهێشـت، جارێکی دیکە و خۆی و خێزان و کەسـوکارە نزیکەکانی پەڕینەوە سنووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان و چوونە شـاری نەغەدە و لە تەلارێکی کۆنی حکومەتدا نیشـــتەجێ بوون. پاشـــان لەمانگی (کانونی یەکەمی١٩٧٥) مـاڵی بـارزانی چووە گەڕەکی عەزیمییە لە کەرەج، کە نزیکەی (٤٠) کم لە تـارانی پایتەختی ئێرانەوە دووربوو[194].

بارزانی لەمانگەکانی پێش کۆتایی شـۆڕش، بارودۆخی تەندروسـتی باش نەبوو، ئازاری لە پشـت و پێیەکانیدا هەبوو، بۆ چارەســەری ســەردانی تارانیشــی کردبوو، هەندێک دەرمانی بەکاردەهێنا، دوای نســـکۆی شـــۆڕش ئازارەکانی زیادی کرد، ئەمجارە ڕەتیکردەوە سەردانی دکتۆرەکانی تاران بکاتەوە. بۆیە بە مەبەستی پشکنین و چارەســەرکردنی نەخۆشــییەکەی، دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی هەردوو حکومەتی ئێران و ئەمریکا، لەســەرەتای (ئابی١٩٧٥) لەگەشـتی فڕۆکەوانی تاران، بەشـێوەیەکی نهێنی گەیشـــتە فڕۆکەخانەی (جون ئف کینیدی) نێودەوڵەتی لە نیویۆرک، لەڕۆژی دواتر بە پاســەوانی دەزگاکانی ئاسـایشــی ئەو وڵاتە، گوازرایەوە بۆ نەخۆشـخانەی (مایوکلینیک)ی شاری روتشستر لەویلایەتی مینیسوتا[195].

لەئەنجامی پشکنینە تەندروستییەکان دەرکەوت، مستەفا بارزانی توشی نەخۆشی شـێرپەنجەی سـییەکان بووە، بەو هۆیەوە یەکەم بەشـی لەچارەســەری (کیمیایی)، لەسەر دەستی ئەو دەستە پزیشکییەی سەرپەرشتی چارەسەری تەندروستیەکەی

---

١٩١ – بروانە دەقی ڕێککەوتنامەکە لە: لوقا زودو، اتفاق الجزائر و جوانب القانون الدولي بين العراق و ايران و نهاية الملا مصطفى البرزاني، بيروت، ١٩٧٥، ص٢٦.

192 - Eric Pace, Leader of Kurdish Revolt Says That Fighting in Iraq Is Ended, the New York Times, 23 March, 1975, p.1.

193 - Deniz Gumustekin: Kurds under Threat: The Role of Kurdish Transnational Networks During Peace and Conflict. London, 2021, P.33.

١٩٤ – محسن دزەیی، م.س، ص٢١- ٣٠.

195 -David A. Korn, op.cit.

دەکرد، وەرگرت[196]. پاشـــان لەدوای مـانگێـک و چەنـد هەفتەیەک لە وەرگرتنی چارەسەری پێویست، لە(١٠ی تشرینی دووەمی١٩٧٥) گەڕایەوە ئێران و لە کەرەج لە ماڵەکەی خۆیدا نیشـتەجێ بوو. بەڵام لەسـەر ڕێنمایی و داواکاری پزیشـکەکانی، کە چاودێری بارودۆخی تەندروسـتیان دەکرد، بارزانی جارێکی دیکە لە ڕۆژی(١٩ی حوزەیرانی١٩٧٦) بۆ وەرگرتنی کۆرسـێکی دیکەی چارەسـەری پزیشـکی، گەڕایەوە نەخۆشـخانەی مایوکلینیک[197]. بەڵام ئەمجارە جیاواز لەجاری پێشـوو، بڕیاریدا نەگەڕێتەوە ئێران تا ڕژێمی شای پەهلەوی لە ئێران حوکمڕانی بکات[198].

دوای جێبەجێکردنی ڕێنماییە تەندروستییەکان و وەرگرتنی چارەسەری، پشکنینە تەنـدروسـتیەکـان لە ڕۆژی(٢٠ی حوزەیرانی١٩٧٦) دەریـانخسـت، بـارزانی نەخۆشـییەکەی بەتەواوەتی تێپەڕاندووە. ئەو کاتە گەشـتێکی بۆ دوورگەی (تاهو) لە کالیفۆرنیا ئەنجامدا و دوای سێ هەفتە، سەردانی واشنتنی پایتەختی ئەمریکای کرد و ماوەیەک لە میوانخانەی شـیراتۆن لەشـەقامی (کونکتیکت) مایەوە. لە پایتەخت چاوی بەژمارەیەک لە ڕۆژنامەنووسـە بەناوبانگەکانی دۆسـتی بوون کەوت، لەوانە: ( ولیەم سـافیر) و (جیمس هۆکلاند) و نووسـەر ومێژوونووسـی بەناوبانگ(حنا بطاطو) و (ئەدمۆند غەریب) بیشـی بینی، کە ئەو کاتە خەریکی نووسـینی تێزی دکتۆرایەکەی بوو[199]. هەروەها سەردانی هاوڕێ دێرینەکەی ( دانا ئادەم شمیدت)ی کرد، کە یەکێک بوو لە پەیامنێرانی ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمزی ئەمریکی و لەسـەرەتای سـەرهەڵدانی شـۆڕشـی ئەیلول سـەردانی باشـووری کوردسـتانی کردبوو. وێڕای ئەنجامدانی ژمارەیەک دیداری سیاسی لەگەڵ بەشێک لەسیاسەتمەدارانی ئەمریکا[200].

---

١٩٦ – مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج ٣، ثورة أيلول ١٩٦١–١٩٧٥، ، اربيل، ٢٠٠٢، ص٤٠٥.

١٩٧ – بڕوانە: محسن دزەیی، م.س، ص٦٨،٨٨،١٧٧.

198 - William Safire, Of Kurds and Conscience, The times News, Des 16, 1976. p.2.

١٩٩ – د. ئەدمۆند غەریب، (دیدار)، هەولێر، ١٧ی ئایاری ٢٠٢٣؛ ناوبراو لە ٢٦ی ئاداری ١٩٤٢ لە لوبنان لەدایک بووە. بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرای لە مێژوو و زانستە سیاسی و ئابوورییەکان لە زانکۆی جۆرج تاون لە ئەمریکا بەدەستهێناوە. چەندین کتێبی مێژوویی هەیە. ئێستاش لەژیاندا ماوە و لە ئەمریکا نیشتەجێیە.

٢٠٠ – محسن دزەیی، م.س، ص٩٤،٩٩،١٠١،١٣٥.

ماوەی ئەو سێ ساڵەی ( ١٩٧٦-١٩٧٩) مستەفا بارزانی لەئەمریکا ژیاوە، بەشێکی لە میوانخانەی (کاهلەر گراند) نیشتەجێبووە، کە دەکەوێتە ناوەڕاستی شاری ڕوتشستر(Rochester) لە ویلایەتی مینیسوتا(Minnesota)، لەبەرئەوەی میوانخانەکە کەوتبووە بەرامبەر نەخۆشخانەی مایوکلینیک و بۆ هاتوچۆکردنی ئاسان بووە[٢٠١]. ئەو کاتەشی کە لەساڵی ١٩٧٦ بۆ جاری دووەم سەردانی ئەمریکای کرد، لەواشنتن لە میوانخانەی (ئومنی شورهام) لەباکووری ڕۆژئاوای شارەکە نیشتەجێبوو[٢٠٢]. پاشان لەکۆتایی تشرینی یەکەمی ١٩٧٦ لەنزیک( بلغارماک) لە ناوچەی جورج تاون لە ویلایەتی فیرجینیا خانووەکی بەکرێ گرت و تێیدا نیشتەجێبوو. بۆماوەی نزیکەی یەک ساڵ لەو خانووەدا مایەوە. بەر لەوەی بچێتە ناوچەی ماکلین لەهەرێمی فیرفاکس لەهەمان ویلایەت، کە (١٣)کم لە باکووری ڕۆژئاوای واشنتنی پایتەختەوە دووربوو[٢٠٣].

بارزانی لەو ماوەیەدا بەشێوەیەکی بەردەوام سەردانی نەخۆشخانەی مایوکلینیکی دەکرد. هەندێک کاتیش بۆ وەرگرتنی تیشک و چارەسەری کیمیایی سەردانی نەخۆشخانەی زانکۆی جورج تاون و نەخۆشخانەی سیبلی کردووە[٢٠٤]. تا کۆتایی ساڵی ١٩٧٨ نەخۆشییەکە لەژێر کۆنترۆڵی پزیشک و چارەسەرییە تەندروستیەکاندا بووە، بەڵام دوای ئەو ڕێککەوتە، دۆخی تەندروستی بارزانی گۆرانکاری بەسەردا هات و نەخۆشیەکەی لە کۆنترۆڵی پزیشەکانی چارەسەریان دەکرد دەرچوو، دوای ئەوەی هەموو جەستەی گرتەوە، هەر بۆیە جارێکی دیکە گەڕایەوە نەخۆشخانەی مایوکلینیک. دواجار لە (شوباتی ١٩٧٩) نەخۆشخانەی بەجێهێشت، بەبێ بوونی هیچ ئومێدێک بۆ چارەسەرکردنی و گەڕایەوە ماڵەکەی خۆی لە (ماکلین)[٢٠٥].

مستەفا بارزانی لەو کاتەدا خواستی ئەوەی هەبوو بگەڕێتەوە ناو کەسوکارەکەی خۆی لە ئێران. بۆ ئەم مەبەستەش ئەوانەی یاوەری بوون، کاروباری گەشتەکەیان بۆ ئێران ئامادە کرد، بەڵام کاتێک کۆمپانیا فڕۆکەوانییەکە تێگەیشت لەوەی بارزانی

---

٢٠١ – م.ن، ص١١٢.

202 -David A. Korn, op.cit.

٢٠٣ – محسن دزەیی، م.س، ص١١٢.

204 -David A. Korn, op.cit.
205 - Ibid

بەهۆی هەناسە تەنگییەکەی، بۆ گەشتەکەی پێویستی بە ئامێری (ئۆکسجین) هەیە لەناو فڕۆکە، ڕاستەوخۆ داوای ڕاپۆرتی پزیشکیان کرد بۆ ئەوەی دڵنیابن لەوەی گەشتەکە کاریگەریی لەسەر بارودۆخی تەندروستی دروست ناکات و بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە ئێران[٢٠٦].

بارزانی لەچاوەڕوانی ئامادەکردنی ڕاپۆرتی پزیشکیدا، بە ئامانجی گەڕانەوەی بۆ ئێران مایەوە، تا لە کاتژمێر ٥ ی ئێوارەی ڕۆژی پێنج شەممە(١ی ئاداری١٩٧٩) کۆچی دوایی کرد[٢٠٧]. پەیامنێری ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی (سڤین سیمون)، ڕۆژی دواتر هەواڵی ئەو ڕووداوەی بەناوونیشانی( MUSTAFA BARZANI, KURDS' LEADER, DIES) بڵاوکردەوە و ڕایگەیاند"مستەفا بارزانی، گەورە ڕێبەری کورد، کە بەدرێژایی تەمەنی بۆ بەدیهێنانی سەربەخۆیی و مافی گەلەکەی خەباتی کرد، دوێنێ لەتاراوگە لە نەخۆشخانەی جۆرج تاون لە واشنتن لەتەمەنی(٧٦) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد"[٢٠٨]. بەپێی زانیارییەکانی ئاژانسی هەواڵی(ڕۆیتەرز)، تەرمەکەی بارزانی دوای ئەوەی لە ئەمریکا گەیشتەوە ئێران، بەچەند فڕۆکەیەکی هێزی ئاسمانی ئێرانی لە ئێوارەی(٤ی ئاداری١٩٧٩) گوازرایەوە ماڵی کوڕەکەی لە شاری شنۆ لە سنووری باکووری ڕۆژئاوای ئێران و لە ڕۆژی دواتر بە ئامادەبوونی هەزاران کەس لە پەنابەرانی کورد، بەخاک سپێردرا[٢٠٩].

## تەوەری دووەم: کەسایەتی و تایبەتمەندیە کەسییەکانی بارزانی

مستەفا بارزانی لەژیانی خۆیدا وێڕای ئەرکی سیاسی، بەرپرسیارەتی خێزانێکی گەورەی لەئەستۆدا بوو، ئەو خاوەنی سێ خێزان بوو. بەگشتی (١٧) منداڵی هەبوو، (١٠) یان کوڕ و (٧) یان کچ بوون. هاوسەرەکانی هەمیشە یاوەری بوون[٢١٠].

---

206 - Ibid.

٢٠٧ – مات البرزاني بعد كفاح لم يثمر من أجل بناء الوطن الكردي، الانوار (صحيفة)، ع(١٥٣٩)، ٣ أذار ١٩٧٩، ص١٢.

208 – Sven Simon، MUSTAFA BARZANI KURDS' LEADE DIES، The New York Times، March 2, 1979, p.13،

209 - Barzani, a Kurd Leader, Buried in Northwest Iran, The New York Times, March 6, 1979, p.6.

٢١٠ – حبيب تومي،م.س،ص٣١.

(مەحبوبە ئەحمەد ئاغا بێرسیاڤی) کە دەکاتە کچی خاڵی، هاوسەری یەکەم و گەورەی بوو. وەک لە پێشتر باسکراوە، ئەحمەد ئاغای بێرسیاڤی، ڕۆڵی لە پێگەیاندنی بارزانیدا هەبوو. بارزانی لەو هاوسەرەی سێ کوڕ و سێ کچی هەبووە، ئەوانیش: عوبێدوڵا(١٩٢٧–١٩٨٠)، لوقمان(١٩٣٣–١٩٨٠)، سابیر(١٩٤٧–١٩٨٠)، (جوهەدیا)، (فەوزیا)، (ئیقلیمیە) بوون، ئێستا هیچیان لەژیاندا نەماون. هاوسەری دووەمی ناوی (حەفسە عەبدولڕەحیم) بوو، ئەویش لە بنەماڵەی ماڵە مەلا بوو، یەکێک بووە، لەبنەماڵەکانی گوندی بارزان و بەسێ پشت دەگەڕێنەوە سەر ماڵە شێخەکانی بارزان. لەو هاوسەرەی کوڕێکی بەناوی ئیدریس و دوو کچی بەناوەکانی (زەکیە و کەمیلا) هەبوو[٢١١].

هاوسەری سێیەمی بارزانی ناوی (حەمایل) بوو، ئەمیش کچی (مەحمود ئاغای زێباری) سەرۆکی هۆزی زێباری بووە. ئەو خێزانەی تەمەنی(١٦) ساڵان بووە، کاتێ هاوسەرگیری لەگەڵ مستەفا بارزانی کردووە. وەک یەکێک لەسەرچاوەکان باسی دەکات، لەو کاتەی بارزانی لەدوای دانوستانەکانی لەگەڵ حکومەتی عێراقی لە (شوباتی ١٩٤٤) دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی ئاکرێ، هەوڵی کۆکردنەوەی هێزە کوردیەکان دەدات، لەو ماوەیەدا مەحمود ئاغای زێباری ئەو کچەی خۆی پێ دەدات. بێگومان هەموو کات، ژن و ژنخوازی باشترین ڕێگا بووە بۆ دروستکردنی پردی پەیوەندی لەنێوان هۆزەکان[٢١٢]. بارزانی لەو خێزانەیدا، شەش کوڕ و دوو کچی هەبووە، کەناوەکانیان(مەسعود، نیهاد، سیهاد، دلشاد، سیداد، وەجی، خاتون، لەیلا) نە[٢١٣].

زۆرێک لەو نووسەر ڕۆژنامەنووسە بیانی و غەیرە کوردانەی چاویان بە بارزانی کەوتووە، ئەو دیدگاییەی لەسەریان دروستکردووە، لە نووسینەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە. بۆ نمونە دکتۆر گۆینتەر دشنەر، لەوێناکردنی دیمەنی ئەو ڕێبەرەدا دەڵێ "دیمەن و ڕواڵەتی بارزانی، ڕێک لە دیمەن و ڕواڵەتی ئەو کوردانە دەچوو کە کارل مای لە ڕۆمانە بەنێوبانگەکەیدا (گەشتێک لەکوردستانی کێوی) دا وەسفی

---

٢١١ – کاروان جوهر محمد، ئیدریس بارزانی ١٩٤٤_١٩٨٧، ژیان و ڕۆڵی سیاسی و سەربازی لەبزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورددا، چاپخانەی هێڤی، هەولێر،٢٠١٩،ل١٤.

212-Michael Gunter. Rutledge Handbook on the Kurds. Now York, 2019, p.236.

٢١٣ – کاروان جوهر ، س.پ، ل١٤.

کردبوون. نوســـخەیەکی خـاکی لە جلی نەتەوەیی، کراســـێکی دەڵبی[٢١٤] کورت، شــەرواڵێکی فش و فۆڵ، پشــتێنێکی قوماشــی ڕەنگاورەنگ، کە بارزانی خەنجەرەکەی پێدا کردبوو. دار جگەرەیەکی درێژ، جامانەیەکی ســوور، دیمەنی بارزانی جگە لەمانە، جورئەت و زیرەکی دەنواند". زیاتر لەمەش لە درێژەی ناســـاندنی بارزانیدا دەڵێت:" هەرچەندە ژەنەراڵ هەندێ کورتە باڵا بوو. بەڵام کەســـایەتیەکی بەهێز و کاریگەری هەبوو، لە یەکەم چاوپێکەوتن دا ئەمەم بۆ دەرکەوت، چاوە ڕەشـەکانی کە پرشـنگیان دەدا، هەموو ســوچێکی ژوورەکەی بەوردی دەپشــکنی، لۆچە قوڵەکانی دەموچاوی، ســام و تام و هەیبەت بوو، لەســیمای نەرەویەوە، باڵی بەســەر دانیشــتنەکەیدا کێشـا بوو. ئەو وێنەیەی لەم دانیشـــتنەدا دەربارەی بارزانی لەلام دروســـت بوو، وێنەیەک بوو، گوزارشـــتی لە جوامێرییەکی جەنگاوەری ســـەرکێشـــی چارەنووس ئاڵۆز و دژواری ڕۆمانسی دەکرد، سەرەڕای ئەوەی ژیانی بارزانی، زۆر دوور بوو لە هەموو ڕۆمانسیەتێکەوە"[٢١٥].

لەلایەکی دیکە پێشەوا قازی محەمەد(١ی ئایاری١٨٩٣-٣١ی ئاداری١٩٤٧) لەسەر بنەمای هەڵســـەنگاندنی خۆی بۆ نـاســـاندنی بـارزانی لە ڕۆژی(٢٦ ی کـانونی دووەمی١٩٤٧) لەوەڵامی پرســـیارێکی لیژنەی دادگەران لەڕۆژی دادگاییکردنەکەیدا لەدوای ڕووخانی کۆماری کوردستان، سەبارەت بە تایبەتمەندی و خورەوشتی ئەو ڕێبەرە دەڵێـت:" ئەوەی لە پیـاوەتی و کەرامەت و شـــەرافەت و ئینســـانییەت و شەجاعەت و نەبەزی و سەخاوەت و نەترسی، لە مێژووی کەسانی مەزن بوویێتیان، مەلا مستەفاش هەیەتی. ئەوەی موسـڵمانانی سـەدری ئیسـلام لە باوەڕ و ڕاسـتی و پاکیی و دڵسۆزی بۆ خوا و ئایین و خەڵکی هەژار و داماوی میللەت بوویانە، بارزانی هەموو ئەوانەی تێدایە"[٢١٦].

---

٢١٤ – ئەم وشەیە بە مانای (بەرگ، هەروا، فشوفۆل) هاتووە لە: عبدالرحمن شرفکندی(هەژار)، هەنبانە بۆرینە(فەرهەنگی کوردی- فارسی)، تهران، (١٣٦٩هـ)، ل٣٢٥.

٢١٥ – د.گوینتەر دیشنەر، کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێ کراو، گۆڕینی لە ئەلمانی یەوە بۆ عەرەبی: عبدالسلام بەرواری، گۆڕینی بۆ کوردی: حەمە کەریم عارف،چ٢،چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٩،ل٢٩.

٢١٦ – سەرۆک کۆماری کوردستان لەبەردەم دادگای ئێراندا، بەرهەڤکردنی: بەدرەدین سالح، هەولێر، ٢٠٠١، ل٢٥.

بارزانی مرۆڤێکی ئاشتیخواز بووە، بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتی و سەقامگیری لە باشووری کوردستان جەنگاوە. تایبەتمەندی ئاشتیخوازانەی لە کاروانی خەباتی سیاسیدا دەنگدانەوەی زۆری هەبووە، بۆیە سکرتێری گشتی ئەنجومەنی ئاشتی جیهانی رۆمیش چاندرا- Chandra (١٩١٩-٢٠١٦)ی هیندی دەڵێ:" ئومێد دەکەم چاوم بە بارزانی بکەوێ و سڵاوی لێ بکەم، لەبەرئەوەی لایەنگیری ئاشتییە لەجیهاندا"[٢١٧]. یەکێک لەسیما هاوبەشەکانی لەگەڵ سەرکردە مێژووییەکانی جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی گەلان ئەوەبووە، هەرگیز دەستی بۆ تیرۆر و گورز وەشاندن لەهاوڵاتیانی سڤیلی بێ تاوان نەبردووە[٢١٨].

بارزانی مرۆڤێکی سادە بووە و خۆبەگەورەزان نەبووە، لەهەموو تەمەنیدا نەچۆتە ژێر باڵی کۆکردنەوەی سامان و پێکهێنانی ژیانێکی جیاواز لەژیانی گەلەکەی. ئەو پێی وابووە ڕاکردن بە دوای کۆکردنەوە و گڵدانەوەی سامان و خواستە تایبەتییەکان، هەموو ئەو شتە بەهادارانەی سیفاتی باشن لەمرۆڤ، دادەتاشێ. بۆیە لەو بارەیەوە دەڵێت:" بەدەوڵەمەندی شەرەف پەیدانابێ، پارە و دەوڵەمەندی ئەگەر بۆ مەسڵەحەتی میللەت سەرف نەکرێ، مایەی سەرشۆڕی و ڕەزاڵەت ئەبێ"[٢١٩]. (فوئاد عارف)[٢٢٠]لەم بارەیەوە نووسیویەتی:" نهێنی مەلا مستەفا لەوەدابوو کە توانی متمانەی میللەتەکەی بەدەست بهێنێت، مرۆڤێکی زاهید بوو. لەسەر زەوی دەنوست، نانی پێشمەرگەی دەخوارد، سادە و ساکار بوو. مانای پارەی نەدەزانی"[٢٢١].

---

٢١٧ – عبدالفتاح علي بوتاني، الملامح الاساسية لشخصية مصطفى البارزاني القيادية والانسانية، دهوک، ١٩٩٦،ص٢٧.

٢١٨ – باقی نازێ، المسافة والمراحل و ....، ص١٢.

٢١٩ – بروانە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بگ:٣،، ب: ١، شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١–١٩٧٥،هەولێر، ٢٠٠٤، ل٤٠٤.

٢٢٠ – فوئاد عارف، یەکێکە لە ئەفسەر و سیاسەتمەدارانی کورد لەعیراقدا. ساڵی ١٩١٣ لە عومارە لە خوارووی عیراق لەدایک و باوکێکی کورد لەدایک بووە. چەندین پۆستی لەسەردەمی پادشایەتی و کۆماری وەرگرتووە. سەرەتا یاوەری تایبەتی مەلیک غازی بووە. پاشان بۆتە سوپا سالاری عیراق و پارێزگاری کەربەلا و ساڵی ١٩٥٩ بۆتە وەزیری دەولەت و پاشان وەزیری ئیرشاد و دواتر وەزیری کشتوکاڵ لە ساڵی ١٩٦٠ و دواجار لەساڵی ١٩٦٧ دەبێتە جێگری سەرۆک وەزیران. لەساڵی ٢٠١٠ مردووە. مذكرات فؤادعارف، تحقيق: د.كمال مظهر أحمد،دار ئاراس للطباعة والنشر، أربيل، ٢٠٠٩، ص١٥.

٢٢١ – فوئاد عارف، نهێنی سەرکردایەتی مەلا مستەفا، برایەتی(ڕۆژنامە)، ژ(٣٨٦٧)، ٢٠٠٢/١٢/١٥،ل٣.

مێژوونووسـێک لەبارەی دنیانەویسـتی بارزانی لەسـەر زاری یەکێک لەبەرپرسـەکانی حکومەتی نـاوەندی، کە گفتوگۆی لەگەڵ بـارزانی کردووە نووسـیویەتی:" لەسـەرەتای سـاڵی ١٩٦٤ دا، دوای ڕێککەوتننامەی ئاگربەسـتی ١٠ شوبات، (٣٠) هەزار دینارم پێشکەش بە بارزانی کرد، ئەویش برە پارەکەی وەرگرت و لەبەردەمی داناو دەسـتیکرد بە دابەشـکردنی بەسـەر بەرپرس و فەرماندەکانی شـۆڕش، کە لەویێ دانیشـتبوون و فەرمانی پێکردن بەسـەر پێشـمەرگە دەسـت کورتەکان دابەشی بکەن". لەدرێژەی باسەکەدا، ئەو بەرپرسە دەڵێ کاتێک بە بارزانیم گوت بۆچی ئەو پـارەت دابەشـکرد کە من بۆتۆم هێنـابوو، دەڵێ بـارزانی بەدێرە شـعرێکی عەرەبی وەڵامی دامەوە و گوتی:" أيها المال لسـت ربا معبودا ...... ولكنك قاضـي الحاجات و سـتار العيوب"[ ئەی پارە تۆ خودایەکی پەرسـتراونی...بەڵام دابینکەری پێداویستییەکان و داپۆشەری نەنگییەکانی]"[٢٢٢].

موحسین دزەیی[٢٢٣] لەسەر زاری یەکێک لەخزمە نزیکەکانی خۆی، کە ناوی زەید ئەحمەد عوسـمـان بووە دەیگێڕێتەوە، ئەو کاتەی ئەوەی دوایی لەسـاڵی ١٩٧٤ لەوەزارەتی دارایی حکومەتی عێراقی بەڕێوەبەری گشـتی بووە، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی حزبی بەعس بەنووسراوێکی نهێنی تەواوی دامەزراوەکانی دەوڵەت ئاگاداردەکاتەوە بەدەسـت بەسـەرداگرتنی موڵکە گوزراو و نەگوازراوەکانی مسـتەفا بارزانی لەعێراقدا، ناوبراو باسـی لەوە کردووە، دوای ماوەیەک لەگەڕان و پشکنین، بەڕێوەبەرایەتی تاپۆی گشتی و فەرمانگەکانی دیکەی پەیوەندیدار بەو بابەتە، وەڵامی نوسـراوەکەیان دایەوە، هیچ جۆرە موڵکێک لەهەموو عێراقدا بەناوی مەلا

---

٢٢٢ – عبدالفتاح بوتاني، الملامح الاساسية لشخصية ...،ص٢٠.

٢٢٣ – موحسین دزەیی کوڕی حەمەدەمین ئاغای دزەییە، لە ساڵی ١٩٣٢ لە گوندی دووگردکانی دەشتی هەولێر لەدایکبووە. لەساڵی ١٩٦٣ پەیوەندی بەشۆڕشی کورد دەکات. لەدوای بەیاننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ دەبێتە باڵیوزی عیراق لە چیکسلۆفاکیا و پاشان دەبێتە باڵیوزی عیراق لە کەنەدا و دواتر دەبێتە وەزیری نیشتەجێکردن. لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٧٦-١٩٧٩ یاوەری مستەفا بارزانی کردووە لەکاتی نەخۆشکەوتنی ئەوەی دوایی. تاکو ئێستاش لەژیاندا ماوە ولەشاری هەولێر نیشتەجێیە. بڕوانە: وێستگەکانی ژیانم، دیمانە لەگەڵ موحسین دزەیی، ب:١، سازدانی: تاریق ئیبراهیم شەریف، و: ئیسماعیل بەرزنجی، بڵاوکراوەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٩.

مســـتەفا بـارزانی تۆمـارنەکراوە و نییە. دواتریش ڕێنمـاییـانـدا ئەو مەســـەلەیە بشارنەوە[٢٢٤].

حکومەتی بریتـانیـا لە لێکۆلینەوەیەکی دەزگـا هەواڵگرییەکـانی ســـەبـارەت بەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەتەوەرێکیدا باس لە کەسـایەتی مسـتەفا بارزانی دەکات و بە پیاوێکی بوێر و چاونەترس و خۆڕاگر بەرامبەر نارەحەتیەکان ژیان وەســـفی دەکات[٢٢٥]. عەلی حەسـەن تافرشـیانیش کە یەکێک بووە لە ئەفسـەرە ئازادیخوازەکانی ئازربیجان، ئەو بۆچوونە پشـــت ڕاســـتدەکاتەوە بەگێڕانەوەی چیرۆکی دیدارەکەی بارزانی لەگەڵ شای ئێران لە ساڵی ١٩٤٧ و دەڵێ، بارزانی دوای گەڕانەوەی لە تاران بۆمن جەختی لەســـەر ئەوە کردەوە، کە ئەو هەرگیز خۆی ڕادەســـتی هیچ یەکێک ناکات، ئەگەر لەژێر باری هەر بارودۆخێکدابێ[٢٢٦]. لەو ســـۆنگەوە رزم ئارا (١٩٠١–١٩٥١)ی سـوپا سـالاری ئێران لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی، کە لەبارەی شـەڕەکانی سوپای ئێران و هێزی بارزانیەکان لەدوای ڕووخانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد، لە(٩ ی ئاياری١٩٤٧) ئەنجامیدا، کاتێک دێتە ســـەر باســـی بارزانی ڕوونتر لەوانەی پێشوو باسی دەکات و دەڵێ:**"من پیاوم لە مستەفا بارزانی ئازاتر نەدیوە"**[٢٢٧].

هەندێ لەو تایبەتمەندییانەی لە کەسایەتی بارزانی تێبینیکراوە، لەمزگەوتی بارزان لەســەر دەســتی مەلا مەحمودی مامۆســتای لەســەری ڕاهێنراوە. بەتایبەتی نەبوونی حەزی خۆپەرســـتی و ماددی زیانبەخش، هاوکات ڕاهێنانی لەســـەر چاکەکاری و لێبوردەیی و ســـادەیی و چەکەرەکردنی گیانی خزمەتکردنی مرۆڤایەتی و گرنگیدان بەهەژاران و سەرخستنی زوڵملێکراوان و ڕووبەڕوو بوونەوەی زوڵم[٢٢٨].

---

٢٢٤ – محسن دزەیی، أحداث عاصرتها، ج٣،ص١٣٢.

225 - NA, FCO/51/358, 1974, Research Middle East: Iraq- Soviet Relations 1968-1973, 12 December 1974, P.12.

٢٢٦ – أبو حسن تفرشيان،م.س، ص٢٧٥.

٢٢٧ – دیروز رئیس ستاداریش برای روزنامەنگاران اوضاع کردستان رابە تفصیل شرح داد، ارس(روزنامە)، ش (٧٧)،٢٠ فروردین ١٣٢٤، ١٠ اوربل ، ١٩٤٧. ص١؛ شێرکۆ فەتحوڵا عومەر، پارتی دیموکراتی کوردستان و بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد لە عیراقدا (١٩٤٦– ١٩٧٥)، و: سـوارە قەڵادزێی،چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، سلێمانی، ٢٠١٣،ل١١٣.

٢٢٨ – أيوب بارزاني، المقاومة الكردية للاحتلال ١٩١٤–١٩٥٩، ص٦٤.

لەلایەکی دیکە ئەو لە ژیانی لاوییەتی دا ، فێری ڕاووشـــکار کراوە و لە دۆخی ئاســاییدا ئەو کارەی کردووە[229]. بێجگە لەوە وەک جووتیار لە کێلگەی باوکی، زەوی کێڵاوە و کاری کردووە. لەناو چیاکاندا ئاژەڵی لەوەڕاندووە. فێربووە چۆن مازوو لە درەختە کێوییەکان وەک جوتیارێکی دانیشـتووی چیا بەرزەکان کۆبکاتەوە، ئەو کاتە دەیانفرۆشت و لەپیشەسازی پێستە خۆشکردندا لەباشووری کوردستان بەکاریان دەهێنا[230].

هەروەها زانراوە بارزانی ســـوارچاکێکی باش و بەتوانا بووە[231]. زۆر حەزی لە ســواری و غارغارێن بە ولاغ کردووە[232]. ســـەرباری ئەوەش مەلەوانیزانێکی باش بووە لە کۆچکردن وپەڕینەوە مێژووییەکەی ڕووبـاری ئـاراس دا بەرەو یەکێتی سـۆڤیەت، سـوودی لەدەسـت و باڵای لە مەلەکردندا وەردەگرێ، کاتێک هاوڕێیەکی ئاوی ڕووبار لەگەڵ خۆی دەبیات و ئەمیش لە مردن ڕزگاری دەکات[233].

کەســـایەتی مســـتەفا بارزانی لەو ســـەردەمەدا بۆتە بابەتی چەندین بەرهەمی ئەدەبی بەتایبەتی شـیعر[234]. لەســـەر ئەو بنەمایە دیڤید ئادامســـنی ڕۆژنامەنووســـی ئەمریکی لە ئاماژەکردن بەکەســـایەتی بارزانی نووســـیویەتی:" قەد پێشـــتر کورد ئەوەندەی ئەو، هیچ ڕێبەرێکیان پیرۆز و گەورە نەبینیوە بەگشـــتی، تەنانەت ئەوان ناوی ئەویان خستووەتە پاڵ ناوی سەلاحەدینی ئەیوبی"[235].

بارزانی خۆی بەدوورگرتووە لە دوورکەوتنەوە لەزێد و نیشتمانەکەی ئەوەندەی بارودۆخی ســیاســی دەرفەتی بۆ ڕەخســاندبێ. بەگشــتی ڕێزی لە خەڵک گرتووە،

---

٢٢٩ – محسن دزەیی، أحداث عاصرتها ،ج٣،ص١٢٧.
٢٣٠ – دانا ئادامز شمیدت، س.پ، ل١٨٥.
٢٣١ – سوارە قامشلی، س.پ، ل١٠١٨.
٢٣٢ – عەبدوڵڵا ڕەسول ئەحمەد پشدەری، بارزانی نەمر کەسایەتییەکی ناودار و ناسراو لەمێژووی کوردو کوردستاندا، کۆنگرەی یادەوەریی سەد ساڵەی بارزانی نەمر، هەولێر، ٢٠٠٣، ل١٢٢١.
٢٣٣ – سوارە قامشلی، س.پ، ل١٠١٧.
٢٣٤ – بروانە شیعری قەدری جان ( سرداری کردان برزانی ) لە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد ١٩٣١_ ١٩٥٨، ل٤٤٥؛ شیرکۆ بێ کەس، بۆ بارزانی، دەنگی کوردستان(گۆڤار)، ژ (١)، کانوونی دووەمی ١٩٧٥، ل١٥٦.
٢٣٥ – دیڤید ادامسن و جرجیس فتح الله، الحرب الكردية وأنشقاق ١٩٦٤، دار أراس للطباعة والنشر، أربيل، ١٩٩٩، ص ٩٦ .

بەتایبەتیش زانا و ڕوناکبیران، تەنانەت ڕێزی لەجوتیارێکی سادەش ناوە[٢٣٦]. زۆربەی کات دووربووە لە رق و تورەیی، کاتی وا هەبووە تورە ببێ، بەڵام نەک بەسەختییەک ببێتە بەڵگە لەسەری. ئەو پێدەکەنی، بەڵام لە قاقای نەداوە[٢٣٧].

دەرخستنی نیەت پاکی لە دیارترین خەسڵەت و تایبەتمەندیە کەسیەکانی بووە. ئەوە بێجگە لەوەی کە هەمیشە گەشبین و ووردبین بووە و پێشبینی زۆرێک لە ڕووداوەکانی کردووە. سەبارەت بەمەی دوایی گوینتەر دێشنەری ڕۆژنامەنووس باس لەوە دەکات کە: "شەوێک لەبارەگای سەرەکی بارزانی لە حاجی ئۆمەران و ساڵێک بەر لەنسکۆی ١٩٧٥، دیمانەیەکم لەگەڵ بارزانیدا کرد، شەوێکی تەواوی خایاند، هەردوو کوڕەکەی ( ئیدریس ومەسعود) و وەرگێری کوردی _ ئەمریکی( شەفیق قەزاز) ی زمان رەوان، ئامادەبوون. بارزانی لە ئەو دەمە تەمەنی٧٢ ساڵ بوو، لەم دیمانەیەدا، بە ئاشکرا ئاماژەی بۆ نسکۆی ئاینده کرد. ئەم پێشبینی یە زادەی ئەزمونی پتر لە نیو سەدە کاری ڕێبەرایەتی و سیاسی و تێکۆشانی بەردەوام بوو، لەپێناو وەدی هێنانی ئامانجەکانی گەلی کورد و دەستەبەرکردنی مافەکانی"[٢٣٨].

بارزانی خواست و ئارەزووی زۆری بۆ سەرکەوتن و زاڵبوون بەسەر کێشەکاندا هەبووە، ئەمەش لە ژیانی کەسی و سیاسیدا ڕەنگی داوەتەوە. تێگەیشتنی قووڵی بۆ سروشت و ڕەوشتی مرۆڤ و دەوروبەری هەبووە. هەڵوێستی بوێرانەی زۆری هەبووە و تەنانەت زۆرکات رەخنەی لەخۆشی گرتووە، بۆ نمونە لە دوای نسکۆی شۆڕشی کورد لە ساڵی ١٩٧٥ بەو پەڕی ئازایەتی و سادەییەوە دەڵێ:" هەڵەم کرد متمانەم بە شای ئێران کرد. پەشیمانم لەو باوەڕەی بەئەمریکام هەبوو. من هۆکاری ئەوەم کە ڕوویداوە، هیچ لە ژیانی من نیە شایانی گێڕانەوەبێ"[٢٣٩]. بەڵام ئەو وتانەی لە شوێنی ئەوەی کاریگەریی نەرێنی لەسەر پێگەی سیاسیان دروست بکات، بەپێچەوانە گەلی کوردی زیاتر لەجاران پابەندی ئەو سەرکردەیە کرد، بەڵکو دواتر بووە سمبولێک بۆ خەباتیان.

---

٢٣٦ – عادل تقي عبد محمد البلداوي، نضال الشعب الكردي و موقع البارزاني في الوثائق العراقية السرية، مركز الابحاث العلمية والدراسات ألكردية، دهوك ،٢٠١٢، ص١٧.

237–Michael M. Gunter, the Kurds of Iraq…p.8.

٢٣٨ – گوینتەر دێشنەر، س.پ،ل٢٠.

٢٣٩ – عبدالفتاح البوتاني، منطقة بادينان ... ، ص٤٧.

دیاره بارزانی بەخێرایی خەڵکانی دەوروبەر و ئەوانەی کە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردوون ناسیوە. هەوڵیداوە کاریگەریی لەسەر خەڵک دروست بکات، زیاتر لەوەی ئەوان بتوانن کاریگەری لەسەر دروست بکەن. بەهەرەیەکی باشی لە گفتوگۆکردندا هەبووە، بۆ بەهێزکردنی تێڕوانین و ڕاوبۆچوونەکانی، زمانێکی تێکەڵاو لە وشە و دەستەواژەی عەرەبی و کوردی پوختی بەکارهێناوە[٢٤٠]. بەشێوەیەکی سادە و ساکار قسە و گفتوگۆیەکانی ئەنجام داوە. لە قسەکردندا هیچ چوارچێوەیەکی دیارکراوی دانەناوە. هەمیشە ئەوانەی گوتوە، سەرچاوە و بەڵگەی پێویستی لەسەر بووە. باوەڕی زیاتری بەدەقە پیرۆزەکان بووە[٢٤١]. ئەمەش دەرخەری ئەوەیە خوێندنەوەی ووردی بۆ کەسایەتی تاکی کورد و کۆمەڵگەی کوردستانی هەبووە.

سەبارەت بەو تایبەتمەندییە ، کەمال جومبولاتی سیاسەتمەداری لوبنانی ، دوای ئەوەی لە هاوینی ساڵی ١٩٧٣ سەردانی ناوچە ئازادکراوەکانی باشووری کوردستانی کرد و چاوی بە بارزانی کەوت، دەڵێت:" بارزانی باوەڕی بەهێزی بەو ئازادی و ڕیالیزمەی ژیانی خۆی هەیە. ئەو هەمیشە لەژیانی خۆیدا، بەرگری لەبیروڕا و باوەڕی خۆی کردووە"[٢٤٢].

بارزانی خواستی زۆری بۆ فێربوونی بابەتە هەمەجۆرەکان هەبووە. دکتۆر گوینتەر دێشنەر لەو دیدارەی لەساڵی ١٩٧٤ لەگەڵیدا ئەنجامیداوە دەڵێ:" بۆم دەرکەوت بارزانی چەند تینوی زانیاری و شارەزابوونە. زیاد لەجارێک ڕووگیر وشەرمەزاری ئەوە بووم، کە نەمدەتوانی وەکو پێویست وەڵامی پرسیارەکانی بدەمەوە لەمەڕ هەندێ بابەت، کە لەڕاستیدا کاری خەڵکی تایبەتی و پسپۆڕ بوون"[٢٤٣].

بارزانی لەئەنجامی ژیانی ئاوارەیی و دەربەدەری فێری چەندین زمانی جۆراوجۆر بووە، وەک سەرنووسەری هەفتەنامەی ( کوهستان )ی ئێرانی لەتاران،

---

٢٤٠ – بروانە: دانا ئادامز شمیدت، س.پ، ل٣٦٠.

٢٤١ – مەحمود عوسمان سیاسەتمەدارێکی دیاری کوردە و لەساڵی ١٩٣٨ لە شاری سلێمانی لەدایک بووە. ساڵی١٩٦٢ بۆتە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان. ساڵی ١٩٦٨ لێپسراوی مەکتەبی تەنفیزی بووە لەناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەلاتی پێشمەرگەی کوردستان. تا ئێستاکە لەژیاندا ماوە و لەشاری هەولێر نیشتەجێیە.د.مەحمود عوسمان (دیدار)، هەولێر، ٢٠٢١/١٢/٢٣.

٢٤٢ – بهرام ولدبیکی، برتارک طوفان، ملا مصطفی بارزانی بەروایت مطبوعات ایران،( ١٣٥٨–١٣٢٤) ، تهران،١٣٩٥،ص٢٠.

٢٤٣ – گوینتەر دێشنەر، س.پ،ل٣٠.

نووسیویەتی:" مەلا مستەفا کەسایەتیەکی ڕۆشنبیرە و زمانەکانی کوردی و عەرەبی و فارسـی زۆرباش دەزانێ و شـارەزایی لەزمانەکانی ئینگلیزی و تورکیدا هەیە"[٢٤٤]. هەرچەنـدە بە بڕوای توێژەر، لەبەرئەوەی لە هیچ ژێدەرێک زانیـاری ئەوە نیە کە بارزانی زمانی ئینگلیزی و تورکی شـارەزابێت. بەڵام بەدڵنیاییەوە زمانی روسـی زانیوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو کاتە بارزانی نەچووبووە سـۆڤیەت، بۆیە ئەم ژێدەرە ئاماژەی بەو خالە نەکردووە.

بـارزانی متمـانەیەکی زۆری بەخۆی هەبووە، دیـارە ڕۆژانی تەمەنی درێژ و ئەزموونەکانی، هەقیانەتی ئەم سیفەتانەیان پێداوە. سەرباری ئەمانەش زۆر بە وردی سـنووری خۆی ناسـیوە. لەگفتوگۆدا بە وریایی گوێی لەبەرامبەرەکەی گرتووە، بەتایبەتی ئەگەر باسـەکەی لەمەر بابەتێک کردبایە، ئەو شـارەزایی لێ نەبوایە یان پێشتر نەی بیستبوایە[٢٤٥]. ئەو گوتویەتی:"هەرچی پێویستی بەگوێگرتن نەبێ، هەمیشە قسەیەکی هەیە بۆ گوتن"[٢٤٦].

سـەبارەت بە بیروباوەڕی ئایینی، ڕۆژنامەی کوردسـتان لە هەواڵێکیدا لە (١٨ی ئـاداری ١٩٤٦) بڵاوکراوەتەوە، ئـامـاژە بۆ ئەوە دەکـات کە:" لە ڕۆژی جمعەی (١٣٢٤/١٢/١٠ک) ئەندامانی حزب و ئەشراف و ئاغایانی هاری(شاری) مهاباد وروئای عشـایریەک بەدوای یەکدا چونە خومی ناسـینی میوانی خۆیان. هەر کە کاتی نوێژی جمعە هات، زعیم مەلا مستەفا لەگەڵ ئەندامێکی هەیئەتی مرکزی حزب تشریفی بردە مزگەوتی جامعە و فەریزەتی خودای مەزنی لەگەڵ هەموو مسلمانانی شاری مەهاباد دا لەسـەرخۆ لابرد و دوایی لەنـاو قەرەبـالغیکی زۆردا گەڕایەوە یـانەی فەرهەنی مەرکەزی حزب"[٢٤٧].

لەلای خۆیەوە (سەفەر قهرامانیان)[٢٤٨]، کە شەڕکەرێکی چەپی ئازربیجانی بووە، لەدوای ڕووخانی کۆماری ئازربیجانی میللی هاوڕێیەتی بارزانی کردووە، باسـی لە

---

٢٤٤ – وەرگیراوە لە: بهرام ولدبیکی، م. پ، ص١٨.

٢٤٥ – گوینتەر دێشنەر، س.پ،ل٣٠.

٢٤٦ – بهرام ولدبیکی، م. پ، ص٢٩.

٢٤٧ – زعیم مەلا مصطفی بارزانی، کوردستان(ڕۆژنامە)، ژ(٢٦)، ١٨مارس ١٩٤٦، ل٣. وەرگیراوە لە: ڕۆژنامەی کوردستان،چ٢، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠١١،ل١٠٧.

٢٤٨ – لەبارەی ئەو کەسایەتییە بڕوانە: علی اشرف درویشیان، خاطرات صفرخان (صفر قهرمانیان)، سی و دو سال مقاومت در زندان های شاه ،نشر چشمە، تهران، ١٣٧٨، ص ص ١٥–١٦.

پابەندی بارزانی بە نوێژەکانی دەکات[٢٤٩]، دینیس کۆماروفی توێژەری روسیش ئەوە دووپات دەکاتەوە، کە بارزانی لە ژیانی خۆیدا بەڕادەیەکی زۆر پابەندنی نەریتە ئاینییەکان بووە[٢٥٠]. ئەوە ســـەرباری ئەوەی ژیگالینای مێژوونووس، کە باس لە پابەندی و باوەڕی پتەوی بارزانی بەئایین و ئەو تەریقەتە ســـۆفیگەرییەی لەســـەری پەروەردە بووە دەکات، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، بارزانی کەســـێکی لەخواترســـی باوەڕداربووە، لەژێر کاریگەریی ئایدۆلۆژیای تەریقەتی ســـۆفیگەری نەقشـــەبەندی بووە، کە شێخ ئەحمەدی برا گەورەی سەرۆکایەتی کردووە[٢٥١].

موحســـین دزەیی کاتێک باس لەو ڕۆژانە دەکات، کە لە ئەمریکا لەماوەی نێوان ســالانی(١٩٧٦_١٩٧٩) لەگەڵ بارزانیدا ژیاوە لەســەر هەندێک لەم تایبەتمەندیانە قسـە دەکات و دەیگێڕێتەوە، کە بارزانی یەکێک بووە لەوانەی کە خواســتی زۆری لەســەر خوێندنەوەی کتێبە مێژووییەکان و چیرۆکی جەنگەکان هەبووە. هەروەها زۆر حەزی لە گوێگرتن لە مۆسـیقا و گۆرانی فۆلکلۆری کۆنی کوردی هەبووە، بەتایبەتی ( لاوک )[٢٥٢]. مســـتەفا بارزانی کاتێک خۆشـــی باس لەگرنگیدانی بە ئەدەب دەکات، دەقە ئەدەبییەکانی عومەری خەیام بەپێشـــەنگی ئەو دەقانە زانیوە، کە هەمیشــە تامەزرۆی خوێنـدنەوەی بووە بۆ دڵخۆشـــی و تێرکردنی ڕۆحی[٢٥٣]. لە یەکێـک لە دیـدارە ڕۆژنامەوانییەکانیشی دوای نسکۆی شۆڕش لەساڵی ١٩٧٥ دا ئاماژە بۆ ئەوە کردوە ئەو زۆر بە ئەدەبی فارســـی کاریگەرە و لەم بارەیەوە دەڵێ:" قەدەر وایلێکردووم لە بەرهەمی شاعیرانی وەکو ( حافزی شیرازی و سەعدی) دووربکەومەوە، بەڵام ئێستا گەڕاومەتەوە و دەستم کردۆتەوە بە خوێندنەوەی دیوانەکانیان"[٢٥٤].

بەگشتی وەک نووسەرێک باسی دەکات، لەژیانی ئەو سەرکردەیە هەموو شتێ بوونی هەبووە، ســەرکەوتن و شــکســت بەیەکەوە کۆبوونەتەوە، وێڕای دۆســت و نەیاری زۆر. هەمیشـــە ســـۆز وعەقل ئامادەییان لە رەفتار و کرداری بارزانیدا

---

٢٤٩ – بهرام ولدبيكی، م. پ، ص١٩.

٢٥٠ – دینیس کوماروف، م.س، ص١٧٥.

251- О.л. Жигалина предыдущий источник, с.9.

٢٥٢ – محسن دزەیی، أحداث عاصرتها، ج٣، ص١٢٧.

٢٥٣ – بروانە: دیفید ادامسن و جرجیس فتح الله، م.س، ص٢٨٣.

٢٥٤ – ئەمیر تاهیری، کاری من تمام است، کیهان(روزنامه )، ش (٩٥٤٦)، ٣ مى ١٩٧٥،ص١.

هەبووە[255]. کاتێک ژیانی ئەو دەخوێنیتەوە، لەوە دەگەی دڵســـۆزی زۆری بۆ ئەو ڕێگـایە هەبووە کە هەڵیبژاردووە. ئەو دەرفەتی زۆری لەبەردەم بووە بۆ ئەوەی بە ئارامی خۆشــگوزەران بژی، بەڵام ســەرباری ئەوە، ڕێگای دنیانەویســتی و خەباتی هەڵبژاردووە. ژیانی بارزانی پڕبووە لەمەترســـی و دابڕان و جۆرەها ئاســـتەنگ و ئـالانگـاری ســـەخـت. دیـارە بژاردەی ئەو بۆ ئەو ڕێگـایە بەڕێکەوت نەبووە یـان بارودۆخێک بۆی هێنابێتە پێشـــەوە، بەڵکو لە تێگەیشـــتنی تەواوی بووە، کە خۆی لەدڵسۆزی بۆ دۆزی ڕزگاریخوازی گەلەکەی ئەدۆزێتەوە

٢٥٥ – حبیب تومي، م.س،ص٢١.

## بەشی دووەم: ڕۆڵی مستەفا بارزانی لەگەشەپێدانی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیدا

بزاڤی ڕزگـاریخوازی هەموو گەلان، پرۆســـەیەکی ئـابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسـی و کولتوری مێژووکرد بووە و ئاوێنەی یاسـاکانی گەشـەکردنی کۆمەڵایەتی بووە. بــارزانیش بەرهەمێکی ئەو بــارودۆخە مێژووییە کۆمەڵایەتییە بووە، وەک ســەرکردەیەکی مێژووییش، کاریکردۆتە ســەر هەڵومەرجە کۆمەڵایەتییەکە. بۆیە ئەو جوڵانەوە نەتەوەییە لە بازنەی بزاڤێکی شـــۆڕشـــگێری پێشـــکەوتنخوازی دژ بە داگیرکاری و دەرەبەگایەتی و کۆنەپەرستی قەتیس نەبووە، بەڵکو هاوپەیمانی بەهێزی جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی گەلانیش بووە[٢٥٦]. لەئـامـانجە نەتەوەییەکانیشـــیدا، نەک دوژمنایەتی گەلی عەرەبی لەعێراق نەکردووە، بەڵکو پشـــتی بەخەباتی دادپەروەرانە بەستووە و لە دژی پاشکۆیەتی ئیمپریالیزم و بیرە کۆنەپەرستییەکانی، لەگەڵ خەباتی نیشـــتمانی عێراق هاوتەریب بووە[٢٥٧]. مســـتەفا بارزانی لەســـەرەتای بەرپرســـیارەتی مێژوویی خۆیدا وەک ڕێبەرێک، ڕۆڵی دیاری لە فۆرمەڵەکردنی ئەو بزاڤە نەتەوەییە بینی بەو شێوازەی لەخوارەوە باسی دەکەین:

### تەوەری یەکەم: پێکهێنان و سەرکردایەتیکردنی ڕێکخراو و دامەزراوە سیاسییەکان

بزووتنەوەی ڕزگــاریخوازی کوردی، بەچەنـد قۆنــاغێکی مێژوویی جیــاواز لەیەکتری تێپەڕیوە، کە هەریەک لەم قۆناغانە، خاوەنی ســـیما و تایبەتمەندی خۆیان بوون، بەگشـــتی تا ئەو قۆناغەی مســـتەفا بارزانی ڕێبەرایەتی کردووە، دیارترین تـایبەتمەنـدییەکـانی ئەوەبووە، کە پێکهـاتەکەی لە چوارچێوەی هێزێکی دەرەبەگی و هۆزایەتی خاوەن ســـەرکردە و ڕێبەرێکی تەقلیدیدا بوو، بەبێ بوونی هیچ دەســـتەیەک یان ڕێکخستنێکی سیاسی[٢٥٨]. بەڵکو بزاڤەکە مۆرکی ناوچەیی پێوە دیاربوو، بێگومان هۆکاری ســـەرەکی قەتیســـبوونی ئەو شـــۆڕش و ڕاپەڕینانەی کورد لە ســـنوور یان

---

٢٥٦ – بڕوانە: گەلی کورد دۆستی گەلانە، خەبات(ڕۆژنامە)، ژ(١٧٧)، ١ی ئاداری ١٩٦٠، ل١؛ شێرکۆ فەتحوڵا عومەر، س.پ، ل١٤٠.

٢٥٧ _د.أسماعيل حصاف، المسألة الكردية في العلاقات الدولية في مرحلة مابعد الحرب العالمية الثانية، أربيل،٢٠٢٢،ص٧١؛ دەنگی کوردستان(گۆڤار)، ژ(١)، کانوونی دووەمی ١٩٧٥، ل٢٠.

٢٥٨ – بڕوانە: د.عبدالرحمن قاسملو، كردستان والكرد(دراسة سياسية و أقتصادية)، ط٢، ت: ثابت منصور، د. غانم حمدون، تحقيق: حسين فيض الله الجاف، بنکەی ژین، السليمانية، ٢٠٠٨، ص٩١.

ناوچەیەکی دیاریکراو، دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ئەو کەلێن و بۆشـــاییەی لە ئەنجامی نەبوونی باڵی سـیاسـی و هێزی سـەربازی ڕێکخراو دروسـت بووە[٢٥٩]. ئەمانەش بە خاڵی لاوازییان دادەنرێ و هۆکاری ســـەرەکی شـــکســـت و بەردەوام نەبوونیان بووە[٢٦٠].

بەپێی شــیکاری مێژوونووس ســـەعدی هەروتی لە پۆلێنکردنی قۆناغەکانی ئەو بزاڤە نەتەوەییە، تەنانەت لە ســـەرەتاکانی قۆناغی ســـێیەمدا، کە پارت و ڕێکخراوە ســیاســـییەکان ڕێبەرایەتیان کرد[٢٦١]، هەمیشـــە بنەما ســـەرەکیەکانی، کە کۆڵەگە و پێویســـتی ســـەرەکی ســـەرکەوتن و بەردەوامی جوڵانەوەکان بوون، بەتایبەتی (ڕێبەرێکی نەتەوەیی و باڵەکانی سـیاسـی و سـەربازی ڕێکخراو) لە هیچ یەکێک لەو بزاڤە نەتەوەییانە بەیەکەوە دەســـتەبەر نەبوون، تا دەرکەوتنی مســـتەفا بارزانی و ڕۆڵبینینی وەک ڕێبەر و پێشـــەوای بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی لە باشـــووری کوردســـتان. ئەو هەرســـێ بنەما ســـەرەکییەکانی لەپێشـــەوە ئاماژەمان پێکرد، لە چوارچێوەی شـۆڕشـێکی جەماوەری گشـتگیردا کۆکردنەوە[٢٦٢]. لەسـەر ئەم بنەمایە، دەکرێ بڵێین ئەو ماوەیەی مسـتەفا بارزانی ڕێبەرایەتی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی کرد، کە دەکەوێتە نێوان ســـاڵانی (١٩٤٣ _ ١٩٧٩)، لەمێژووی بزاڤەکەدا بەخـاڵی وەچەرخـان دادەنرێ، بەو هۆیەوە (دینیس چـاپمـان-Dennis P. Chapman)ی گەورە ڕاوێژکاری ســـەربازی ئەمریکا، مســـتەفا بارزانی بە" باوکی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کوردی لە عێراق" دەناسێنێ[٢٦٣].

---

٢٥٩ _ بروانە نامەی ژمارە(٩)ی حیزبی هیوا بۆ بارزانی لە ڕێککەوتی ٣٠ی کانوونی دووەمی ١٩٤٥، لە: محەمەد عەلی سولتانی، بارودۆخی سیاسی، کۆمەڵایەتی و مێژوویی عەشیرەتی بارزان، و: کامبیز ئیبراهیم زادە(زەردەشت موکریانی)، مهاباد، ١٣٩٩ش ، ل١١٦.

٢٦٠ – بروانە: د.اسماعیل محمد حصاف، کوردستان و المسالة الکوردیة، مؤسسة موکریاني للبحوث والنشر، أربیل، ٢٠٠٩،ص ص١٥١-١٦٦.

٢٦١ – لەبارەی قۆناغەکانی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی بروانە: د.سەعدی عوسمان هەروتی، بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ل٣٦-٧٢.

٢٦٢ – بروانە: هلبین محمد أحمد المزوري، م.س، ص١٥١- ١٥٦.

263 –Dennis P. Chapman, Security Forces of the Kurdistan Regional Government, United States, 2009, p.41.

بارزانی لەگەڵ دەرکەوتنی وەک ڕێبەر و سەرکردەی ڕاپەڕینی دووەمی بارزان و لە قۆناغی دواتریش، لەڕێگای ئەو لێکتێگەیشتنەی لەگەڵ پارت و ڕێکخراوە سیاسیەکانی کوردستان دروستیکرد، هەوڵی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانەی داوە. دوای ئەوەی حزبی هیوا و حزبی خۆیبون[264] و کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد(ژ.ک)[265] بە دەربڕینی هاوسۆزی و پشتگیریکردن لە ڕاپەڕینی دووەمی بارزان وەک جووڵانەوەیەکی نەتەوەیی، مستەفا بارزانیان بە ڕێبەری کورد بۆ ئەو قۆناغە مێژووییە پەسەند کرد[266]. لە نموونەی ئەو هەڵوێستەشیان ئەو بابەتە بوو کە لە ژمارە دووی گۆڤاری نیشتمانی زمانحاڵی کۆمەڵەی (ژ.ک) بە خەتێکی درشت بڵاویانکردەوە کە:" ئەم جەنگەی سەرۆکی گەورەی کورد مەلا مستەفا بارزانی هەڵیایسیاندوە، ئیختیلالێکی میللی کوردە"[267]، دواتر هەر لەهەمان ساڵ ئەو کۆمەڵەیە لەنامەیەکیدا بەناوونیشانی" بۆ جەنابی زەعیمی ئازادی مەلا مستەفای بارزان"، داوایان کرد بارزانی ڕاپەڕینەکە بکاتە ڕاپەڕینێکی سەرتاسەریی کوردستان و هێزێکی یەکگرتووی سەربازی ڕێکبخات لەژێر فەرماندەیی خۆیدا و کۆنگرەیەکیش ببەستێت

---

٢٦٤ – خۆیبون: حیزبێکی سیاسی کوردی بوو، لەساڵی ١٩٢٧ دامەزراوە. ڕۆڵی گرنگی لە جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردیدا بینیوە، بەتایبەتی لە ڕێکخستن و سەرکردایەتیکردنی ڕاپەڕینی ئارارات لە ساڵی ١٩٣٠. شیاوی باسە ئەم کۆمەڵەیە لە ساڵی ١٩٤٣ ئاڵای کوردستانی ناردووە بۆ مەلا مستەفا بارزانی ، بۆ ئەوەی لە ڕاپەڕینی دووەمی بارزان لەسەر چیاکانی باشووری کوردستان هەڵیبکات. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم کۆمەڵەیە و پشتیوانی لە ڕاپەڕینی دووەمی بارزان، بڕوانە: د.اسماعیل محمد حصاف، تاريخ كردستان سوريا المعاصر(١٩١٦-١٩٤٦)،ج١، أربيل،٢٠١٧، ص ص٣٠١-٣١٤؛ د. بلەچ شيرگوه، القضية الكردية- ماضي الكرد و حاضرهم( جمعية خويبون الكردية الوطنية)، النشرة الخامسة، رابطة كاوا للثقافة الكردية، دار الكتاب، بيروت،١٩٨٦،ص ص١٠٧-١١١.

٢٦٥ – کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد(ژ.ک): کۆمەڵێکی بچووک لە ڕوناکبیران و ڕۆشنبیران و کاسبکارانی شاری مەهاباد کە ژمارەیان(١٥) کەس بوو لە ١٦ی ئابی ١٩٤٢ لە نزیک چەمی سابلاخ لە باغی(حاجی داود) کۆبوونەوە و ئەم ڕێکخراوەیان پێکهێنا. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مەهدی محەمەد قادر، پێشهاتە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق(١٩٤٥-١٩٥٨)، بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٥٦-٦٣.

266 -Nagel Joane, the Conditions of Ethnic Separatism: The Kurds in Turkey, Iran, and Iraq, California, May 1978, p.24.

٢٦٧ – نیشتمان(گۆڤار)، ژ(٢)، ساڵی یەکەم، خەزەلوەری ١٣٢٢ش،ل١٨؛ وەرگیراوە لە: نیشتمان بڵاوکراوەی بیری کۆمەڵەی ژ.ک، ئامادەکردنی: عەلی کەریمی، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٨،ل٨٩.

بۆ دامەزراندنی دەستەی سەربازی و دیاریکردنی ئەرک و کاری هەموو لایەک[٢٦٨].
بەم شێوەیە ئەندامانی کۆمەڵەی ناوبراو، پشتگیری خۆیان بۆ ڕاپەڕینی دووەمی بارزان و مەلا مستەفا وەک ڕێبەری کورد دووپات کردەوە[٢٦٩].

ئەو پاڵپشتییانەی هەبوون، هاوکاربوو بۆ ئەوەی بارزانی هەوڵ بۆ دروستکردنی هێزێکی سەربازی ڕێکخراو بدات، بە سوود وەرگرتن لەتوانا و شارەزایی ئەو ئەفسەرە ئازادیخوازانەی، کە لەنێو حزبی هیواوە پەیوەندیان بە ڕاپەڕینی دووەمی بارزانەوە کرد[٢٧٠]. بەئامانجی دوورکەوتنەوە لەو پێکهاتە سەربازییە کلاسیکییەی لەپێشووتر پشتی پێ دەبەسترا، ئەمەیان دواتر لەتەوەری داهاتوو ووردکاری زیاتری لەسەر دەخەینەڕوو. ئەوەی وەک کەلێن و بۆشایی مایەوە، نەبوونی باڵی سیاسی جولانەوەکەی بوو، کە لەڕێگای ئەنجامدانی ڕێکاری سیاسی پەیوەست بەو بابەتە، هەوڵی چارەسەرکردنی داوە، وەک لێرە بەدوا باسی دەکەین:

### باسی یەکەم: دامەزراندنی لێژنەی ئازادی

دوای چارەسەرکردنی دوو لە توخمە سەرەکیەکانی ڕێبەرایەتیکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی، ئەمجارە بارزانی پێکهێنانی باڵی سیاسی بۆ جولانەوەکەی، وەک بەرنامە و ستراتیژی سیاسی سەیرکرد، ئەو هەوڵەشی وەک باسمانکرد لەدوای پەیوەندیکردنی ژمارەیەک لە ئەفسەرە ئازادیخوازەکانی حزبی هیوا دەستپێکرد[٢٧١]، هەرچەندە بەو ڕادەیە نەبوو، کە بتوانێ ڕێکخستنێکی سیاسیان لێ

---

٢٦٨ – بروانە: نەوشیروان مستەفا ئەمین، حکومەتی کوردستان (ڕێبەندانی١٣٢٤– سەرماوەزی ١٣٢٥) کورد لەگەمەی سۆڤیێتی دا، چ٣، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان، سلێمانی ، ٢٠٠٧، ل٨٣.

269 -ED161813: The Conditions of Ethnic Separatism: The Kurds in Turkey, Iran, and Iraq, 1978.p.24. https://eric-ed-gov.translate.goog/?id=ED161813.

٢٧٠ – ئەفسەرانی ئازادیخوازی ئەندامی حیزبی هیوا ئەوانەی پەیوەندیان بە بارزانی کرد دیارترینیان بریتی بوون لە عیزەت عەبدولعەزیز خەڵکی (ئامێدی)، مستەفا خۆشناو خەڵکی (بیتواتە)، عەبدولحەمید باقر خەڵکی (خانەقین) و لەعەشیرەتی (لور)، محەمەد مەحمود قودسی خەڵکی (سلێمانی)، ئەحمەد ئیسماعیل خەڵکی (هەولێر)، شەوکەت نعمان خەڵکی (ئامێدی)، حەفەزوڵلا ئیسماعیل خەڵکی (ئاکرێ)، ئەمین ڕەواندزی، پاشان میرحاج ئەحمەد ئاکرەیی و ماجد عەلی و سەعید عزیز شەمزینی و سەعید عەبدوڵلا پەیوەندیانکرد. بروانە: محەمەد عەلی سوڵتانی، س.پ،ل١١٢؛ شێرکۆ فەتحوڵا عومەر، س،پ، ل٩٢.

٢٧١ – بروانە: عبدالرحمن قاسملو، م.س، ص٨٨.

پێک بهێنێ[٢٧٢]. بەڵام لە ( ١٥ی کانونی دووەمی ١٩٤٥ ) ڕێکخراوێکی بەناوی ( لیژنەی ئازادی) دامەزراند[٢٧٣].

دەســـتەی دامەزرێنەرانی لیژنەی ئازادی[٢٧٤]دوای هەڵبژاردنی مســـتەفا بارزانی وەک ســـەرۆکی ڕێکخراوەکە و نووســـینی مەرامنامە و پێڕەوی ناوەخۆیی، ناوەندی ئۆپراســـیۆنی ســـەربازییان بەشـــێوەیەکی کاتی لە بارزان پێکهێنا، یەکەم داواکاری خۆشـــیان بەشـــێوەیەکی فەرمی ڕاگەیاند، کە بریتی بوو لە ئازادکردن و ئۆتۆنۆمی کوردســـتانی عێراق[٢٧٥]. وێڕای جەختکردنەوەیان لەســـەر پێویســـتی دامەزراندنی لەشکری شۆڕشگێری کوردستان[٢٧٦].

لیژنەی ئـازادی دوای دانـانی پلان و بەرنـامەکـانی، کـارەکـانی خۆی لە پێنـاو ڕزگارکردنی کوردستانی عێراق بەڕێکاری سیاسی و ئاشتیخوازانە دەستپێکرد, بە بەستنی پەیوەندی لەگەڵ حزبە ئازادیخوازەکانی کوردستان و ناردنی داخوازینامە بۆ نوێنەرانی ســـیاســـی وڵاتانی بیانی و بانگەشـــەکردن بۆ ڕاپەڕین لە ڕێگای گۆڤار و بڵاوکراوەکان و ڕووبەڕووبوونەوەی ســیاســەتە دژەکانی حکومەتی عێراق بەرامبەر بە کورد و ڕێکخستن و ئامادەکردنی هێزە چەکدارەکان[٢٧٧]، سەرەڕای هەموو ئەمانە، نەیتوانی کەلێنی نەبوونی ڕێکخســـتنێکی ســـیاســـی لەنێو جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردی پڕ بکاتەوە، لەبەرئەوەی پێکهاتەی سەرکردایەتی لیژنەی نێوبراو، پێکهاتەیەکی ســەربازی بوو نەک سیاسی، بەجۆرێک ڕێکخراوەکە مۆرکی ســەربازی بەســەریدا زاڵ بوو، بۆیە بۆ کاری ڕێکخراوەیی سوودی لێ وەرنەدەگیرا.

---

٢٧٢ – فريد أسسرد، أصول العقائد البارزانية، منشورات مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، السليمانية، ٢٠٠٨، ص٢٠٥.

٢٧٣ – عبدالفتاح على البوتاني، منطقة بادينان(١٩٢٥_ ١٩٧٠)...،ص١٢٠.

٢٧٤ – دەستەی دامەزرێنەرانی لیژنەی ئازادی جگە لە مستەفا بارزانی کە سەرۆکی ڕێکخراوەکە بوو، پێکهاتبوون لە: عیزەت عەبدولعەزیز، مستەفا خۆشناو، محەمەد محمود قودسی، ئەحمەد ئیسماعیل، شەوکەت نعمان، حەفەزوڵا ئیسماعیل. محەمەد عەلی سوڵتانی، س.پ،ل١١٢.

٢٧٥ – هـ. س، ل١١٣.

276 – Gareth R.V. Stansfield, Iraqi Kurdistan: Political Development and Emergent Democracy, London, 2003, p.62.

٢٧٧ – د. ئیسماعیل ئەردەلان، نهێنییەکانی بارزان، و: ڕەنجبەر شەوکەت پیرانی، هەولێر، ٢٠٢٢، ل٣٦.

حزبی هیوا ســـەبارەت بەم بابەتە، لەنامەیەکدا کە لە (٣٠ ی کانونی دووەمی ١٩٤٥) بۆ مســـتەفا بارزانی نووســـی، ڕوونیکردەوە کە:" بزاڤگەلی ئازادیخوازانەی نیشـــتمانی، دەبێ ســـەرۆکێک و دوو باڵی بەهێزی هەبێ: باڵێکی ســـیاســـی و باڵێکی ســـەربازی ڕێکخراو. ئەرکی باڵی ســـیاســـی ئەوەیە کە هەڵی شـــۆڕش، داخوازییەکان، هەڤاڵەکان[مەبەســـتی هەواڵە]، خواردەمەنی و پێوەندییەکان برەخســـێنێ و باڵی سەربازی ڕێکخراویش دەبێ گەلەکەی بە شەڕ و شیر و سەرنێزە نیشان بدا،... لامان وایە کە باش ئەوەیە، دەبێ هەردووک لەژێر ئیدارەیێکی ڕێکدا بین. لێرەدا خالێکی گرینگ دێتە بەرچاو و ئەویش پێوەندی دۆســـتانە و بەهێز لەنێوان ئێمە و ئێوەیە. بەجۆرێک بەردەوام ئاگامان لە کارەکانی یەکتری بێ، هەر بۆیە پێمان باشـــە ناوەندی حزبی هیوا لەلای ئێوەبێ"[٢٧٨].

بارزانی لە (١٥ی شـــوباتی١٩٤٥) وەڵامی حزبی هیوای بەنامەیەک دایەوە و لە ژێدەرێکدا دەقی نامەکە بەم شـــێوەیە هاتووە" ئەوەی کە ویســـتبوتان کە ناوەندی حزبی بۆ دەڤەری ئێمە ڕابگوێزرێ، وای لێ تێگەیشـــتین کە گشـــت ڕوناکبیرانی کوردســـتانێ متمانەیان پێ کردووین و دڵنیابوون کە ئێمە بزاڤێکی فیداکارین و ئاواتمان ئازادی کوردی هەژار و بێ پەنا لە چنگی دوژمنانی درندە و زۆرداره. گومان نییە کە پێویســـتی شـــۆڕشـــێکی نیشـــتمانی بۆ ڕزگاری گەلەکەی، تەنیا گیان فیداییە و ئێمە ئەم هەســـتەمان لەناخی دایە و ئەم بزاڤی فیداکارەین بۆ وەدەســـت خســـتنی ئازادی، ئامادەین گیانمان فیدا بکەین. ئێمە هەریەکە و لەناوچەیێکی کوردستانێ بڵاودەبینەوە هەتا چالاکییە پێویستەکان دەست پێ بکەین، کەوایە وامان پێ باشە ناوەندی حزبی هیوا هەر لە (D)[٢٧٩] بمێنێتەوە و داوامان لە گشت ئەندامە بە وەجەکانی حزب و لقەکانی ئەوەیە کە لەناوەندی حزب نا ئاگادار نەبن، ... داوا لەم برایانە دەکەین ئەگەر کوو بیانهەوێ، ڕاستەوخۆ هاوکاریمان بکەن، هەر ئێستاکە بێنە ئێرە، هەتا بەدابەشـــکردنی ئیش و کارەکان یارمەتیدەرمان بن...بەباشـــی ئاگادارین کە ســـیاســـەتی ئەمڕۆی دەوڵەت ئەوەیە کە دۆســـییەی کوردســـتان و دۆســـییەی بارزانی لێک جیابکاتەوە، هەر بۆیە لە گشـــت کوردســـتانێ دەنگۆ و بیروبڕوای هەڵەی بڵاودەکاتەوە و بانگەشـــەی نەرێنی دەکا. لەم پێوەندیەدا ئێوە بەباشـــی ئاگادارن کە

٢٧٨ – محەمەد عەلی سوڵتانی، س،پ، ل١١٦.

٢٧٩ – پیتەکە مەبەستی شاری بەغدایە، ئیسماعیل ئەردەلان ، س. پ ، ل٤٣.

سیاسەت و ڕای ( لیژنەی ئازادی) ئەوەیە کە کوردستانی ڕزگار بکا. پێویستە بۆ بەرگریکردن لەم بانگەشـە ژاژاوییەی دەوڵەتی لە ناوەندی حزبی هیوا چالاکییەکان بەگوڕتر بکرێن و ئەم کارە ڕەشانە بۆ خەڵکی ڕوون بکرێتەوە..و بەربەرەکانی لەگەڵ دوژمنان بەهەر شێوەییک باشە بکرێ"[280].

بارزانی لەو وەڵامەدا وێڕای نیشـاندانی ئامادەیی و پشـتگیری خۆی بۆ پێشنیازەکەی حزبی هیوا، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ هێڵە گشتییەکانی جۆر و شێوەی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولای دیاریکرد، دوای چەند ڕۆژێک، ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری لیژنەی ئازادی لە (٣ ی ئاداری١٩٤٥) بەنامەیەکی دیکە، دووپاتی پشتگیری خۆیان بۆ هەڵوێستەکەی بارزانی بۆ حزبی هیوا و داخوازییەکەی ئەوەی دوایی، کردەوە و نووسیان "بزاڤەکەیان ، بزاڤێکی کوردی نیشتمانییە و سەر بە هیچ حکومەتێکی دەرەکی نییە. ئاوات و خولیاکانی سەرۆکی مەزن[مەبەستیان مستەفا بارزانییە]، ئاواتی هەر کوردێکی دڵسۆز و نەتەوەپەروەرە، کە بە ئاماژەیێکی لیژنەی ئازادی و حزبی هیوا بۆ کورد و کوردستان تێدەکۆشێ و حەولی بۆ دەدا. ئاواتی لیژنەی ئازادی و حزبی هیواش ڕزگارکردنی کورد و کوردستانە"[281]. ئەم نامەیەش نیشانەیەکی ڕوون و ئاشکرای ئامادەگییە بۆ بەستنی هاوپەیمانی سیاسی لەگەڵ حزبی هیوا بۆ سەرکردایەتیکردنی ڕاپەڕینەکە، بە ڕێبەرایەتی مستەفا بارزانی.

بەم شێوەیە ڕاپەڕینی دووەمی بارزان ئەگەرچی لە سەرەتادا مستەفا بارزانی وەک سەرکردەیەکی تەقلیدی ناساند[282]، بەڵام دواتر حزبی هیوا ڕۆڵێکی کاریگەری تێدا بینی بەهەماهەنگی لەگەڵ دەستەی دامەزرێنەرانی لیژنەی ئازادی، بۆ ئاوەژۆکردنی ئاراستەی جوڵانەوەکە، لە بزاڤێکی ناوچەیی بەرتەسک، بۆ بزاڤێکی سیاسی بەرفراوانی نیشتمانی و نەتەوەیی[283]. بەگوتەی (ئەدگار ئوبلانس)ی ڕۆژنامەنووسی بەریتانی ئەم هەماهەنگییەی نێوان پارتێکی سیاسی لەگەڵ هۆزێک لە مێژووی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیدا یەکەم نمونە بوو پێشتر ڕووی نەدابوو[284].

بەڵام بە بۆچوونی توێژەر ئەو هاوپەیمانەتییەی حزبی هیوا لەگەڵ کەسی مستەفا

---

٢٨٠ – محەمەد عەلی سوڵتانی، س،پ، ل ل١١٨-١٢١.

٢٨١ – محەمەد عەلی سوڵتانی، س،پ، ل١٢٦.

٢٨٢ – بروانە: سەعدی هەروتی،س.پ، ل ٦٠.

٢٨٣ – بروانە: عزيز حسن عزيز البارزاني، م.س، ص٢٠٦.

284 -Edgar O'Ballance, the Kurdish Revolt (1961-1970) ,London,1973, 47.

بارزانی وەک فەرماندەیەکی سەربازی خاوەن پاشخانێکی نەتەوەیی و جەنگاوەرانی بوو، نەک هۆزێک. لە بەرئەوەی بارزانی ڕێگاپێدانی هاوپەیمانەتییەکەی لە هۆزەکەیەوە وەرنەگرتبوو، بەڵکو خواستێکی کەسی خۆی بوو.

کاربەدەستانی عێراق لەڕێگای دەزگا هەواڵگرییەکانیانەوە هەستیان بەو گۆڕانە کرد، کە لە ڕەوتی بەرێوەچوونی جوڵانەوەکە ڕوویدا. بۆیە لە یەکێک لە ڕاپۆرتەکانی ئەو دەزگایە، کە بۆ وەزارەتی ناوەخۆ بەرزی کردەوە، سەرنجی خۆیان بەچەند دێڕێکی کورت دەربڕی و ڕایانگەیاند" جوڵانەوەکە زیاترە لەوەی وەک هەڵگەڕانەوە یان یاخیبوونی دەستەیەکی هۆزگەرایی سەیر بکرێ، بەڵکو جوڵانەوەکە تێکەڵاوی سیاسەت بووە، بەشێوەیەک هەستی کوردانە لەڕووی گەنج و پیرەکانیاندا بە ئاشکرا دەبینرێ"[٢٨٥].

بەم شێوەیە دوای ئەو لێکتێگەیشتنەی لەنێوان مستەفا بارزانی و حزبی هیوا دروستبوو[٢٨٦]. ئەو ڕێکخراوەی دوایی، یەکێک لە باڵە سەرەکیەکانی ڕاپەڕینی دووەمی بارزانی پێکهێنا[٢٨٧]، لەڕێگای دابینکردنی پشتیوانی سیاسی و میللی[٢٨٨]، و کۆمەککردنی جوڵانەوەکە لە ڕووی دارایی و ڕێکخستنی پەیوەندییەکان[٢٨٩].

ئەو هاوپەیمانەتییەی مستەفا بارزانی لەو ڕاپەڕینەدا لەگەڵ حزبی هیوا ئەنجامی دا، بۆ دابینکردنی بەشێکی پێداویستیەکانی جوڵانەوەکە. دواجار بە دەستێوەردانی زلهێزێکی وەک بریتانیا و بەشداریکردنی لە هەڵمەتی سەربازی بۆ سەر دەڤەری بارزان، کۆتایی پێهات و ڕاپەڕینەکە سەرکوتکرا[٢٩٠].

لەئەنجامی پەڕینەوەی بارزانی و ئەندامانی دیکەی لێژنەی ئازادی، کە زۆربەیان وەک پێشتر ئاماژەی پێکرا، لەئەفسەرانی ئازادیخواز بوون، لەگەڵ خاوخێزانە

---

٢٨٥ – د.ك.و، البلاط الملكي،(٣١١/٤٣٣٣)، أوراق متفرقة/ البارزانيون(١٩٤٣– ١٩٤٩)، ص٢.

٢٨٦ – مسعود بارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية( ثورة بارزان ١٩٤٣–١٩٤٥)، كردستان، ١٩٨٦، ص ص٥٣–٦١.

٢٨٧ – بروانە: هلبين المزوري، م.س، ص١٥٦.

٢٨٨ – سەعدی هەروتی، س.پ، ل٦١.

٢٨٩ – بروانە: عزيز البارزاني، م.س، ص١٥٦.

٢٩٠ – بروانە: د.ك.و، البلاط الملكي،(٣١١/٤٣٣٣)، اوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣–١٩٤٩)، تقرير عام و موجز عن حركات بارزان سنة ١٩٤٥، كتاب رقم (د/١٥/١/٢٠٥) في ١١ كانون الثاني ١٩٤٦، الحكومة العراقية، وزارة الدفاع، دائرة ألاركان العامة(شعبة الحركات)، ص٢.

بارزانییەکان بۆ ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردســـتان و بەشـــداریکردنیان لە نۆبەرەی دەســـەڵاتی ســـەربەخۆی کوردی لە مەهاباد کە لە (کانونی دووەمی١٩٤٦) پێکهات، دواتریش لەپاراســتن و بەرگریکردن لە کۆماری کوردســتاندا، ڕۆڵی گەورەیان بینی. بەهۆی تێکەڵبوونیان بەهێزە چەکدارەکانی کۆمار لەژێر سەرپەرشتی و سەرکردایەتی مســـتەفا بارزانی، بەم هۆیەوە قۆناغێکی نوێ لە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی هاتە پێشەوە[٢٩١].

## باسی دووەم: دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کورد

بەکۆتـاییهـاتنی ڕاپەڕینی دووەمی بـارزان، جـارێکی دیکە بزاڤی ڕزگـاریخوازی کوردی لەباشـووری کوردسـتان، ڕووبەڕووی هەمان ئاسـتەنگی پێشـوو بویەوە کە خۆی لە نەبوونی باڵی سیاسی بزاڤەکەدا دەبینییەوە، وێڕای مانەوە و بەردەوامبوونی هەردوو بنەمـاکـانی دیکەی، کە بریتی بوون لە هەبوونی ڕێبەرێکی نەتەوەیی وەک (مســتەفا بارزانی) و باڵە ســەربازییەکەی، کە ئەفســـەرە ئازادیخوازەکان و بەشـێکی ڕۆڵەی هۆزەکان نوێنەرایەتیان دەکرد. هەربۆیە دوای دامەزراندنی حیزبی دیموکرات لە ڕۆژهەڵاتی کوردســـــتان لە (١٦ی ئابی١٩٤٥)[٢٩٢]، بیرۆکەی دامەزراندنی پارتێکی هاوشـــێوە، لە هزری بارزانیدا گەڵاڵە بوو[٢٩٣]. وەک هەوڵێک بۆ ڕێکخســـــتنەوەی جوڵانەوەکە و پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە، لە شوباتی ١٩٤٦ دەستەی دامەزرێنەرانی (پارتی دیموکراتی کورد)[٢٩٤]بەســەرۆکایەتی مســتەفا بارزانی و ئەندامیەتی هەریەک لە

---

٢٩١ – کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا، و: حەمە کەریم عارف،چ٦، هەولێر،٢٠١١، ل٢٢٥.

٢٩٢ – عبدالرحمن قاسملو، م.س، ص٩٣.

٢٩٣ – د.ئەحمەد حەمەدئەمین، پارتی دیموکراتی کورد- عێراق – بەرەی پێشکەوتوو(١٩٥١-١٩٥٦)، هەولێر، ٢٠١٧، ل١٢.

٢٩٤ – سەرەتا ئەو حیزبە ناوی پارتی دیموکراتی کورد_ عیراق بوو، پاشان لە کۆنگرەی سێیەمی کە لە ٢٦ی کانوونی دووەمی ١٩٥٣ بە نهێنی لە کەرکوک ئەنجامدرا، ناوەکەی گۆڕدرا بۆ ( پارتی دیموکراتی کوردستانی_ عیراق). لەدوای مۆڵەت وەرگرتنی لە ٩ی شوباتی ١٩٦٠ گۆڕانێکی دیکەی کەم بەسەر ناوەکەیدا هات و بووە( پارتی دیموکراتی کوردستان). بروانە: جلال طالباني، كردستان والحركة القومية الكردية، ط١، منشورات النور، بغداد، ١٩٧٠، ص١٠١.

(هەمزە عەبدوڵڵا، میرحاج ئەحمەد، نوری ئەحمەد تەها[٢٩٥]، مستەفا خۆشناو، محەمەد مەحمود قودسـی، خەیروڵڵا عەبـدوڵکەریم، عزەت عەبـدولعەزیز)، لە مەهـابـاد پێکهات[٢٩٦].

زۆرینەی ئەندامانی دامەزرێنەری ئەو پارتە لە باڵە سـەربازییەکەیەوە بوون، بۆیە لە پێناو دەسـتەبەرکردنی باڵی سـیاسـی، جارێکی دیکە بارزانی بیری لە دروستکردنی هاوپەیمانی سیاسی یان یەکگرتن لەگەڵ پارت و کۆمەڵە سیاسیەکانی ناوەخۆی باشـووری کوردسـتان کردەوە، لەنمونەی پارتەکانی (شـۆڕش[٢٩٧]و ڕزگاری[٢٩٨]ولقی (ژ.ک) لە سلێمانی[٢٩٩]. بۆ پێکاندنی ئەم ئامانجەش، بارزانی لە بەهاری ١٩٤٦ هەمزە عەبدوڵڵای وەک نوێنەری خۆی لەمەهابادەوە ڕەوانەی لای ئەو پارت و ڕێکخراوە سیاسییانە کرد[٣٠٠]. دوای پشتیوانی ئەوانەی دوایی لەو بیرۆکەیە، یەکەم کۆبوونەوەی دامەزرانـدنی پـارتی دیموکراتی کورد لە (١٦ی ئـابی١٩٤٦) بە نهێنی

---

٢٩٥ – نوری ئەحمەد تەها: لە ٨ی ئابی ١٩٢١ لە دەرگەزین لە شاری سلێمانی لەدایک بووە. لە ٢٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٣٨ چۆتە کۆلێجی سەربازی و بەپلەی مولازم دەرچووە. ئەندامی حیزبی هیوا بووە. ساڵی ١٩٤٦ پەیوەندی بە پارتی دیموکراتی کوردستان کردووە. لە ڕۆژی ٢١ی ئایاری ١٩٩١ لە سەردەشت کۆچی دوایی کردووە. حیدر نجم عبد مراد، معجم ضباط ثورة أيلول ١٩٦١_١٩٧٥، م: د. أزاد سالم محمد، دهوک، ٢٠٢١، ص٤٦.

٢٩٦ – حبيب محمد كريم، تاريخ الحيزب الديمقراطي الكوردستان– العراق(في محطة رئيسية) ١٩٤٦–١٩٩٣،ط١، مطبعة خبات، دهوك، ١٩٩٨، ص٣٣.

٢٩٧ – حیزبی شۆڕش: لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ بەسەرۆکایەتی ساڵح حەیدەری دامەزراوە، لە بنجدا لقی کوردی ڕێکخراوی (یەکێتی تێکۆشین) بوو. بۆ زانیاری زیاتر بروانە: صلاح الخرسان، م.س، ص٦٥.

٢٩٨ – حیزبی ڕزگاری: پارتێکی نەتەوەپەروەری کوردی بووە و مەیلی کۆمۆنیستی هەبووە، ئامانجی وێڕای داواکردنی چاکسازی کۆمەڵایەتیی گشتی، دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی بووە، کە کوردی ئێران و عیراق و تورکیا و سوریا بگرێتەوە. بۆ زانیاری زیاتر بروانە: کەمال مەزهەر، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکوومەتی بریتانیادا، ب٢، هەولێر، ٢٠١٤، ل٩٩–١٠٠.

٢٩٩ – لقی (ژ.ک) لە باشووری کوردستان کە ئیبراهیم ئەحمەد سەرپەرشتی دەکرد، لە دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان لەسەرەتای ساڵی(١٩٤٧) هاتە ناو پارتی دیموکراتی کورد. دیفید مكدول، تاريخ الاكراد الحديث، ت: راج أل محمد، دار الفارابي، بيروت ، ١٩٩٦،ص٤٤٩؛ شێرکۆ فەتحوڵا عومەر، س.پ ل١٢٥؛ عمار علي السمر، شمال العراق ١٩٥٨– ١٩٧٥( دراسة سياسية)، المركز العربي للابحاث و دراسة السياسات، بيروت، ٢٠١٢، ص٢٩١.

٣٠٠ – نوري شاويس، من مذكراتي، من منشورات حيزب الشعب الديمقراطي الكردستاني، بغداد، ١٩٨٥، ص٣٦؛ دیفید مکدول، م.س، ص٤٤٨.

لەماڵی (سەعید فەهیم) لە بەغدا ڕێکخراو دەستەی دامەزرێنەرانی بەسەرۆکایەتی مستەفا بارزانی هەڵبژێردرا[٣٠١]، دوای هەڵوەشانەوەی ڕێکخراوەکانی شۆڕش و ڕزگاری و بەشداریکردنی کەسایەتییەکانی پێشووی ناو حیزبی هیوا لە باشووری کوردستان[٣٠٢].

دەستەی دامەزرێنەرانی پارتی لە دوای یەکەم کۆبوونەوەیان، ڕاگەیەنراوێکیان بۆ گەلی کورد بڵاوکردەوە، کە لەچاپخانەی کوردستان لە مەهاباد چاپکرا[٣٠٣]. لە ڕاگەیەنراوەکە بانگەشەیان بۆ هەموو نیشتمانپەروەران و کۆمەڵە کوردییەکان لە عێراق کرد، بۆ ئەوەی یەکبگرن و پشتگیری لەو پارتە کوردیە بکەن[٣٠٤].

حزبەکە دوای دامەزراندنی، لەبەندەکانی بەرنامەی خۆیدا، چەند ئامانجێکی ڕاگەیاند، وەک تێکۆشان لەپێناو ڕزگارکردنی عێراق لەژێر دەستی داگیرکەر و دوورخستنەوەی لە خەونی کۆنەپەرستان، لەپێناو بەدیهێنانی کۆمارێکی پەرلەمانی دیموکراتی و بەدەستهێنانی ئازادییە دیموکراتییەکان بۆ گەلانی عێراق، بە مسۆگەرکردنی مافی چارەی خۆنووسین بۆ گەلی کورد لە چوارچێوەی عێراقێکی یەکگرتوودا. بەرنامەی پارتی دووپاتکردنەوە و پێداگرتن بوو لەسەر پتەوکردنی برایەتی نێوان کورد و عەرەب و داوای خەبات و تێکۆشانی کرد، لەلایەن هەردوو نەتەوە دژ بە دوژمنی هاوبەش لەپێناو ڕزگارکردنی عێراق. ئەمە سەرەڕای چەندین ئامانجی ئابووری و سیاسی دیکە[٣٠٥].

---

٣٠١ – دەستەی دامەزرێنەرانی پارتی پێکهاتبوون لە ( مستەفا بارزانی– سەرۆک)، ( شێخ لەتیف شێخ مەحمودی حەفید– جێگری یەکەم)، ( کاکە حەمە زیاد ئاغا– جێگری دووەم)، ( هەمزە عەبدوڵڵا– سکرتێری لێژنەی مەرکەزی)، و ( میرحاج ئەحمەد، ساڵح عەبدوڵڵا یوسفی، دکتۆر جەعفەر کەریم، عەلی عەبدوڵڵا، عەبدولکەریم توفیق، ڕەشید عەبدولقادر، ڕەشید باجەلان، تەها محێدین مەعروف، مەلا سەید حەکیم خانەقینی، عەونی یوسف، عەبدولسەمەد محەمەد– یەدەگ) و چەند کەسێکی دیکە بوون. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج١، ط٢، كاوا للثقافة الكردية، بيروت، ١٩٩٧، ص٢١٧.

٣٠٢ – حبيب محمد كريم، م.س، ص٣٣.

٣٠٣ – ئەحمەد حەمەدئەمین، س. پ، ل١٢.

٣٠٤ – جلال طالباني، م.س، ص٨٩.

٣٠٥ – شێرکۆ فەتحوڵا عومەر، س.پ، ل١٣٠.

بەم شــێوەیە حزبێکی پێشــکەوتنخوازی کوردســتانی بۆ ســەرکردایەتیکردنی جوڵانەوەی ڕزگـاریخوازی کوردی بەهەردوو بـاڵە ســیاســی و ســەربازییە ڕێکخراوەکەی بەدیارکەوت، بەڕێبەرایەتی ســەرکردەیەکی نەتەوەیی، کە دروشــمی شۆڕشگێری و بەرگریکردن لە سروشتی دیموکراتی و جەماوەری خۆی کردبووە ئامانج. دواتر ئەو حزبە بەر لەوەی ڕۆڵی خۆی لە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیدا لە باشووری کوردستان بگێڕێ، کۆماری کوردستان لە مەهاباد، ڕووبەڕووی هێرش و پەلاماری ســوپای ئێرانی بویەوە و لەئەنجامیشــدا لە(١٧ی کانونی یەکەمی١٩٤٦) شاری مەهاباد کەوت و بارزانی و بەشێک لەو پێشمەرگانەی لەگەڵیدابوون، وەک لە پێشــتریش باســی لێکرا، بەهۆی ئامادەنەبوون بە خۆڕادەســتکردن بە حکومەتەکانی ئێران و عێراق[٣٠٦]، پەڕینەوە سنووری یەکێتی سۆڤیەت[٣٠٧].

## باسی سێیەم: پێکهێنانی حکومەتی کاتی کوردی لە سۆڤیەت

پەڕینەوەی بـارزانی و هەڤاڵەکـانی لە (حوزەیرانی١٩٤٧) لە ئێرانەوە بۆ یەکێتی سۆڤیەت[٣٠٨]، جارێکی دیکە ئەو سەرکردەی لە بنکە جەماوەریەکەی و باڵی سیاسی حزبەکەی دوورخســتەوە، بەم شــێوەیە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی لە نێوەخۆی باشووری کوردستان، نەیتوانی ئەو ڕۆڵە کاریگەرە بگێڕێ، بەبێ بوونی سەرکردە و باڵە سەربازییەکەی. لەلای خۆیەوە مستەفا بارزانی کەوتە ژێر کاریگەریی ئەو دۆخە نەرێنییە ســیاســییەی ڕووبەڕووی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی بوویەوە، بەهۆی لێکدابڕانی توخمەکانی لەیەکتری[٣٠٩].

لەو هەلومەرجەدا و لەپێناو دۆزینەوەی میکانیزمی گونجاو بۆ گێرانەوەی ڕۆڵی کاریگەریی بزاڤەکە لەسەر ڕەوتی ڕووداوە سیاسییەکان لە عێراقدا، دوای ماوەیەکی کەم لە چوونە ناو خاکی ســۆڤیەت، بارزانی توانی لەگەڵ کاربەدەســتانی ســۆڤیەت بگاتە ڕێکەوتنێک بۆ ڕێکخســتنی دامەزراوەیەکی سیاسـی و سـەربازی بە پاڵپشـتی

---

٣٠٦ – قنصلية العراق الملكية، تقرير، الرقم(٣/١/٣٣)، ١/ مارت/١٩٤٧، ص٣، في: د.ك.و، (٣١١/٧٣٧)، البلاط الملكي، المفوضية العراقية في طهران(١٩٤٦–١٩٤٩)،

٣٠٧ – کریس کۆچێرا، س.پ، ل٢٣٧.

308 -FIRAT SÖZERİ ,BELGE VE MEKTUPLARLA MELA MUSTAFA VE SSCB İLİŞKİLERİ,Kürt Tarihi, , Sayı(38), Ekim-Kasım-Aralık 2019 ,S.25.

٤– د. عبدالفتاح علي البوتاني، ملا مصطفى البارزاني قائد الثورة الكوردية و ملهمها، ص٢٣.

حکومەتی ئازەربیجان. دیارە ئەو حکومەتە ئامانجی سیاسی خۆی هەبوو لە پاڵپشتیکردنی ئەو پڕۆژەیە، لەمانەش دروستکردنی فشار لەسەر هەردوو حکومەتی ئێران وعێراق، بۆ سازشکردن بەرامبەر داخوازییەکانی ئەو سەردەمەی سۆڤیەت، کە بەشێکی پەیوەندی هەبوو بەو خواستەی هەیانبوو بۆ دوورکەوتنەوەی ئەو حکومەتانە لە پاشکۆیەتی و هاوپەیمانی لەگەڵ بەرەی ڕۆژئاوا، ئەمە سەرەڕای ئامانجیان لە دروستکردنی هەژموونی سیاسی و سەربازی لەناوچەکە[٣١٠].

ئەنجامی ڕێککەوتنەکەی بارزانی لەگەڵ حکومەتی ئازەربیجان، لە (١٩ی کانونی دووەمی ١٩٤٨) بووە هۆی دامەزراندنی حکومەتێکی کاتی کوردی لە باکۆی پایتەخت، کە پێکهاتەکەی بەشێکی لە کوردەکانی باشوور و بەشەکەی دیکەی لە کوردەکانی خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوون، کە پێکهاتبوون لە( مستەفا بارزانی- سەرۆک، میرحاج ئەحمەد ئاکرەیی، محەمەد نەجیب بەرواری، عەبدولڕەحمان موفتی ئامێدی، سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، شێخ سولەیمان بارزانی، عەلی محەمەد سدیق)، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش( سەید عەزیز سەید عەبدوڵڵا، ڕەحیمی قازی، مستەفا سەلماسی، حەسەن حیسامی، ڕەحمان گەرمیانی، سەید کەریم، کاک موراد)[٣١١].

سەرباری ئەوەش حکومەتی ئازەربیجان، دەرفەتی بۆ بارزانی و سەرکردایەتی نوێی کورد ڕەخساند، بۆ ئەوەی سوود لە ئێزگەی ئازەربیجانی میللی وەربگرن و هەروەها ڕەزامەندی نیشاندا بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی کوردی[٣١٢].

دامەزراندنی حکومەتی کاتی کوردی لە ئازەربیجان، لە نێوەندە سیاسییە جیهانییەکان دەنگدانەوەی هەبوو، بۆ وێنەش بەڵگەنامەیەکی حکومەتی فەرەنسا، لەژێر ناوونیشانی:" دامەزراندنی دەوڵەتێکی نوێی کوردی لەژێر چاودێری سۆڤیەتییەکان"، باس لەوە دەکات کە سۆڤیەت جاڕی دامەزراندنی حکومەتی کوردی لە ئازەربیجان دەدا. بەپێی ئەو بەڵگەنامە فەرەنسییە، ئەم حکومەتە لەلایەن سەرۆکی کورد مەلا مستەفا سەرۆکایەتی دەکرێ و بارەگای سەرکردایەتی لەم شارەدا دەبێ، کە لەوێدا لەلایەن کۆمەڵێک ئەفسەری سۆڤیەتی، چەند هەزار سوارەیەکی کورد

310 - Павел Судоплатов, Бывший источник، С.90. http:// loveread.me/ read book.

٣١١ - مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٩٣١- ١٩٥٨)، دهۆک، ١٩٩٨، ل١٩٨؛ زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، س.پ،ل١٩٤.

٣١٢ - مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٩٣١- ١٩٥٨)، ل١٩٨.

مەشـــق و ڕاهێنانیان پێ دەکرێ[٣١٣]. دیارە ئەو زانیارییانەی لەو بەڵگەنامەیەدا هاتووە، هەرچەنـدە لە بـاســـکردنی پێکهێنـانی دامەزراوە کوردییەکە دروســـتە، بەڵام لە وردەکـارییەکـانی دیکەی لە نیوەرۆکیـدا هـاتووە، گومـان لە ژمـارەی ئەو هەموو جەنگاوەرە کوردە دەکرێ، چونکە ئەوانەی لەگەڵ بـارزانی چوونە ســـۆڤیەت، بەو ژمارەیە نەبوون و لەپێشتر ئاماژەی پێکراوە.

لەلای خۆیەوە، کۆمســـیۆنی پادشـــایەتی عێراق لە تارانی پایتەختی ئێران، بە نووســـراوێکی فەرمی، کە بۆ وەزارەتی دەرەوەی حکومەتەکەی ڕەوانەکردووە، بەهەمان شـــێوە ئاماژە بە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لەشـــاری نەخجەوانی قەفقاسـیای روسـی دەکات، لەلایەن سـەرکردە کوردەکانی کە چوونەتە روسـیا بە پاڵپشتی حکومەتی سۆڤیەت. هەر لەو نووسراوەدا، نوێنەرایەتی حکومەتی عێراقی لە تاران، باسی لەوە کردووە ، حکومەتی سۆڤیەت ئێزگە و چاپخانەیەکی وەک هاوکاری بە گەورە پیاوانی کورد لە عێراق و تورکیا و ئێران داوە، بۆ ئەنجامدانی پروپاگەندەی سیاسی و گواستنەوەی هەواڵەکانیان. لەم سۆنگەوە نووسیویەتی:"ڕادیۆی (یەروان-یەریوان-ڤان) کە لەلایەن حکومەتی کاتی کوردیەوە سەرپەرشتی دەکرێت، بەردەوامە لە پەخشکردنی وتارەکانی لەسەر کورد و ڕابردوویان"[٣١٤].

ئەم هەنگاوە مەترســـییەکی زۆری بۆ حکومەتی ئێرانی دروســـتکرد، تەنانەت لە ئایاری ١٩٤٨ جوولەی بە چەند یەکەیەکی هێزە سەربازییەکانی خۆی لەتاران کرد بۆ ناوچەی ئازەربیجان، بە مەبەســـتی پاراســـتنی ســـنوورەکانی لەگەڵ ســـۆڤیەت، لەبەرئەوەی زانیارییان پێگەیشتبوو مستەفا بارزانی لەگەڵ ژمارەیەک لەچەکدارەکانی، لەسنووری ئێران نزیک بۆتەوە[٣١٥].

لەلایەکی دیکە سـەرۆک وەزیرانی ئێران محەمەد سـەعید مەراغی (١٩٤٨-١٩٥٠) لە ڕۆژی (١٣ی کانونی دووەمی١٩٤٩) نامەیەکی بۆ بالیۆزی سـۆڤیەت لەتاران نارد،

---

٣١٣ - بروانە بەڵگەنامەی ژمارە(١٣٣)، لە: کوردو کوردستان لەبەڵگەنامە...، ل ٣٣٥.

٣١٤ - دیارە حکومەتی عێراقی ئەو ڕێکخستنەی بە دامەزراوەیەکی کارگێری- سیاسی بینیوە، لەکاتێکدا دامەزراوەیەکی سیاسی- سەربازی بووە؛ بروانە: د.ک.و، البلاط الملكي،(٣١١/٧٣٧)،وزارة الخارجية، الدائرة السياسية، الشعبة الشرقية، رقم الكتاب:٤/٣١٣٣، ١٠/تشرين الاول/١٩٤٨، بۆ دەقی نووسراوەکە بروانە: پاشکۆی ژمارە(٥).

٣١٥ - د.ک.و، البلاط الملكي،(٣١١/٧٣٧)، المفوضية الملكية العراقية بطهران، أنباء عن أيران، الرقم(١٦٠/١/٢)، في ١٩٤٨/٥/٣٠،ص٢.

تیایدا بە توندی سەرکۆنەی ئەو کارەی کرد، کە سۆڤیەتییەکان لەبەرژەوەندی کوردە پەناهەندەکان ئەنجامی دەدەن[٣١٦]. هەروەها ڕۆژنامەکانیان هێرشی ڕاگەیاندنی چڕیان دەســـتپێکرد و ســـۆڤیەتیان بەوە تۆمەتبار کرد، کە لە ڕێگەی ئەو هەوڵانەی بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی ئەنجامی ئەدا، مەبەســتیانە شــکســتەکانی خۆیان لە نێوەندی نێودەوڵەتی بشارنەوە[٣١٧].

دیارە وەک مەسعود بارزانی باسی دەکات، تەمەنی ئەو دامەزراوەیە کورت بوو، بەهۆی ئەوەی کەسانێکی ناسراو لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، کە ئەندامی سەرکردایێتی سیاسیش بوون، ڕۆڵێکی نەرێنیان گێڕا و بەتەنگ ئەرکی نیشتمانی خۆیانەوە نەهاتن، بەڵکو بەپێی ئەو ژێدەرە، بوونە داردەستی جەعفەر باقرۆفی سەرۆکی ئازەربیجان و دەزگا نهێنییەکەی، تا بە ئارەزووی خۆی بیانجولێنێ و بیانکاتە ئامرازی لێکدابڕان و ناتەبایی، ئەوە ســەرەڕای ناکۆکییەکانی بارزانی لەگەڵ جەعفەر باقرۆف، کە هەمیشــە مەبەستی بوو لەبەرژەوەندی ئەجێندای خۆی بەکاریان بێنێ، تا ئەو ڕادەیەی باقرۆف کەوتە هەڕەشـــەکردن لە بارزانی، بەڵکو بچێتە ژێر باڵی خواســـت و داخوازییەکانی. ئەوەبوو بارزانی لەدیدارێکیدا لەگەڵ ناوبراو لەوەڵامی ئەو هەڕەشـانەی هەبوون پێی ڕاگەیاند:"هاوڕێ باقرۆف، ئێمە بۆیێ نەهاتوینە ئێرە تۆ هەڕەشەمان لێ بکەیت، ئەگەر ئێمە لەهەڕەشــە ترســابا‌ین، تۆ منت لێرە نەدەدی، ئێمە بۆیێ هاتوینە یەکێتی ســۆڤیەت کە دەنگی گەلی زوڵم لێکراوی کوردســـتان بەگەلانی ســـۆڤیەت ڕابگەیێنین، دەمانەوێ پیاوەتی و ســــەربەرزی خۆمـان بپارێزین، تکـات لێدەکەم ئەوەیش بزانە، کە ئێمە گەلێکین ســـەر بۆ هەڕەشــە دانانەوێنین و هەرگیز ئامادەنین پاشــکۆی گەلێک بین، با دۆست و برایشمان بێ وەکو گەلی ئازەربیجان، بەڵام هیچی لە ئێمە زیاتر نەبێ، ئێمە گەلێکی ســــەربەخۆین و پارچەییێک لە ئازەربیجان نین و ناشـــمانەوێ کەســـایەتی گەلەکەمان پێشێل بکرێ"[٣١٨].

بەگوێرەی زانیارییەکانی مەســـعود بارزانی دواجار تێکچوونی پەیوەندیەکانی بارزانی لەگەڵ باقرۆف بوونە هۆی کۆتایهاتنی کاروباری ئەو دامەزراوەیە و پاشـــان

---

٣١٦ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٩٣١–١٩٥٨)،ل١٩٩.

٣١٧ – د.ک.و، البلاط الملكي،(٣١١/٧٣٧)، المفوضية الملكية العراقية بطهران، القضية الكردية في أيران، الرقم(١٤٨/٩/٢)، في ١٩٤٩/٤/١٨،ص٢.

٣١٨ – وەرگیراوە لە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٩٣١– ١٩٥٨)، ل١٩٩.

لەسەر داخوازی بارزانی، حکومەتی سۆڤیەت، بارزانی و هەڤاڵەکانی گواستەوە بۆ تاشقەند لە ئۆزبەکستان[٣١٩]. گەورە ئەفسەری دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت (پاڤێل سودۆپلاتوڤ) لە یاداشتەکانی خۆیدا باس لەوە دەکات کە لە (ئاداری١٩٥٢) بە نوێنەرایەتی حکومەتی سۆڤیەتی لەگەڵ بارزانی کۆبویەوە و پێشنیازی بۆ کردووە دامەزراوەیەکی سەرکردایەتی سیاسی و سەربازی نوێ بە پاڵپشتی ئەوان پێکبهێنێ، بۆ ئەنجامدانی چالاکی سەربازی لەنێو خاکی عێراق و ئێران، بەمەبەستی فشار دروستکردن لەسەر حکومەتەکانی ئەو دوو وڵاتە بۆ دوورکەوتنەوەیان لەبەرەی ڕۆژئاوا. دیارە مستەفا بارزانی بەپێی ئەو ژێدەرە، لە بەرامبەردا داوای ڕەزامەندی حکومەتی سۆڤیەتی کرد، بۆ دامەزراندنی ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد، لەسەر سنوورەکانی تورکیا و ئێران و عێراق، کە خۆی سەرپەرشتی بکات و حکومەتی سۆڤیەت پاڵپشتی بکات، بەڵام بەپێی گێڕانەوەی سۆدوبلاتۆڤ ئەو پێشنیازە بەهۆی نەبوونی دەسەڵاتی ئەندامانی دانوستکار لەسەر ئەو بابەتە هەستیارە، ڕەتکرایەوە[٣٢٠].

## باسی چوارەم: ئەنجامدانی کاری ڕێکخراوەیی لە ناوەخۆی عێراق

ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لەناوەخۆی عێراق، لەو ماوەیەی بارزانی لە سۆڤیەت بوو، لەهەوڵە سیاسییەکانی خۆیان بەردەوام بوون، ئەگەر لەچوارچێوەیەکی بەرتەسکیشدا بووبێ[٣٢١]، چونکە لە دروستکردنی پەیوەندی و هەڵوێستی نیشتمانی زیاتر بری نەکرد[٣٢٢]. ئەوەی بۆ ئەو قۆناغەی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی گرنگ و بایەخدار بوو، هەردوو باڵی سیاسی و سەربازییەکەی وێڕای دوورکەوتنەوەیان لەیەکتری، بەیەکگرتوویی مانەوە، تەنانەت باڵی سیاسی لە کۆنگرەکانی پارتی، کە لە ساڵەکانی ١٩٥١ و ١٩٥٣ ڕێکخران، مستەفا بارزانیان وەک سەرۆک هەڵبژاردەوە، بەبێ ئەوەی ئامادەیی لە کۆنگرەدا هەبێ[٣٢٣].

---

٣١٩ – هس، ل١٩٩–٢٠٠.

٣٢٠ – الجنرال بافل سوبوبالتوف، م.س، ص١٦.

٣٢١ ـ بروانە: د. عبدالفتاح علي يحيى البوتاني، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية(ملاحظات تاريخية و دراسات أولية)، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل، ٢٠٠١، ص٦٥.

٣٢٢ – بروانە: جلال طالباني، م.س، ص١٧٣.

٣٢٣ – بروانە: صلاح الخرسان، م.س، ص٥٨.

بەم شـــێوەیە بارزانی وەک تەنها ســـەرکردە و ڕێبەری کورد لە باشـــووری کوردســـتان و لە تەواوی عێراقدا لەمەیدانی ســـیاســـی مایەوە[٣٢٤]. ئەو کەرنەڤاڵە جەماوەرییەی لەپێشـوازی ئەودا لەکاتی گەڕانەوەی لە یەکێتی سـۆڤیەتەوە بۆ عێراق لە (٦ی تشـــرینی یەکەمی١٩٥٨) ڕێکخرا[٣٢٥]، وێڕای هەڵواســـینی وێنەکەی بەجلی سـەربازی لە زۆربەی گوند و شـارەکانی کوردسـتان[٣٢٦]، ڕاستی پابەندبوونی بنکەی جەماوەری ڕێکخستنەکانی حزب و باڵی سیاسی پارتی بە پرەنسیپەکانی جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردی و ڕێبەرەکەیان دەسەلمێنێ.

گەڕانەوەی بارزانی بۆ عێراق، لاپەڕەیەکی نوێی لە مێژووی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی هەڵدایەوە، بەهۆی کۆبوونەوەی هەر سێ توخمە سەرەکییەکەی کە (ڕێبەر و باڵەکانی سیاسی و سـەربازی ڕێکخراو) بوون، لە خانەی یەک ڕێکخراوی سیاسی کە (پارتی دیموکراتی کوردستان) بوو. بەتایبەتی دوای ئەوەی مەلا مستەفای بارزانی و (٩) کەس لە ئەندامانی ســـەرکردایەتی پارتی وەک دەســـتەی دامەزرێنەر و (٥٠) کەســـی دیکە لە لایەنگرەکانیان وەک لە ژمارەی ڕۆژی(٩ ی کانونی دووەمی١٩٦٠) ڕۆژنامەی (خەبات)دا هاتووە، یاداشـتێک دەدەنە وەزیری ناوەخۆی حکومەتی عێراق بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی بە ئاشـــکرا کارکردنی پارتی دیموکراتی کوردســـتان[٣٢٧]، بەو هۆیەوە پارتەکە لە (٩ ی شـوباتی١٩٦٠) بەپێی (یاسـای کۆمەڵەکان)[٣٢٨]ی ژمارە(١)ی

324-Michael G. Lortz, op.cit, p.46.

٣٢٥ – بروانە: د. دینیس کوماروف، البارزاني و نضال الاكراد الجنوبيين، في: البارزاني و شهادة ألتاريخ، ص ص٥١،٥٢؛ د. عبدالفتاح علي البوتاني، ملا مصطفى البارزاني، قائد الثورة الكوردية...،ص٢٨.

٣٢٦ – بروانە بەڵگەنامەی ژمارە (٥٥) لە: محەمەد عەلی سوڵتانی، س.پ،ل٢٨٥.

٣٢٧ – ملا مصطفى البارزاني و رفاقه يقدمون أخبار ألى سيادة وزير الداخلية عن تأسيس الحيزب الديموقراطي لكردستان العراق، خەبات(جريدة)، ع(١٤١)، ٩/١/١٩٦٠، ص١.

٣٢٨ – لەبارەی(یاسای پارتەکان)، بروانە:الوقائع العراقية، العدد(٢٨٣)، ٢ كانون الثاني ١٩٦٠؛ عبدالفتاح علي البوتاني، التطورات السياسية الداخلية في العراق(١٤ تموز ١٩٥٨– ٨ شباط ١٩٦٣)،دهوک،٢٠٠٧، ص ص٢٦١-٢٦٦.

ســـاڵی ١٩٦٠[٣٢٩]، وەک پارتێکی ســـیاســـی لە عێراق بەشـــێوەیەکی فەرمی مۆڵەتی کارکردن و ئەنجامدانی چالاکی سیاسی بەئاشکرای وەرگرت[٣٣٠].

بەم شـــێوەیە پارتی وەک یەکەم ڕێکخراوی ســـیاســـی کوردی مۆڵەت پێدراو لەدوای دامەزراندنی ڕژێمی کۆماری لەعێراق، تێکەڵ بەپرسـی نیشـتمانی بوو، ئیتر لە چوارچێوەیەکی فراوانتر و لەمەیدانێکی ســیاســی گەورەتر، چالاکییە ســیاســیەکانی خۆی ئەنجامدا[٣٣١]، دروشــمەکانیشــی لە بازنەی داخوازییە نەتەوەییەکان هەرمانەوە، بەڵام بە پێداگریکردن لەســـەر بەدیهێنانی دیموکراتیەت بۆ عێراق، گوزارشـــتی لە خواستێکی گشتی نیشتمانی دەکرد[٣٣٢]، بەتایبەتی دوای خۆدزینەوەی دەسەڵاتدارانی ئەو کاتەی عێراق لە جێبەجێکردنی ئەو برگە و ماددانەی دەســـتووری کاتی، کە پەیوەندیان بە مافەکانی کورد و پێکهاتەکانی دیکە هەبوو[٣٣٣].

ئامانجی مســتەفا بارزانی لە دامەزراندنی ئەو پارتە ســیاســییە، دەگەڕێتەوە بۆ خواســـتی ئەو بۆ ڕزگارکردنی جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردی لە کۆت و بەند و ئالانگارییە کلاســیکیەکان و بونیادنانی کەســایەتی شــۆڕشــگێری دیموکراتیخوازی کوردی و فراوانکردنی مەیدانی شـــۆڕش لەدێهاتەکانەوە تا شـــارەکان، بۆ ئەوەی جوڵانەوەی نەتەوەیی خاوەنی مۆرکێکی گشـتگیری نیشـتمانی و ئایدیا و سـتراتیژی نەتەوەیی بێ، لە ڕێگای تێپەڕاندنی ئەو بەربەستانەی ببونە هۆی قەتیس بوونی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی لەناوچە و سنوورێکی دیاریکراوی بەرتەسکدا.

---

٣٢٩ – حبیب محمد کریم، م.س، ص ٦٧-٦٩.

٣٣٠ – بروانە: الحیزب الدیمقراطي الکردستاني یظهر الی العلن، خەبات/ النضال (صحیفة)، ع(١٦٧)، ١٠ شباط ١٩٦٠،ص١؛ أوریل دان، العراق في عهد قاسم ( تاریخ سیاسي ١٩٥٨- ١٩٦٣)، ت: جرجیس فتح الله، دار أراس للطباعة والنشر، أربیل، ٢٠١٢،ص٣٨٣.

٣٣١ – دینیس کوماروف،م.س، ص٥١.

٣٣٢ – لەماددەی (٦)ی پەیرەو پرۆگرامی پارتی لەکاتی دامەزراندنی،جەخت دەکاتەوە لەسەر پێویستی کارکردن بۆ فراوانکردنی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردی لەسەر بنەمای ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی یەکێتی خاکی عێراق و پەسەندکردنی لە دەستووری هەمیشەیی عێراقدا. لە مادەی(٢٣)جەخت دەکاتەوە لەسەر پاڵپشتیکردنی خەباتی گەلی کورد لە هەموو ناوچەکانی کوردستان. لەپێناو ڕزگاربوون لە ئیستعمار و کۆنەپەرستی و لەپێناو بەدەستهێنانی مافی چارەی خۆنووسین. عبدالفتاح البوتاني، التطورات السیاسیة.. ص٢٩٠.

٣٣٣ – سەبارەت بە مافەکانی کورد لە عێراقدا، بروانە: د. جواد ملا، کوردستان و الکورد( وطن مسروق ومغتصب و مقسم، أمة مستعبدة و سجینة و بلا دولة)، ط٣، د.م، ٢٠٠٨، ص ص١١٠-١١٥.

سەرەڕای ئەوەش مستەفا بارزانی لە ساڵی ١٩٦٤ جارێکی دیکە ڕووبەڕووی هەمان کێشەی پێشوو دەبێتەوە، بەهۆی دابڕانی بەشێکی ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و خۆجیاکردنەوەیان لەڕیزی شۆڕشی کورد[٣٣٤]. بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتە و لەپێناو پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە، بارزانی پەنای بۆ دامەزراندنی(ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق) برد، وەک لە خوارەوە باسی دەکەین.

## باسی پێنجەم: دامەزراندنی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق

ئامانجی مستەفا بارزانی لە پێکهێنانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق بەپێی بۆچوونی کەسێکی نزیک لەخۆی ئەوەبوو، هەموو چین و توێژەکانی میللەت لەسەرتاسەری کوردستان لە دروستکردنی بڕیار و کاروباری شۆڕش بەشداربن، چونکە بە گوتەی ئەو، شۆڕش موڵکی کەسێک یان پارتێک نەبوو، ئەمەش هەڵقوڵاوی بۆچوونێکی دیموکراسیانە بوو بۆ بارودۆخەکان[٣٣٥]. بەڵام توێژەرێک ئەوە بە دوور نازانێ، کە یەکێک لە ئامانجەکانی پێکهێنانی ئەنجومەن، خواستی بارزانی بووبێ بۆ سنووردارکردنی ئەو جیابوونەوەیەی لەڕیزەکانی پارتی ڕوویدا، بە دامەزراندنی هەندێک لە کەسایەتییە ناسراوەکان و سەرۆک هۆزەکان لە ئەنجومەن و لەو بەڕێوەبەرایەتییانەی دواتر لەلایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشەوە لە کوردستان پێکهێنران، هەروەها هەوڵێک بوو بۆ ڕێگەگرتن لە پەیوەندیکردنیان بە گروپی مەکتەبی سیاسی پێشووی پارتی و حکومەتی عێراق[٣٣٦].

ئەو دوو تێڕوانینەی پێشوو بە ڕادەیەکی زۆر ڕاستن، بەڵام هۆکاری دیکەش هەبوون بۆ ئەوەی بارزانی بیر لە پێکهێنانی دامەزراوەیەک بکاتەوە بۆ سەرپەرشتیکردن و بەڕێوەبردنی شۆڕش لە ناوچە ئازادکراوەکان، یەکێک لەو

---

٣٣٤ – سەبارەت بە جیاوازییەکانی نێوان باڵی مەکتەبی سیاسی و بارزانی، بڕوانە: د. حامید مەحمود عیسا، کێشەی کورد لە عێراقدا،ب١، و: سوارە قەڵادزەیی، هەولێر، ٢٠١٤، ل ل٢٣٠–٢٤٠.

٣٣٥ – محسن دزەیی، م.س ، ص٨٧.

٣٣٦ – د. شێرزاد زکریا محمد، ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕەشی ئەیلول لە کوردستان– عێراق( توێژینەوەیەکی مێژوویی سیاسی گشتی ١٩٦٤–١٩٧٠)،و: هەندرێن شێرزاد، دهۆک، ٢٠٢١، ل٧٦.

هۆکارانەش پێدەچێ کاریگەری ئەو نامەیە بووبێ، کە (عیســمەت شــەریف وانلی)[٣٣٧] (ســـکرتێری لیژنەی بەرگری لە مــافەکــانی گەلی کورد)[٣٣٨] لە ڕێککەوتی(٢٧ی حوزەیرانی١٩٦٢) لە بەیروتەوە بۆ مستەفا بارزانی ڕەوانکرد. لەو نامەیەدا وانلی باس لەو دیدارەی خۆی دەکات کە لە ( ٦ی حوزەیرانی١٩٦٢ ) لە سـویسـرا لەگەڵ لیژنەی خاچی سـووری نێودەوڵەتی ئەنجامی داوە، بۆ ئەوەی هەوڵ بدەن وەک ناوبژیکارێک لە نێوان سـەرکردایەتی شـۆڕشـی کورد و حکومەتی عێراقی، کار بۆ هێورکردنەوەی دۆخەکە بکەن و یـارمەتی و کۆمەکی مرۆیی پێویســـتیش پێشـــکەش بە نـاوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسـەڵاتی شـۆڕشـی کورد بکەن. هەر لەو نامەیەدا وانلی ئاماژە بۆ وەڵامی ڕێکخراوی نـاوبراو دەکـات و بـاســـی لەوە کردووە، کە ئەوان پێیـان ڕاگەیاندووە لەبەرئەوەی ئامانجی شـۆڕشـی کورد ئۆتۆنۆمیە لە چوارچێوەی عێراقدا، هیچ دەوڵەت و ڕێکخراوێک نـاتوانێ بەبێ ڕەزامەنـدی حکومەتی عێراقی دەســــت وەردان لەو بابەتە بکات، لە درێژەی ئەو زانیاریانەی لە نامەکەیدا ناوبراو بە بارزانی گەیاندوە، باســـی لەوە کردووە کە بەو ڕێکخراوەی ڕاگەیاندووە: "هەڵوێســـتتان چی دەبی ئەگەر شـــۆڕش ئامانجەکانی بگۆڕێ و حکومەتێکی کوردی لە کوردســــتانی باشـوور واتە لەناوچە ئازادکراوەکان پێک بهێنێ لەژێر سـەرکردایەتی جەنابتان"[واتە:

---

٣٣٧ – عیسمەت شەریف وانلی: لە ٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٢٤ لەدایک و باوکێکی کورد لەدیمەشق لەدایک بووە. یەکێکە لە کەسایەتییە ئەکادیمی و سیاسییە نەتەوەییە کوردیەکان. ڕۆڵی گرنگی لە شۆڕشی ئەیلول وەک نوێنەری مستەفا بارزانی لە ئەوروپا گێڕاوە. بڕوانامەی ماستەری لە مێژوو لە زانکۆی جنێف لە سویسرا و دکتۆرای لە ساڵی ١٩٧٠ لە زانکۆی پاریس بەدەستهێناوە. وەک مامۆستایەک لە زانکۆی سۆربۆن لە فەرەنسا وانەی وتۆتەوە. ساڵی ١٩٥٦ لەگەڵ ژمارەیەک لەهاوڕێکانی (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لەئەوروپا دادەمەزرێنن و ساڵی ١٩٦٢ سەرۆکایەتی کۆمەڵەکە دەکات. ساڵی ٢٠١١ لە شاری لۆزان لە سویسرا کۆچی دوایی کردوە. پ.د.ئیسماعیل محمد حصاف، هاوکار کریم حمەشریف، عیسمەت شریف وانلی نوێنەری شۆڕشی ئەیلول لە ئەوروپا ١٩٦٤-١٩٧٥،چالاکیێن کۆنفرانسێ زانستیێ نێڤدەوڵەتیێ سیێ کۆمەکا ڤەکولەران، شۆرەشا ئەیلولێ وەچەرخانەک د دیرۆکا سیاسی یا کوردی دا، کۆنفرانسا هەڤبەش یا دەستەیا ئینسکلۆپیدیایا پارتیا دیموکراتا کوردستانێ و زانکۆیا دهۆکێ، دهۆک،٢٠٢١،ل ل٢٣٣-٢٥١.

٣٣٨ – ئەم کۆمیتەیە لە کۆتایی تەمموزی ساڵی ١٩٦١ لەلایەن ژمارەیەک کوردی نیشتەجێی سویسرەوە، بەهاندانی دیپلۆماسیی عیراقی (عیسمەت کەتانی) لە جنێڤ دامەزرێنرا. کەمال مەزهەر، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بریتانیادا،بگ١، چ٢، ئا: عەبدوڵڵا زەنگەنە و شەهلا تاهیر حەیدەری،چاپخانەی گرین گلۆری، لوبنان، ٢٠٠٩، ل٤٩٢.

بارزانی] دەڵێت ئەوان لە وەڵامدا باســـیان لەوە کرد، کە لەو دۆخەدا یاســـاکانیان ڕێگایان پێدەدات دەستوەردان لەکاروباری عێراقدا بکەن، بەبێ گەڕانەوە بۆ حکومەتی ناوەندی[٣٣٩]. لێرەدا پێدەچێ یەکێک لە هۆکارە ســەرەکیەکانی دامەزراندنی ئەنجومەنی ســـەرکردایەتی شـــۆڕشـــی کوردســـتانی عێراق، بگەڕێتەوە بۆ ئامانجی بارزانی بۆ بەدەســتهێنانی پشــتیوانی نێودەوڵەتی بۆ شـۆڕشـی کورد، وەک لە پوختەی نامەکەی وانلی بەدیاردەکەوێ.

لەلایەکی دیکە دەتوانین بڵێین هۆکاری ڕاســتەوخۆ بۆ پێکهێنانی ئەم دامەرزاوەیە پەیوەنـدی هەبوو بەو دۆخەی ڕووبەڕووی نـاوچە ئـازادکراوەکـان بووەوە، چونکە دوای ئەوەی شـــۆڕشـــی کورد بۆ ماوەی ســێ ســاڵ (١٩٦١_١٩٦٤) بەردەوام بوو، ناوچەیەکی بەرفراوان لە (زاخۆ تاوەکو خانەقین)، کە مەیدانی شەڕی نێوان پێشمەرگە و ســـوپای عێراقی بوون، ئـازادکران و ئەرکی بەڕێوەبردنیـان کەوتە ئەســـتۆی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد[٣٤٠].

ئاشـــکرایە بوونی پانتاییەکی بەرفراوانی خاک لەژێر دەســـەڵاتی شـــۆڕش، کە دانیشـــتوانەکەی بە (یەک ملیۆن) کەس دەخەمڵێنـدرا، وێڕای کەڵەکەبوونی کەموکوڕییەکی زۆری خزمەتگوزاریی بەهۆی کشـــانەوەی دامەزراوە فەرمییەکانی حکومەتی عێراقی لەو نـاوچـانە، هەروەهـا پێویســـتی نـاوچە ئـازادکراوەکـان بە پێکهاتەیەکی کارگێڕی بۆ چارەســەرکردنی کێشــە و گرفتە کارگێری و کۆمەڵایەتی و دادوەرییەکان[٣٤١]. بەڕادەی پێویســتی خۆیان، هاندەربوون بۆ ئەوەی مســتەفا بارزانی وەک ڕێبەری بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد و ســەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردســتان، لە کۆنگرەی شـــەشـــەمی پـارتەکەدا کە لەمـاوەی (١_٩)ی تەمموزی ١٩٦٤ لە شــارۆچکەی قەڵادزێ بەســترا، پێشــنیازی دامەزراندنی ئەنجومەنی ســەرکردایەتی شـۆڕشـی کوردســتانی_عێراق بکات. تاوەکو لە ڕێگەی ئەو ئەنجومەنەوە کاروبارە

---

٣٣٩ – أيوب بارزاني، الحركة التحررية الكوردية و صراع القوى الاقليمية والدولية ١٩٥٨– ١٩٧٥، دار نشر حقائق المشرق، جنيف، ٢٠١١، ص١٥٧.

٣٤٠ – بۆ سنووری ناوچە ئازادکراوەکان، بڕوانە: عصمت شريف وانلي، كردستان العراقية هوية وطنية (دراسة في ثورة ١٩٦١)، ت:د. سعاد محمد خضر، مطبعة شڤان، السليمانية، ٢٠١٢، ص٣٣٧.

٣٤١ – مەسعوود بارزانی، بارزانی ...(شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١–١٩٧٥)، ٢٠٠٤،ل١٥٤؛ شيرزاد زكريا محمد، مجلس قيادة الثورة في كوردستان– العراق ١٩٦٤– ١٩٧٠، دهوك، ٢٠١٠، ص٢٧.

ســیاســی و ســەربازییەکان لە ناوچە ئازادکراوەکان بەڕێوەببات[342]. دوای بڕیاری دوورخســتنەوەی (١٤) ئەندامی ســەرکردایەتی باڵی مەکتەب ســیاســی[343] لە ڕیزی شۆڕش[344].

دوای ڕێکخســتنی کۆبوونەوەیەکی میللی نیشــتمانی بەرفراوان لە شــاری قەڵادزێ[345]، لە ڕۆژانی(٢٨_٢٩)ی ئەیلولی ١٩٦٤ بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتی سیاسی و سەربازی و پیاوماقوڵان و سەرۆک خێڵە کوردییەکان و چەند کەســایەتییەک لە پێکهاتەی ئایینی و نەتەوەییەکانی دیکەی کوردســتان[346]، مســتەفا بارزانی پێشنیازی پێکهێنانی ئەنجومەنی سەرکردایەتیکردنی شۆڕشی کوردی کرد، بۆ بەڕێوەبردنی ناوچە ئازادکراوەکان لەبەردەم ئامادەبووانی کۆنگرە[347].

دوای دوو ڕۆژ کۆبوونەوە لەسەر ئەم پرسە، بارزانی بە وتارێک بۆ ئامادەبووان هۆکارەکانی پێکهێنانی ئەنجومەنەکەی ئاشکرا کرد و باسی لەوە کرد، کە لەم ڕۆژانە بارودۆخی کوردســتان بە قۆناغێکی زۆر هەســتیاردا گوزەر دەکات، لە لایەک دەبینن حکومەت تا ئێســتا هیچ هەنگاوێکی ئەرێنی نەناوە لە پێناوی چارەســەرکردنی دۆزی ڕەوای کورد بە شێوەیەکی ئاشتییانە، چاوەڕێش ناکرێ هیچ شتێک بکات، بۆیە گرنگە ڕیزەکانمان ڕێکبخەین و بەبێ جیاوازی هەوڵی ئامادەکردن و ڕێکخســتنی ڕۆڵەکانی

---

٣٤٢ – سعد ناجی جواد، العراق والمسألة الكردية ١٩٥٨– ١٩٧٠، لندن، ١٩٩٠، ص١٣٠؛ د. عبدالفتاح علي البوتاني، الحركة القومية الكوردية التحررية( دراسات و وثائق)، دهوک، ٢٠٠٤، ص٢٥٧؛ شكيب عقراوي، سنوات المحنة في كردستان( أهم الحوادث السياسية والعسكرية في كوردستان والعراق من ١٩٥٨– ١٩٨٠)، ط٢، أربيل، ٢٠٠٧، ص١٥٠.

٣٤٣ – مەکتەبی سیاسی پارتی پێکهاتبوون لە : (ئیبراهیم ئەحمەد، جەلال تاڵەبانی، عومەر دەبابە، عەلی عەسکەری، حیلمی عەلی شەریف، عەلی عەبدوڵڵا، نوری شاوەیس، مەلا ماتۆر (عەبدوڵڵا ئیسماعیل)، سەید عەزیز شەمزینی، عەلی حەمدی، محەمەد حاجی تایەر، شەمسەدین مفتی و نوری ئەحمەد تاها). بروانە: بەڵگەنامەی ژمارە(٣٤) لە: الكورد في وثائق الارشيف الوطني البريطاني(ج٢) ١٩٥٨–١٩٦٩، أعداد و ترجمة: شيركو حبيب،القاهرة، ٢٠١٩، ص ص١٣٧–١٣٨.

٣٤٤ – بروانە بەڵگەنامەی ژمارە(٣٤) لە: م.ن، ص ص١٣٧–١٣٨.

٣٤٥ – شەوکەت مەلا ئیسماعیل حەسەن، ڕۆژانێ لە مێژووی شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١–١٩٧٥، هەولێر، ٢٠٠٧،ل٢١٥؛ جەبار قادر، یەکەمین کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش،ب٥، هەرێمی کوردستان(گۆڤار)، ژ(٣٨٠)، ١٢ی ئایاری ٢٠٠٦،ل٥.

٣٤٦ – سەبارەت بە ناوی ئامادەبوونی کۆنفرانسەکە،بروانە:د. شێرزاد زکریا محمد، س.پ، ل٦٦–٧٠.

٣٤٧ – شەوکەت مەلا ئیسماعیل، س.پ،ل٢١٥؛ جەبار قادر، س.پ،ل٥.

گەلی کوردستان بدەین، لە پێناوی قوربانیدان بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجانەی گەلەکەمان لە پێناویاندا خەبات دەکات. بارزانی لە درێژەی وتارەکەیدا گوتی:" ئێوە باش دەزانن کە پارتی لەســـەر بنەمای تازەوە ڕێکخراوەتەوە و ئەو گرووپانەش لە کوردســـتان دەرکران کە خۆیان بەســەر گەلی کوردا دەســەپاند، دەخوازین بەگوێرەی پرۆگرام و ڕێگایەکی تازە کار بکەین، بە مەرجێک هەموو چینەکانی گەلی کوردستان بەشداربن تیایدا"[٣٤٨].

دواجار بـارزانی داوای لە ئـامادەبووانی کۆبوونەوەکە کرد ئەو کەســـانە بۆ ســـەرکردایەتیکردنی دامەزراوەکە هەڵبژێرن کە لەخزمەتی گەل و نیشـــتماندا، ڕۆڵی باڵایان بینیوە، بۆ ئەوەی ببن بە نوێنەری ڕاســـتەقینەی گەلەکەیان لە ئەنجومەن[٣٤٩]. ئەو کاتە ئامادەبووانی کۆنگرە بەگشتی پێشوازییان لە پێشنیازەکە کرد. بەو شێوەیە لە(٤ ی تشرینی یەکەم ١٩٦٤) بڕیاری پێکهێنانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان درا[٣٥٠].

هەر لەو کۆبوونەوەیەدا مەلا مســـتەفای بارزانی بە کۆی دەنگی ئامادەبووان بە ســـەرۆک هەڵبژێردرا، ئەمیش داوایکرد لە ڕێگەی هەڵبژاردن، نوێنەری خۆیـان بۆ ئەنجومەنەکە دەستنیشـان بکەن. ئەوە بوو دوای ئەنجامدانی پرۆسـەکە، زیاتر لە(٦٣) کەسـایەتی لە نێوان ســەرۆک هۆز و پیاو ماقوڵان و پێکهاتە ئایینی و نەتەوەییەکانی دیکەی کوردســـتان وەک ئەندامانی ســـەرکردایەتی ئەنجومەنەکە هەڵبژێردران[٣٥١]، بەشێک لەمانە کادیرانی پێشکەوتووی سیاسی و فەرماندەی باڵای سەربازی پارتی بوون، کە بە پشتگیری پارتەکەیان و چەند کەسایەتییەکی دیکە لە پێکهاتە نەتەوەیی و ئایینیەکان وەک میر تەحسین سەعید بەگ بە نوێنەرایەتی کوردە ئێزیدییەکان (خوری

٣٤٨ – جەبار قادر،س.پ،ل٥.

٣٤٩ – شێرزاد زکریا محمد، س.پ،ل٥٨.

٣٥٠ – مسعود بارزانی،بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی...(شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١–١٩٧٥)، ل١٨٦.

٣٥١ – بۆ زانینی ناوی ئەندامانی هەڵبژێردراوی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق، بڕوانە: شێرزاد زکریا محمد، س.پ، ل٦٦–٧٠؛ جەبار قادر، س.پ، ل٥

پۆلس بیداری)[٣٥٢] بە نوێنەرایەتی کلدان[٣٥٣] و (مار یولاها ئەندراوس)[٣٥٤]بە نوێنەرایەتی ئاشوورییەکان، بوونە ئەندامی ئەو دامەزراوەیە[٣٥٥].

یەکەمین کۆبونەوەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق لە (٩ی تشـــرینی یەکەم١٩٦٤) لە دێی بۆســـکێن ڕێکخرا[٣٥٦]. لە کۆبوونەوەکە لەپێناو ڕێکخستنی کاروباری سەربازی و هێزەکانی پێشمەرگە و کاروباری گومرگ و باج و دارایی و بەڕێوەبردنی ناوچە ئازادکراوەکان و دارشـــتنی پەیڕەوی ناوەخۆیی و پرۆگرامی ئەنجومەنی ســـەرکردایەتی شـــۆڕش و دیاریکردنی ئەرک و مافەکانی ئەنجومەن و سەرۆکەکەی بڕیار لەسەر نووسینەوەی دەستوورێک درا، پاشان پێنج لیژنەی پەیوەندیدار بە کاروبارەکانی (ســـەربازی و دارایی و کارگێڕی و دادوەری و دەستووری) بۆ ئەم مەبەستە پێکهات[٣٥٧].

لە لیژنەی یاســـایی زانایەکی فیقهی و چەند پارێزەرێکی تێدا ئەندام بوون[٣٥٨]. لیژنەکان بۆ ماوەی یەک هەفتە لە (٩_١٧)ی تشـــرینی یەکەمی ١٩٦٤ کۆتاییان بە کارەکانی خۆیان هێنا. (١٣) ماددەی یاســـاییان پێشـــکەشـــی ئەنجومەن کرد، پاشـــان دەســـتوورەکە پێشـــەکییەکی بۆ نووســـرایەوە، کە مەبەســـت و ئامانجی ســـەرکردایەتی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی ســـەبارەت بەنووســـینەوەی بەدیارخســـت، وێڕای

---

٣٥٢ – خوری پۆلیس بیداری: ساڵی ١٨٨٧ لەناوچەی زاخۆ لەدایک بووە، دوای کودەتای بەعسییەکان لە ٨ ی شوباتی ١٩٦٣ پەیوەندی بە شۆڕشی ئەیلول کردوە. لە ٧ی ئەیلولی ١٩٧٤ لەشاری موسڵ مردووە. بۆ زانیاری زیاتر بروانە: وەسفی حسن ردێنی، قەشە پۆلس بیداری ئەو کەسایەتیا کوردستان پەروەر و ڕەوشەنبیر، هیزل(گۆڤار)، ژ(١)، هاوینی ٢٠٠٦، ل٢٨–٣٥.

٣٥٣ – الکورد في وثائق الارشیف الوطني البریطاني(ج٢) ١٩٥٨–١٩٦٩،ص١٧٥.

٣٥٤ – مار یولاها ئەندراوس تیادورس ئەیود بەرواری: لە گوندی دوری لە ناوچەی بەرواری بالا لە ناحیەی کانی ماسی ساڵی ١٩٣٨ لەدایک بووە. لەساڵی ١٩٦١ بەشداری شۆڕشی ئەیلولی کردووە و پەیوەندی باشی لەگەڵ مستەفا بارزانیدا هەبووە. لەساڵی ١٩٧١ لەشاری بەغدا مردووە. بۆ زانیاری زیاتر بروانە: وصفي حسن، المطران مار یولاها (١٩٣٨– ١٩٧١ ) الانسان المثقف والمناضل الکوردستاني، ت: رمضان یعقوب، هیزل(مجلة)، ع (٣)، شتاء ٢٠٠٧، ص٩٥–٩٧.

٣٥٥ – حبیب محمد کریم، م.س، ص١٠٤.

٣٥٦ –ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان– عێراق(نووسینگەی ڕاپەراندن) دەستوور و یاساکان ١٩٦٤–١٩٦٥، ئا: ئاری فاروق نانەکەلی، هەولێر، ٢٠١٧،ل١١.

357-CIA-RDP79-00927A004800110003-7,THE KURDISH WAR–ROUND FOUR, WASHINGTON, April 23, 1965,p.5.

٣٥٨ – بۆ زانینی ناوی ئەندامانی لیژنە تایبەتمەندەکان، بروانە: شێرزاد زکریا محمد، س.پ، ل٧١.

چەســـپاندنی (١٣) ماددەی ســـەرەکی، کە تایبەت بوون بە ناســـاندنی (ئەنجومەنی سـەرکردایەتی شـۆڕشـی کوردسـتان_عێراق) وەک باڵاترین دەسـەڵاتی یاسـادانان و نـاســـانـدنی (مەکتەبی تەنفیزی) وەک دەســـەڵاتی بـاڵای ڕاپەڕانـدن لە نـاوچە ئازادکراوەکانی باشووری کوردستان[٣٥٩].

شـیاوی باسـە بە پشت بەسـتن بە ماددەکانی (٩_١٠) لە دەسـتووری سـاڵی ١٩٦٤، ئەنجومەنە هەڵبژێردراوەکە لە (١٧ی تشرینی یەکەمی١٩٦٤) بڕیاری پێکهێنانی دامەزراوەی مەکتەبی تەنفیزی دەرکرد، بۆ ئەوەی لە ناوچە ئازادکراوەکانی باشووری کوردســـتان ســـەرپەرشـــتی کاروباری بەڕێوەبردن بکات. مەکتەبی تەنفیزی لە (١٧) ئەندام پێکهات، کە (٩)یان ئەندامی حزب و (٥)یان فەرماندەی سەربازی و (٣) ئەندامی دیکەیان لە پێکهاتە ئایینی و نەتەوەییەکان بوون[٣٦٠]. دوای هەموارکردنەوەی دەستوور لە ســـاڵی ١٩٦٨، ئەنـدامێکی دیکە لە پێکهـاتەی مەســـیحییەکـان بۆ ئەنجومەنەکە زیادکرا[٣٦١]. ئەو دامەزراوەیە لە چەند نووســـینگە و بەشـــێکی وەک نووســـینگەکانی (سـیاسـی، عەسـکەری، دادوەری، دارایی، کاروباری دەرەوە، ئابووری) و بەشـەکانی (ئاسایش و پشکنین، ڕاگەیاندن) پێکهات[٣٦٢].

لەڕاسـتیدا ناوبانگی مەکتەبی تەنفیزی بۆ شـۆڕش، لە ناوبانگی مەکتەبی سـیاسـی بۆ پارتی زیاتر بوو، چونکە ئەو هاوشـــێوەی ئەو دەســـەڵاتە کارگێڕییە بوو، کە سەرپەرشتی جێبەجێکردنی بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی دەکرد. تەنانەت حکومەتی عێراقی زۆرجار لە دانوســـتانەکانی لەگەڵ ســـەرکردایەتی کورد،

٣٥٩ – قارەمان حەیدەر ڕەحمان، کاریگەریی دەستووری ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق لەسەر ڕەوشی ناوچە ئازادکراوەکان(١٩٦٤–١٩٧٠)، زانکۆ بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان(گۆڤار)، بگ٢١،ژ(٣)،٢٠١٧،ل٤٤.

٣٦٠ – سەبارەت بەناوی ئەندامانی مەکتەبی تەنفیزی، بڕوانە: خەبات(جريده)، ع (٤٧٥)، كانون الاول ١٩٦٤. ص٨،وەرگیراوە لە: جەمال خەزنەدار، ١١ ژمارەی دەگمەنی ڕۆژنامەی خەبات ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستانی یە، هەولێر، ٢٠١٩، ل٢٦.

٣٦١ – بۆ زانینی ناوی ئەندامانی مەکتەبی تەنفیزی بڕوانە: شێرزاد زكريا محمد، ئەنجوومەنی س.پ، ل٧٣–٧٤ ؛ حبيب محمد كريم، م.س، ص١٠٤.

٣٦٢ – عصمت شريف وانلي، م.س، ص٣١٨.

ئـامـاژەی بـۆ ئەوە کـردووە، ئەم دامەزراوەیە وەک حـکـومەتـێـک وایە لەنـاو حکومەت(حكومة داخل حكومة)[٣٦٣].

ســـەبارەت بە مێژووی هەڵوەشـــاندنەوەی ئەو دامەزراوەیە، هیچ بەیاننامەیەکی فەرمی یان ســـەرچاوەیەکی باوەڕپێکراومان لەبەردەســـتدا نییە، بەڵام بەڵگەنامەیەکی حکومەتی ئەمریکا بەپشت بەستن بەو زانیاریانەی لەلایەن نوێنەرێکی سەرکردایەتی شـــۆڕشـــی کورد بەدەســـتی گەیشـــتووە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە دوای ڕێککەوتنی(١١ی ئاداری ١٩٧٠)، کوردەکان ئەنجومەنی ســـەرکردایەتی شـــۆڕشـــی کوردستانی عێراق و مەکتەبی تەنفیزیان هەڵوەشاندەوە[٣٦٤]. کەچی بەپێی زانیارییەکانی توێژەرێک، مەکتەبی تەنفیزی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق تا ساڵی ١٩٧٤ ڕۆڵی و شێوازی بەڕێوەبردنی کۆتایی هات، تەنها ناوەکەی ماوەتەوە. دواجار سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لە کۆتایی مانگی ئاداری ١٩٧٤ بۆ بەڕێوەبردنی ناوچە ئازادکراوەکان پرۆژەیەکی نوێی جێبەجێکرد[٣٦٥]، کە لەباســـی داهاتوو، زانیاری لەسەر دەخەینەڕوو.

## باسی شەشەم: دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی کاروباری ئەمیندارەتییەکان

دانوستانەکانی حکومەتی عێراقی و سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لەساڵی ١٩٧٠، ڕێکەوتننامەی ١١ی ئاداری لێکەوتەوە، بەپێی ئەو ڕێکەوتنەی ئەنجامدرا، ئەنجوومەنی ســەرکردایەتی شـۆڕشـی عێراق، بڕیاریدا لەســەر دامەزراندنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی لە کوردستان وەک وەڵامدانەوەیەک بۆ داخوازییەکانی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی لەو کاتەدا[٣٦٦]. لە بەڵگەنامەیەکی حکومەتی ئەمریکا باســـی ئەوە کراوە، کە هەر بەپێی یەکێک لە خاڵەکانی ڕێککەوتنامەکە، ســـەرکردایەتی شـــۆڕشـــی کوردی ڕەزامەندی دەربڕیوە لەســـەر هەڵوەشـــانـدنەوەی دامەزراوەکـانی بەڕێوەبردن لەنـاوچە

---

٣٦٣ – شێرزاد زكريا محمد، س.پ، ل٧٥.

364 -F.R.U.S, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, 292. Airgram 222 From the Embassy in Lebanon to the Department of State, Request from Mustafa Barzani for Clandestine Contact with USG, Beirut, July 16, 1971, p.3. بروانە: پاشکۆی ژمارە(٦).

٣٦٥ – شێرزاد زكريا محمد، س.پ، ل١٣٧.

٣٦٦ – بڕوانە: قرار(٢٨٨) في الوقائع العراقية، العدد(١٨٦٣)، ٤ نيسان ١٩٧٠، ص ص ١٠-١١.

ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش، بۆئەوەی دوو دەسەڵاتی کارگێری لەیەک ناوچەدا نەبن[٣٦٧].

هەرچەندە لەسەر بنەمای ئەو ڕێککەوتنە، سەرکردایەتی کورد پابەندی بەشێکی زۆری بەڵێنەکانی خۆی بوو، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی هەبوو بە هەڵوەشاندنەوەی دامەزراوەکانی بەڕێوەبردن لەمانەش ئەنجومەنی سەکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق و مەکتەبی تەنفیزی، بەڵام حکومەتی عێراقی هیچ هەنگاوێک بۆ جێبەجێکردنی ڕێککەوتنامەکە نەهاتە پێشەوە لەچەند خاڵێکی سادە نەبێ، بەو هۆیەشەوە پەیوەندییەکان لەنێوان هەردوولا، بەهۆی ماوەی درێژی بڕیار لەسەردراو بۆ جێبەجێکردنی ڕێککەوتنامەکە ساردی و ئالۆزی تێکەوت[٣٦٨]،

ئەوەبوو دواجار حکومەتی عێراق تاک لایەنە و بەبێ گەڕانەوە بۆ سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی لە(١١ی ئاداری١٩٧٤) بڕیاری پرۆژەی ئۆتۆنۆمییەکی کارتۆنی لە سنوورێکی دیاریکراوی باشووری کوردستان، کە تەنها بەلای خۆیەوە پەسەند و گونجاو بوو ڕاگەیاند[٣٦٩].

پرۆژەکەی حزبی بەعس بەلای بارزانی و سەرکردایەتی سیاسی و گەلی کوردستان پەسەند و گونجاو نەبوو[٣٧٠]، بەو هۆیەوە مستەفا بارزانی لە (١٨ی ئاداری١٩٧٤) لەگەڵ مەحمود عوسمان بۆ چارەسەرکردنی و بەدەستهێنانی پشتگیری و کۆمەکی دارایی و سەربازی، سەردانی شای ئێرانی کرد[٣٧١]، بەتایبەتی لەو کاتەدا سەرکردایەتی سیاسی کورد، زیاتر پێویستی بە هاوکاریی مرۆیی هەبوو لە

367-F.R.U.S, 1969–1976, VOLUME E-4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972,(Doc:292). Airgram 222 From the Embassy in Lebanon to the Department of State, Request from Mustafa Barzani for Clandestine Contact with USG, Beirut, July 16, 1971, p.3.

٣٦٨- سەبارەت بە کێشەو گفتوگۆیەکانی پرۆژەی یاسای ئۆتۆنۆمیی، بڕوانە: فەرەیدوون عەبدولڕەحیم عەبدوڵڵا، بارودۆخی سیاسی کوردستان- عێراق (١١ی مارت ١٩٧٠-١١ی مارتی ١٩٧٤)، هەولێر، ٢٠٠٨،ل٢٤٥-٢٥٠.

369-Dennis P. Chapman, op.cit, p.16.

370-NA: FCO 8/2308, Kurds in Iraq (Rebellion And Self Rule In Iraqi Kurdistan 1974), United Kingdom, 1974, p.161.

371- CIA, 741503699, Helms to Scowcroft re Mulla Mustafa Barzani and Dr. Uthman, March 1974,(٧) بڕوانە پاشکۆی ژمارە

جلوبەرگ و خۆراک و خیوەت و پێداویســـتی دیکە بۆ حەوانەوەی ئەو پەنابەرانەی ڕوویان لە ناوچە ئازادکراوەکان کرد[٣٧٢].

ئەوە ســـەرەڕای ئامانجەکانی بۆ بەڕێوەبردنی شـــۆڕش و هەموو ئەو خەڵکەی لەژێر ســەرپەرشــتی شــۆڕشــەکەدا بوون لەناوچە ئازادکراوەکان، بەتایبەتی کە دوای ئەو ڕووداوە، ڕووبەرێکی فراوانی خاک، (بەگوێرەی زانیاری یەکێک لە ژێدەرەکان بە نزیکەی (٣٥٠٠) کم$^{2}$ دەبوو[٣٧٣] کە نزیکەی یەک ملیۆن کەس تێیدا نیشـــتەجێ بوون، کەوتنە ژێر دەســەڵاتی هێزی پێشمەرگە. ئەم خاکە بریتی بوو لە ناوچەکانی ڕەواندز و قەڵادزە و رانیە و نـاوچەکـانی ســـنووری ئێران تـا هەڵەبجە و تەواوی نـاوچە سنووریەکانی تورکیا لەگەڵ عێراق[٣٧٤].

بەپێی زانیارییەکانی موحســین دزەیی ســەرکردایەتی شــۆڕشــی کورد، لەمانگی نیسانی ١٩٧٤ دوای ئەنجامدانی چەندین کۆبوونەوە، بڕیاری پێکهێنانی دامەزراوەکانی بەڕێوەبردنی لەناوچە ئازادکراوەکان دەرکرد، کە لە شێوەی ئەمیندارەتییە گشتییەکان و ئەنجومەنی ئەمیندارەتییەکان بوو. بەشـــێوەیەک ئەو ئەنجومەنە لە ئەمیندارەتییە گشـــتییەکانی ناوەخۆ، ڕۆشـــنبیری و ڕاگەیاندن و لاوان، پەروەردە، ئەشـــغال ونیشتەجێکردن، دارایی، داد و ئەوقاف، تەندروستی، کشتوکاڵ پێکهات[٣٧٥]. سەرۆکی دامەزراوەکەش سامی عەبدوڵڕەحمان(١٩٣٢-٢٠٠٤) بوو[٣٧٦].

---

372-F.R.U. S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, Memorandum from Director of Central Intelligence Colby to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Mulla Mustafa Barzani's Requests for Additional Assistance, Washington, March 21, 1974, p.682.

٣٧٣ – کریس کۆچێرا، س.پ،ل٣٩٩.

374-F.R.U.S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, Backchannel Message From the Ambassador to Iran (Helms) to the President's Deputy Assistant for National Security Affairs (Scowcroft), Tehran, March 18, 1974, p.678.

٣٧٥ – محسن دزەیی، م.س، ص٢٧٠.

٣٧٦ – یۆنان هورمز، بیرەوەرییەکانم لە شۆڕشی کوردستاندا، و: ئەبوبەکر ساڵح ئیسماعیل، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٢٢٠.

پێکهاتەی بەڕێوەبردنی ئەو قەوارە سـیاسـی و کارگێرییە، لەناوچەکانی نێوان ڕێگای هـاملتۆن لە حـاجی ئۆمەرانەوە تـا نـاوپردان دامەزرێنـدران. حـاجی ئۆمەران بەشێوەیەکی ڕانەگەیەنراو بووە پایەختی ئەو قەوارە کوردییە[٣٧٧].

هەریەکێک لەو دامەزراوانە، خاوەنی پەیکەری کارگێری تایبەت بە خۆیان بوون، بەشـێوەیەک کاروباری ناوەخۆ لەلایەن موحسـین دزەیی سـەرپەرشـتی کراوە، ئەرکەکەی بریتی بوو لە دابینکردنی ئـاسـایشـی نـاوچە ئـازادکراوەکـان و سـەرپەرشـتیکردنی کـاروبـاری پەنـابەران و بەخشـینی مۆڵەتی پشـوودان وسـەردانیکردنی خێزانەکانیان بە فەرمانبەرانی دامەزراوەکانی بەڕێوەبردنی شـۆڕش بۆ چوونە ناو سنووری ئێران[٣٧٨].

کاروباری ئەمینداریێتی گشـتی ڕۆشـنبیری و ڕاگەیاندن و لاوان لەلایەن دارا توفیق(١٩٣٢-١٩٨١)سـەرپەرشـتی کراوە و بریکارەکەی کەمال محەمەد سـەعید خەیـات بوو. ئەو دامەزراوەیە یەکێک بوو لە ئەمینـدارەتییە چـالاکەکـان و ڕۆڵێکی کاریگەری لەناو شـۆڕش بینیوە، بەهۆی بایەخدانی بەلایەنی ڕۆشـنبیری کوردی، بەتـایبەتی بەڕێوەبردنی ئێسـتگەی(دەنگی کوردسـتـان) و بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکانی(دەنگی پێشـمەرگە) و پاشـبەندی دەنگی پێشـمەرگە (کادیر) و (دیاری لاوان)[٣٧٩].

ئەمینداریێتی گشـتی پەروەردە. یەکێک بووە لە پرکارترین دەزگاکانی کارگێری حکومەتی کوردسـتان و بووە پەناگەی ئەو قوتابی و خوێندکارانەی پەیوەندییان بە شـۆڕشـی کوردەوە کرد[٣٨٠]. سـەرکردایەتی کورد سـووربوو لەسـەر ئەوەی کارێکی

---

٣٧٧ - کریس کۆچێرا، س.پ،ل٤٠٠.

٣٧٨ - کریس کۆچێرا، س.پ، ص٢٧٨.

٣٧٩ - د. ئازاد عوبێد سالح، شۆڕشی ئەیلول لە ژمارە(یەکی) گۆڤاری(دەنگی کوردستان)، لێکۆلینەوەیەکە لە ناوەڕۆکی گۆڤارەکە، چالاکیێن کۆنفرانسێ زانستیێ نێڤدەولەتیێ سیێ کۆمەکا ڤەکولەران، شۆرەشا ئەیلولێ وەچەرخانەک د دیرۆکا سیاسی یا کوردی دا، کۆنفرانسا هەڤبەش یا دەستەیا ئینسکلۆپیدیایا پارتیا دیموکراتا کوردستانێ و زانکۆیا دهۆکێ، دهۆک، ٢٠٢١، ل٣٥٦.

٣٨٠ - ئازاد عوبێد سالح، کاریگەریی شۆڕشی ئەیلول لەسەر ڕۆژنامەوانی کوردی ١٩٦١-١٩٧٥، کوردستان، ٢٠٠٧، ل٢٥٢.

وەها بکەن، ئەو کیژ و کورە خوێندکارانەی زانکۆ کە پەیوەندییان بە شـــۆڕشـــەوە کردبوو لە کوردستانی ئازادکراودا درێژە بەخوێندن بدەن[٣٨١].

بەشـێوەیەکی گشـتی ئەنجومەنی ئەمیندارەتییە گشـتییەکان، لە هەموو هەفتەیەک یەکجار لە ڕۆژی چوارشەممە بۆ گفتوگۆکردن لەسەر پێداویستی خەڵک و کاروباری سیاسی و سـەربازی کۆدەبوونەوە[٣٨٢]. هەر لەو هەفتەیەشـدا ڕۆژێک لەکاتی ئێواران لەبارەگای بارزانی کۆبوونەوەیەکیان بە سەرپەرشتی مستەفا بارزانی ئەنجامداوە، بۆ قسـەکردن لەســەر چۆنییەتی بەڕێوەچوونی کاروباری دامەزراوەکانی بەڕێوەبردنی شۆڕش[٣٨٣].

لەلایەکی دیکە مســـتەفا بارزانی لە ســـەردانێکدا کە لە(ئایاری ١٩٧٤) بۆ تارانی پایتەختی ئێران ئەنجامیدا ، وەک لە بەڵگەنامەیەکی ئاژانســـی هەواڵگری ئەمریکادا هاتووە، پێشنیازی پڕۆژەی ئۆتۆنۆمی پارتی دیموکراتی کوردستانی لە ڕۆژی( ١٦ی ئایاری١٩٧٤) خسـتە بەردەم کاربەدەسـتانی سـیاسـی ئەمریکا و ئێران[٣٨٤]، بۆ ئەوەی پشـــتگیری ڕاگەیاندنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بکەن، لە ڕێگای دانپێدانانیان بەو قەوارە ســـیاســـییەی ئامانجیانە دایبمەزرێنن و هاوکات هاوکاری دارایی پێویســـتی بۆ دەستەبەربکەن[٣٨٥].

ئەم هەوڵەی مســـتەفا بارزانی لە ڕۆژنامە عەرەبییەکاندا دەنگدانەوەی هەبوو، بۆ نمونە ڕۆژنـامەی نەهـاری لوبنـانی لە ڕاپۆرتێکیدا لە ئـایاری ١٩٧٤ بڵاویکردۆتەوە، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، پارتی دیموکراتی کوردســتان ئامادەســازی ئەنجامداوە بۆ ئەوەی بەشـــێوەیەکی تاک لایەنە، پڕۆژەی ئۆتۆنۆمی ڕابگەیەنێ. ئەو ژێدەرە لەســـەر زاری مەحمود عوســـمان بڵاویکردۆتەوە ، پارتی دیموکراتی کوردســـتان، مکوڕە لەســەر ڕاگەیاندنی ئۆتۆنۆمی لە کوردسـتان. بەپێی ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانیەکە، پڕۆژەی

---

٣٨١ – کریس کۆچێرا، س.پ،ل٤٠١.

٣٨٢ – یۆنان هورمز، س.پ، ل ٢٢٠.

٣٨٣ – محسن دزەیی، أحداث عاصرتها، ج٣، ص٢٧٩.

٣٨٤ – سەبارەت بە پڕۆژەی ئۆتۆنۆمی پارتی دیموکراتی کوردستان، بروانە پاشکۆی ژمارە(٨).

385–F.R.U.S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976,Backchannel Message From the Ambassador to Iran (Helms) to Secretary of State Kissinger, (Barzani’s letter to Secretary Kissinger), Tehran, April 17, 1974, p.688.

ئۆتۆنۆمی کوردی لەسـەر بنەمای ناچارکردنی حکومەتی عێراق بەدانپێدانان بەو ئۆتۆنۆمییەی کورد ڕایدەگەیەنێ هەنگاوی بۆ هەڵێنراوە. ئەمەش بەپێی خەملێنی ئەو ژێدەرە بەو مانەیە دێ، ئەو پارتە ئومێدی ئەوەیە ڕژێمێکی دیموکراتی و پێشـکەوتنخواز لە باکووری عێراق دابمەزرێنی، کاریگەرییەکانی ئەو ڕژێمەش بەو ڕادەیەبێ، بتوانی ڕێگربێ لەبەردەم دروسـتبوون یان بەردەوامبوونی هەر ڕژێمێکی سیاسی، کە بەشێوەیەکی دیکتاتۆری لەبەغدا حوکمڕانی بکات[٣٨٦].

مسـتەفا بارزانی بەئامانجی بەدەسـتهێنانی دانپیدانانی حکومەتی ئەمریکا بەو دەسـەڵاتە ناوخۆییە و پرۆژەی پێشـنیازکراوی ئۆتۆنۆمی شـۆڕشـی کورد، لە (٢٢ تشـرینی یەکەمی ١٩٧٤) نامەیەکی بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (هنری کسـنجەر) نووسـی. لەو نامەیەدا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە " عێراقییەکان ڕێکاری دیاریکراویان بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی ناوی لێ دەنێن(یاسـای ئۆتۆنۆمی) گرتۆتەبەر کە تایبەتە بەخۆیان. دەسـتیان کردووە بە پێکهێنانی دامەزراوەکانی تەشـریعی وتەنفیزی. ئەو ڕێکارە ڕووکەشـیانە بەلای زۆرینەی گەلی کورد پەسـەندکراونین، بەڵام ڕەنگە ئەو هەوڵە چەواشـەکاریانە کاریگەریی لەسـەر جیهانی دەرەوە هەبێ، لەلای خۆمانەوە پێویسـتە جێگرەوەیەکمان هەبێ لەڕێگای ڕاگەیاندنی شـێوازێکی سـەربەخۆیی نێوخۆیی بۆ گەلەکەمان لە کوردسـتانی عێراق، یان دامەزراندنی حکومەتێکی عێراقی باوەڕپێکراو لەناوچەکەمان، لەپێناو ئەوە پێویسـتە یەکێک لەو ڕێکارانە جێ بەجێ بکەین"[٣٨٧].

بڕوای حکومەتی ئەمریکا وابوو ڕاگەیـانـدنی نـاوچەی ئۆتۆنۆمی لەلایەن سـەرکردایەتی شـۆڕشـی کورد، بڕیارێکی دروسـت نییە[٣٨٨]. لەسـەر ئەو بنەمایە سـەرکردایەتی شـۆڕشـی کورد، کاتێک تێگەیشـتن لەوەی پرۆژەکە پشـتیوانی

---

٣٨٦ - الزعماء الاكراد قد يعلنون الحكم الذاتي من جانب واحد، النهار (صحيفة)، د.ع، ١٩٧٤/٥/٩، ص١٢.

387 -CIA-173-7-14-7, TEXT OF GENERAL MULLA MUSTAFA BARZANI'S, LETTER TO SECRETARY KISSINGERWASHINGTON, November 2, 1974, p.3. بڕوانە: نامەی بارزانی بۆ کسنجەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە پاشکۆی ژمارە(٩)

388- Ibid, p.1. سەبارەت هەڵوێستی دەزگای هەواڵگری ئەمریکا لەسەر ڕاگەیاندنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی.بڕوانە: پاشکۆی ژمارە (١٠)

نێودەوڵەتی بەدەســت ناهێنێ. بڕیاری ڕاگەیاندنی پڕۆژەی ئۆتۆنۆمیان هەڵپەســارد و بڵاویان نەکردەوە. بەم جۆرەش کۆتایی بەدوا هەوڵی شـــۆڕشــــی کورد هات، بۆ دروستکردنی قەوارەیەکی کوردی سەربەخۆ لە باشووری کوردستان.

**تەوەری دووەم: ڕۆڵی مستەفا بارزانی دامەزراندنی هێزی سەربازیی نیشتمانی ڕێکخراو**

پێکهاتەی ســەربازی ڕێکخراوی نیشــتمانی لەباشــووری کوردســتان لەســاڵی ١٩٤٣ بەهەوڵ و کۆشــشــی مســتەفا بارزانی دامەزرا، پاشــان دوای دامەزراندنی لەشــکری شــۆڕشــگێری کوردســتان لە ســاڵی ١٩٦٤دا ، بارزانی لە دیمانەیەکی ڕۆژنامەوانیدا ســـەبارەت بەهۆکارەکانی پێکهێنانی ئەو هێزە دەڵێت:"یەکەکانی پێشـــمەرگە وەک وەڵامـدانەوەیەک، بۆ پێویســـتیەکی مێژوویی و نەتەوەیی پێکهات ... وەکو هێزێکی بەرگری بۆ پاراستنی ژیان وکەرامەتی گەل"[٣٨٩].

بانگەوازەکانی شێخ مەحمودی حەفید لە شۆڕشی ١٩١٩ و شێخ سەعیدی پیران لە شـۆڕشـی ١٩٢٥ و خۆیبون لە شـۆڕشـی ئارارات (ئاگری داغ) ١٩٢٧_١٩٣٠ بۆ هێزە نیشتمانپەروەرەکان بۆ هاریکاریکردنی شۆڕشی کورد و بەدەنگەوەهاتنی شێخ ئەحمەدی بارزانی وەک ڕێبەری ڕۆحی ئێلی بارزان و ڕەوانەکردنی هێزی سەربازیی پشـتیوانی ئێلەکەی بەفەرماندەیی مسـتەفا بارزانی بۆ هەر یەک لەم شـۆڕشـانە[٣٩٠]، ســـەرەتای دەرکەوتنی خواســـتی نیشـــتمانپەروەرانی کورد بوو بۆ یەکخســـتن و یەکگرتنی هێزە کوردییەکان لەســـەدەی بیســـتەم[٣٩١]. کە دواجار مســـتەفا بارزانی ئەو خواستەی هێنایەدی، بەم شێوەیەی لەو باسەدا دەیخەینەڕوو:

---

٣٨٩ – البارزاني يدلي بتصريحات هامة، خەبات، ع(٤٧٦)، شباط ١٩٦٥، ص٧.

390 – Michael G. Lortz, op.cit, Pp.11, 14, 17.

391 – Hussein M. Khorsheed, the Role of Subnational Forces in Combating Terrorism during Civil War: The Case of Peshmerga of Kurdistan Region-Iraq AGAINST ISIS (2014–2017), Master of Arts in Security Studies (Combating Terrorism: Policy and Strategy) National Security Affairs, Naval Postgraduate School, California, 2020, p.17

## باسی یەکەم: ڕۆڵی مستەفا بارزانی لە ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان

توێژەرێکی ئەمریکی لە شێوازەکانی شەڕی نارێکخراو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، مستەفا بارزانی بە دامەزرێنەری هێزی سەربازی ڕێکخراوی نیشتمانی کورد دەناسێنێ و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، ئەو سەرکردەیە دوای بەشداریکردنی لەم شۆڕشانەی لە پێشەوە ئاماژەیان پێکرا، پاشان بەتێکەڵبوونی لەگەڵ ژمارەیەک لە نیشتمانپەروەرانی کورد لەماوەی دوورخراوەیی لەنێوان سالآنی ( ١٩٣٣_ ١٩٤٣ ) لە موسڵ و سلێمانی، بیری نەتەوەیی گەشەی کرد، دوای ئەوەی لە (تەمموزی ١٩٤٣) گەڕایەوە زێدی خۆی لە بارزان ، بڕیاری هەڵگیرسانی ڕاپەڕینێکی دیکەی دا. ئەو ڕاپەڕینە، بیرۆکەی پێکهێنانی هێزێکی ڕێکخراوی نیشتمانی لە ڕێگای یەکخستنی هێزی هۆزەکان لەلای بارزانی گەلالە کرد[٣٩٢].

مستەفا بارزانی دوای هەڵگیرسانی ڕاپەڕینەکە، بانگەوازی بۆ چەند هۆزێکی کوردی کرد پشتگیری بکەن، لەگەڵ وەلآمی ئەرێنی بەشێکیان بۆ داواکارییەکەی، یەکەم هەنگاوی بۆ دامەزراندنی هێزێکی نیشتمانی کوردی لەژێر فەرماندەیی و سەرکردایەتی خۆی هەلێنا[٣٩٣].

هێزەکەی بارزانی لە ماوەی چەند مانگێکی کەم، ژمارەی جەنگاوەرانی گەیشتە (٢) هەزار کەس. لەپێناو ڕێکخستنیان، لەسەر فەرمانی مەلا مستەفا دابەشی سەر چەند دەستەیەکی شەڕکەرکران و ئەرک و بەرپرسیارەتی بەڕێوەبردنیانی بەهەر یەک لە محەمەدئەمین میرخان و مامەند مەسیح و سالّح کانی لەنجی سپارد[٣٩٤].

سەبارەت بە چۆنیەتی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری سەربازییان، بارزانی چەندین ڕێنمایی و ڕاسپاردەی پێگەیاندن، لەمانەش پێویستی گوێڕایەڵی جەنگاوەران بۆ فەرمانەکانی سەرووی خۆیان و جێبەجێکردنیان و پێویستی ڕەفتارکردنی فەرماندەکان لەگەڵ جەنگاوەران بەشێوەیەکی برایانە و ئامۆژگاریکردنیان لەسەر چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردنیان لەگەڵ خەڵکی سڤیل و دیلەکانی دوژمن و شێوازی دابەشکردنی دەستکەوتەکانی شەڕ[٣٩٥].

---

392 –Lortz, op.cit, p.20.

393 – Khorsheed, op.cit, p.15.

٣٩٤ – مسعود بارزانی، بارزانی ...(١٩٣١–١٩٥٨)، ل٨٩.

395 – Lortz, op.cit, p.20.

مســـتەفا بارزانی دوای ئەوەی وەک فەرماندەی گشـــتی هێزە چەکدارەکانی شۆڕش لەلایەن لیژنەی ئازادی دەستنیشانکرا، دەستیکرد بە ڕێکخستنی هێزەکانی و بەســەر بەرەکانی شــەڕ لە بارزان و ئاکرێ و ئامێدی دابەشـیکردن، لەو سـۆنگەوە مسـتەفا خۆشـناو(١٩١٢_١٩٤٧) وەک فەرماندەی لەشـکر لەکەرتی (مێرگەسـۆر _ رەواندز) و عزەت عەبدولعەزیز وەک فەرماندەی کەرتی (ئامێدی) و شـێخ سـلێمان بـارزانی بە فەرمـانـدەی کەرتی (ئـاکرێ) دەســـتنیشـــانکران. ئەم فەرمـانـدانە بە ســەرکردایەتی گشـتیی هێزەکانی شـۆڕش کە مەلا مسـتەفا خۆی بەڕێوەی دەبرد بەسـترانەوە[٣٩٦]. بەم شـێوەیە ئەو گۆڕانەی لە پێکهاتە و سـتراتیژی خەباتی چەکداری پێشـــمەرگەدا هاتەدی، هۆکاری ســـەرەکی بوو بۆ ئەوەی ئەو هێزە گوزارشـــت لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی بکات[٣٩٧].

ئەو هێزانەی بەدرێژایی مـاوەی ڕاپەڕینی دووەمی بـارزان ڕێکخران، لە دوای (٢٥ی ئابی١٩٤٥) ســـەرکەوتنی گەورەیان بەســـەر لەشـــکری حکومەتی عێراقی بەدەســـتهێنا[٣٩٨]، ئەگەر ناپاکی ســـەرۆک هۆزەکان و یارمەتییەکانی هێزی ئاســـمانی بریتانیا نەبوایە، ســـوپای عێراقی لە ســـەرکەوتنی بەســـەر ڕاپەڕینی کورد، نائومێد دەبوو[٣٩٩]. بەڵام ئەو هەماهەنگییە ســـەربازییەی نێوان حکومەتی عێراق و بریتانیا، دەرئەنجامەکەی پەڕینەوەی مســـتەفا بازرانی و ئەندامانی ســـەرکردایەتی لیژنەی ئـازادی بوو[٤٠٠]، بۆ ئێران و دواتر هەر ئەوان بوونە پشـــتیوانی ســـەرەکی بۆ دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد وەکو پێشتر باسمانکردووە.

---

٣٩٦ – مسعود بارزانی، بارزانی ...(١٩٣١–١٩٥٨)،ل١١٥.

397 – Lortz, op.cit, p.23.

٣٩٨ – بروانە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٩٣١– ١٩٥٨)، ل ل ١٣٠– ١٣٣.

399 –Joseph R. Rudolph Jr, Encyclopedia of Modern Ethnic Conflicts, 2nd Edition, Santa Barbara, 2015, p.271.

٤٠٠ – ئەو ئەندامانەی لیژنەی ئازادی کە لەگەڵ بارزانی چوونە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بریتی بوون لە( عیزەت عەبدولعەزیز، سەید عەزیز سەید عەبدوڵڵا، مستەفا خۆشناو، میرحاج ئەحمەد، محەمەد مەحمود قودسی، عەبدولرەحمان مفتی و شەوکەت ئەفەندی، بەکر عەبدولکەریم، نوری ئەحمەد تەها، محەمەد ساڵح و ئەحمەد ئەفەندی کۆیی). مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٩٣١– ١٩٥٨)، ل١٤٩.

دوای دامەزراندنی کۆماری کوردستان بەسەرۆکایەتی قازی محەمەد لە (کانونی دووەمی ١٩٤٦)، پێکهاتەیەکی دیکەی سەربازی ڕێکخراو لە مێژووی بزاقی ڕزگاریخوازی کوردی دامەزرا[٤٠١]، کە وەزیری جەنگ و سوپا سالار و چوار ژەنەراڵی هەبوو، مستەفا بارزانی وەک یەکێک لە فەرماندە باڵاکانی سەربازی کۆمار، پلەی ژەنەراڵی وەرگرت و لەگەڵ ئەو هێزەی لەگەڵیدابوو ئەرک و بەرپرسیارەتی پاراستنی کۆماری کوردستانی کەوتە ئەستۆ[٤٠٢]، سەبارەت بەو بابەتە بارزانی لە وتەیەکدا، کە دەقەکەی لە ڕۆژنامەی کوردستان بڵاوکراوەتەوە، ئاماژە بە ئەرکە سەربازییەکەی لە کۆماری کوردستان دەکات و دەڵێت:" ئەوە شەرەفێکی زۆر گەورەیە، کە وەک پێشمەرگە لە شۆڕشی ئازادیدا بەشداربم و شەرەفێکی زۆر گەورەترم وەرگرت، کە هێزی ئازادی سەرکردایەتی خۆی دامێ بۆ پارێزگاری کوردستان"[٤٠٣].

یەکێک لە دەرهاویشتە ئەرێنییەکانی بەشداریکردنی مستەفا بارزانی لەگەڵ هێزەکەی لە کۆماری کوردستان، بەدەستهێنانی نازناوی ( پێشمەرگە ) بوو بۆ جەنگاوەرانی کورد، لەشوێنی بەکارهێنانی ناوی (سەرباز) بەزمانی فارسی، بەو جۆرەش بارزانی وەک فەرماندەی هێزی پێشمەرگە، لە دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان، بەردەوامی بە خەباتی چەکداریدا، لەبزاقی ڕزگاریخوازی کوردیدا[٤٠٤].

ژیدەرێک وای دەبینێ کە هاتنی مەلا مستەفای بارزانی بە پێشەوایەتی جەنگاوەرانی بۆ کوردستانی ئێران وەک دیارییەکی خودایی چاوەڕواننەکراو بوو بۆ قازی محەمەدی سەرۆکی کۆماری کوردستان، لەبەرئەوەی قازی لەو کاتەدا، هیچ جۆرە سوپا و لەشکرێکی شەڕکەری ڕێکخراوی بەتوانای نەبوو، ئەوەندە نەبێ لەلایەن خەڵکی دانیشتووی شاری مەهاباد و هەندێک لە ڕۆڵەی هۆزە کوردییەکان لە

---

401 – Karwan Salih Waisy, The Kurdish Peshmarga Force 1943–1975, Global Journals Inc, Volume 15, Issue 2 ,Version 1.0, USA, 2015,p.26.

٤٠٢ – مرتضى زريخت، من كردستان العراق حتى الضفة الاخرى لنهر أراس، فى البارزاني من مهاباد ألى أراس، ص٣١٦.

٤٠٣ – بڕوانە: خطابەی زعیم جنابی مەلا مصطفى بارزانی لە: کوردستان(ڕۆژنامە)، ژ(٢٧)، ٢٥ مارسی ١٩٤٦، ل١-٢؛ وەرگیراوە لە:ڕۆژنامەی کوردستان (مەهاباد ١٣٢٤-١٣٢٥ی هەتاوی- ١٩٤٦ی زایینی)، دەزگای ئاراس، هەولێر،چ٢، ٢٠١١،ل١٠٩-١١٠.

404 – Lortz, op.cit, p.34.

ئێران پشتگیری دەکرا[٤٠٥]. لەسەر ئەم بنەمایە، ژێدەرێک هێزەکەی بارزانی بە بڕبڕەی پشـــتی کۆماری کوردســـتان داناوە[٤٠٦]. یەکێکی دیکەش ئەوان بە گەورەترین و ڕێکخراوترین هێزی ســەربازی کۆمار دەناسـێنێ و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە دوای ئەوەی جارێکی دیکە چەکدارکرانەوە و لەچەند یەکەیەکی ســـەربازیدا ڕێکخران و لەچەندین شــەڕدا بەرامبەر ســوپای ئێرانی لەبەرەی ســەقز، بەرگری بەهێزیان لە کۆمار کرد، توانیان زیانی ماددی و گیانی زۆر بەهێزەکانی ئێران بگەیەنن[٤٠٧].

دواجار ڕووخانی کۆماری کوردستان لە(١٧ی کانونی یەکەمی١٩٤٦)، بووە هۆی لەناوچوونی ڕێکخســتنە ســەربازییە کوردییەکە، دوای ئەوەی زۆربەی جەنگاوەران گەڕانەوە ناو هۆزەکانیان، بارزانی خۆی و هێزەکەی بەتەنیا مانەوە، ئەو کاتە لەوە گەیشـــت ئەوان بەتەنها لە ڕۆژهەڵاتی کوردســـتان ناتوانن ئەو هێزە ئامادەبن پارێزگاری لە پاراستنی ئەو قەوارە کوردیە بکەن، لەبەرامبەر سوپا و لەشکری ئێران، بەهۆی نەبوونی پاڵپشتی هۆزەکانی ئەو ناوچەیە، بەتایبەتی دوای ئەوەی ژمارەیەکیان هێزەکانی خۆیان دایە پاڵ هێزەکانی ئێران[٤٠٨].

مستەفا بارزانی بەهۆی هاتنە پێشەوەی ئەو دۆخە سەربازییە، بڕیاریدا خۆی و هێزەکەی لە ئێراندا بە ئاراســـتەی عێراق بکشـــێنەوە، ئەو بڕیارەش ڕووبەڕووی ئالانگەری دژوار و ســەختی کردنەوە، بەهۆی بەریەککەوتنە ســەربازییەکانیان لەگەڵ لەشـــکری ئێرانی لە (نەلۆس) و (گوجار) لە (ئاداری ١٩٤٧)، ئەمە وێڕای ڕووبەڕووبوونەوەی دیکەی سەربازی لە هەمان مانگ[٤٠٩].

ســـەرەڕای ئەو دۆخە ئالۆزەی ڕووبەڕوویان بویەوە، بارزانی و هێزەکەی یاوەری بوون، بە مۆڕاڵێکی بەرزەوە لە(١٩ی نیســـانی١٩٤٧) پەڕینەوە ناو خاکی

٤٠٥ – جوناثان راندل، أمة في شقاق دروب كردستان ،كما سلكتها، ت: فادي حمود، ط١، بيروت،١٩٩٧،ص١٧٠.

406 –Hussein Tahiri, The Structure of Kurdish Society and the Struggle for a Kurdish State, Mazda Publishers, Costa Mesa, USA, 2007, p.84.

407 – Chapman, op.cit، p.46.

408 – Lortz, op.cit, p.31–35.

٤٠٩ – بروانە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٩٣١– ١٩٥٨)، ل ل١٧٧،١٧٨،١٨٠.

عێراق[٤١٠]. بەڵام بەهۆی ئەو دۆخەی حکومەتی عێراقی بۆ هەموو ئەوانەی لە ئێران گەڕانەوە خوڵقاندبووی، نەیانتوانی لەناوچەکە بمێننەوە، لەبەرئەوەی خزم و کەسوکار و لایەنگرانیان زۆربەیان دەستگیرکران و خرانە زیندانەوە، ئەمە سەرەڕای دەست بەسەرداگرتنی موڵک وماڵەکانیان و تەنانەت لە سێدارەدانی بەشێکیان[٤١١]. لەئەنجامدا بارزانی و هێزەکەی لەگەڵیدا بوون، بۆ جارێکی دیکە لە (٢٧ی ئایاری١٩٤٧) بڕیاریاندا بگەڕێنەوە ناو سنووری ئێران و لەوێشەوە بە سێ هەفتە و دوای ئەنجامدانی چەندین شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی، وەک ئەو هەوڵەی سوپای ئێرانی لە ڕێگای هێرشێکی بەرفراوان لە ڕۆژی (١٥ی حوزەیرانی١٩٤٧) لە گۆشەی باکووری ڕۆژئاوای چیایی بۆ لە ناوبردنی هێزەکەی بارزانی ئەنجامیدا، کە نەیتوانی تێیدا سەرکەوتووبێ[٤١٢]. هێزە کوردیەکە توانیان لە ڕۆژەکانی(١٧) و (١٨)ی حوزەیرانی ١٩٤٧ بپەڕنەوە ناو سنووری یەکێتی سۆڤیەت[٤١٣].

یەکێک لە ئامانجەکانی بارزانی لەو ڕێپێوانە مێژووییەدا، پاراستن و پارێزگاریکردن بوو لەو هێزەی، داینەمۆی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی بوو لە باشووری کوردستان. ئەوان کاتێک پەڕینەوە ناو خاکی سۆڤیەت، هەرچەندە ماوەیەک لە مستەفا بارزانی جیاکرانەوە[٤١٤]. بەڵام دواتر لە(٢ی کانونی یەکەمی١٩٤٧) بەهۆی هەوڵەکانی ئەوەی دوایی هەموویان لە باکۆی پایتەختی کۆماری ئازەربیجانی سۆڤیەت بەیەکەوە کۆکرانەوە[٤١٥].

لە باکۆ، مستەفا بارزانی جارێکی دیکە هێزەکەی ڕێکخستەوە و فەوجێکی لێ پێکهێنان و ئەسعەد خۆشەوی[٤١٦] بە فەرماندەی فەوج و هەریەک لە (سەعید وەلی

---

410 – Chapman, op.cit, p.47.

411 – O'balance, op.cit, p. 56.

412 – Iranians Encircle Barzani Tribesmen, (New York Times), June 16, 1947, p. 8.

413 – Chapman, op.cit, p.47.

٤١٤ – بروانە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٩٣١–١٩٥٨)،ل١٩٥.

415- О.л. Жигалина. Предыдущий источник, С.114.

٤١٦ – ئەسعەد خۆشەوی(١٩١٧–١٩٧٧): لەدایکبووی گوندی سێلکی– مێرگەسۆرە لە سنووری پارێزگای هەولێر. ساڵی ١٩٤٣ بەشداری ڕاپەڕینی دووەمی بارزانی کردووە. ساڵی ١٩٤٥ لەدوای نسکۆی شۆڕشەکە لەگەڵ مستەفا بارزانی ڕووی کردۆتە ڕۆژهەلاتی کوردستان. لەساڵی ١٩٤٧ لەگەڵ

بەگ وحەمەدەمین میرخان و مامەند مەسیح و مستۆ میرۆزی) بە فەرماندەی(سریە) دەستنیشانکرد. ئەو کات حکومەتی ئازەربیجان یەکێک لە فەرماندە سەربازییەکانی بەناوی (کازمۆف)ی بە سەرپەرشتیاری مەشق پێکردنیان دامەزراند[417]. پاشان جلوبەرگی سەربازی و چەکی تازەی روسییان بۆ دابینکراو و خرانە ناو خولێکی مەشق و ڕاهێنان لەژێر سەرپەرشتی ئەفسەرانی سۆڤیەتی وەک ( کولییف و کریموف و زینالوف و مامیدۆف)، لەپێناو ئامادەکردنیان بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی سەربازی ڕێکخراو[418]. ئەو هەنگاوە بەهەر مەبەستێک بووبێ، سەرەنجام ئەزموون و توانای سەربازی پێشمەرگەکانی بارزانی زیاد کرد و بە شێوەی هێزی سەربازی ڕێکخراو ئاشنا بوون.

وەکو پێشتر باسکراوە، ژیانی بارزانی و هەڤاڵەکانی لەماوەی حکومڕانی جۆزیف ستالین، زەحمەت و دژوار بوو، بەڵام دوای مردنی ستالین لە ساڵی ١٩٥٣، گۆڕانی ئەرێنی بەسەر بارودۆخی بارزانییەکاندا هات، بەتایبەتی دوای دیداری بارزانی لە حوزەیرانی ١٩٥٣ لەگەڵ نیکیتا خروشوفی سەرۆکی نوێی سۆڤیەت[419]. دوای ئەم دیدارە، بارزانی لیستی ناوی (١٠٤) لاوی کوردی ئامادەکرد کە یاوەری بوون، بۆئەوەی حکومەتی سۆڤیەت بیانخاتە زانکۆکانی (بیلاروسیا) بەمەبەستی فێربوونی زانستە جۆراوجۆرەکان و تەواوکردنی خوێندن. ئەوانەی ناویان لەو لیستەدا بوو، بەسەر چوار بەش دابەشکران و ڕەوانەی زانکۆکانی (ساراتوف، گۆرکی، ئیڤانۆف، تامبۆف) کران، ژمارەیەکی دیکەشیان چوونە زانکۆی تاشقەند[420].

بارزانی پێگەیاندنی ئەو لاوانەی لەڕووی مەعریفییەوە، وەک پێداویستییەکی سەرەکی جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی سەیرکرد. هەر بەو ئامانجەش دوای ڕێپێدان و کارئاسانی حکومەتی سۆڤیەت بۆ ئەو داواکارییەیان، خۆی هاوشێوەی

---

بارزانیدا چۆتە سۆڤییەت. عەبدوڵا رحمان مەلازادە، شێوەی پێکهاتەی سەربازی شۆڕشی ئەیلولی مەزن، دهۆک،٢٠٢١،ل١٥.

٤١٧ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٩٣١–١٩٥٨)،ل١٩٧.

418- О.л. Жигалина, op.cit, 2013, С.114.

٤١٩ – خالد خالد کۆچی،السياسة السوفيتية تجاه القضية الكردية في الميزان، ستوكهولم، ١٩٩٠، ص٤٤.

٤٢٠ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٩٣١–١٩٥٨)،ل٢١٣.

هەڤاڵەكانی لە ئەكادیمیای سیاسی سۆڤیەتی لە مۆسكۆ بەمەبەستی ئاشنابوون و تێگەیشتن لە زانستی سیاسی، دەستی بە خوێندن كرد[٤٢١].

دوای ئەوەی بۆ ماوەی (١٢) ساڵ لە تاراوگە ژیانیان بەسەربرد، لە ئەنجامی سەركەوتنی شۆڕشی (١٤ی تەمموزی ١٩٥٨)، بارزانی و هەڤاڵەكانی گەڕانەوە عێراق، بەڵام ئەو ژیانە ئارامەی كە بۆیان دەستەبەر بوو، زۆر دیژەی نەكێشا، سەرباری هەڵوێستی ئەرێنی بارزانی بۆ بەردەوام بوونی ئاشتەوایی، بەڵكو شەڕ بەسەر كورد سەپێنرا. دواجار شۆڕشی كورد لە ئەیلولی ١٩٦١ هەڵگیرسا. لەسەرەتادا هێزەكانی بارزانی بەو ژمارەیە نەبوون، چاوەڕوانی ئەوەیان لێ بكرێ بتوانن بەشێوازی شەڕی بەرەیی، پارێزگاری لەمانەوەی خۆیان بكەن. بۆیە بەهۆی هاوسەنگ نەبوونی هێز لەنێوان هەردوولا، بارزانی پشتی بە ئەزموونی ڕابردووی خۆی بەست و بڕیاریدا شەڕی پارتیزانی پیادە بكات، كە بۆ ناوچە شاخاوییەكانی كوردستان گونجاوترین شێوازی شەڕ بوو، لە بەرامبەر هێزەكانی حكومەتی عێراق[٤٢٢].

لەسەرەتای هەڵگیرسانی ئەو شۆڕشە، ژمارەی پێشمەرگە كەمبوون، بارزانی لەدیدارێكی ڕۆژنامەوانی لەگەڵ چەند پەیامنێرێكی ڕوسی، ئاماژەی بۆ ئەوە كردووە، كە لە ئەیلولی ١٩٦١ كاتێ سوپای عێراقی هێرشی كردە سەر كوردستان، تەنها (٦٠٠) شەڕكەری چەكداری هەبوو، ئەو دەڵێ هەرچەندە خەڵكی دیكە هەبوون كە ئامادەبوون بەرگری لە وڵاتەكەیان بكەن، بەڵام چەك و پێداویستی سەربازییان نەبوو، بەهۆی نەبوونی پاڵپشتی دەرەكی بۆ هێزە كوردیەكان. بۆیە لەو كاتەدا شۆڕش بۆ چەكداركردنی پێشمەرگەكانی، پشتی بەست بە دەستكەوتەكانی شەڕ[٤٢٣].

لەلایەكی دیكە ڕێكخستنی هێزی پێشمەرگە زۆر لاوازبوو، ئەو چەكەی بەدەستیانەوە بوو بە پێوەری نوێی سەربازی، سادە و ساكار بوو. تەنانەت ئەو

---

421 -Евгений Примаков, БлижнИЙ Восток на сцене и за кулисами (вторая половина XX - начало XXI,2006, с.325.

422 – Dana Adams Schmidt, Kurds' Guerrilla Tradition Aids Rebels in War on Iraqi Army,The New York Times, September 12, 1962,p.1؛Michael M. Gunter, the Kurds of Iraq, p.13.

٤٢٣ – از مطبوعات شوروی مسئله كردها در عراق، خواندنیها (مجله)، ش (٥٢)،(١٢مارس١٩٤٤)، ص٨

هێزانە لەو کاتە لە بەرەکانی جەنگ بوون، هیچ پاڵپشتیەکی سەربازییان نەبوو، بەڵکو بەهۆی کەمی چەکی قورس و خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان، ڕووبەڕووی ئاریشەی زۆر دەبوونەوە. جگە لەمانەش ئامێری بێتەلی پێویستیان بۆ ڕوومالکردنی مەودایەکی دیاریکراو و پەیوەندیکردن بە سەرکردایەتی خۆیان لەبەردەست نەبوو[٤٢٤].

مستەفا بارزانی نەبوونی چەکی قورسی لە سەرەتای شۆڕش بەگەورەترین مەترسی و هەڕەشە سەیر دەکرد لەسەر بزاڤەکە، هاوکات نەبوونی کارمەندانی تەندروستی لەپاڵ هێزەکانی پێشمەرگە بەڕادەیەکی زیاتر مەترسیدار بوو، تەنانەت دۆخی مرۆیی خەمناکی لێکەوتەوە، بەجۆرێک کاتێک پێشمەرگەیەک لەبەرەکانی شەڕ زامدار دەبوو، ئەو کارمەند و پێداویستییە تەندروستیانەی پێویست بوون بۆ تیمارکردنی بەردەست نەبوون[٤٢٥]. سەرەڕای ئەوەش، وەکو لە ژێدەرێکدا هاتووە: "ئەوەی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان لەگەڵ بوونی ئەو کەموکوڕییانە ئەنجامیاندا، ئەستەم بوو بە هیچ هێزێکی سەربازی ڕێکخراو لەو قۆناغە ئەنجام بدرێ"[٤٢٦].

ئەو ڕێکارە سەربازییانەی بارزانی لەسەرەتای شۆڕشەکە لەدەڤەری بادینان ئەنجامیدا، ڕێکای بەپەلە و خێرابوون و پێویستیان بە پێداچوونەوە و ڕێکخستنەوەیەکی نوێ هەبوو، بۆیە لەڕۆژی (٢٥_٢٩ی کانونی یەکەمی١٩٦١ ) لەگوندی (عەودالان)[٤٢٧] کۆبوونەوەیەکی بەرفراوانی سەربازی لێژنەی مەرکەزی پارتی دیموکراتی کوردستان ڕێکخرا و لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیاردرا هێزەکان جارێکی دیکە ڕێکبخرێنەوە ناوی (پێشمەرگە) وەک ناوی جەنگاوەرانی کورد و شۆڕشەکەش

---

424 – Uriel Dann, Iraq under Qassem,a political history, 1958_1963, New York, 1969, p.339.

٤٢٥ – بروانە: عەبدوڵلا سالح مستەفا(چاوپێکەوتن)، ئا: میدیا خالید سالح، پەیامی ئەیلوول (گۆڤار)، ژ(٢١)، تەمووزی ٢٠١١، ل٥٢، ٥٣.

426 –Uriel Dann, op.cit, p.339.

٤٢٧ – عەودالان: گوندێکە لە سنووری پارێزگای سلێمانی، دەکەوێتە نزیک چیای پیرەمەگرون، لەو کاتەدا بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی لێبووە. هاوکار کەریم حەمە شەریف، شۆڕشی ئەیلول( لێکۆلینەوەیەکی مێژوویی لە ڕێکخستن و چالاکییە سەربازییەکان ١٩٦١–١٩٧٠)، هەولێر، ٢٠١٢،ل٦٧.

بە شـۆڕشـی ئەیلول و هێزی شـۆڕشـگێری کوردسـتانیش بە (هێزی پێشـمەرگە) بناسێنن، هەر لەو کۆبوونەوەیەشدا دروشمی (کوردستان یان نەمان) بەرزکرایەوە[٤٢٨].

لەدوای تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێک، بەدیاریکراویش لە (١ی کانونی دووەمی١٩٦٢)، بارزانی بڕیاری لەسەر پێکهێنانی دوو ( لق )ی هێزی پێشمەرگە دا، لەسەر شێوازی هێزی سـەربازی ڕێکخراوی عێراقی، کە هەریەک لەوانە لە سێ ( پەل ) وهەر پەلێکیش لە سێ ( دەستە) پێک دەهات[٤٢٩]. بەڵام هیچ یەکێک لەو دوو لقانە، شوێن و بارەگا و بنکەیەکی دیاریکراویان نەبوو، بەڵکو بەپێی پێویسـتی دۆخەکە، جوولەیان بەو هێزانە کردووە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە[٤٣٠].

ئەو ڕێکخسـتنانەی لە ڕیزی پێشـمەرگە ئەنجام درا، کاریگەریی لەسـەر گۆڕینی ئاراسـتەی شـەڕ و دروسـتکردنی جۆرێک لە هاوسـەنگی هێز هەبوو، بەو هۆیەوە لەماوەیەکی کورتدا لە زسـتانی(١٩٦١_ ١٩٦٢)، هێزەکانی پێشـمەرگە توانیان دەسـت بەسـەر چەندین نـاوچە و ڕووبەری بەرفراوانی زەوی دابگرن، وەک دەسـت بەسـەرداگرتنی قەزای زاخۆ و بەرەی ( دهۆک_ ئامێدی). سـەرەڕای ئابلوقەدانی شارۆچکەی ئامێدی[٤٣١].

لەلایەکی دیکە شارۆچکەی کۆیە و چیای سەفین لە دەوروبەری شاری هەولێر، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی پێشمەرگە. لەپارێزگای سلێمانیش، پێشمەرگە چوونە ناو شـارۆچکەکانی (هەڵەبجە) و (چوارتا) و (تەوێڵە) و شـارۆچکەی (پێنجوێن)یان ئابلووقەدا. تەنانەت لەدەوروبەری شـاری کەرکوک، توانیان دوای زاڵبوون بەسـەر هێزەکانی حکومەتی عێراقی، ناحیەی (قادر کەرەم) و (سەنگاو) دەست بەسەردا بگرن و هەوڵیاندا ڕێگای (کەرکوک_ سـلێمانی) بخەنە ژێر دەسـەڵاتی خۆیان. ئەوە سەرباری ئەوەی چەندین جار هێرشیان کردە سەر دامەزراوەکانی نەوت، بەئامانجی ڕاگرتنی بەرهەمهێنانی نەوت لەو کێڵگانەی لەناوچەکەدا بوون[٤٣٢].

---

٤٢٨ – هـس، ل٨٥.

٤٢٩ – مەسعود بارزانی، بارزانی وبزووتنەوەی...،ب٣، ل١٨٧.

٤٣٠ – أوریل دان، م.س، ص٣٨٣.

٤٣١ – بروانە: هوژین سەرنی، س.پ، ل٦٤–٦٥.

٤٣٢ – أبراهيم فيصل الانصاري، أيام لا تنسى( مذكرات الفريق الاول الركن أبراهيم فيصل الآنصاري رئيس أركان الجيش العراق الاسبق)، تحقيق: علاءالدين حسين مكي خماس، شركة دار الاكاديميون للنشر والتوزيع، عمان،٢٠١٩.ص١٤٨–١٤٩.

ئەو هێرشــە پارتیزانیانەی هێزی پێشــمەرگە ئەنجامیاندا، تەنها بۆ ســەر مۆڵگە و بنکە و بارەگاکانی ســوپای عێراقی نەبوو، بەڵکو بەشــێک لەناوچە و ســنووری ئەو هۆزانەشی گرتەوە، کە لەسەنگەری دوژمنانی پێشمەرگەبوون و لە شەڕدا هاوکار و یارمەتیدەری حکومەتی عێراقی بوون، بەتایبەتی ئەو هۆزانەی لە سنووری پارێزگای موسـڵ بوون. بۆیە هێزی پێشـمەرگە لەگەڵ دەسـتپێکردنی پرۆسـە پارتیزانییەکانیان هێرشیان کردە سەر هۆزەکانی زێباری و هەرکی کە لەناوچەی (گردەسین) بوون و هەروەها هێرشیان کردە سەر هۆزی شەرفانی و گوندەکەیان ئابلووقەدان[٤٣٣].

لەپێناو ڕێکخســـتنی کاروباری بەرەکانی شـــەڕ، بارزانی چەندین ڕێنمایی بە هێزەکانی پێشـــمەرگە دا، وەک دوورکەوتنەوە لە چوونە ناو گوندەکان لەژێر هەر بیانوێک بێ، ئەمەش بۆ پاراســتنیان لە بۆردومانی ئاســمانی، هەروەها ڕێنمایی پێدان، کە نابێ لە ڕێگەی هێزەوە کەلوپەل لە خەڵکی گوندەکان زەوت بکەن و پێویسـت بوو لەســـەریان ملکەچی ئەو فەرمانانەبن کە لەلایەن فەرماندەکانەوە دەردەچن و بەبێ دوو دڵی جێبەجێیان بکەن، وێڕای هەوڵدان بۆ بەفیرۆنەدان و دەستگرتن بە تەقەمەنی و گرتنەبەری ئامادەکاری پێویست بۆ خۆپاراستن لە بۆردومانی تۆپ و فرۆکە[٤٣٤].

لەلایەکی دیکە هێزەکانی پێشـــمەرگە ڕێنمایی پێویســـتیان لە بارزانی وەرگرت ســـەبارەت بە چۆنیەتی دەســـتنیشـــانکردنی خاڵە لاوازەکانی دوژمن بۆ ئەوەی لەو خاڵانەوە هێرش بکەنە سەر سوپای عێراق و دووربکەونەوە لە کوشتن یان ئازاردان یان شـــکاندنی ئابڕووی ســـەربازە دیلەکان و هەوڵبدەن هەماهەنگی لەگەڵ هێزە هاوســـەنگەرەکانیان بکەن و لەکاتی شـــەڕ یارمەتی یەکتری بدەن و پەناببەنە بەر شـــێوازی شـــەڕی پارتیزانی و دابەشـــی ســـەر چەند گروپێکی بچووکبن، بۆ کەمکردنەوەی قەبارەی قوربانییەکان[٤٣٥].

بەم شـێوەیە، هەوڵەکانی مسـتەفا بارزانی بۆ ڕێکخسـتنی هێزی پێشـمەرگە لە ســەرەتاکانی شــۆڕشــی کورد بە ئەنجام گەیشــت، بە تایبەتی دوای ئەوەی هێزی پێشـــمەرگەی کوردســـتـان لە (ئـاداری١٩٦٢) بەدواوە لە ڕووی چەنـدایەتی و

---

٤٣٣ – م.ن، ص١٤٩.

٤٣٤ – شێرزاد زکریا محمد، س.پ ، ل٢٦،٢٧.

٤٣٥ – شێرزاد زکریا محمد، س.پ ،ل٢٦،٢٧.

چۆنایەتییەوە، بەرە و گەشەکردنێکی خێرا هەنگاوی نا و لقەکانی گەیشتنە (١٥) لق[٤٣٦].
دوای ئەوەی هەر لەو مانگەدا ناوچەیەکی بەرفراوانی زەوی لە سنووری سوریا تا خانەقین، بەدرێژایی(٣٠٠) میل و پانی نزیکەی(٧٠) میل کەوتە ژێر دەستیان[٤٣٧].

بەهۆی ئەم بەرەو پێشەوەچوونەی هێزەکانی پێشمەرگە، مستەفا بارزانی لە (نیسانی١٩٦٢)، کاریکرد بۆ ئەوەی جارێکی دیکە هێزەکانی پێشمەرگەی لە بادینان ڕێکبخاتەوە. ئەو کاتە دەستیکرد بە دابەشکردنی هێزەکانی لەم ناوچەیە بۆ سەر سێ هێزی سەرەکی و (ئەسعەد خۆشەوی) بە فەرماندەی گشتی دەڤەرەکە و (محەمەد ئەمین میرخان)ی بە فەرماندەی هێزی گورزوەشێن و (عیسا سوار)ی بە فەرماندەی کەرتی زاخۆ دامەزراند، کە (٦٠٠) پێشمەرگەی لەگەڵدا بوو، لەهەمان کات (عەلی خەلیل خۆشەوی)[٤٣٨]کە نزیکەی (٣٥٠-٤٠٠) پێشمەرگەی لەگەڵدا بوو، ئەرک و بەرپرسیارەتی بەرەی شەڕی لە دهۆک و ( حەسۆ میرخان دۆڵەمەری ) ئەمیش نزیکەی (٤٠٠) پێشمەرگەی لەگەڵ بوو، ئەرکی پاراستنی کەرتی شێخانی پێ ڕاسپاردن،[٤٣٩].

دوای ماوەیەکی کەم لە هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد، ژمارەی لقەکانی پێشمەرگە دووبارە زیادیان کرد، بەو هۆیەوە لە (ئابی١٩٦٢) مستەفا بارزانی تێکڕای هێزەکانی شۆڕشی لە (چەمی ڕەزان) کردە یەک بەناوی (کەرت) و ئەرک و بەرپرسیارەتی پارێزگاریکردنی ئەم بەرە سەربازییەی بە جەلال تاڵەبانی سپارد[٤٤٠].

بەم شێوەیە هێزی پێشمەرگەی کوردستان، تا ڕادەیەک وەک هێزێکی ڕێکخراوی سەربازی دەرکەوت. هەریەکە لەو پێکهاتە سەربازییانەی بۆ ئەو ناوچانە دەستنیشانکران، کە لە چوارچێوەی دەسەڵاتیان دابوون و هەمان سیستەمی سوپای

---

٤٣٦ – هاوکار کەریم ، س.پ، ل٩٢-٩٣.

437 –Uriel Dann, op.cit,p.338.

٤٣٨ – عەلی خەلیل خۆشەوی(١٩٢٥- ٢٠١١): لە گوندی سێلکێ لە سنووری پارێزگای هەولێر لەدایکبووە. لە یەکێتی سۆڤییەت لەگەڵ بارزانی بووە. لە مۆسکۆ بەشی سیاسی لە خوێندنگەی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤییەت خوێندووە و لەساڵی ١٩٥٩ گەڕاوەتەوە عێراق. پاشان لەساڵی ١٩٦١ بەشداری شۆڕشی کوردی کردوە. لە ڕۆژی ٢١ی کانوونی دووەمی ٢٠١١ مردووە. عەبدولڕەحمان مەلازادە، س،پ، پەراوێزی ل١٨.

٤٣٩ – حيدر نجم ، الاستراتيجية العسكرية .... ص٦٠.

٤٤٠ – عەبدولڕەحمان مەلازادە، س.پ، ل١١.

عێراقیان بەسەر پیادەکرا، پاشان بارزانی دەستیکرد بە پێکهێنانی بەتالیۆن و لق و پەلی سەربازی دیکە[٤٤١]. بەشێوەیەک دوای ئەو قۆناغە یەکەکانی هێزی پێشمەرگەی لە گەورەوە بۆ بچووک وەک ( هێز، بەتالیۆن، لق، پەل) ڕێکخست[٤٤٢].

دوای تێکچوونی بارودۆخەکە لە کۆتایی (نیسانی١٩٦٣)، مستەفا بارزانی بۆ جارێکی دیکە، بڕیاریدا ڕیزەکانی پێشمەرگە ڕێکبخاتەوە و بەرەکانی شەڕی لە خانەقین تا زاخۆ بۆ سەر (١١) ناوچە دابەشکرد، ژمارەیەک لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و لێژنەی مەرکەزی پارتی هەڵبژارد و ئەرک و بەرپرسیارەتی بەرەکانی شەڕی پێ سپاردن[٤٤٣]. بەم شێوەیە ڕێکخستنی هێزەکانی پێشمەرگە لەگەڵ بەرفراوانبوونی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان و زیادبوونی ژمارەیان، تا کۆتایی شۆڕشەکە بەردەوام بوو .

**باسی دووەم: ڕۆڵی بارزانی لە ڕێکخستنی پێکهاتەی لەشکری شۆڕشگێری کوردستان**

لەسەرەتاکانی هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە (ئەیلولی١٩٦١)، هێزەکانی پێشمەرگە ڕێکخراو نەبوون، مستەفا بارزانی وەک ڕێبەری شۆڕشەکە، هێزەکانی خۆی دابەشی سەر دوو پێکهاتەی سەربازی کرد، یەکەمیان ئەو هێزانە بوون، کە لەبەرەکانی شەڕدا بەردەوام ئامادەبوونیان هەبووە، بەشەکەی دیکە پێکهاتەیەکی هۆزایەتی بوو، کە هێزێکی شەڕکەر بوون، بەڵام بەشێوەیەکی تەقلیدی گورزیان لەهێزەکانی حکومەتی عێراقی دەوەشاند و دوای ئەنجامدانی چالاکییەکە پارتیزانیەکان، دەگەڕانەوە ماڵەکانی خۆیان و دەستیان بەکاروباری ڕۆژانەی خۆیان دەکردەوە[٤٤٤]. ئەو پێکهاتە سەربازییە ناڕێکخراوەی دوایی پێی گوتراوە (بەرگری میللی)[٤٤٥]. هەمیشە وەک هێزێکی یەدەگ دەرکەوتوون و ڕۆڵیشیان لە بەشێک لە سەرکەوتنەکانی هێزی پێشمەرگەدا هەبوو. چەک و تەقەمەنیەکانیان، خۆراک و جلوبەرگ و پێخەفەکانیان

---

٤٤١ – شێرزاد زکریا محمد، س.پ ،ل٢٨.

٤٤٢ – عەبدولڕەحمان مەلازادە، س.پ، ل١١.

٤٤٣ – بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەو ڕێکخستنە، بڕوانە: حیدر نجم ، الاستراتیجیة العسکریة ....ص٦١.

٤٤٤ – ادمون غریب، الحرکة القومیة الکردیة، دار النهار للنشر،بیروت،١٩٧٣،ص٥٩.

٤٤٥ – هێزەکانی (بەرگری میللی) لە ساڵی ١٩٧٠ ژمارەیان دەگاتە(٥٠) هەزار پێشمەرگە. یۆنان هورمز، س.پ، ل٢٢٢.

لەئەســتۆی خۆیاندابووە، ئەوەندە نەبێ پابەندییان تەنها بە مســتەفا بارزانی ڕێبەری شۆڕشی کورد بوو.[٤٤٦]

بـارزانی دوای مـاوەیەک گەیشـــتە ئەو بـاوەڕەی کە پێویســـتە ئەو هێزانە لەچوارچێوەی هێزێکی ڕێکخراودا کۆبکرێنەوە، ئەوەبوو لەســـــاڵی١٩٦٤ لەگەڵ دامەزراندنی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان، دامەزراوەیەکی تایبەتی بە پێشمەرگە پێکهێنا و سیستەمێکی سەربازی گونجاوی بۆ ڕێکخستن و لێپسراوانی ئەم هێزانەی دەســتنیشــانکرد، لەگەڵ دابینکردنی تۆڕێکی بێتەل و چەک و تەقەمەنی پێویســـت لە جۆری چەکەکانی ( بریتانی و ئێرانی و ئەمریکی و ســـوڤیەتی)، کە پێکهاتبوون لە تفەنگی تورکی کۆن و ڕەشــاش و تفەنگەکانی وەک ئەلسـتن و برن و مۆرتەر و بازوکا. کە ڕێژەی(٢٠%)ی ئەو چەک و تەقەمەنیانە لەدەرەوەی کوردستان بەڕێگەی ئێرانەوە دەگەیشـــتنە نـاوچە ئـازادکراوەکـانی ژێر دەســـەڵاتی هێزی پێشمەرگە[٤٤٧].

ئەنجومەنی ســـەرکردایەتی شــۆڕشـــی کوردســـتانی عێراق، دوای ئەوەی لە(٤ی تشـــرینی یەکەمی١٩٦٤) دامەزرا، ڕاســـتەوخۆ دەســـتوورێکی بۆ ڕاپەرانـدنی کاروبارەکانی شـۆڕش دەرکرد، بەپێی ماددەی(٣)ی ئەو دەسـتوورە، کە تایبەت بوو بە پێکهێنانی ســوپای شــۆڕشــگێری کوردســـتان، دامەزراوەی ســـەربازی وەک دەزگایەکی فەرمی لەناوچە ئازادکراوەکانی شۆڕش پێکهات. ئەمەش گۆڕانێکی ئەرێنی بوو بۆ بەڕێوەبردنی کاروبـاری هێزەکانی پێشـــمەرگە، دوای ئەوەی پێکهاتەیەکی ســەرکردایەتی ڕێکخراو بە فەرماندەیی مستەفا بارزانی و نوری مەلا مەعروف وەک ســوپا ســالار و ئەســعەد خۆشــەوی بە فەرماندەی تیپی یەک لە دەڤەری بادینان و

---

٤٤٦ – كمال غمبار، قراءة جديدة في العقل السياسي للبارزاني الخالد، صوت الاخر(مجلة)، ع(٤٠)، ٢١ أذار ٢٠٠٥، ص٧.

٤٤٧ – أدمون غريب، م.س، ص٦١.

ڕەشـــید ســـندی[٤٤٨] بە فەرماندەی هەولێر دیاریکران و ئەرک و بەرپرســیارەتی ئەو هێزەیان کەوتە ئەستۆ[٤٤٩].

بەگوێرەی سیستەمی سەرکردایەتی گشتی شۆڕشی کوردستان ،ژمارە(١) بۆ ساڵی ١٩٦٤، بە پشت بەستن بە مادەی(٣) لە دەستووری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شـــۆڕشـــی کوردســـتانی عێراق و مادەی (٩)ی تایبەت بە پێکهێنانی نووســـینگەی ڕاپەڕاندن(مەکتەبی تەنفیزی) لەئەنجومەنی ســـەرکردایەتی شـــۆڕش، لە (تشـــرینی یەکەمی ١٩٦٤) لەدوای وەرگرتنی ڕەزامەندی مســـتەفا بارزانی فەرماندەی گشـــتی هێزە چەکدارەکان، بڕیاردرا لەســـەر پێکهێنانی (ئەنجومەنی بەرگری نیشـــتمانی). ئەو دامەزراوەیە، ئەندامە بنەڕەتییەکانی لە ســـوپا ســـالاری لەشـــکر و جێگرەکەی پێک دەهات و ئەندامانی دیکەی وەک لە دەستووری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردســـتانی عێراقدا هـاتووە، لە فەرمـانـدەی تیپەکـان و ئەنـدامـانی ڕاوێژکـاری لەبەڕێوەبەرەکانی (جووڵە، مەشق و پلاندانان، ئاسایش و هەواڵگری، کارگێری، میرە، خواردەمەنی و گرێبەســـت و فرۆشـــتن، ژمێریاری، ووردبینی، کەلوپەلی پزیشـــکی، ڕیزەکان، سەرۆکی دادگەی باڵای سەربازی، ڕاوێژکاری دادی) پێکهات[٤٥٠].

هەر لەم بڕیارە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە ناوی (لەشکری شۆڕشگێری کوردســـتان) ناســـێنرا و لەســـەر فەرمانی مســـتەفا بارزانی دوای ڕاوێژکردن بە ئەنجومەنی بەرگری و مەکتەبی تەنفیزی، بە ســـەر ســـێ لەشـــکر دابەشـــکران، هەر لەشـــکرێک لە (٣) یان (٤) هێز پێکهاتبوو[٤٥١]. ژمارەی ئەندامانی پێشـــمەرگە لەو یەکە ســـەربازیەدا ( ٥٠٠٠_ ٦٠٠٠) کەس بوو[٤٥٢]. هەر هێزێک لەو لەشکرە لە (٣) بەتالیۆن

---

٤٤٨ – ڕەشید حاجی بەدری سندی، ساڵی ١٩٣٣ لە گوندی ئەسپینداڕۆک لە قەزای زاخۆ لەدایک بووە. ساڵی ١٩٥٥ پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووە. ساڵی ١٩٥٧ بڕوانامەی بە کالۆریۆسی لە زانستی سەربازی پادشایەتی لە بەغدا وەرگرتووە. ساڵی ١٩٧٠ بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان و بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری بووە تا نسکۆی شۆڕش. پەیامی ئەیلوول(گۆڤار)، ژ(١١)، ئاب و ئەیلولی ٢٠٠٩، ل٣٩.

٤٤٩ – شێرزاد زکریا محمد، س.پ، ل ل ٢٠٠-٢٠١.

٤٥٠ – بڕوانە: ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆرشی کوردستان...، ل٤٠، ٤١.

٤٥١ – عەبدولڕەحمان مەلازادە، س.پ، ل١١.

٤٥٢ – شێرزاد زکریا محمد، س.پ، ل٢٠٦.

پێکهاتبوو[٤٥٣]، ژمارەی پێشمەرگەکانی (١٥٠٠_٢٠٠٠) کەس بوون، هەر بەتالیۆنێکیش لە (٣) لق کەمتر نەبوو. ژمارەی پێشـــمەرگەکانی (٤٠٠_٥٠٠) کەس بوو[٤٥٤]، هەر لقێکیش لە (٣) پەل پێکهـاتبوو، هەر پەلێکیش لە (٣) دەســـتە کەمتر نەبوو، هەر دەستەیەکیش لە (١٠) پێشمەرگە کەمتر نەبوو[٤٥٥].

شـیاوی باســە لە سـەرەتای هەڵگیرسـانی شـۆڕشـی کورد لە ئەیلولی ١٩٦١ پێکهـاتەی هێزەکـانی پێشـــمەرگە زۆربەیـان لە ڕۆڵەی هۆزە کوردەکـان و خەڵکی دێهاتەکان بوون[٤٥٦]. بەشـــێکی دیکەشـــی لە پێکهاتە ئایینی و نەتەوەییەکانی دیکەی کوردستان بوون، لە نموونەی کلدان و ئاشوریەکان[٤٥٧]. بۆیە بەهۆی بەشداری کارای کریســـتانەکان لە شـۆڕش، لەســـەر فەرمانی مســـتەفا بارزانی لەســـاڵی ١٩٦٤ ئەم بەتـاڵیۆنێـک بەنـاوی ( هورمز مەلەک چەکۆ) کرا، کە یەکێـک بوو لە فەرمـانـدە کریسـتیانەکانی پێشـمەرگە و پێشـتر لە سـاڵی ١٩٦٣ لە شـەڕێکدا بەرامبەر سـوپای عێراقی کوژرابوو[٤٥٨].

بە تاڵیۆنەکەی(هورمز مەلەک چەکۆ) چەندین دەستەی شەڕکەری لە خۆگرتبوو، کە لەلایەن فەرماندە دیارەکانی کریسـتیان سـەرپەرشـتی دەکران لە نمونەی ( تۆما تۆماس، ئەشـیعیا ئیسـرائیل سـرسـنگی). بە فەرمانی مەلا مسـتەفا بارزانی لە نیسـانی ١٩٦٤ ( تلیا شـــینۆ) بە فەرماندەی ئەو بەتاڵیۆنە دامەزرا و بارەگاکەی لە دۆڵی (دێر رەهبان) گواستەوە بۆ گوندی ( دیبری) لە ناوچەی نەهلە. دواجار ژمارەی پێشمەرگە کریســـتانە کان لە ناو شـــۆڕش لە ماوەی نێوان ســـاڵانی (١٩٧٣-١٩٧٥) بەهۆی پەیوەندیکردنی ژمارەیەکی زۆری گەنجانەکانیان لە ناوچەکانی( کرنجوک، بیروزاڤا،

---

٤٥٣ – عەبدولڕەحمان مەلازادە، س.پ، ل١١.

٤٥٤ – شێرزاد زکریا محمد، س.پ، ل٢٠٦.

٤٥٥ – عەبدولڕەحمان مەلازادە، س.پ، ل١١.

٤٥٦ – م.ن، ل٧٢.

٤٥٧ – بروانە: د. أفرام عيسى يوسف،أزمنة في بلاد الرافدين– ذكريات و أحداث(١٨٣٠– ١٩٧٦)، ت: علي أبراهيم، دهوک، ٢٠٠٩، ص٢٢٤؛ وصفي حسن الرديني، شهيد كوردستان(هرمز ملك جكو)، دهوک،٢٠١٠،ص٧.

٤٥٨ – م.ن،ص٧.

تلسـقوف، باطنایا، تەلکیف، باتوفا)، گەیشـتە (٥٧٠) پێشـمەرگە و لە پێنچ ( دەسـتە ) کۆکرانەوە[٤٥٩].

عەرەبەکـانیش هـاوشـێوەی پێکهـاتەکـانی دیکەی نەتەوەیی، دوای ئەوەی عەبدولکەریم قاسم یاسای چاکسازی کشتوکاڵی دەرکرد، ژمارەیەک لە شێخەکانیان لە دەوروبەری موسڵ، دژی ئەو یاساییە ڕاوەستان، بەوهۆیەوە پەیوەندیان بە ڕیزی شۆڕشی کورد کرد و لەژێر فەرماندەیی ئەسعەد خۆشەوی لە ناوچەی (سەرسەنگ) جێگیرکران. ئەوە سـەرباری ئەوەی بەشـی زۆری ئەوانەی ئەندامی حزبی شـیوعی بوون و دوای کودەتای(٨ی شـوباتی ١٩٦٣) لەعێراق، بەهۆی ڕاوەدونانیان لەلایەن حزبی بەعس، ڕوویانکردە ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش[٤٦٠]، لەسەر فەرمانی مسـتەفا بارزانی هەموو دەرگاکانیان بۆ واڵاکران، وەک وەڵامدانەوەیەک بۆ ئەو هەڵوێسـتەی بارزانی یەکەیەکی تایبەتی سـەربازییان لەناو هێزی پێشـمەرگەی کوردسـتان لەژێر فەرماندەیی بارزانی دامەزراند و لەدوای سـاڵی ١٩٦٣ بەدواوە بەشـداری شـۆڕشـی کوردیان کرد[٤٦١]. ئەوە سـەرەڕای بەشـداریکردنی کوردانی پارچەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و باکووری کوردسـتان[٤٦٢]. هەموو ئەمانەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو متمانەییەی مسـتەفا بارزانی بۆ بەرامبەرەکانی دروسـتیکردبوو، لەئەنجامی داکۆکیکردنی لە مافی هەمووان بەبێ جیاوازی. وێڕای باوەڕی ئەو خەڵکە، بەو داواکارییانەی بارزانی خەباتی لەپێناو دەکرد.

بێگومان هەموو ئەوانە کاریگەرییان لەسـەر زیادبوونی ژمارەی پێشـمەرگە هەبوو. تەنانەت یەکێک لە ژێدەرەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، لەسـاڵی ١٩٦٦ ژمارەی پێشمەرگەکانی شۆڕش (١٤٠١٢) کەسی تێپەراند، ئەمەش بە پشت بەستن بە تۆماری مەکتەبی تەنفیزی، کە تایبەت بە مووچەی پێشمەرگە تۆمارکراوە. جگە لە شەڕکەرانی سـەر بە هۆزە کوردیەکانی بەشـداری شـۆڕشـیان کرد و تێکەڵی ڕیزەکانی سـوپای

---

٤٥٩ – م.ن، ص٢٢.

٤٦٠ _ بروانە: نداء من الضباط الاحرار العرب الملتحقين بفصائل الانصار الوطنية في كردستان، خەبات(جريدة)، ع(٤٧٢)، تشرين الثاني١٩٦٣، ص٢.

461 –Primakov, Blizhniĭ Vostok na st͡sene i za kulisami, Moskva ,2006,c.329.

٤٦٢ – بێوار ئدریس دەحلێنەوی، کامیران عالی بەدرخان ژیان و چالاکیێن وی بێن سیاسی و رەوشەنبیری ١٨٩٥–١٩٧٨، دهۆک،٢٠٢١،ل٩.

شۆڕشگێری کوردستان کران[٤٦٣]. دواجار لەساڵی ١٩٧٠ ژمارەکە بەڕادەیەک زیادی کرد گەیشتە(٢٠) هەزار پێشمەرگە[٤٦٤].

مستەفا بارزانی وەک فەرماندەی گشتی هێزەکانی پێشمەرگە، سەرپەرشتی تەواوی هێزە چەکدارەکانی دەکرد، کە لە (٣) لەشکر پێکهاتبوون. لەشکرەکانی پێشمەرگە (١٢) هێزی سەربازیان هەبوو لەگەڵ هێزێکی سەربەخۆ، لەشکری یەکەم لە (بادینان) سەرپەرشتی بەرەکانی شەڕی لە ناوچەکانی ( زاخۆ و دهۆک و شێخان و ئاکرێ) دەکرد، دووەمیان لەشکری(هەولێر) بوو، کە سەرپەرشتی هێزەکانی ( سەفین و کاوە و بێتواتە )ی دەکرد، تایبەت بە بەرەکانی شەڕیش لە (سلێمانی) لەشکرێکی سەربازی هەبوو، کە سەرپەرشتی هێزەکانی (خەبات و قەرەداغ و ڕزگاری) دەکرد. هەریەک لەمانە لە کۆمەڵێک بەتاڵیۆنی سەربازی پێکهاتبوون[٤٦٥].

سەرباری هێزەکانی پیادە، بارزانی گرنگی بە پێکهێنانی دەزگای هەواڵگری سەربازی و یەکەی تۆپخانەی شۆڕش داوە. دامەزراوەی یەکەم وەک لە بڕگەی سێ لە مادەی حەوتەمی دەستووری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراقدا بەناوی ( بەڕێوەبەرایەتی کاروباری ئاسایش و هەواڵگری) هاتووە، لەبەشەکانی هەواڵگری سەربازی و ئاسایشی سەربازی پێکهاتبوو. ئەرکی بریتی بوو لە ڕێکخستنی پەیوەندییە گشتییەکان و پروپاگەندەکردن بۆ شۆڕشی کورد و چاودێریکردنی بڵاوکراوەکان و وەرگرتنی هۆیەکانی پێویست بۆ شاردنەوەی نهێنی سەربازی[٤٦٦]، زیاتر لەوەش کاریکردووە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری سەربازی لەسەر هێزەکانی سەربازی حکومەتی عێراق[٤٦٧].

یەکێک لە ژێدەرەکان سەبارەت بەکاریگەریی ئەو دامەزراوەیە لەسەر بارودۆخی شۆڕش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە مستەفا بارزانی زانیاری هەواڵگری لە زۆربەی ناوچەکانی عێراق هەبوو، تەنانەت لەنێو دامەزراوە سەربازییەکانی حکومەتی عێراق، زانیاری هەواڵگری پێدەگەیشت. بەشێوەیەک هێزەکانی عێراق بەر لەوەی جووڵە بکەن بەمەبەستی هێرشکردنە سەر بنکە و بارەگاکانی پێشمەرگە، زۆرکات زانیاری

---

٤٦٣ – عصمت شریف وانلي، م.س، ص٣٣٥.

٤٦٤ – حيدر نجم ، الاستراتيجية العسكرية ....ص٧٢.

٤٦٥ – عصمت شریف وانلي، م.س،ص٣٣٣.

٤٦٦ – بڕوانە: ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆرشی کوردستان، ل،٤٥.

467 – Lortz, op.cit, p.41.

لەســـــەر تەواوی ئەو هێزە و ئامانجەکانیان هەبوو، بۆیە بەپێی زانیارییەکانی ئەو ژێدەرە هێزە عێراقییەکان بەر لەوەی بگەنە ناوچەکانی ژێر دەســـەڵاتی شـــۆڕش، بارزانی ڕێنمایی پێویســـتی بۆ بەرگریکردن و خۆپاراســـتن بە هێزەکانی پێشـــمەرگە داوە[٤٦٨].

لەلایەکی دیکە تۆپخانەی شـــۆڕش، کاریگەرترین هێزی پشـــتیوانی یەکەکانی پێشـمەرگە بووە. مسـتەفا بارزانی لەسـاڵی ١٩٦٥ دوای هەوڵە سـیاسـییەکانی لەگەڵ حکومەتی ئێران، توانی (٨) چەکی هـاوەنی جۆری (٨١) ملم بەدەســـتبێنێ[٤٦٩]. بۆ ئاشـناکردنی پێشـمەرگە لەسـەر بەکارهێنانیی ئەو چەکە، هەشـت پێشـمەرگەی بە پلە جیاوازەکانی ســـــەربازی ڕەوانەی ئێران کرد، دوای مانگێک لە وەرگرتنی مەشـــقی پێویســـت، ئەو پێشـــــمەرگانە گەڕانەوە باشـــووری کوردســـتان و بوونە هەوێنی دامەزراندنی یەکەی تۆپخانەی شۆڕش. بۆ یەکەمجار لەساڵی ١٩٦٥ لەکاتی هێرشێکی سوپای عێراقی بۆسەر چیای سەفین لە باکووری شاری هەولێر، مستەفا بارزانی بە بروســـکەی ژمارە (١) لە نیســـانی ١٩٦٥، فەرمانی کرد بە هەناردەکردنی یەکەی تۆپخانەی شـــۆڕش وەک پشـــتیوانی بۆ ئەو هێزانەی پێشـــمەرگە لە ناوچەکەدا، ڕووبەڕووی ســـوپای عێراقی دەبوونەوە. لە ڕۆژی(٢٠ی نیســـانی١٩٦٥) توانیویان چەند گوللە تۆپێک بگرنە سەربازگەی (زیارەت) لەپشتی چیای سەفین و (بانە نۆل) لە شـەقلاوە لە ڕێگای هیران. دوای پێکاندنی ئامانجەکە، هێزەکانی پێشـمەرگە دەسـتیان بەسەر سەربازگەکەدا گرت[٤٧٠].

ســـــەربـاری هەموو ئەمـانە، چەنـدین بەش و دامەزراوەی دیکە لە پێکهـاتەی سەربازی شۆڕشی کورد هەبوون لە نمونەی (فەرمانگەی گشتی ئەرکان) کە لەلایەن ســوپا ســالاری پێشــمەرگە ســەرۆکایەتی دەکرا و فەرمانەکانی لە مســتەفا بارزانی فەرمـانـدەیی گشـــتی هێزە چەکـدارەکـانی شـــۆڕش وەردەگرت[٤٧١]. دواتریش هەموارکردنەوەی دەســتووری ئەنجومەنی ســەرکردایەتی شــۆڕشــی کوردســتانی

---

٤٦٨ – بروانە: ملاقات با گرگ کوهستان، تهران مصور(مجلة)، ش(١١٧١)، جمعة ٢٢ بهمن ١٣٦٦، ١١ فوریە ١٩٤٤، ص٨.

٤٦٩ – خدر عەبدوڵلا دەباغ، بیرەوەرییەکانم و تۆپخانەی شۆڕشی ئەیلولی مەزن، ب٢، هەولێر، ٢٠٠٣، ل٧٨.

٤٧٠ – خدر عبدالله دەباغ، س.پ، ل٧٨.

٤٧١ – بروانە: ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان...، ل٤٣.

عێراق لەساڵی ١٩٦٨، هۆکاربوو بۆ دامەزراندنی بەشێکی دیکەی سەربازی لە نووسینگەی ڕاپەڕاندن بەپێی مادەی (٢٥) لە دەستوورەکەدا، کە ئەرکی ڕێکخستنی کاروباری سەربازی شۆڕش و کارکردن بوو بۆ پەرەپێدانی لەهەموو ڕوویێکەوە. ئەم بەشە بە ڕاوێژکردن لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی و نووسینگەی ڕاپەڕاندن، هەموو ڕێسا و ڕێنمایی و بڕیارە پێویستییەکانی بەپێی ئەو دەسەڵاتەی دەستوورەکە بۆی دیاریکردبوو، دەرکردووە[٤٧٢].

لەدوای دەستپێکردنەوەی شەر لە ئاداری ١٩٧٤، بەهۆی شکستهێنانی دانوستانەکانی نێوان کورد وحکومەتی عێراقی، بەفەرمانی مەلا مستەفا بارزانی و بەڕاوێژکردن لەگەڵ فەرماندە باڵاکانی لەشکری شۆڕشگێری کوردستان، دەستەیەکی تایبەت بە پلان و نەخشەی سەربازی لە(٤ ی کانونی دووەمی ١٩٧٥) بەناوی (نەخشەکێشانی سەربازی) پێکهات، ئەرکی ئەم دەستەیە بریتی بووە لە چاوخشاندن بە ڕاپۆرتی فەرماندەی هێز و بەتالیۆنەکانی پێشمەرگە بەشێوەیەکی مانگانە و دوای ووردبوونەوە لە ڕاپۆرتەکان، بڕیاری پێویستی لەسەر بابەتەکان داوە[٤٧٣].

## باسی سێیەم: ڕۆڵی بارزانی لە دابینکردنی پێداویستییەکانی هێزی پێشمەرگە

مستەفا بارزانی لە دیدارێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی ئیتلاعاتی ئێرانی دەڵێت: "ناپلیۆن لە پێناو سەرکەوتن لە شەڕ دەیگوت یەکەمجار زێر پێویستە، لەپلەی دووەمیش زێر پێویستە، لە پلەی سێیەمیش زێر پێوستە. بەڵام من دەڵێم بۆ سەرکەوتن لەشەڕ، یەکەم چەک پێویستە، دووەمیش چەک، سێیەمیش چەک"[٤٧٤]. لەسەر ئەم بنەمایە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستی هێزەکانی، هەر لەسەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد، هەوڵیداوە سەرچاوەیەکی دەرەکی بدۆزێتەوە بۆ بەدەستهێنانی چەک بۆ هێزی پێشمەرگەی کوردستان[٤٧٥]، ئەمەش کارێکی ئاسان نەبووە. لەبەرئەوەی زۆربەی

---

٤٧٢ – بڕوانە: هـس، ل٦٩.

٤٧٣ – بڕوانە:مسعود بارزانی، بارزانی ...(شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١–١٩٧٥)، ل١٥٣.

٤٧٤ – ژنرال بارزانی: شکاف عمیقی بین کردها و شوروی و وجود دارد، اطلاعات(روزنامه)،ش(١٤٤٩٥)، ٢٨ اکوست ١٩٧٣، ص٦.

٤٧٥ – بڕوانە: ملاقات با گرگ کوهستان، تهران مصور(مجلة)، ش(١١٧١)، جمعة ٢٢ بهمن ١٣٦٦، ١١ فوریه ١٩٤٤، ص٨.

ولاَتە زلهێزەکان ڕەتیان کردەوە پاڵپشتی شۆڕشی کوردی بکەن[٤٧٦]. بەو هۆیەوە بارزانی تا ڕادەیەک نائومێد دەبێ لە هەڵوێستی نێودەوڵەتی بەرامبەر بە شۆڕشی کورد و بەدوو لەو ڕۆژنامەنووسە ئەلمانیاییەی لەسەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕشەکە سەردانی بەرەکانی شەڕیان کرد دەڵێت:"جیهان ئێمەی لەبیرکردووە، پێویستە لە چیاکاندا بەتەنها شەڕ بکەین"[٤٧٧].

ئەم تێڕوانینەی مستەفا بارزانی گشتگیر نەبوو، بەڵکو ڕێژەیی بوو، لەبەرئەوەی یەکێتی سۆڤیت لەسەر داواکاری مەلا مستەفای بارزانی لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٦١ دەستپێشخەریکرد بۆ ناردنی بڕێک هاوکاری دارایی بۆ شۆڕشی کورد، کە بەپێی زانیارییەکانی ژێدەرێک یارمەتییە داراییەکانی سۆڤیەت لەدوای هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لەگەڵ حکومەتی عێراق گەیشتە(٧٠) هەزار دینار[٤٧٨]، ئەوە لە کاتێکدا مسعود بارزانی ئەو یارمەتییە داراییانە لەسەرەتای شۆڕشەکە بە(٢٥٠) هەزار دۆلار دادەنێت و لەم بارەیەوە دەڵێت:" یارمەتییە داراییەکان لە یەکێتی سۆڤیەت کە بۆ شۆڕش دەهات بەشێوەیەکی بەردەوام لە ساڵی ١٩٦١ ەوە تا ساڵی ١٩٧٢، برەکەی زۆرکەم بووە، بەلاَم لەساڵەکانی یەکەمی شۆڕش، بۆشاییەکی گەورەی پڕ کردەوە و زۆر کێشەی چارەسەرکرد و کە بە (٢٥٠) هەزار دۆلار دەستیپێکرد و لە ساڵی ١٩٧٢ گەیشتە (یەک) ملیۆن دۆلار[٤٧٩].

بارزانی جگە لە سۆڤیەت، داوای هاوکاری دارایی و دابینکردنی چەکی لە زۆربەی ولاَتانی وەک ئەمریکا و فەرەنسا و بریتانیا و ئیسرائیل و ئێران کردووە، شیاوی باسە وەک پێشتریش ئاماژەی پێکراوە، جگە لە ئێران و ئیسرائیل، زۆربەی ولاَتانی ئەوروپا و تەنانەت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش، تا ساڵی ١٩٧٢ هیچ

---

٤٧٦ – د.فاضل رسول،كردستان والسياسة السوفيتية في الشرق الاوسط، ت: غسان نعسان، مؤسسة حمدي للطباعة والنشر، ٢٠٠٨،ص٢٨١.

٤٧٧ – بروانە: ملاقات با گرگ كوهستان، تهران مصور(مجلة)، ش(١١٧١)، جمعة ٢٢ بهمن ١٣٦٦، ١١ فوريه ١٩٤٤، ص٨.

٤٧٨ – مێهفان محمد حسين البامرني، سياسة الاتحاد السوفيتي تجاه الحركة القومية الكوردية التحررية في كوردستان الجنوبية(١٩٤٥-١٩٦٨) دراسة تاريخية تحليلية، أربيل، ٢٠٠٨، ص١٩٨.

٤٧٩ – مسعود البارزاني، البارزاني ...(ثورة ايلول ١٩٦١-١٩٧٥)، ص ٣٧٥.

جۆرە یارمەتییەکی سـەربازییان پێشـکەشـی شـۆڕشـی کورد نەکرد[٤٨٠]، سـەرەڕای هەوڵی بەردەوامی نێردراوەکانی بارزانی بۆ ئەم وڵاتانە بۆ ڕازیکردنیان بە مەبەسـتی یارمەتیدانیان، بەڵام بەهۆی بەرژەوەندی هاوبەشـی بەشـێک لەم وڵاتانە لەگەڵ حکومەتی عێراقی، یان بەهەر هۆکارێکی دیکەی سـیاسـی بێت، یارمەتی شـۆڕشـی کوردیان نەدا[٤٨١].

هەڵویستی حکومەتەکانی ئێران و ئیسرائیل هەر لەدوای ساڵی ١٩٦٣ و پاشـان حکومەتی ئەمریکا لەسـاڵی ١٩٧٢ تا١٩٧٥ بەهۆی پێداگری مسـتەفا بارزانی بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری و پشتیوانی ئەم وڵاتانە، بەراورد بە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا جیاوازبوو، بەتایبەتی ئەم دوو حکومەتەی لە پێشـەوە ئاماژەیان پێکراوە، بەڕادەیەک هاوکاری دارایی و سـەربازییان پێشـکەشـی شـۆڕشـی کورد کرد[٤٨٢]. لەم سـۆنگەوە دەزگای هەواڵگری ئەمریکا(CIA) لە بەڵگەنامەیەکدا، کە دەگەڕێتەوە بۆ سـاڵی (١٩٦٥) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە:" هێزی بارزانی بە باشـی تەیار کراوە بە چەک، لەوانە بازووکە و چەکی دیکەی تاڕادەیەک مۆدێرن. بەشـێکی زۆری ئەم چەکانە لەلایەن کوردانی ئەوروپا کڕدراوە. بڕێک تەقەمەنی و چەکی سـووک لە ڕێگەی هەڵکوتانە سـەر دامەزراوە سـەربازییەکانی عێراقەوە دەسـتیان کەوتووە"[٤٨٣]، وەک تفەنگی کۆنی ئەلمانی و بڕنۆی چیکی و تفەنگەکانی سـیمینۆف و کلاشـینکۆفی روسـی و

---

480-F.R.U. S,1969-1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973-1976, Memorandum from the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger) to President Nixon, Continued Covert Support for the Kurds, Washington, March 29, 1973, p.606.

481 -F.R.U. S, 1969-1976, VOLUME E-4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969-1972, 292. Airgram 222 From the Embassy in Lebanon to the Department of State, Request from Mustafa Barzani for Clandestine Contact with USG, Beirut, July 16, 1971, p.3.

482 -F.R.U.S, 1969-1976, VOLUME E-4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969-1972, 267.Central Intelligence Agency Information Cable TDCS DB, Israeli Aid to Kurdish Rebels, Washington, March 9, 1970.p.1-3.

483-CIA-RDP79-00927A004800110003-7,THE KURDISH WAR-ROUND FOUR, WASHINGTON, April 23, 1965,p.8.
**https://www.cia.gov/readingroom/document/cia-rdp79-00927a004800110003-7.**

ڕەشـــاشـــی دیکتاریۆف[٤٨٤]. هاوکات بڕێکی کەمی چەکیان لە چیکۆسـلـۆفاکیاوە پێگەیشـــت[٤٨٥]. بەشـــێکی دیکەشـــیان لەبازاری ڕەش بەیارمەتی چەند کوردێکی خۆبەخش لەسـوریا و ئێران و لوبنان بەدەسـتهێناوە[٤٨٦]. ئەوە سـەرباری ئەوەی هەر لەسەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشەکە، بەهاوکاری ئەو پۆلیس و سەربازانەی دەهاتنە ڕیزی پێشـمەرگەی کوردسـتان، شـۆڕشـگێرانی کورد، بڕێکی دیاریکراوی چەکیان بەدەســتکەوتووە[٤٨٧]. وەک یەکێک لە ســەرچاوەکانیش باســی دەکات، بەشــێک لە (جاش)[٤٨٨] و تەنانەت ســـەربازەکانی عێراقیش، هەندێکجار فیشـــەک و نارنجۆکی خۆیان بە خۆرایی یان بە نرخێکی کەم دەدایە پێشمەرگە[٤٨٩].

لەلایەکی دیکە هەندێک لە کەســایەتیەکانی خاوەن هەژموون بوون لە نێو کوردان، بەپێی توانای خۆیان هاوکاری دارایی و چەک و تەقەمەنیان پێشــکەش بە پێشـــمەرگە کردووە. بۆ نمونە یەکێک لە فەرماندە پلە باڵاکانی ســـوپای عێراقی لەیاداشـــتەکانی خۆیدا، باس لەوە دەکات کە لەو کاتەی لەســـاڵی ١٩٦٨ هێزەکەی لەناوچەی ڕەواندوز و سـپیلک بووە، لە بۆسـەیەکدا دەسـتیان بەسـەر ئۆتۆمۆبێلێکدا گرت، چەک و تەقەمەنی و کەرەستەی دیکەی جەنگی بۆ پێشمەرگە دەگواستەوە[٤٩٠].

دوای ڕێککەوتنامەی (١١ی ئاداری١٩٧٠) و تێکەڵکردنی بەشـــێکی هێزەکانی پێشمەرگە، بەیەکە سەربازییەکانی پاسەوانی سنووری حکومەتی عێراقی، حکومەتی عێراق مانگانە بڕی (٢٠٠) هەزار دۆلاری بۆ هێزی پێشـــمەرگە خەرج کرد، بەڵام ئەو

---

484 - Lortz, op.cit, p.40.

485 -NA, FCO 51/358, Research Department Memorandum the Kurdish Problem in Iraq, 1963-1971, 6 December, 1971. P.14.

486 - Lortz, op.cit, p.40.

٤٨٧ – حيدر نجم ، الاستراتيجية العسكرية لثورة أيلول، ص٧٥.

٤٨٨ – جاش: وشەیەکە لە بنچینەدا لە وشەی (جەحشی) عەرەبی وەرگیراوە، کوردەکان سوکتر دەریدەبڕن. دیار نییە کێ ئەم وشەی داهێناوە، بەڵام مستەفا بارزانی یەکەم کەس بووە ئەو دەستەواژەی لەدژی کوردە بەکرێگیراوەکان بەکاریهێناوە. وشەکە لە واتادا هاوتای خیانەت و خۆفرۆشی و نۆکەرایەتییە. أوریل دان، م.س، ص٤٤٢.

٤٨٩ – عیسی پژمان، نهێنییەکانی بەستنی پەیمانی ١٩٧٥ی جەزائیر لە ئارشیفی تەواو نهێنی ساواک، و: ناسر ئیبراهیمی، سوید، ١٩٩٧، ل٦٨.

٤٩٠ – أسماعيل تايه النعيمي، تجربتي في القيادة، ج١، دائرة التدريب( مديرية التطوير القتالي)، مديرية المطابع العسكرية، بغداد، تشرين الاول ١٩٨٥،ص٥٤.

یارمەتیانە کاتی بوون و بەردەوام نەبوون. بەپێی زانیاریەکانی شـــەفیق قەزاز ، کە یەکێک بووە لەئەنـدامـانی پـارتی دیموکراتی کوردســـتـان و لە دەرەوەی عێراق نوێنەرایەتی شـــۆڕشـــی کورد و مســـتەفا بارزانی کردووە، لەدیدارێکی لە (٢٧ی تەمموزی١٩٧٣) لەگەڵ بەرپرسی نووسینگەی عێراق (ئیدوارد جیریجیان_ Edward jerejian) لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە یارمەتییەکانی حکومەتی عێراقی بۆ پێشمەرگە لە مانگەکانی ناوەڕاستی ئەو ساڵە ڕاگیراون، ئەمەش بەهۆی پاشـــەکشـــەی دەســـەڵاتدارانی بەغدا لە جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار[٤٩١].

سەبارەت بە ڕاگرتنی یارمەتییە داراییەکانی حکومەت بۆ هێزی پێشمەرگە، بەپێی ئەو زانیارییانەی یاریدەدەری ســەرۆکی ئەمریکا بۆ کاروباری ئاســایشــی نەتەوەیی هنری کیسنجەر بە نامەیەک بۆ سەرۆکی ئەمریکا ریتشارد نیکسون(١٩٦٩-١٩٧٤)ی ڕوونکردۆتەوە، کە ڕاگرتنی هاوکارییەکانی حکومەتی عێراقی بۆ هێزەکانی پێشمەرگە، بەهۆی هەڵویســـتی نەرێنی ســـەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردســـتان بووە، لە بەرامبەر داخوازییەکانی یەکێتی سۆڤیەت و حزبی بەعسی دەسەڵاتدار لە عێراقدا، بۆ بەشـــداریکردنی پـارتی نـاوبراو لە پێکهێنـانی (حکومەتی بەرەی نیشـــتمـانی) بەســـەرۆکایەتی حزبی بەعس، کە لەدوای(٣٠ی تەمموزی ١٩٧٣) کاری لەســـەر کرابوو. دیـارە کوردەکـان ڕووبەڕووی ئەو هەوڵە بوونەوە، هەرچەنـدە مەترســـی ئەوەیان لەســەر هەبوو بەهۆی ئەو هەڵویســتەیان، هێرشــیان بکرێتەســەر. بە گوتەی نێوبراو، ســەرکردایەتی کورد ئێســتا [مەبەســتی ســاڵی١٩٧٣یە] پاڵپشــتی دارایی بە بەهـای (١،١٢٥) ملیۆن دۆلار، کە بەغـدا خەرجی دەکرد بۆیـان، بۆ مووچەی پاســەوانەکانی ســنوور و پۆلیســە کوردەکان و خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان لە دەستیانداوە، بەهۆی ئەو زیانەش بارزانی داوای پشتیوانی زیاتر دەکات[٤٩٢].

491-F.R.U. S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, U.S. Attitude toward the Kurds, Washington, July 27, 1973. p.643.

492-F.R.U.S,1969–1976,VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976,Memorandum From the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger) to President Nixon, Increased Assistance to the Kurds, Washington, September 6, 1973,p.663-664.

لەلایەکی دیکە بەپێی زانیارییەکانی مەحمود عوســـمان لە دیداریکدا لە( ٦ی تەمموزی١٩٧٣) کە لەگەڵ بەڕێوەبەرانی ئـاژانســـی هەواڵگری حکومەتی ئەمریکا ئەنجامیداوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، ژمارەی هێزەکانی پێشـــمەرگە لەو ســـاڵەدا (٢٥) هەزاربوون و نزیکەی(٣٤) هەزار پێشـــمەرگەی دیکەیان وەک هێزی یەدەگ هەبووە، بەشـێکی یارمەتییە داراییەکانیان لە پاڵپشـتیە داراییەکانی ئەمریکا بۆ خەرج کراوە، کە بۆ هەریەکەیـان تەنهـا (١٤) دۆلاریـان خەرجکردووە[٤٩٣]. لە بەڵگەنـامەیەکی دیکەدا، ئەوەی دوایی باس لەوە کردووە، مووچەی هەر تاکێکی پێشـــمەرگە لە دوو مانگ جارێک (٥) دینار بووە[٤٩٤].

کاتێک لە(١١ی ئاداری١٩٧٤) دووبارە جەنگ لە نێوان حکومەتی عێراقی و هێزی پێشــمەرگە دەســتیپێکردەوە، بارزانی لە (٢٢ی تشــرینی دووەمی١٩٧٤) نامەیەکی بۆ هینری کیسنجەری یاریدەدەری سەرۆکی ئەمریکا بۆ کاروباری ئاسایشی نیشتمانی و وەزیری دەرەوەی ئەو وڵاتە رەوانەکرد و داوای هـاوکـاری ســـەربـازی لە حـکـومەتەکەی ئەمـریـکـا کـرد. لەو نـامەیەدا بـارزانـی بـاس لەوە کـرد، بـۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێزەکانی حکومەتی عێراق، پێویستی بەچەک هەیە[٤٩٥].

بەپێی یاداشـــتێکی ســـەرۆکی ئاژانســـی هەواڵگری ئەمریکا (کولبی) کە لە(٢ی تشرینی دووەمی ١٩٧٤) بۆ یاریدەدەری سەرۆک بۆ کاروباری ئاسایشی نیشتمانی (کیســـنجەر)ی ڕەوانەی کردووە. حکومەتی ئەمریکا لە ســـاڵی دارایی ١٩٧٣، ١٩٧٤، هەروەها بۆ ساڵی ١٩٧٥ بڕی (٢٠) ملیۆن دۆلاری ئەمریکی، کە نزیکەی (١٢٥٠) تەن

---

493 -F.R.U.S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, 222. Backchannel Message from the Ambassador to Iran (Helms) to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Tehran, July 9, 1973, P.636.

494 -F.R.U. S, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, 292. Airgram 222 From the Embassy in Lebanon to the Department of State, Request from Mustafa Barzani for Clandestine Contact with USG, Beirut, July 16, 1971, p.3.

495-CIA-173-7-14-7,Text of General Mulla Mustafa Barzani's, Letter to Secretary Kissinger, Washington, November 2, 1974,p.4-5.

کەرەستەی جەنگی بووە وەک هاوکاری بە کورد بەخشیوە[٤٩٦]. بەڵام وەک ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکا لەبەڵگەنامەیەکیدا ئاماژەی پێکردووە، کە لە دوای داواکاری شای ئێران لە سەرۆکی ئەمریکا لە ئایاری ١٩٧٢ بۆ هاریکاریکردنی شۆڕشی کورد، تەنها (١٦) ملیۆن دۆلار لە کڕینی چەکی چینی و روسی خەرجکرا و بەشێوەیەکی نهێنی لە ڕێگای ئێرانەوە گەیەنرایە دەستی هێزی پێشمەرگە[٤٩٧]. بەپێی زانیارییەکانی مەحمود عوسمان ئەو ژمارەی دوایی دروستە و حکومەتی ئەمریکا، لەوەی زیاتر بە کورد نەداوە[٤٩٨]، تەنانەت هنری کسنجەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، لە یاداشتەکەی خۆیدا، ئاماژە بەهەمان برە پارە دەکات، کە مەحمود عوسمان ئاماژەی پێکردوە[٤٩٩]، دواتر لە بەشی پێنجەم لەگەڵ هاوکارییەکانی وڵاتانی ئێران و ئیسرائیل بۆ شۆڕشی کورد بە پوختی باسی دەکەین. بەم شێوەیەش دەبینین سەرباری پێویستی شۆڕشی کورد بە پشتیوانی دەرەکی و بانگەوازە بەردەوامەکانی مستەفا بارزانی بۆ بەدەستهێنانی هاوکاری و کۆمەکی سەربازی لە بەشێک لە وڵاتانی هەرێمی و نێو دەوڵەتی، بەڵام ڕادەی پشتیوانییەکان بۆ شۆڕش سنووردار بووە و لەم ئاستەدا نەبووە بتوانێ بە تەنها پشتیان پێ ببەستێ، ئەگەر هاوکاری وپشتیوانی میللی و جەماوەری نێوخۆیی کوردستان و خواست و باوەڕی پێشمەرگە نەبوایە بۆ بەردەوامیدان بە شۆڕش و بەرخوادن.

---

496-F.R.S. U,1969–1976, VOLUMEXXVII, IRAN; IRAQ,1973–1976.Memorandum from Director of Central Intelligence Colby to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Text of General Mulla Mustafa Barzani's Letter to Secretary Kissinger, Washington, November 2, 1974, p.721.

497 - CIA, RDP81M00980R002000090053-3, Jack Anderson, How the Abandoned Kurds Lost Out, 2004

٤٩٨ – مەحمود عوسمان (دیدار)، هەولێر، ٢٠٢١/١٢/٢٣.

٤٩٩ – هنري كيسنجر، سنوات التجديد(المجلد المستخلص لمذكراته)، ت: د.هشام الدجاني، ط٢، السعودية، ٢٠١٠، ص٥١٤.

## باسی چوارەم: ڕۆڵی بارزانی لە ئامادەکردن و ڕاهێنانی پێشمەرگە

مستەفا بارزانی لە ڕۆژی دامەزراندنی حکومەتی کاتی کوردی لە ( ١٩ی کانونی دووەمی ١٩٤٨ ) لە باکۆی پایتەختی ئازەربیجان، وتارێکی پێشکەشی ئامادەبووان کرد گوتی:"بۆ ئەوەی کوردستانی ئازاد مودافەعە بکرێ، پێویستە و فەرزە لەسەر هەموو فەردێک کە لەکوردستاندا دەژێت، مودەتێکی موعەیەن تەعلیماتی عەسکەری ببینێت و خزمەتی عەسکەری بکات"[٥٠٠]. ئەم دەربڕینە بەمانای پێویستی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی هاتوە بە گەلێکی ڕاهێنراو لە شێوازەکانی شەڕ و بەرگریکردن لە خاک . بێگومان بایەخ و گرنگی مەشق و ڕاهێنان لای بارزانی بۆ جەماوەری کوردستان ئەگەر بەم ڕادەیە بێ، بۆ هێزی پێشمەرگە زیاتر بوو. لەبەرئەوەی دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لەساڵی ١٩٦١، پێویست بوو هێزەکانی پێشمەرگە لەسەر شێوازی شەڕی ڕێکخراو و بەکارهێنانی چەکی پێشکەوتوو ڕاهێنان بکەن، لەپێناو بەرزکردنەوەی توانا سەربازییەکانیان. بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە، مستەفا بارزانی هەوڵیدا سوود لەتوانا مرۆییەکانی ژێر دەستی شۆڕش وەربگرێ[٥٠١].

لەسەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە ساڵی ١٩٦١، مستەفا بارزانی فەرمانیکرد بە ڕێکخستنی خولی مەشق و ڕاهێنانی سەربازی بۆ هێزەکانی پێشمەرگە، لەسەر ئەم بنەمایە پرۆگرامی تایبەت لەسەر (بەکارهێنانی چەک، نیشانەگرتن، خەملاندنی مەوداکان، بنەما سەرەکیەکانی ئاگر و جوولە، فێڵ و خۆشاردنەوە، بنەماکانی تفەنگ هاوێشتن، بۆسەدانانەوە، هەڵمەت بردن، مانەوە و خۆڕزگارکردن لە شەڕ، فریاگوزاری سەرەتایی) دیاریکرا[٥٠٢].

لەدوای کودەتای حزبی بەعس و ناسرییەکان لە عێراق لە(٨ ی شوباتی ١٩٦٣)، بەشێک لە شیوعیەکان کە هەندێکیان ئەفسەر و پلەداری سەربازی بوون، لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی عێراقی ڕایانکرد و ڕوویانکردە ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشی کورد، ئەمانە لەگەڵ هەبوونی ژمارەیەک لە کادیرانی سەربازی

---

٥٠٠ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٩٣١– ١٩٥٨)، ل٣٥٨.

٥٠١ – بڕوانە: خبات(جريدة)، ع(٤٧٢)، تشرين الثاني١٩٦٣،ص٦؛ ع(٤٧٣)،كانون الثاني١٩٦٤،ص٣؛ وەرگیراوە لە: نەوزاد عەلی ئەحمەد، خەبات ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان(نیسانی ١٩٦٢_ کانوونی دووەمی ١٩٦٤)، بنکەی ژین،سلێمانی، ٢٠٠٨، ل ل٩٩،١٠٥.

٥٠٢ – حيدر نجم ، الاستراتيجية العسكرية لثورة أيلول،ص٧٢.

ئەكادیمی، بەیەكەوە دەرفەتیان بۆ بارزانی و سەركردایەتی شۆڕش ڕەخساند، بیر لە دامەزراندنی فێرگەیەكی مەشـــق و ڕاهێنانی ســـەربازی بكەنەوە، بەمەبەســـتی دەوڵەمەندكردنی شـــۆڕشـــی كورد بە توانای ئەكادیمی ســـەر بازی، بۆ ئەوەی ســـەرپەرشـــتی یەكەكانی پێشـــمەرگە بكەن. بەو هۆیەوە هەروەک لە هەواڵێكی ڕۆژنامەی خەباتدا هاتووە، لەسـەر فەرمانی بارزانی لە ناوەراسـتی(تشـرینی دووەمی ١٩٦٣)، یەكەم ئەكادیمیای سەربازی شۆڕش دامەزرا[٥٠٣].

ســەرباری ئەوە، مســتەفا بارزانی بە هەماهەنگی لەگەڵ فەرماندەیی لەشــكری كوردســـتان، كاریكرد بۆ كردنەوەی خولی جۆراوجۆری دیكەی ســـەر بازی، بۆ ڕاهێنانی پێشمەرگە لەسەر جۆرەكانی چەک و جوڵانەوەی سووک لەناو شارەكان و هێرشی تاكە كەسی. بۆ ئەم مەبەستەش چەند بنكەیەكی مەشق و ڕاهێنانی سەربازی دامەزرا، وەک ( فێرگەی كۆماندۆ)[٥٠٤].

لەلایەكی دیكە لە ســـەرەتای ســـاڵی ١٩٦٥ دوای ئەوەی بارزانی بەهۆی ئەو كۆشـشـە سـیاسـیانەی لەگەڵ حكومەتی ئێران ئەنجامیدا، توانی بۆ یەكەمجار هەندێک چەكی قورس لە چوارچێوەی یارمەتییە ســەربازییەكانی ئەو حكومەتە بۆ شـۆڕشـی كورد بەدەســت بێنێ[٥٠٥]، پێویســتی بەوە بوو، بەشـێک لە پێشــمەرگەكانی شـۆڕش لەســەر بەكارهێنانی ئەم چەكانە ڕاهێنان بكەن، بۆ ئەم مەبەســـتەش بە هاوكاری و هەماهەنگی لەگەڵ حكومەتی ئێران، هەشـــت پێشـــمەرگەی هەڵبژارد و ڕەوانەی ئەم وڵاتەی كرد، بۆ شـــارەزابوون لەســـەر چۆنیەتی بەكارهێنانی ئەم چەكانە. دوای مانەوەیان بۆ ماوەی یەک مانگ، پێشـمەرگەكان لە خولێكی سـەربازی لەسـەر چەكە تازەكەی شۆڕش ڕاهێنانیان وەرگرت و پاشان چەكەكانیان كە (هاوەن) بوون، لەگەڵ خۆیاندا هێنایەوە كوردســـتان[٥٠٦]. هەر لەو ماوەیەدا لە پێناو برەودان و ئاشـــناكردنی پێشـــمەرگە بە تازەترین زانیارییە ســـەربازییەكان، لەمانگی ئابی ١٩٦٥ یەكەم خولی

---

٥٠٣ – أكادیمیة حربیة لتخریج ضباط لقیادة قوات الحكم الذاتي، خەبات(جریدة)، ع(٤٧٢)، تشرین الثاني١٩٦٣،ص٦؛ وەرگیراوە لە : نەوزاد عەلی ئەحمەد، س.پ، ل٩٩.

٥٠٤ – هاوكار كەریم ، س،پ، ل٩٧

٥٠٥ – نازناز محەمەد عەبدولقادر، سیاسەتی ئێران بەرامبەر بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی كورد لە كوردستانی عێراقدا(١٩٦١–١٩٧٥)، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ل١٥٨.

٥٠٦ – خدر عەبدوڵڵا دەباغ، س.پ، ل٧٨.

سـەربازی بۆ ئەفسـەرانی کورد لەناوچەکانی ژێر دەسـەڵاتی شـۆڕش کرایەوە، کە ماوەی سێ مانگی خایاند[٥٠٧].

جارێکی دیکە لەساڵی ١٩٦٧ بۆ ڕاهێنانی پێشمەرگە لەسەر چۆنیەتی بەکارهێنانی چەکە قورسـەکان، لەسـەر ڕاسـپاردەی بارزانی و لەژێر سـەرپەرشـتی مەکتەبی عەسـکەری، خولێکی دیکەی سـەربازی کرایەوە. کە پرۆگرامەکانی بریتی بوون لە (خوێندنەوەی نەخشـە و ئەرکەکانی ئەفسـەرانی تۆپهاوێژ، ئەفسـەرانی خەملاندنی پێوانە و بەکارهێنانی تۆپی(٢٥) ڕەتل و هاوەنی(١٢٠،٨٢،٦٠)ملم. هەروەها لە(١ی نیسانی ١٩٦٧) تا ( ٢٦ی ئەیلولی١٩٦٧) خولێکی دیکە لە گەڵاڵە لەژێر سـەرپەرشـتی مەکتەبی تەنفیزی بۆ شـارەزاکردنی پێشـمەرگە لەسـەر بەکارهێنانی ئامێری بێتەل کرایەوە[٥٠٨].

لە بەردەوامی هەوڵەکانیدا بۆ بەرزکردنەوەی توانا سـەربازییەکانی هێزی پێشـمەرگەی کوردسـتان و گفتوگۆکردن دەربارەی بارودۆخ و کەموکورتیەکانی شـۆڕشـی کورد، لە(١٥ی نیسـانی١٩٦٧) لە بارەگای مەکتەبی سـیاسـی پارتی لە ناوچەی کانی سماق نزیک گوندی گەڵاڵە لە قەزای ڕەواندز و قەزای چۆمانی ئێستا، کۆنگرەیەکی سـەربازی بۆ فەرماندە باڵاکانی سـەربازی ڕێکخرا. ئامادەبوون باسـیان لە چۆنیەتی ڕێکخسـتن و پێشـخسـتنی هێزەکانی شـۆڕشـی کورد کرد، لە ڕێگای بەرزکردنەوەی ئاستی ڕێکخستن و ڕاهێنان و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کێشـانە کە ئەو کاتە لە ئارا دابوون[٥٠٩]. لەو بۆنەیەدا بارزانی ڕێنمایی بە هێزەکانی پێشـمەرگەدا، بۆ پابەندبوون بە ئەرکەکانی سـەرشـانیان لەکاتی شـەڕ و ئاشـتیدا، لە نێو بەرەکانی جەنگ و جەماوەردا، تەنانەت لە تەوەری وتارێکی پێشـکەشـی کرد گوتی:" ئەگەر دڵی میللەت لەگەڵمان بێ، دوژمن هەزار جار قوەتی زیاتر بێ، ناتوانێ بماشـکێنێ، ئەگەر دڵی میللەت لەگەڵمان نەبێ... وەڵلاهی بە ئێوە بلێم هەزار دەفعە لە ئێسـتە بە

٥٠٧ – شموئيل سيجف، المثلث الايراني، الكتاب الاول، العلاقات السرية الاسرائيلية الايرانية الامريكية، ت: غازي السعدي، دار الجليل للنشر، عمان، ٢٠١٦، ص٢٦٦.

٥٠٨ – بۆ زانیاری زیاتر لەسەر خوولەکانی مەشق و ڕاهێنانی پێشمەرگە، بڕوانە: حيدر نجم، الاستراتيجية العسكرية ،ص٧٣،٧٤.

٥٠٩ – شێرزاد زکریا، س.پ، ل٢٠٥.

قوەتتر بین... دەشـــکێین و نـاتوانین نەجـاحەت وەربگرین"[510]. لێرەدا بـارزانی مەبەستیەتی ئەوە نیشان بدات، کە سەرباری هێز و توانای سەربازی شۆڕش، بەڵام پێشـــمەرگە تەنها بە نەخشـــە و تەکنیکی شـــەڕ و چەکی پێشـــکەوتوو ناتوانێ سـەرکەوتووبێ، ئەگەر پشـتیوانی و هاندانی جەماوەری لەگەڵدا نەبێ. بەڵکو بەڕوونی گوزارشـــــت لەوە دەکـات، کە هەر بزاڤێکی شـــۆڕشـــگێری بەبێ بوونی بنکە جەماوەرییەکەی، دەچێتە بازنەی چەتەگەرییەوە و لەبنەماکانی شـــۆڕشـــگێری دوور دەکەوێتەوە.

## باسی پێنجەم: پلان و نەخشە سەربازییەکانی مستەفا بارزانی

شـــەڕی پارتیزانی لە ئەنجامی هاوســـەنگ نەبوونی تواناکانی هێزی پێشـــمەرگە بەرامبەر سوپای عێراقی لە ڕووی ژمارە و چەکەوە، یەکێک بووە لە پلانە سەربازییە زۆر بەکارهێنراوەکانی ســـەربازی، کە لە ســـەرەتای شـــۆڕشـــی کوردەوە لەلایەن مســـتەفا بارزانییەوە پیادەکراوە[511]. مێژوونووســـی ســـەربازی ســـۆڤیەت شـیشـوف ئەلیکســـی(Shishov Aleksey) باس لەوە دەکات، کە هێزی پێشـــمەرگە توانایەکی زۆری لە پیادەکردنی ئەو شـــێوازە لەشـــەڕ بەرامبەر ســـوپای عێراقی نیشـــانداوە. بەگوێرەی شـــارەزا ســـەربازییەکەی ســـۆڤیەت، ئەو توانا ســـەربازییە بەرزەی پێشـــمەرگەی کوردســـتان لە شـــەڕی پارتیزانی نواندی، بەشـــێکی دەگەڕایەوە بۆ شـــارەزایی و ئەزموونی ســـەرکەوتووی بارزانی خۆی لە پیادەکردنی ئەو جۆرە شـــەڕە، بەو هۆیەوە وەک شـارەزاترین ســەرکردەی ســەربازی لە هونەری شــەڕی پارتیزانی دەیناســـێنێ[512]. یەکێک لە بەڵگەنامە بریتانیەکانیش ئەو ڕاســـتییە دووپات

510 - سەبارەت بەدەقی ووتارەکەی بارزانی بروانە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١-١٩٧٥)،ل٤٠٢-٤٠٨.

511 - برنارد ويتمان، رسائل من كردستان ١٩٥٤-١٩٦٣،ت: غسان نعسان، مكتب الفكر والوعي للاتحاد الوطني الكردستاني، السليمانية، ٢٠٠٩، ص٣٣١.

512 - Шишов Алексей, Военные конфликты XX века. От Южной Африки до Чечни, Москва, 2006, С.192.

دەكاتەوە كە هێزە كوردیەكان، پلانی شـــەڕی پارتیزانییان، زۆر بە ســـەركەوتوویی ئەنجامداوە[٥١٣].

سـوپا سـالاری ئێران ژەنەرال رزم عەلی ئارا لەلای خۆیەوە لە هەڵسـەنگاندنی توانا ســـەربازییەكەی ڕێبەری كورد مســـتەفا بارزانی، دوای ئەو بەریەككەوتنە ســـەربازییانەی لەگەڵ ســـوپای ئێراندا لەســـاڵی ١٩٤٦ ئەنجامی دا، دەڵێت:"مســـتەفا بارزانی لە دووری ٥٠٠ مەتر نیشـــانە لەســـەربازەكانمان دەگرێ دەیانپێكێ، ئەو توانایەكی زۆری لەشـەری پارتیزانیدا نیشـانمانداوە. بارزانی خاڵی لاوازی بەرامبەری بە ووردی دیاری دەكات و لەناكا و گورز دەوەشـێنێ"[٥١٤]، هەروەها سـوپا سـالاری عێراقی لەماوەی شـۆڕشـی ئەیلول، لەیاداشـتەكانی خۆی نووسـیویەتی:" ئەو كاتەی لەبۆنەیەكدا لەگەڵ بـارزانی كۆبوومەوە پێم گوت، بـاوكی لوقمـان، تۆ لەشـــەڕی پارتیزانی، باشترین سەركردەی لەهەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەراست"[٥١٥].

بەشـێكی دیكەی هۆكاری شـارەزایی پێشـمەرگە لە شـەڕی پارتیزانی وەك لە ڕاپۆرتێكی باڵیۆزخـانەی بریتـانیا لەبەغدا هـاتووە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پاشـــخانە كۆمەڵایەتییەی هۆزە كوردیەكـان هەیـانبوو، ئەو ڕاپۆرتە بـاس لەوە دەكـات كە: "كوردەكان لەباوك و باپیرانیانەوە فێری شـــەڕی پارتیزانی بوون، لە بیســـتەكان لە بەرامبەر ئێمەدا توانای زۆریان پیشانداوە ، ئێمە هەڵە بووین لەوەی وامان دەبینی، كە كورد تەنها شـــەڕی بەرگری دەكەن و خۆیان لە هێرشـــكردن دەپارێزن و مۆڕاڵیان نیە، بەپێچەوانەوە توانای ئەوەیان هەیە. ئەوان لەو ئەفســـەرە كوردانە فێربوون، كە لەسوپای عێراقی ڕایانكردووە"[٥١٦].

بەپێی زانیاری یەكێك لە بەڵگەنامە بریتانییەكان، بارزانی شـــەڕی پارتیزانی بە كـارامەیی جێبەجێكردووە. ئەمەش نەك وەك هەوڵێك بۆ دەســـتگرتن بەســـەر

513 -NA, FCO 51/191, Research Middle East (The Kurdish Problem in Iraq 1963-1971), 1971, p.22.

٥١٤ - دیروز رئیس ستاداریش برای روزنامەگاران اوضاع كردستان رابە تفصیل شرح داد، ارس(روزنامە)، ش(٧٧)، (١٠ اوربل ١٩٤٧)، ص١.

٥١٥ - أبراهیم فیصل الانصاري، م.س، ص٣٤٥.

٥١٦ - بروانە بەڵگەنامەی ژمارە(٢٦) لە: الكورد في وثائق الارشیف الوطني البریطاني(ج٢) ١٩٥٨-١٩٦٩، ص١١٦.

شارەکاندا، بەڵکو بۆ ڕاکێشانی سوپای عێراقی بۆ ناو شاخەکان[517]. هەمیشە وابووە ئەو ناوچانەی، کە سوپای عێراقی لە هاوین دەستیان بەسەردا گرتووە، لە زستاندا هێزەکانی پێشمەرگە وەریان گرتۆتەوە، لەبەرئەوەی بەفر و باران، ئاستەنگی زۆری بۆ سوپای عێراقی لە پێشرەوی کردن بۆ ناوچە شاخاوییەکان دروست دەکرد[518].

فەرماندەیەکی باڵای سوپای عێراقی لە یاداشتەکانی خۆیدا باسی لە یەکێک لە نمونەکانی شەڕی پارتیزانی پێشمەرگە کردووە، لەو باسەدا ئەو فەرماندە سەربازییە ڕووداوی شەڕێکی هێزەکەی لەگەڵ دەستەیەکی پارتیزانی پێشمەرگە دەگێڕێتەوە، کە لە (١٤ی ئایاری ١٩٦٩) بە دوو قۆناغ لە گوندی سەنگەسەر و گوندی جیراوە ڕوویداوە. ئەو دەڵێت:"بۆ یەکەمجاربوو کە هەڵگەڕاوەکان[مەبەستی پێشمەرگەیە] بەشداری شەڕی شەقام بە شەقام بکەن، لەبەرئەوەی مەشق و ڕاهێنانیان لەلایەن شارەزایانی سەربازی ئێرانی پێ کرابوو. شەڕەکە شەڕێکی سەخت بوو، پێشمەرگەکان سەنگەریان لە ماڵێک دەگواستەوە ماڵێکی دیکە و خۆڕاگربوون و دەستیان نەئەدا و زیانی زۆریان بە ئێمە گەیاند، ئەگەر هێزەکانی تایبەتیەکانی سوپای عێراقی لەسەر شەڕی شەقام ڕانەهێنرابوونایە، زیانی زیاتریشمان بەردەکەوت"[519].

پلانێکی دیکەی سەربازی مستەفا بارزانی، بریتی بووە لە سوود وەرگرتن لە ماوەی ئاگربەست و دانوستان لەگەڵ حکومەتی عێراقی، بۆ بڵاوکردنەوەی هێزەکانی بەسەر زۆرترین و بەرفراوانترین ناوچە لە باشووری کوردستان. هەروەک فەرماندەی تیپی یەکەمی هێزی پیادەی سوپای عێراقی لە موسڵ باسی دەکات، کە سەرباری شکستهێنانی دانوستانەکانی ساڵی ١٩٦٣ی سەرکردایەتی کورد لەگەڵ حکومەتی عێراقی. بارزانی لە ڕووی سەربازییەوە دەستکەوتی زۆری بەدەستهێنا، بەسوود وەرگرتن لە ماوەی ئاگربەست، توانی هەژمونی شۆڕشی کورد بەسەر زۆربەی گوند و هۆز و ئاغاکان بسەپێنێ. هەروەها توانی دەست بەسەر ناوچەی

517 -NA, FCO 51/191, Research Middle East (The Kurdish Problem in Iraq 1963-1971), 1971, p.22.

518 -NA, FCO 51/358, Research Department Memorandum the Kurdish Problem in Iraq, 1963-1971, 6 December, 1971. P.14.

٥١٩ – أسماعيل تايه النعيمي، م.س،ص١٠٠.

دیکەی ســـتراتیژی گرنگ بگرێ، وەک تەنگەبەر و ڕێگا و لوتکەی چیاکانی بەســـەر ڕێگا سەرەکیەکاندا دەیانڕوانی[٥٢٠].

یەکێک لەبەڵگەنامەکانی حکومەتی ئەمریکاش کە لەســـاڵی (١٩٧٤) دەرچووە، ئاماژەی بەوەداوە، کە توانای شـــەڕکردنی هێزەکانی بارزانی، هەمیشـــە زۆر بەرزتر بووە، لەتوانای شەڕکردنی سەربازانی عێراقی لە ناوچە شاخاوییەکاندا[٥٢١]. هەرچەندە کردە ســـەربازییەکانی پێشـــمەرگە بەزۆری تەنها بەرگریکردن بووە، ســـەرباری هەوڵدانی بەردەوامیدان بۆ پارێزگاریکردن لەڕێگا ســـنووریەکان بۆ وڵاتانی ئێران و تورکیا و سوریا بۆ هێنانی کۆمەک و هاوکاری بەتایبەتی لە سنووری ئێران[٥٢٢].

ئەو پلانە ســـەربازییەی پێشـــمەرگە پیادەی دەکرد، هۆکارێک بوو بۆ ئەوەی لەبەرەکانی شـەڕ بەرامبەر سوپای عێراقی کەمترین زیانی هەبێ، بۆ نمونە، یەکێک لە ژێدەرەکان باس لەوە دەکات، کە لەشـــەڕەکانی هێزی پێشـــمەرگە بەرامبەر ســـوپای عێراقی لە مانگەکانی تشـــرینی دووەم و کانونی یەکەمی ســـاڵی ١٩٦٣، نزیکەی (٢) هەزار ســـەربازی عێراقی بەدیلی کەوتنە دەســـتی هێزەکانی پێشـــمەرگە، لەبەرامبەردا تەنها یەک پێشـمەرگەش بەدیلی نەکەوتە دەسـتی سـوپای عێراقی. لەبەرئەوەی وەک ژێدەرەکە باســـی دەکات، هێزی پێشـــمەرگە بەبیروباوەری کوردایەتی شـــەڕیان کردووە، بۆیە ڕێگایان نەداوە کەسیان دەستگیر بکرێن[٥٢٣].

دواجار دەکرێ بگوترێ، پرۆســـە ســـەربازییەکان لەو بزاڤەی مســـتەفا بارزانی ڕێبەرایەتی کرد، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی تۆبۆگرافیا و پلانی ســـەربازی بەرنامە بۆداڕێژراو نەخشـەیان بۆ کێشـرابوو، لەسـەر بنەمای شـیکردنەوەی مەیدانی شـەڕ و توانای هێزی بەرامبەر و ســـروشـــتی چەکدارانی و دیاریکردنی ئامانجە ســـتراتیژییە

---

٥٢٠ - عبدالكريم فرحان، حصاد الثورة ( مذكرات تجربة السلطة في العراق ١٩٥٨-١٩٦٨)،ط٢، دار البراق، لندن، ١٩٩٦، ص٨٩.

521-F.R.S.U,1969–1976.VOLUME XXVII, IRAN;IRAQ, 1973–1976, Memorandum From Director of Central Intelligence Colby to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Request by Mulla Mustafa Barzani to see Dr. Kissinger, Washington, May 23, 1974,p.694.

522 -NA, FCO 51/358, Research Department Memorandum the Kurdish Problem in Iraq, 1963-1971, 6 December, 1971. P.14.

٥٢٣ - ديفيد ادامسن و جرجيس فتح الله،م.س، ص٢٠٩.

گشتییەکانی. بە شێوەیەک بۆ یەکەمجار بوو پرۆسە سەربازییە چەکدارییەکانی کورد لە فۆرمێکی نوێدا دەرکەون، بەهۆی ئەوەی پشـــتی بە ناوچەیەک یان پێکهاتەیەکی هۆزایەتی دیاریکراو نەبەست، بەڵکو پشتی بە بنکەیەکی جەماوەری بەرفراوان بەست، کە پیاوانی شـــاخ و کشـــتیار و جووتیاری لادێیەکان و کرێکار و پیشـــەگەران و کاسبکاران و ڕۆشنبیران و توێژێکی دیکەی چەپرەوی کوردی بوون. هەموو ئەمانە وایکرد شـــۆڕشـــەکە ڕەهەندی کۆمەڵایەتی و ئابووری هەبێ، کە لەڕاگەیەنراوە سیاسییەکان و مەرجە بابەتییەکانی شۆڕش بۆ ڕاگرتنی شەڕ بەدیارکەوتن.

## بەشی سێیەم: ڕۆڵی مستەفا بـــارزانی لە گەشەپێدانی هزری نەتەوەیی

لەدەســتپێکدا پێویســتە ئەوە بگوترێ، کە باســکردن لەڕێبەرێکی مێژوویی وەک مسـتەفا بارزانی، هاوکات باسـکردنە لەپرسـی کورد وەک نەتەوە و کوردسـتان وەک نیشتمان، چونکە لەو قۆناغەدا ناوی ئەو ببووە ناسنامە و گەوهەری دۆزی کورد[٥٢٤]، بۆیە ڕۆڵ و کەسایەتی کاریزمای بـــارزانی بە پایەکی گرنگی ناسنامەی نیشـتمانی دادەنرێت، بەتایبەت لەقۆناغێکدا، کە ئەم ســیاســەتمەدارە دەبێتە کۆکەرەوەی پێکهاتە ئیتنی و ئاینیی و کۆمەڵایەتییەکان[٥٢٥]. تەنانەت توێژەرێکی بیانی، ڕۆڵی ئەو ڕێبەرە لەبزاڤی ڕزگاریخوازی کورددیدا، وەک تایبەتمەندییەکی گەلی کورد ســـەیر دەکات، کـاتێـک دەڵێـت:" کوردەکـانی عێراق تـایبەتمەنـدیـان لەوەدایە، ئەوان خـاوەنی سەرکردەیەکی کاریزمایی و ڕێبەرێکی نەتەوەیی وەک مستەفا بـارزانین"[٥٢٦].

مســتەفا بارزانی بێجگە لەڕێبەرایەتیکردنی بزاڤی چەکداری، ڕۆڵێکی بەرچاویشـی هەبوو لەگەشـــەپێدانی بیری نەتەوەیی لای گەلەکەی، مێژوونووســێکی ڕوس، بیری سـیاسـی مسـتەفا بارزانی و کۆی تێڕوانینی کۆمەڵایەتی و سـیاسـی و ئابووری ئەم سـەرکردەیە بە ووردی دەخاتەڕوو، بەتایبەتی گەشـەپێدان بەو هزرە نەتەوەییەی، کە لەوانەی پێش خۆی بەمیرات بۆی مابووەوە، کە خۆی لەخواستی ئازادی و یەکریزی گەل و مافەکانی مرۆڤ و یەکســـانی و پێشـــکەوتن دەبینییەوە. ئەو پێیوایە، هزری بارزانی لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە جەختکردنەوەیەتی لەســـەر بوار ڕەخســـاندن بۆ پێشکەوتنی زمان و ڕۆشنبیری، کە کۆڵەگەی بنەڕەتی نەتەوەیە. لەڕووی سیاسیەوە گەڵاڵەکردنی مافە سـیاسـییەکانی کورد و لەڕووی ئابووریشــەوە ئەو تێڕوانینەیە، کە لەبارەی ململانێی وڵاتانی بەرهەمهێنەری نەوت و عێراقەوە خســـتوویەتییە ڕوو، بۆ بەدەستهێنانی مافە ئابوورییەکان. ئەمەش بەڕای ئەو مێژوونووسە گەشەپێدانی بیری

---

524–Michael M. Gunte, The Kurdish Question in Perspective, World Affairs(Jornal), Vol.166, No.4, spring 2004, p.197. doi:https://www.jstor.org/stable/20672696.

525 –Michael M. Gunter, Historical Dictionary of the Kurds, 2nd ed. Scarecrow Press, 2010, p.55.

٥٢٦ – أوفرا بينغيو، كرد العراق بناء دولة داخل دولة، ت: عبدالرزاق عبدالله البوتاني، أربيل، ٢٠١٤، ص٢١.

نەتەوەییە، کە بارزانی لەسـەری پەروەردە بووە و گونجاندویەتی لەگەڵ سـەردەم و قۆناغەکەی خۆی[٥٢٧].

سـەرەڕای ئەوەش دەتوانین بڵێین، بیری بارزانی لەژێر هیچ ناوونیشـانێکی ئایدۆلۆژی قەتیس نابێت، تەنانەت دیدی نەتەوەیی ئەو لەچوارچێوەی ناسـیۆنالیزمدا بە مانا تەسـکەکەی جێینابێتەوە، بۆیە دەکرێت وەک (لۆرتز)ی ئەمریکی بە پڕۆژەیەکی نیشـتمانی وێنای بکەین[٥٢٨]، کە لەهەر قۆناغێکدا وەک پێویسـتییەکی سـیاسـی لەژیانی کوردسـتان و عێراقدا خۆی مانفێسـت کردووە و باشـترین چوارچێوەش ئەوەیە، کە لەژێر ناوونیشـانی کوردایەتیدا[٥٢٩] دەربکەوێت. پێویسـتە ئەوەش بزانین، کە مسـتەفای بارزانی بیروباوەڕی نەتەوەیی کوردی دانەڕشـتووە، بەڵکو ئەو بەو میکانیزمانەی بەردەسـتی بوون، هەسـتی نەتەوایەتی کوردی بەشـێوەیەکی ڕوون دەرخسـتووە و هەروەها پێشـخسـتووە[٥٣٠]، ئەمەش لە سـێ تەوەردا باس دەکەین:

## تەوەری یەکەم: بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی

مسـتەفا بارزانی ئەو ڕێبەر و سـەرکردەیەی کورد بوو، کە لەبنجدا لەنێو خێزانەکەی لەسـەر بنەمایەکی نەتەوەیی و نیشـتمانپەروەریی پەروەردە بوو[٥٣١]. ئەو دیدگا و بیرە نەتەوەییەی، کە لەقۆناغی پێگەیشـتنی لەنێو گوند و کۆمەڵەکەیدا، گواسـتەوە بۆ نێو بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد و کاریکرد بۆ بەرجەسـتەکردنی لە نیشـتمانێک، کە زۆر لەخەڵکەکەی تا دەرکەوتنی ئەو ڕێبەرە، بەدۆزە نەتەوەییەکەی

---

٥٢٧ – أ.ف. كيسيليوف، الكبير يرى من بعيد، البارزاني و شهادة التاريخ، ص١٢٠.

٥٢٨ –.Lortz,op.cit, p.45

٥٢٩ – کوردایەتی( بیری نەتەوەیی کوردی)، زاراوەیەکە دوو مەبەست بەدەستەوە دەدات: یەکەم- زاراوەیەکە بە هەڵگرانی خودی بیروباوەڕەکە دەوترێت. دووەم: مەبەستێکە بۆ بزووتنەوەی نەتەوایەتی و ڕزگاریخواز و ئازادی بەخشی کوردی. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د. جەمال نەبەز، بیری نەتەوەیی کوردی، چاپخانەی ئازاد، ستۆکهۆڵم، ١٩٨٤، ل٦.

٥٣٠ – بڕوانە: خوجلي عبدالواحد حسن جمعة، القضية الكردية و تأثيرها على الدولتين العراقية والتركية في الفترة من (١٩٨٩- ٢٠١٦)، بحث تكميلي مقدم لنيل درجة ماجستير العلوم السياسية في العلاقات الدولية، قسم العلوم السياسية في كلية الدراسات الاقتصادية والاجتماعية بجامعة الخرطوم. ٢٠١٨، ص٣٢.

٥٣١ – أ.ف. كيسيليوف، م.س، ص١١٩.

ئاشـــنا نەبوون[٥٣٢]. ڕاســـتە ژمارەیەک لە ڕۆشـــنبیران و پیاوانی بورژوای شـــار و کەسـایەتییە سـیاسـییەکانی نێو حزب و ڕێکخراوە کوردییەکان، هەوڵی سـەرخسـتنی پرۆژە نەتەوەییەکـانی گەلەکەیـان داوە[٥٣٣]. بەڵام بەشـــێکی گەلی کورد لەو قۆنـاغە مێژووییەدا، ئەوەندەی پابەندی سنووری هۆز و ئێل و سەرۆکەکانیان بوون، ئەوەندە خولیای ڕزگاری خاک و خەڵکی کوردستان نەبوون[٥٣٤].

مستەفا بارزانی باوەڕی بەهێزی بەوە هەبوو، کە سەرکەوتنی پرۆژەی نیشتمانی، بەسـتراوەتەوە بەگەشـەپێدانی هزری نەتەوەیی تاکی کورد، بۆیە ئەوانەی خەسـڵەتی کاریزما بوون دەبەخشـنە ئەو سـەرکردەیە، دەگەڕێنەوە بۆ ڕۆڵی ئەو لەتواندنەوەی بیری هۆزگەرایی و ناوچەگەریتی، لەسـیسـتەمی سـیاسـی و ئابووری و کۆمەڵایەتی کوردستاندا[٥٣٥].

بارزانی بەگەڕانەوە بۆ سـیسـتەمی کۆمەڵایەتی دەڤەرەکەی[٥٣٦]، کاری لەسـەر بونیادنانی نەتەوە و کۆمەڵگەیەکی کوردی پابەند بە نیشـتمانێک کرد، کە هەمووانی تێدا خاوەن ماف و ئازادی بن[٥٣٧]. بۆ ئەم مەبەسـتەش وەک پێشـتر باسـی لێکراوە، حزبی سـیاسـی لە شـوێنی بنەماڵە و هۆز دامەزراند و فرەیی لەنێو بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیدا هێنا کایەوە[٥٣٨]. ئاغا و جوتیار و سـەرمایەدار و کرێکار و ئەندازیار و پیشەگەر و گوندی و شاریی لەبازنەی ڕێبازی کوردایەتیدا کۆکردنەوە[٥٣٩]، بەم شێوەیە چەندین ساڵ لەتەمەنی خەباتی سیاسی خۆی، بۆ بەدیهێنانی جوگرافیا و ئابوورییەکی هاوبەش تەرخانکرد.

---

532 – Khorsheed, op.cit, p.17.

٥٣٣ – بروانە: دیفید مکدول، م.س،ص٤٣٧.

٥٣٤ – باسیلي نیکیتین، الکرد دراسة سوسیولوجیة و تاریخیة، ت: د. نوري الطالباني، السلیمانیة، ٢٠٠٧،ص٢٩٤؛ د. عبدالفتاح علي البوتاني، بدایات الشعور القومي الکردي في التاریخ الحدیث، ط٢، دهوک، ٢٠٠٥، ص٢٨.

٥٣٥ – سیامند البنا، ذکری الاجیال، في: البارزاني و شهادة ألتاریخ ، ص١٢٧.

٥٣٦ – سەبارەت بە تێکەڵاوبوونی پیاوانی ئایینی بە خەباتی چەکداری و سیاسی لە بارزان ، بروانە: د. محەمەد بەکر، سیتەمێ بنەماڵا بارزان(پێکهاتە و گەشەکردن)، مەتین(گۆڤار)، ژ(١٠)، گولان ٢٠٠٠، ل٥٩.

٥٣٧ – بروانە: أ.ف.کیسیلیوف، م.س، ص١١٩.

٥٣٨ – بروانە: د. حامید مەحمود عیسا، س.پ، ل٢٣٢.

٥٣٩ – منذر الموصلي ، القضیة الکردیة في العراق ( البعث والاکراد)، دار المختار، دمشق، ٢٠٠٠، ص١٢٣.

یەکێک لەتایبەتمەندی و ســـیماکانی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی لەو قۆناغە مێژووییەدا، کە مەلا مســـتەفای بارزانی ســــەرکردایەتی کردووە، هەوڵدان بووە بۆ تێپەڕاندنی چوارچێوەی هۆز و بنەماڵە[٥٤٠]، ئەمەش هەر لەگەڵ ســەرهەڵدانی ڕاپەڕینی دووەمی بـارزان بەدی دەکرێ، کـاتێک بـارزانی لەگەڵ ئەو ڕێکخراوە کوردییـانەی نێوەخۆ و پارچەکانی دیکەی کوردســـتان، نەخشـــەیان بۆ ڕزگارکردنی کوردســـتان دارشــت. بۆیە کە حکومەتی عێراقی شــێخ محەمەد خالیدی کوڕی شــێخ ئەحمەدی بارزانی، لەگەڵ فازل عەلی یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشـــتی پۆلیس، لەڕۆژی (١٧ی کانونی یەکەمی١٩٤٣)، بەئامانجی دانووســـان و لێکتێگەیشـــتن لەگەڵ مەلا مســـتەفا بارزانی ڕەوانەی مێرگەســـۆر کرد[٥٤١]، بارزانی لەو دیدارەدا بە میوانەکانی ڕاگەیاند، ئامانجی ئەو ڕاپەرینەی ئەو ســـەرکردایەتی دەکات، لەناوچەیەکی بەرتەســـک و ســـنوورێکی دیـاریکراو قەتیس نـابێ، بەڵکو پلان و نەخشـــەی ئەوەیە، لەگەڵ هـاوپەیمـانەکـانی لە کۆمەڵەی خۆیبون و حزبی هیوا و شـــێخ لەتیفی حەفید، بە شـــێوەیەک بەرفراوانی بکەن، هەموو ناوچەکانی هەولێر و ســـلێمانی و قەزاکانی دەوروبەری موسڵ بگرێتەوە[٥٤٢]. لەساتی کۆتایی دیدارەکەشدا گوتی:"بەردەوام دەبم لەســـەر جێبەجێکردنی پلانەکەم، یان ئەوەتا بەدەســـتی دێنم و ئەو ناوچەیە پاک دەکەمەوە لە حکومەت، یان دەکوژرێم و پیاوەکانیشم لەگەڵمدا دەکوژرێن"[٥٤٣].

وەڵامی بارزانی بۆ میوانەکانی، ئەو تێڕوانینەی پێشـوومان پشـتڕاسـت دەکاتەوە، کە ئەو ســەرکردەیە گوزارشــتی لەخواســتێکی گشــتی ئەو قۆناغە مێژووییەی گەلی کورد کردووە، ئەمیش ڕزگـاربوون بووە لەژێر دەســـتەیی و داگیرکـاری. نەک خواســـتێکی تایبەتی خۆی یان ئێلەکەی. بە بەڵگەی ئەوەی لەکاتی ئەو ســـەردانەی محەمەد خالیدی کوڕی شـــێخ ئەحمەد بۆ لای مســـتەفا بارزانی لە مێرگەســـۆر، ژمارەیەکی زۆری کەسوکاری، بەتایبەتی شێخ ئەحمەدی براگەورەیان لەگەڵ چەندین خێزانی دیکەی بارزانییەکان، ماوەی (١٠) ساڵ بوو لە زێدی خۆیان دوورخرابوونەوە

540- Gunter, the Kurds of Iraq…, p.7, 9.

٥٤١ – د.ک.و، (٣١١/٤٣٣٤)، البلاط الملكي، مخابرات-الاكراد (١٩٢٢– ١٩٥٨).

٥٤٢ – د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة، البارزانيون (١٩٤٣–١٩٤٩)، متصرفية لواء أربيل، ألى وزارة الداخلية، الموضوع: ملا مصطفى البارزاني،المرقم(٤٥١)، ١٩٤٣/١٢/٢١، ص١.

٥٤٣ – د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة، البارزانيون (١٩٤٣–١٩٤٩)، متصرفية لواء أربيل، ألى وزارة الداخلية، الموضوع: ملا مصطفى البارزاني،المرقم(٤٥١)، ١٩٤٣/١٢/٢١، ص١.

و ڕێگایان پێ نەئەدرا بگەڕێنەوە ناوچەی بارزان. کەچی بارزانی سازشی لەسەر پرسی نەتەوەیی کورد نەکرد، لەکاتێکدا ئەوەی لەلاوە ڕوونبوو، بەهۆی ئەو ڕاپەرینەی ئەو بەرپایکردووە، کەسوکارەکەی ڕووبەڕووی نارەحەتی زیاتر دەبنەوە[٥٤٤].

بارزانی لەو دیدارەدا نەک هەر بەزار، بەڵکو بەکردار، کاری لەسەر ناساندنی ڕاپەرینەکەی بۆ کاربەدەستانی بەغدا کرد. وەک بەڵگەنامە عێراقییەکان بەپشت بەستن بەزانیارییەکانی یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتی پۆلیس گواستویەتییەوە، لەنێو گفتوگۆیەکانیاندا لەگەڵ بارزانی، ئەوەی دوایی بەئاماژەیەک داوای لە ئەسعەد خۆشەوی هاوسەنگەری کرد، ئەو پەرچەمەی لەلایەتی کە ئاڵای کوردستانە و هێمایە بۆ خواستە نەتەوەیی و نیشتمانیەکانیان، دەرببخات[٥٤٥]، بۆ ئەوەی ئەو دەسەڵاتە لەوە بگەیەنێ، کە ئەوان دەستبەرداری ئەو ڕاپەرینە نابن[٥٤٦]، تا ئەو ئاڵایە لە کوردستانی ئازاددا هەڵنەکەن[٥٤٧].

ئەو مەسەلەیە ئەوەی دەرخست کە ئامانجی بارزانی، ئامانجی گشتی نەتەوەیی و نیشتمانی هەموو ئەو هێزانەبوو، کە پشتیوانیان لە ڕاپەڕینی دووەمی بارزان و ڕێبەرەکەی دەکرد. دیارە حکومەتی عێراقیش لە پەیامەکەی بارزانی گەیشت، بۆیە (شێخ سدیقی کوڕی سەید تەها)ی نوێنەری هەولێری لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق، بۆ جەختکردنەوەی لەسەر پێویستی ڕاوەستانی شەڕ و ئەنجامدانی دانوستان، لە ڕۆژی (١٨ی کانونی یەکەمی ١٩٤٣) بۆ دیداری مەلا مستەفا بارزانی ڕەوانەی

---

٥٤٤ – د.ك.و، (٣١١/٤٣٣٤)، البلاط الملكي، مخابرات-الاكراد (١٩٢٢– ١٩٥٨).

٥٤٥ – بەگوێرەی زانیارییەکانی یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتی پۆلیس، ئاڵاکە لاکێشەیی بووە و لە سەرەوە پارچەیەکی سوور و لە ناوەراستی پارچەیەکی سپی و ئەستێرەیەکی زەردی لەناو بووە و لەخوارەوەش پارچەیەکی سەوزی هەبووە. د.ك.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة، البارزانيون (١٩٤٣–١٩٤٩)، متصرفية لواء أربيل، ألى وزارة الداخلية، المرقم(٤٣٨)، ١٩٤٣/١٢/١٨، ص٣.

٥٤٦ – د.ك.و، ٣١١/٤٣٣٣، البلاط الملكي، أوراق متفرقة، البارزانيون (١٩٤٣–١٩٤٩)، متصرفية لواء أربيل، ألى وزارة الداخلية، (٤٣٨)، ١٩٤٣/١٢/١٨، ص١.

٥٤٧ – بروانە: د. اسماعيل محمد حصاف، تاريخ كردستان سوريا المعاصر(١٩١٦–١٩٤٦)، ج١، أربيل، ٢٠١٧، ،ص٣١٤.

گونـدی(بیســـتری)ی نزیـک مێرگەســـۆر کرد[548]. ئەو نێردەی حکومەتی عێراقی لەدیـدارەکەیـدا لەگەڵ بـارزانی، ئـامـاژەکـانی دروســـتبوونی ئەو کۆدەنگییەی هێزە نیشـــتمـانپەرەوەکـانی کوردی لەگەڵ بـارزانی بەچـاوی خۆی بینی و دواتر بۆ کاربەدەســـتانی عێراقی گێرایەوە. لەدەســـتی بارزانی دوو نامەی کۆمەڵەی (هیوی کورد)[549]هەبوون، بە شـــکۆمەندییەوە باســـیان لە بارزانی دەکرد، یەکێکیان لەمانگی تشـــرینی دووەم و ئەوەی دیکەیان لە (٢ی کانونی یەکەمی ١٩٤٣)وە ئاراســـتەی بارزانی کرابوون[550]. ئەوە ســـەرباری نامەی پشـــتیوانی ( ئەحمەد ئاغای زێباری ) لەناوچەی ڕێزان و چەندین کەسـایەتی دیکەی سـەربازی و شـارسـتانی لە بەغدا و موسڵ و ڕەواندوز. کە بەگشتی بەڵێنی پشتیوانیکردنی هەوڵەکانیان داوە[551].

لەلایەکی دیکە لەبەدواداچوونی مەسەلەی ئالآیەکەشدا، (شێخ سدیق) باسی لەوە کردووە، کە ئەو ئالآیە لە سوریاوە لەڕێگای موسڵەوە بەدەستی خەڵکێکی دانیشتووی شاری ئاکرێ، کە دۆست و نزیکی بازرانییەکان بوونە، گەیشتۆتە دەستی بارزانی[552]. ئەو نێردراوەی حکومەتی عێراقی لەو هەڵســـەنگاندنەی دوای دیدارەکەی لەگەڵ مەلا مستەفا ئەنجامیدا، بە کاربەدەستانی حکومەتی عێراقی ڕاگەیاند، کە ئەمجارە جیاوازتر لەجاران مەلا مستەفای بینیوە، بەڵکو بارزانی لەو دیدارەدا وەک پیاوێکی لە خۆبایی و شانازیکەر بەخۆی و پێداگر دەرکەوت و گوێی بۆ قسە و ئامۆژگارییەکان نەدەگرت، ئەمەش وەک ئەوەی بەدیـاردەکەوێ، بەردەوام دەبێ لەســـەر کـارەکـانی و ئەو بە پاکردنەوەی ناوچەکە نەبێ لە حکومەت، ڕازی نابێت[553].

---

٥٤٨ – د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣) ، البلاط الملكي، أوراق متفرقة، البارزانيون (١٩٤٣–١٩٤٩)، متصرفية لواء أربيل، ألى وزارة الداخلية، الموضوع: ملا مصطفى البارزاني،المرقم(٤٥١)، ١٩٤٣/١٢/٢١، ص١.

٥٤٩ – مەبەستی (حیزبی هیوا) یە.

٥٥٠ – د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة، البارزانيون (١٩٤٣–١٩٤٩)، متصرفية لواء أربيل، ألى وزارة الداخلية، الموضوع: ملا مصطفى البارزاني،المرقم(٤٥١)، ١٩٤٣/١٢/٢١، ص١.

٥٥١ – متصرفية لواء اربيل، س(٤٣٨)، ١٩٤٣/١٢/١٨، د.ک.و،(٣١١/٤٣٣٣)، البلاط الملكي، أوراق متفرقة البارزانيون(١٩٤٣_١٩٤٩).

٥٥٢ – بەپێی زانیاری سەرچاوەیەک، ئەم ئالآیە لەلایەن کۆمەڵەی (خۆیبوون) بۆ بارزانی ڕەوانەکراوە. أسماعيل حصاف، تاريخ كردستان سوريا المعاصر(١٩١٦–١٩٤٦)،ج١، أربيل،٢٠١٧،ص٣١٤.

٥٥٣ – د.ک.و، ٣١١/٤٣٣٣، البلاط الملكي، أوراق متفرقة، البارزانيون (١٩٤٣–١٩٤٩)، متصرفية لواء أربيل، ألى وزارة الداخلية، الموضوع: ملا مصطفى البارزاني،المرقم(٤٥١)، ١٩٤٣/١٢/٢١، ص١.

مستەفا بارزانی لەو هەوڵ و کۆششانەی بەئامانجی هۆشیارکردنەوەی گەلی کورد بە مافە نەتەوەییەکانی لە باشووری کوردستان ئەنجامیدا، ئەگەر نەیتوانی لە قۆناغی یەکەمی بزاڤەکەدا باوەڕ بە هەموو هێزە کوردییەکان بهێنێ تاوەکو بیانهێنێتە ریزی هێزەکانییەوە، بەتایبەتی ئەو هۆزانەی نەیاری بارزانییەکان بوون. بەڵام توانی بەشێکیان لە ریزی سوپا و پۆلیسی حکومەتی عێراقی دوور بخاتەوە، دوای ئەوەی گەیشتنە ئەو ئەنجامەی، کە بزاڤەکەی بارزانی ئامانجی ڕزگارکردنی کوردستانە. ئەو ڕاستییەش لە ڕاپۆرتی پشکنەری پۆلیسی عێراقی لە مێرگەسۆر، کە لە ڕۆژی (١٤ی کانونی یەکەمی١٩٤٣) ئامادەیکرد بەدیار کەوت، کاتێک ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، بەشێکی زۆری چەکداری ئەو هۆزانەی لە ریزی هێزی پۆلیسی ناڕێکخراوی حکومەت بوون، لە سەنگەرەکانی شەڕ دژ بەهێزەکانی مەلا مستەفا بارزانی کشاونەتەوە، بەپێی ڕاپۆرتی ئەو پشکنەرە، (٢٠٣) چەکداری مەحمود ئاغای زێباری و (٨٣) چەکداری دیکەی سورچییەکان و (٢٤) چەکداری قادر ئاغای شوش لە (٧ی کانونی یەکەمی١٩٤٣) ڕیزی هێزەکانی پۆلیسیان جێهێشت و گەڕانەوە ماڵەکانیان[٥٥٤].

لەئەنجامی ئەو پێشهاتە سیاسییە، حکومەتی عێراقی هەوڵەکانی چڕ کردەوە بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ بارزانی، ئەوەبوو لە (٧ ی کانونی دووەمی ١٩٤٤) ماجید مستەفای وەزیری دەوڵەتی بۆ دانوستان لەگەڵ بارزانی ڕەوانەی مێرگەسۆر کرد. لەو دیدارەدا ئەوەی دوایی داخوازییە نەتەوەییەکانی خستەڕوو، کە بریتی بوون لە دامەزراندنی ویلایەتی کوردستان، کە پێکبێت لە سلێمانی و هەولێر و کەرکوک و قەزا کوردیەکانی لیوای موسل ( واتە: دهۆک و زاخۆ و ئامێدی و ئاکرێ و شێخان و سنجار) و دانپێدانانی حکومەتی عێراقی بە زمانی کوردی وەک زمانێکی فەرمی لەناوچە کوردییەکان و دامەزراندنی وەزیرێکی کورد بۆ سەرپەرشتیکردنی ویلایەتی کوردستان[٥٥٥]. لەگەڵ چەند داخوازییەکی دیکە لەمانەش، گێڕانەوەی شێخی بارزان و ئەوانەی لەگەڵیدابوون بۆ زێدی خۆیان، کە ماوەی (١٠) ساڵ بوو لە بارزان دوور خرابوونەوە. حکومەتی عێراقی لە (٣٠ی کانونی دووەمی ١٩٤٤) یەکێک لە

---

٥٥٤ – الحكومة العراقية، دائرة مديرية الشرطة العامة، تقرير مفتش الشرطة عن الملا مصطفى البارزاني ألى وزارة الداخلية. قلم الحركات، العدد(٣٩٨٣)، التاريخ(١٩٤٣/١٢/١٤)، د.ك.و، ٣١١/٤٣٣٣، البلاط الملكي، أوراق متفرقة، البارزانيون(١٩٤٣_ ١٩٤٩).

٥٥٥ – صلاح الخرسان، م.س، ص٤١.

داخوازییەکانی بارزانی بەجێگەیاند بە گێڕانەوەی شێخ ئەحمەدی بارزانی و دوورخراوە بارزانییەکانی دیکە، بۆ ناوچەکەی خۆیان[٥٥٦].

بارزانی لەبەرامبەردا بۆ نیشاندانی نییەت پاکی خۆی بەرامبەر بە حکومەت، بەپێی ئەو ڕێککەوتنەی لەگەڵ ماجید مستەفا ئەنجامی دابوو، لە (٢٢ی شوباتی ١٩٤٤) چووە شاری بەغدا و پابەندی خۆی و هێزەکەی بە حکومەتی عێراقی ڕاگەیاند و مۆڵەتی لێ خواستن بگەڕێتەوە ناوچەی بارزان بۆ ئەوەی بەپێی ئەو ڕێککەوتنەی ئەنجامیانداوە، ئەو چەکانەی کە لەشەڕەکاندا بەرامبەر پۆلیس و سوپای عێراقی دەستیان بەسەرداگرتبوو ڕادەستی حکومەت بکەنەوە[٥٥٧]. بەڵام کاتێک هەستیکرد حکومەتی بەغدا لەبەڵێنەکانی ڕاستگۆ نییە[٥٥٨]، لەماوەی نێوان (٢٧ی حوزەیران تا ١٠ی ئابی ١٩٤٥) لەنێو هۆزەکانی کەوتبوونە ناوچەکانی باڵەک و برادۆست و بادینان، دەستی بە بانگەشەکرد بۆ پاڵپشتیکردنی جووڵانەوەکەی[٥٥٩]. ئەو چەکانەشی لەلای بوو کە نزیکەی(٦٠٠) تفەنگ و (١٣) ڕەشاش بوون ڕادەستی حکومەتی نەکردنەوە[٥٦٠].

دیارە بانگەشەکانی بارزانی و هەوڵەکانی بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی کاریگەری خۆی هەبووە، چونکە تەنانەت بەشێکی هۆزە کوردییەکانی نەیاری تەقلیدی بارزانییەکان بوون، لەنمونەی زێبارییەکان لە (٢٤ی ئابی١٩٤٥) پەیوەندییان بە بزاڤەکە کرد[٥٦١]. دوای ئەوەی باوەڕی تەواویان بە ئامانجەکانی بارزانی هێنا، کە خواستی ڕزگارکردنی گەل و نیشتمانەکەیەتی[٥٦٢]. بەو شێوەیە بەهۆی ئەو پشتیوانییە

---

٥٥٦ – د.ك.و، البلاط الملكي،(٣١١/٤٣٣٣)، أوراق متفرقة/ البارزانيون(١٩٤٣– ١٩٤٩)، ص٢.

٥٥٧ – محمود الدرة،م.س،ص٢٠٤؛ د. غانم محمد الحفو، د. عبدالفتاح علي البوتاني، الكورد والاحداث الوطنية في العراق خلال العهد الملكي(١٩٢١– ١٩٥٨)، دهوک، ٢٠٠٥، ص٧٩.

٥٥٨ – سەبارەت بەو خاڵانەی مستەفا بارزانی هاندا شۆڕش لە بارزان دەست پێبکاتەوە، بڕوانە: معروف چیاووک، م.س،ص١٣٧،١٣٨.

٥٥٩ – محمود شاكر، التاريخ الاسلامي(١١) التاريخ المعاصر بلاد العراق(١٩٢٤–١٩٩١)، المكتب الاسلامي، بيروت، ١٩٩١، ص٢٤٢،٢٤١.

٥٦٠ – صلاح الخرسان، م.س، ص٤٢.

٥٦١ – معروف چياووک، م.س،ص١٣٩؛ ديفيد مكدول، م.س،ص٤٤٢.

٥٦٢ – بۆ زانیاری لەسەر ئەو هۆز و کەسایەتییانەی بوونە هاوپەیمانی بارزانی،بڕوانە: الحكومة العراقية، مديرية ألشرطة العامة،تقرير مفتش الشرطة عن الملا مصطفى البارزاني، قلم

گەورەی لە نێوەخۆی کوردستان لەبارزانی کرا، نووسەرێکی لوبنانی مستەفا بارزانی لەو قۆناغەدا وەک بەهێزترین کەسـاـیەتی کورد لەعێراق دەناسـێنێ[٥٦٣]. توێژەرێکی ئەمریکیش پێی وایە، بارزانی بەهۆی ئەو ئاراسـتە نەتەوەییەی سـتراتیژی خەباتی سـیاسـی و چەکداری لەسـەر بونیادنا، تەواوی هێزە نەتەوەییە کوردییەکانی گەیاندە ئەو باوەڕەی، وەک ڕێبەری نەتەوەیی خۆیان هەڵبژێرن[٥٦٤].

دەکرێ بڵێین ئەو ئاراسـتە نەتەوەییەی مسـتەفا بارزانی وەک بنەما لە قۆناغی دووەمی ڕاپەڕینی بارزاندا لە ساڵی (١٩٤٥) کاری لەسەرکرد، وێڕای سەرنەکەوتنی لەڕووی سەربازییەوە[٥٦٥]، کەچی بێ هودە و بێ بەرهەم نەبوو، چونکە بارزانی توانی لە گەشـەپێدانی بیری نەتەوەیی لەنێو ژمـارەیەکی زۆری خەڵکی دەڤەرەکەی و ناوچەکانی دیکەی کوردسـتان سـەرکەوتووبێ، ئەو لەو کاتەی سـاڵی ١٩٤٣ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە گەڕایەوە بارزان، تەنها چەند کەسێک لە دۆستە نزیکەکانی یاوەری بوون، لەگەڵ ئەوان بزاڤەکەی هەڵگیرسـاند[٥٦٦]، بەڵام ئەو کاتەی لە (تشـرینی یەکەمی ١٩٤٥) پەڕیەوە ڕۆژهەڵاتی کوردسـتـان، نـزیکەی (١٠) هەزار کەس لەگەڵیدابوون، کە لەو ژمارەیان (٣) هەزاریان چەکدار بوون، لەسـەر ئەو ئامانجەی بارزانی لەپێناویدا بانگهێشـتی کردبوون، چارەنووسـی خۆیان بەو سـەرکردەیە بەستەوە[٥٦٧].

بەرپرسـە سیاسـییەکانی عێراق هەرچەندە لەوە دڵنیابوون کۆتاییان بە ڕاپەڕینی دووەمی بـارزان هێنا و ڕێبەری کورد و شـۆڕشـگێرانی دیکەی لەگەڵیدا بوون لەسـنووری عێراق پەڕینەوە سـنووری ئێران، بەڵام ئەوان لەوە دڵنیا نەبوون، کە

---

الحركات،العدد(٣٩٨٣)،١٩٤٣/١٢/١٤،في:د.ك.و،(٣١١/٤٣٣٣)،البلاطالملكي،أوراق متفرقة، البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)؛ محمود الدرة،م.س،ص٢٠٧.

٥٦٣ – ادمون غريب، م.س،ص٣١.

564 – Chapman, op.cit, p.44.

٥٦٥ – سەبارەت بەو هۆزانەی لە بارزانی هەڵگەڕانەوە و چوونە پاڵ هێزەکانی حکومەتی عێراقی، بڕوانە: محمود الدرة، م. س، ص٢١٣؛ ديفيد مكدول، م.س،ص٤٤٣.

٥٦٦ – بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە(٤٦) لە: ڕاپەڕینەکانی بارزان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی هەردوو حکوومەتی فەرەنسا و بریتانیادا ١٩٣١-١٩٤٩، و. لە فەرەنسییەوە: د. نەجاتی عەبدوڵڵا، دەزگای چاپ و بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ل٨٩.

٥٦٧ – وليم أيغلتن الابن، م.س، ص١٠٨.

توانیبیتیان بە سەرکەوتنێکی سەربازی، مستەفا بارزانی و بزاڤی کوردیان لەهزری خەڵکی کوردستان سڕیبێتەوە. بۆیە کاتێک ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەکۆبوونەوەیەکدا لێکۆلینەوەی لەسەر هۆکارەکانی هەڵگیرسانی ئەم بزاڤەی مەلا مستەفا بارزانی دەکرد، یەکێک لە ئەندامانی ئەنجوومەن لەوێدا گوتی:"دەبێ ئێمە زۆر بەجدییەوە لەو پرسە بکۆڵینەوە، ڕاپەرینەکانی بارزان لەڕابردوودا داخوازییەکی تەواو ناوچەیی بوون، کە بریتی بوون لەچەند ڕاپەڕینێک دژی دۆخ و بەڕێوەبەرایەتی ناوخۆیی، بڕێکجاریش ئەم ڕاپەڕینانە ئامانجی سیاسییان هەبووە، کە کوردەکان بەتەواوی پێی نامۆ بوون، ئێستاکە ئەم هۆکارانە نەماون، ڕووداوەکانی دوایی وەرچەرخانێکی ترسناکیان بە خۆیەوە دەبینی، ئەگەر حکومەت پەلەی نەکردبوایە لەداپلۆسینی"[٥٦٨]. ئەم دەربڕینە سیاسییەی ئەندامەکەی ئەنجوومەنی نوێنەران، مەودای دوو دڵی و دڵەڕاوکێی حکومەتی عێراقی نیشان ئەدات، کە لەژێر کاریگەریی ڕۆڵی مستەفا بارزانی لەگەشەپێدانی هزری نەتەوەیی لەنێو خەڵکی باشووری کوردستان، لەماوەی ڕاپەڕینی دووەمی بارزاندا ڕووبەڕووی بوونەوە.

پەڕینەوەی بارزانی بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان، قۆناغێکی دیکەی خەبات بوو، لەپێناو بەردەوامیدان بە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی. ئەو پەڕینەوەیە ئەگەر لە هۆکارە ڕووکەشەکەیدا خۆڕزگارکردن بوو لەبەردەم سوپا و لەشکری حکومەتی عێراقی و هاوپەیمانەکانی، بەڵام لەنێوەڕۆکیدا، چەندین ئاماژەی نیشتمان ویستی لەخۆگرت، بەتایبەتی دوای ئەوەی بارزانی و ئەو هێزەی لەگەڵیدابوو، لەگەڵ دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە شاری مەهاباد، چوونە ڕیزی سوپا و بەرگریکارانی ئەو دەسەلاتەی، نۆبەرەی حکومرانی کوردی بوو لەناوچەکە[٥٦٩].

بەم شێوەیە بارزانی سەلماندی، کە ئەرکی پاراستن و بەرگریکردن لەماف و ئازادیەکانی هەر کوردێک لەهەر پارچەیەکی کوردستان، بەرپرسیارەتی نەتەوەیی و نیشتمانی هەمووانە لە عێراق بن یان لە ئێران، ئەو دیدگایەشی لە وتارێکی، کە بەبۆنەی یادی جەژنی نەورۆز لە شاری مەهاباد لە ١٩٤٦ سازکرابوو، ڕەنگی دایەوە، کاتێک گوتی:" خوێن ڕژاوە، ئازادی دەست بەسەرکراوە، ڕەنج غەسبکراوە، ملی هاوارکەرانی ئازادی کەچ کراوە، ئەم هەموو بەسەرهاتە لەچاخێکی مێژوودا بەرامبەر

---

٥٦٨ – بۆ دەقی بەڵگەنامەکە بڕوانە: ڕاپەرینەکانی بارزان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی....ل٩٩.
569 - Chapman, op.cit, p.45-46.

کورد کراوە، بەم بەســـەرهـاتـانە یەک بەدوای یەکدا، ئـاگری مقەدەســـی کوردی داگیرســـاند و لەو ئاگرە پاک و گەرمەیدا هەموومانی تواندەوە. ڕوناکی کوژاوەی گیانی پاڵەوانی ئازادی گەلمان لەشـەمزینان، بارزان، دەرســیم، دیاربەکر و سـلێمانی، ئەو ڕێگایەمان بۆ ڕوناک دەکاتەوە، کە گیانمان بۆ بەختکردووە کە بیگەینێ"[٥٧٠].

ئێدمۆند غەریب[٥٧١]سەبارەت بە پەرپینەوەی بارزانی و شۆڕشگێڕانی باشوور بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردســـتان، نووســـیویەتی:"گەیشـــتنی بارزانی و جەنگاوەرەکانی بۆ مەهاباد، گەشـــەی بەهزری نەتەوەیی کوردەکاندا، هاوکات هاندەرێکیش بوو بۆ کۆبوونەوەی نوێنەرانی کورد لە وڵاتـانی دەوروبەر، لەپێنـاو پشـــتیوانیکردن لەدامەزراندنی قەوارەی کوردستانی گەورە"[٥٧٢].

ئەو کۆمارەی خەونێکی بەدیهاتووی ئازادیخوازانی کورد بوو، لە (١٧ی کانونی یەکەمی ١٩٤٦) ڕووخا و قازی محەمەدی ســـەرۆکی کۆمارەکەش زیندانی کرا. ئەو لەڕۆژی دادگاییەکەیدا، بۆ زیندوو ڕاگرتنی هیوا و ئومێدی گەلی کورد لەدوای ئەو کارەســـاتە نیشـــتمانییە، لەبەردەم دادوەرانی دادگاییان کرد گوتی:"مەلا مســـتەفا و بـارزانییەکان هیوای دوا ڕۆژی کوردن و منیش پەرچەمی کوردســـتانم بە ئەوان ســـپاردووە، ئەوان پارێزگاری ئەو ئاڵا (پەرچەم) ە دەکەن، تا ڕۆژی خۆی ئاڵای کوردستان لای ئەوانە... هیوام بە خوایە ڕۆژێک بێت و ئەو ئاڵایە بە دەستی بەتوانا و بەهێزی بارزانی لەســـەر ئەم خانووەی، کە منی تێدایە دادگەیی دەکرێم و لەســـەر هەموو شوێنە بەرزەکانی کوردستان بشەکێتەوە"[٥٧٣].

بارزانی دوای قازی محەمەد، ئەرکی پاراســـتنی ئەو پەرچەمە و چارەنووســـی دۆزی کوردی دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان لەئەستۆگرت، بەو هۆیەوە وەک

---

٥٧٠ – بروانە: خطابەی زعیم جنابی مەلا مصطفی بارزانی، کوردستان(ڕۆژنامە)، ژ(٢٧)، ٢٥ی مارس١٩٤٦، ل١-٢.

٥٧١ – ئێدمۆند غەریب: لە (٢٦ی ئاداری١٩٤٢) لە شارۆچکەی عیتا ئەلفەخار لە قەزای ڕاشیا لە بقاعی لوبنان لەدایک بووە. بڕوانامەی دکتۆرای لە مێژوو و زانستی سیاسی و ئابووری بەدەستهێناوە. چەندین کتێبی لەسەر کورد هەیە، لەمانەش( المسالة الكردية). ناوبراو ئێستا مامۆستای زانکۆیە لە زانکۆی جۆرج واشنتن لە ئەمریکا. (توێژەر).

٥٧٢ – ادمون غریب، م.س،،ص٢١.

٥٧٣ – سەرۆک کۆماری کوردستان لەبەردەم دادگای ئێراندا، بەرهەڤکردنی: بەدرەدین ساڵح، هەولێر، ٢٠٠١، ل٣٢.

ڕۆژنامەی(نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی ئاماژەی پێکردووە، ڕووبەڕووی هێزەکانی عێراق و تورکیا و ئێران بویەوە و خۆی ڕادەستی هیچ یەکێک لەو دەسەڵاتانە نەکرد[٥٧٤] و لە (١٨ی حوزەیرانی١٩٤٧) لە سنووری ئێرانەوە پەڕیەوە خاکی سۆڤیەت[٥٧٥].

بەم شێوەیە بارزانی وێستگەی خەباتی نەتەوەیی و نیشتمانی بۆ ناوچە کوردنشینەکانی نێو سنووری کۆمارەکانی ئازەربیجان و ئەرمینیا، گواستەوە. لەسەرەتادا لە ئازەربیجان لەڕێگەی ئەو ڕێککەوتنەی لەگەڵ حکومەتی سۆڤیەت ئەنجامیدا کە پێشتر باسکراوە، توانی حکومەتێکی کوردی کاتی لەم وڵاتە دابمەزرێنێ بۆ بەردەوامیدان بە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی لەپەناهەندەیی[٥٧٦]. لەڕێگای ئەو حکومەتەوە، بارزانی توانی سەرکردایەتییەکی هاوبەش لەنێوان کوردانی باشوور و ڕۆژهەڵات پێکبهێنێ و هەمووان لە بازنەی دامەزراوەیەکی کوردستانی خاوەن یەک ئامانجی نەتەوەیی کۆبکاتەوە. ویستی مستەفا بارزانی بۆ یەکخستنی کورد، لە یەکەم وتاری لە کۆنفرانسی دامەزراندنی حکومەتەکە بەدیارکەوت. لەم وتارەدا ئامانجی بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی بۆ دامەزراندنی قەوارەیەکی کوردی سەربەخۆ لە هەموو پارچەکانی کوردستان خستەڕوو، کاتێک ئاماژەی بۆ ئەوە کرد:" ئەو جمهوریەتە کوردییەی کە لە کوردستانی ئێران تەشکیل دەبی، دەبێتە ئستنادگاە بۆ ئازادکردنی هەموو کوردستانی گەورە"[٥٧٧].

هەر لەپێناو ئەو ئامانجە، بارزانی لە پەناهەندەیی دەستی بە خەباتی سیاسی خۆی کرد، کە بەشێکی لەبازنەی بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی چڕ کردەوە. لەو چوارچێوەیەدا ناوچە کوردنشینەکانی یەکێتی سۆڤیەتی بە دوورنەگرت و سوودی لەو دەرفەتە وەرگرت کە لەدوای مردنی ستالین و هاتنە سەر دەسەڵاتی خرۆتشۆف، هاتە پێشەوە. ئەو گۆڕانە سیاسییە لە سۆڤیەت دەرفەتی بۆ بارزانی ڕەخساند لەساڵی١٩٥٦ سەردانی کۆماری ئەرمینیا بکات و بچێتە ناو کوردانی

---

574 - BARZANI TRIBE IN RUSSIA; Fugitives From Iraq Battled Armies of Three Countries, The New York Times, June 20, 1947, Page 4.
575 - FIRAT SÖZERİ , Önceki Kaynak,S.25.
٥٧٦ – د.ك.و، البلاط الملكي،(٣١١/٧٣٧)،وزارة الخارجية، الدائرة السياسية، الشعبة الشرقية، رقم الكتاب:٤/٣١٣٣، ١٠/تشرين الاول/١٩٤٨؛مسعود بارزانی، بارزانی و ...(١٩٣١– ١٩٥٨)، ل١٩٨.
٥٧٧ – هـ.س، ل٣٥٥.

ناوچەکانی (ئاراغاتس و ئاباران و تالین و ئشـــتارک) [٥٧٨]، بارزانی لەو ســـەردانەیدا هەوڵیدا ئەو پەیامە بگەیەنێتە خەڵکی کوردی ئەو ناوچانە، کە ئەوان سەرەڕای ئەوەی لەســـەر خاکی یەکێتی ســـۆڤیەت لەدایک بوون و دەژین، بەڵام لە بنجدا کوردن و خاوەن تایبەتمەندی نەتەوەیی خۆیانن.

بارزانی لەناوچەی تالین سەردانی گوندی (هەکو) و لە ناوچەی ئاباران سەردانی گوندی ( جرجریس )ی کرد. لەگەڵ خەڵکی ســـادەی گوندەکان گفتوگۆی کرد، سەردانی ماڵی ژمارەیەکیانی کرد. لە گوندی(جرجریس) کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی لە کوردانی ئێزیدین پیاو و ئافرەت و منداڵەکانیان لەدەوری بارزانی کۆبوونەوە، لەو کاتەدا بارزانی ڕوویکردە بەرپرســـی گوندەکە کە ناوی( لیڤۆن گریگۆریان) بوو، ئەو پیاوە لە بنجدا ئەرمەنی بوو، پێی گوت:" لیڤۆن ڕێگام بدە چاوت ماچ بکەم، تۆش چاوی گەلەکەی من ماچ بکە"[٥٧٩].

خەڵکی کوردی ئەم ناوچانەی ئەرمینیا بۆ یەکەمجار بوو چاویان بە ڕێبەرێکی کورد بکەوێ، کە سەردانیان بکات و گرنگی بەکاروبارەکانیان بدات، وەک بەشێک لە کورد سەیریان بکات. بەر لەچوونی بارزانی بۆ سۆڤیەت، کوردەکانی ئەرمینیا بەهۆی پچڕانی پەیوەندیەکانیان بە کوردستان، وایان دەزانی، کە دەوڵەتی سۆڤیەت نیشتمانی ئەوانە. بەڵام ســـەردانی بارزانی بووە هۆی ئەوەی ، توانا و ئازایەتی ئەوەیان هەبێ بڵێن کوردســـتان لەپاڵ یەکێتی ســـۆڤیەت نیشـــتمانی ئێمەیە[٥٨٠]. هەر لەو دەمە، ئێزیدیەکانی گوندی (جرجریس) ئەوەندە کەوتنە ژێر کاریگەریی ســـەردانەکەی بارزانی، خێزانێک منداڵەکەی خۆیان بەناوی بارزانی کرد[٥٨١]. ئەمەش دەرەنجامێکی ئەرێنی بوو بۆ هەوڵەکانی مەلا مســـتەفای بارزانی، بە ئامانجی بڵاوکردنەوەی هۆشـــیاری نەتەوەیی لەنێو کوردەکانی ســـۆڤیەت. تەنانەت یەکێک لە بەڵگەنامەکانی

578- О.л. Жигалина. Предыдущий источник, С.123.

٥٧٩ – وەزیری أشو، دوسیة البارزاني في محفظة ستالین الفولاذیة، ت:د. أسماعیل حصاف، هولیر، ٢٠٠٨،ص٥١.

٥٨٠ – م.ن،ص٥٢.

٥٨١ – عبدالفتاح البوتاني، ملا مصطفى البارزاني قائد الثورة الكوردیة و ملهمها، ص٢٤.

ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکا، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە: "کوردەکانی سۆڤیەت مستەفا بارزانی وەک پادشای کورد دەبینن"[٥٨٢].

سـەردانی بارزانی بۆ ناو کوردەکانی ئەرمینیا، فاکتەرێکی کاریگەربوو لەسـەر ئەوەی کوردەکان هەسـت بەوە بکەن خاوەنی ئینتما و نیشـتمانن. لە کاتێکدا کاربەدەسـتانی یەکێتی سـۆڤیەت کەسـایەتی بارزانیان وەک سـەرۆکی گەلی کورد لە هەموو کوردستان دەبینی، تەنانەت بە کوردەکانی وڵاتەکەی خۆشیانەوە. بۆیە رێزی زۆریان بۆ دانا. ئەوەش هۆکار بوو بۆ ئەوەی لە نێوەندی کوردی لە سۆڤیەت، بیر و هەسـتێک لەلای کوردەکانی ئەو وڵاتە دروسـت بێ کە گوزارشـتی لە دەرکەوتنی کەسـایەتی نەتەوەیی دەکرد. کوردەکان لەو کاتەوە هەسـتێکیان بۆ دروسـت بوو، ئەوان بەبێ گەل و بێ نیشـتمان نین. زیاتر لەوە تێگەیشـتن بارزانی خەبات لە پێناو رزگاری کوردسـتان دەکات، وە ئەگەر لەو هەوڵەیدا سـەربکەوێ ، ئەوان دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ نیشتمانی باوک و باپیرانیان[٥٨٣].

هەر لێرەدا پێویسـتە باس لەوە بکەین کە مەلا مسـتەفا بارزانی دوای مانەوەی بەدرێژایی(١١) سـاڵ لەیەکێتی سـۆڤیەت، نەبووە کۆمۆنیسـت، چونکە ئەو هەموو هەوڵی ئەوەبوو، جووڵانەوەی کوردی سـەربەخۆیی تەواوی خۆی هەبێ[٥٨٤]. ئەوەش سـەلمێنەری ئەوەیە، بارزانی وابەسـتەی تیۆرە گشـتییەکان نەبووە، چونکە ئەمانە دەبوونە هۆی ئەوەی سـەربەخۆیی لەدەسـت بدات و لە ناوەڕۆکە نەتەوەییە کوردیەکەی بەتاڵی بکاتەوە. سەبارەت بەو بابەتە بارزانی دەڵێت:"من شیوعی نیم، وە شـیوعییەتم خۆش ناوێ. من دیموکراتیم وە حەزدەکەم لەگەڵ گەلەکەی خۆم بە ئاشـتی بژیم لە سـێبەری یەکسـانیدا، هەر کات دەرفەتم بۆ رێک بکەوێ، ئاڵای

582- F. R.U. S, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, Indication of Soviet Disappointment with the Government of Iraq
, Washington, August 24, 1970, p.1. بۆ بینینی بەڵگەنامەی دەزگای ناوەندی هەواڵگری ئەمریکا سەبارەت بە تێڕوانینی کوردانی سۆڤییەت بەرامبەر مەلا مستەفا بارزانی، بروانە: پاشکۆی ژمارە (١٢).

٥٨٣ – وەزیری أشو، م.س،،ص٥٣.

٥٨٤ – عبدالفتاح البوتاني، ملا مصطفى البارزاني قائد الثورة الكوردية و ملهمها، ص٢٥.

کوردســـتان لە هەر ناوچەیەکی کوردســـتان بێ بەرزی دەکەمەوە، ئینجا ئەگەر ئەو خاڵە لەعێراق یان ئێران یان تورکیا بێ، هیچ جیاوازی نییە"[٥٨٥].

کۆششە بەردەوامەکانی مستەفا بارزانی بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی، بەشـــێکی ئەنجـامەکەی دوای گەڕانەوەی بۆ عێراق بەدیـارکەوت، چونکە دوای گەڕانەوەی ئەو ڕێبەرە کوردە بۆ ناو خەڵک و جەماوەر و لایەنگرانی، وەک ئاژانسـی هەواڵگری ئەمریکا لە ڕاپۆرتێکیدا ئاماژەی پێکردووە، هەژموونی ســـیاســـی لەنێو کوردەکانی عێراق بەرزبوویەوە[٥٨٦]، وێڕای ئەوەی ڕۆشـــنبیری کوردی لەگەڵ ئەم ڕووداوە بوژانەوەی بەخۆیەوە بینی[٥٨٧].

نووسـەرێکی عەرەب باس لەوە دەکات، چالاکییە سیاسـییەکانی مستەفا بارزانی لەدوای گەڕانەوەی لە سـۆڤیەت، لەشـاری بەغدا دەسـتیپێکرد. ئیتر ئەو شـارە بووە سـەکۆی چالاکییە سـیاسـییەکانی کورد. هەر لەو شـارە بۆیەکەمجار بوو بارزانی بە ژمارەیەک گەنجی ڕۆشـــنبیری کورد ئاشـــنابێ، کە پڕبوون لەجۆش و خرۆش بۆ دۆزی گەلەکەیـان. لەو کـاتەدا بەگوێرەی گوتەی ئەو نووســـەرە، بـارزانی ڕۆڵی سەرکردایەتی گشتگیری وەرگرت بۆ قۆناغێکی درێژ. بەو شێوەیە بوارەکانی چالاکی و پەیوەندییەکانی تەنها لە چیا و ناو هۆزە کوردییەکان نەمایەوە، بەڵکو گەیشـــتە ئاستی پایتەختی عێراق و شارەکانی کوردستان[٥٨٨].

دەزگـای هەواڵگری ئەمریکا لەڕاپۆرتێکیدا کە لەڕۆژی (٥ی تشـــرینی یەکەمی ١٩٥٨) دەرچووە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە هەرچەندە بارزانی پشـتگیری بۆ رژێمی عێراق دەربڕیوە، بەڵام هەســـتی جوداخوازی لەنێو کوردەکان زیادی کردووە. ئەو دەزگایە بەپشـت بەسـتن بەزانیارییەکانی باڵیۆزخانەکەیان لەبەغدای پایتەختی عێراق، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە پێشبینی دەکەن کوردەکانی عێراق، دوای ڕووداوی گەڕانەوەی بارزانی فشـــاری زیاتر لەســـەر حکومەتی عێراقی دروســـت بکەن بۆ بەدەسـتهێنانی سـەربەخۆیی یان ئۆتۆنۆمییەکی فراوانتر لەوەی بەڵێنیان پێ دراوە. بە بڕوای ئەو دەزگایە ئەوە دەرئەنجامی گەشـــەکردنی هەســـتی نەتەوایەتی کوردەکانە،

---

٥٨٥ – تفرشیان، م. س، ، ص٢٥٦.

586 -CIA/ (FOIA) /ESDN (CREST): 03156626, Central Intelligence Bulletin _ 1958/09/05, Iraq Welcomes Kurdish Leaders Re- Turn from USSR, p.8.

٥٨٧ – کریس کۆچێرا، س.پ، ل١٨٢.

٥٨٨ – منذر الموصلي ، م.س، ص١١١.

بەهۆی گەڕانەوەی ڕێبەرەکەیان بۆ وڵات. لەبەرئەوەی ئەو ڕووداوە زیاتر پابەندی پرسی نەتەوەییی کردن، بەراورد بە کاتەکانی پێشووتر. هەر لەو ڕاپۆرتەدا ، ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکا باس لەوە دەکات، کە لەئێستادا، مستەفا بارزانی پشتگیری (٨٠٠) هەزار کوردی عێراقی بەدەستهێناوە و بەڵکو هەژموونی ئەو، گەیشتۆتە ناوچەکانی باکووری ئێران[٥٨٩].

ئەو دەزگایە لەڕاپۆرتێکی دیکەیدا، کە لەڕۆژی (٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٨) دەرچووە، باس لەوە دەکات، مەلا مستەفای بارزانی بەنیازە لەو ماوەیەدا دوای گەڕانەوەی بۆ عێراق، سەردانی کوردەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی سوریا بکات، بەمەبەستی گەشەپێدانی چالاکیی نەتەوەیی، بەو هۆیەوە لەلایەن کۆماری عەرەبی یەکگرتوو، فەرمان دەرچووە بۆ چاودێریکردنی چڕی جموجۆڵەکانی[٥٩٠].

ئەو کۆششە نهێنییانەی مستەفا بارزانی بۆ گەشەپێدانی هەستی نەتەوەیی لەناوچە جیاوازەکانی کوردستان ئەنجامی ئەدا، ڕۆژنامەی (ئیتلاعات)ی ئێرانی بە دەنگ هێنا، کاتێک لە ڕاپۆرتێکیدا کە لەمانگی (نیسانی ١٩٥٩) بڵاوکراوەتەوە، بەسوود وەرگرتن لەهەندێک زانیاری ڕۆژنامەی (نیویۆرک یونایتد پرس)، هۆشداری بە دەسەڵاتدارانی عەرەبی لەناوچەکە دەدات، وریا و چاوکراوەبن بەرامبەر ئەو چالاکییانە، لەبەرئەوەی وەک ڕۆژنامەکە ئاماژەی پێکردووە، بارزانی کاریگەریی بەهێزی لەسەر گەشەکردنی هزری نەتەوەیی کوردی هەیە لەئێستادا، بەم جۆرەش هەڕەشە و مەترسییەکی گەورە لەسەر جیهانی عەرەبی دروست دەکات[٥٩١]. تەنانەت ڕۆژنامەی (مەعاریف)ی ئیسرائیلی هۆشدارییەکی توندتر لەوە بە وڵاتانی عەرەبی دەدات، کاتێک ئەو دۆخەی بە بۆمبێکی ئامادەکراو وەسفکرد، کە لەهەر کاتێکدا

---

589 -CIA, (FOIA) /ESDN (CREST): 03003301, Central Intelligence Bulletin - 1958/10/15, Iraq — Separatist sentiment increasing among Kurds despite Barzani's avowal of loyalty to regime. بۆ دەقی ئەو بەڵگەنامەیە، بڕوانە پاشکۆی ژمارە(١٣).

590 - CIA, (FOIA) /ESDN (CREST): 06232625, CENTRAL INTELLIGENCE BULLETIN - 1958/10/29, p.3

٥٩١ – روزنامەهای آمریکایی می نوسیند( اعزام اکراد شوروی خاورمیانه رابه خطر می اندازد طبق گزارش خبر گزاری فرانسه)، آطلاعات(روزنامه)، ش(٩٨٨٣)، (١٣ أبریل ١٩٥٩)، ص١٣.

ئەگەری تەقینەوەی هەیە، بەهۆی ئەو هەژموونە بەهێزەی مستەفا بارزانی لەنێو کوردەکاندا هەیەتی لەناوچەکەدا [٥٩٢].

کاریگەری ڕاستەوخۆی مەلا مستەفای بارزانی لەسەر کوردەکانی باشوور و پارچەکانی دیکەی کوردستان، لەدوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول لەساڵی(١٩٦١) بەهێزتر بوو، وەک یەکێک لەبەڵگەنامە فەرمییەکانی حکومەتی بریتانیا لەسەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشەکە ئاماژەی پێکردووە، کە:" ئەو نائارامییەی لەهاوینی ساڵی ١٩٦١ دەستیپێکرد، سروشتێکی جیاوازی لەگەڵ هەڵکشانەکانی پێشوو هەیە. لەبەرئەوەی بارزانی لەو بزاڤەدا رەگەزی ئیلهامی نەتەوەیی کوردی هەیە"[٥٩٣].

ئیبراهیم فەیسەڵ ئەنساری، کە یەکێک بووە لەفەرماندە مەیدانییە باڵاکانی سوپای عێراق، کاتێک باس لەکاریگەریی مستەفا بارزانی دەکات لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی لەنێو گەلی کوردا، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە دوای ئەوەی مستەفا بارزانی لە (زستانی ١٩٦١_ ١٩٦٢) شۆڕشی هەڵگیرساند، هاتە ناوچەکانی نێوان ئامێدی و زاخۆ، لەوێ هێزەکانی خۆی ڕێکخستەوە و دەستیکرد بە پەیوەندیکردن بەسەرۆک هۆزە کوردییەکانی لە ناوچەکە بوون و هانیدان بێنە ناو شۆڕش، ئەوەبوو بەشی زۆری هۆزەکانی ئەو ناوچانە، بەدەم بانگەوازەکەی بارزانییەوە چوون، لە نمونەی هۆزەکانی گولی و سندی لەناوچەی زاخۆ، هەروەها هۆزەکانی هەردوو بەری ڕێگای سەرەکی دهۆک_ ئامێدی. ئەمە وێڕای هۆزی ئاکۆ لە ناوچەی رانیە، تەنانەت ژمارەیەکی زۆر لەو ئەفسەرانەی لە ڕیزی سوپای عێراقدا بوون، ڕایانکرد و پەیوەندیان بە بارزانییەوە کرد[٥٩٤].

لەڕۆژهەڵاتی کوردستانیش هەڵمەتێکی فراوان بۆ یارمەتیدانی شۆڕشی کورد دەستپێکرد، وەک ژێدەرێک ئاماژەی پێ کردووە، کەم کەس هەبوو بەسۆز و پشتیوانی دارایی هاریکاری هەوڵەکانی بارزانی نەکات[٥٩٥]. تەنانەت ژمارەیەک لە

---

٥٩٢ – مەعاریفی ئیسرائیلی (ڕۆژنامە)، ژمارە (١٣٤٣)، ٢٤ی نیسانی ١٩٥٩، ل.٣.

٥٩٣ – بروانە:بەڵگەنامەی ژمارە(١٩)، لە: الكورد في وثائق الارشيف الوطني البريطاني(ج٢) ١٩٥٨-١٩٦٩، ص٧٢.

٥٩٤ – أبراهيم فيصل الانصاري، م.س،ص١٤٨.

٥٩٥ – عمار علي السمر، م.س، ص٢٤٣.

پێشـــمەرگەکانی پارتی دیموکراتی کوردســـتانی ئێران، هاتنە ریزی شـــۆڕشـــگێرانی باشووری کوردستان[596].

دیارە نیشـتمانپەروەرانی باکووری کوردسـتانیش هەمان هەڵوێسـتی بەشـەکانی دیکەی کوردستانیان نیشاندا، دوای ئەوەی بەشێک لە سوارچاکەکانی هۆزی ئۆرامار لە باکووری کوردستانەوە بە چەک و سوارەکانیانەوە پەڕینەوە سنووری باشووری کوردســـتان و خۆیـان دایە پـاڵ هێزەکەی مەلا مســـتەفا بـارزانی[597]. ئەو کـاتە ڕۆژنـامەی(لۆمۆنـد)ی فەرەنســـی لە ڕاپۆرتێکیـدا کە لە (٢٨ی ئەیلولی ١٩٦١) بڵاویکردەوە، ئـامـاژەی بۆ ئەوە کرد، کە:" ئەم ڕاپۆرتـانەی گەیشـــتونەتە تـاران و ئەنقەرە، ئاماژەن بۆ تێپەڕبوونی بەرفراوانی شۆڕشگێرانی کورد لە ئێران و تورکیاوە بۆ ناوچەکانی کوردســـتانی عێراق و لەوێشـــەوە توانا ســـەربازییەکانی کورد بەهێز دەکەن... کۆچی بەکۆمەڵی ئەو هۆزانەی کە هیچ هێڵێکی ســـنووردارکردن نـازانن، هەموویان ڕۆڵێکی بەهێز دەگێڕن لە بەرژەوەندی شۆڕشەکە"[598].

لەلایەکی دیکە ڕۆژنـامەی (مەعـاریف)ی ئیســـرائیلی، ئـامـاژە بۆ ئەوە دەکـات، حکومەتی سوریا لە دوای تێپەڕبوونی ساڵێک بەسەر هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە عێراقدا، شـــانەیەکی نهێنی لەنـاوچەی (عـامودا) ئـاشـــکرا کردووە، کە کوردەکان بەکاریگەریی بڵاوبوونەوەی هۆشـــیاری نەتەوەیی لەو ناوچانە پێکیان هێناوە. بەپێی زانیاری دەزگا هەواڵگرییەکانی سـوریا، کە لە پرۆسـەیەکی پشـکنین و گەڕانی نهێنیدا بەدەستیان هێنا، دەرکەوت بەشێک لە کوردەکانی ســـوریا لە پەیوەندی بەهێزدابوونە لەگەڵ ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان[599]. بەو هۆیەوە بە پارە و چەک و چەکدار، پشـتیوانیان لە شـۆڕشـگێرە کوردەکانی عێراق کردووە[600]. دوای ئەوەی بارزانی لە (تشـرینی دووەمی١٩٦١) داوای هاوکاری و پشـتگیرکردنی شـۆڕشـگێرانی

---

٥٩٦ – مسعود البارزاني،البارزاني ...(الكرد و ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨)...، ص٩٠.

٥٩٧ – محمود الدرة، م.س، ص٣٠٠.

598 –Téhéran dément l'arrestation du chef de la révolte kurde d'Irak, Le Monde, 28 septembre 1961.

**٥٩٩ ـ مەعاریفی ئیسرائیلی (ڕۆژنامە)، ژمارە (٢٦٥٧)، ٢١ی کانوونی دووەمی ١٩٦٢، ل١.**

**٦٠٠ ـ مەعاریفی ئیسرائیلی (ڕۆژنامە)، ژمارە (٢٨١٧)، ٢ی تەمموزی ١٩٦٣، ل٢.**

باشووری لە پارت و کەسایەتییە نیشتمانپەروەرە کوردییەکانی ڕۆژئاوای کوردستان کرد[٦٠١].

لەم سۆنگەوە عیسمەت شەریف وانلی باسی ئەوە دەکات، کە لە (١٩ی کانونی دووەمی ١٩٦٢) بارزانی نامەیەکی بۆ نووسیووە و تێیدا دەڵێت:" ڕێگای ڕاست و لۆژیکی ئەوەیە هەموومان هاوکاری یەکتری بکەین بە حزب و ڕێکخراو و لیژنە کوردستانییەکان لە ناوەخۆ و دەرەوە، بۆ سەرخستنی بەشی گرگرتوو لە کوردستانی عێراق. پێویستە هەمووان خەباتیان یەکبخەن بۆ سەرخستنی ئەو جوڵانەوەیە و لەسەرمانە ئەو دروشمە بەرزبکەینەوە(یەکخستنی کۆششەکانی گەلی کورد بە هەموو توێژ و پارت و ڕێکخراوەکانی، لەپێناو سەرکەوتنی جووڵانەوەی گەلی کورد لە کوردستانی عێراق)"[٦٠٢].

شیاوی باسە کە ئەو تێگەیشتنەی حکومەتی بریتانیا لەسەر بارزانی، کە لەو بەڵگەنامەیەی پێشوو خستمانە ڕوو، لەچیرۆکی ئەو گەشتەی ڕۆژنامەنوسی فەرەنسی(جان لکود سویر) کە لە (کانونی دووەمی ١٩٦٦) بۆ ناوچە ئازادکراوەکانی باشووری کوردستانی ئەنجامیدا، ڕوون و ئاشکرا خۆی دەنوێنێ، کاتێک ئەو پەیامنێرە بە ڕێگای چوونە بارەگای بارزانی، پرسیار لەیەکێک لەگەنجەکانی ئەو ناوچەیەی پێیدا تێدەپەڕێ دەکات و پێی دەڵێت:"ئایا ئێوە مسوڵمانن بۆچی شەڕ دەکەن لەپێناو ئامانجێک کە نایەتەدی؟ بۆچی ئەو هەموو قوربانییەی لەپێناو ئەدەن"؟. لەوەڵامی ئەو دوو پرسیارەدا گەنجەکە بەئاماژەیەکی کورت و ڕوون و دەڵێت:" لەبەرئەوەی ئێمە عەرەب نین، زمانمان عەرەبی نییە، وە لەبەرئەوەی ئێمە نامانەوێ ببینە عەرەب. ڕەوشتمان و کولتوورمان و داب ونەریتمان جیاوازە لەڕەوشتی عەرەب. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە باسی جیابوونەوە ناکەین، ئەوەی دەمانەوێ جۆرێکە لە ئۆتۆنۆمی بۆ بەڕێوەبردنی خاکی خۆمان. سەیری ئەو دۆڵە بکە، قوتابخانەیەک یان گوندێک نیە، ئاو و ڕێگا و پردی تێدا نیە، حکومەتی عێراق تەنانەت مامۆستایەکمان

---

٦٠١ – علي صالح ميراني، الحركة القومية الكوردية في كوردستان سوريا(١٩٤٦–١٩٧٠)، أربيل، ٢٠٠٤، ص١٧١؛ بەپێی بەڵگەنامەیەکی حکومەتی ئەمریکا لە (ئایاری ١٩٧٤)، ژمارەیەک لە پێشمەرگەی ڕۆژئاوای کوردستان، هاتنە ریزی هێزەکانی مستەفا بارزانی. F.R.U.S,1969–1979, Iraq–Iran (1973–1976), Telegram from the Interests Section in Baghdad to the Department of State, Baghdad, April 11, 1974, p.684.

٦٠٢ – عصمت شريف وانلي، م.س، ص١٥٩..

بۆ ڕەوانە ناکات، لەکاتێکدا زۆربەی ســامانی نیشــتمانی عێراق لەســەر خاکی ئێمەیە. ئێمە خۆمـان بە بیـانی نـازانین، ئەوان وەک بێگـانە ڕەفتـار لەگەڵ ئێمەدا دەکەن"[٦٠٣].
لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە بارزانی لەهەوڵەکانیدا بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی تا ڕادەیەکی باش ئامانجەکەی خۆی پێکاوە، چونکە توانیویەتی لەڕێگای ئاشـناکردنی کۆمەڵگە بەمافە نەتەوەییەکانی، کاریگەریی تەنانەت لەسـەر گەنجێک لەو تەمەنە بچووکەشدا دروست بکات.

ســـەبارەت بە کاریگەریی بارزانی لەســـەر خەباتکارانی کورد، بەڵگەنامەیەکی حکومەتی بریتانیا ئاماژەی بەوە کردووە، کە لەو قۆناغەدا گەلی کورد بەشـــێوەیەکی گشـتی پشـتیوانی مەلا مسـتەفا بارزانی بوو، تەنانەت بەشـێکی ئەو کوردانەی بەدیلی دەکەوتنە دەسـتی سـوپا و دامەزراوە هەواڵگری و ئاسـایشـەکانی حکومەتی عێراق، ئەگەر لەدادگاکان سزای لەسێدارەدانیشیان بەسەر دەسەپێنرا، بەڵام ئەوان لەبەردەم پەتی سێدارەدا دروشمی (بژی کوردستان ، بژی بارزانی)یان دەگوتەوە[٦٠٤].

خۆشـــەویســـتی بەشـــی زۆری گەلی کورد بۆ بارزانی، بەهۆی هەوڵدانی ئەو ڕێبەرە بووە لەهەموو بوارەکان، بۆ ئەوەی لەکۆشـشەکانیدا گوزارشت لەخواستێکی گشـتی بکات، ئەو تەنانەت لەکاری ڕێکخراوەییدا وەک یەکێک لە کەسـایەتییەکانی لە نزیکەوە لەگەڵیدا ژیاون دەیگێڕێتەوە، بارزانی هەمیشـــە ئامۆژگاری کادیرانی پارتی کردووە ئەگەر دەتانەوێ لەکاروبارەکانتان ســـەرکەوتووبن و میللەت هاوکاریتان بکات، پێویستە ئیشوکاری ڕێکخراوەیی ئاوێتەی ئەو پیشەیە بکەن کە دەیزانن، ئەگەر واتان کرد ئەو کاتە ئەو میللەتە هەســـت بەوە دەکات ئێوە لەوانن و جیانین و لەگەڵ ئێش و ئازار و کێشـەی ئەواندا دەژین[٦٠٥]. کەواتە بارزانی حزبی کردۆتە ئامرازێک بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی و نیشتمانی، وەنەبێ ئەم کردەشی هەر بە گوتار و ئامۆژگاری ســـیاســـی لەنێو کۆمەڵی کوردی پیادە کردبێ، بەڵکو هەوڵی داوە

---

٦٠٣ – کردهای عراق چرا شورش کردەاند، سپیدة و سیاه (مجله)، ش(٣٨)، ٢٩ أوریل ١٩٦٦ ،وەرگیراوە لە: بهرام ولیدبیگی، م.پ، ص٣٧٨.

604 –NA,FCO 8/ 2318, British parliamentary and public opinion on the Kurdish sitvation in Iraq ،The Iraq government is once more waging war against Kurdistan. 22 July 1974. p.5.(بۆ دەقی بەڵگەنامەکە بروانە پاشکۆی ژمارە(١٤

٦٠٥ – ئەحمەد ڕەشید، شارەزایی بارزانی نەمر لە بە جەماوەرکردنی شۆڕش و حیزبەکەی، سەد ساڵەی بارزانی، ل ١٠٥٣– ١٠٥٥.

لەڕێگەی ئاراســـتەکردنی کادیرانی حزب بۆ تێکەڵکردنیان بە جەماوەر لە هەموو ناوچەکانی کوردستان بەبێ جیاوازی بەرجەستە بکات و بیری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی لە هزری هەر تاکێکی کورد بچەسپێنێ.

یەکێک لەو ڕێکارانەی بارزانی بۆ بەهێزکردنی توانا ســـیاســـییەکانی کادیرانی پارتی دیموکراتی کوردســـتان پیادەی کردووە، ڕێکخســـتنی چوار خولی ڕاهێنانی ســـیاســـی بووە بۆ کادیران لەڕێگەی دامەزراندنی (پەیمانگای کادیران)[٦٠٦]. ئەوان بەهۆی ئەو زانستەی لەو پەیمانگە حزبییە وەریان گرت، ڕۆڵیان بینی لەگەشەپێدانی هزری نەتەوەیی[٦٠٧]. وێڕای ئەوەی ئەم پەیمانگەیە دەرفەتێکی باشـــی ڕەخســـاند بۆ یەکخســـتنی زمانی کوردی، چونکە ئەو فێرخوازەی لەخانەقینەوە دەهات زاراوەی ناوچەی زاخۆ و ئامێدی و شـــوێنەکانی دیکەی نەدەزانی، ئەمە ســـەرباری ئەوەی ناوەندی کۆکردنەوەی هەموو لاوانی کورد بوو[٦٠٨].

بەم شـــێوەیە بەهۆی ئامرازە جۆراوجۆرەکانی لەژێر دەســـتی شـــۆڕش بوو، بارزانی بواری زیاتری بۆ رەخسا بەئامانجی بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی و توانی بەشی زۆری گەلی کورد تێکەڵ بە شۆڕش و بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد بکات و کۆمەڵگەی کوردی لەپەیوەندی هۆزایەتی دەربەگی وەرچەرخێنێ بۆ کۆمەڵگایەکی شـــۆڕشـــگێری خاوەن ئایدیا و ســـتراتیژێکی نیشـــتمانی و نەتەوەیی هاوبەشـــی یەکگرتوو[٦٠٩].

---

٦٠٦ – لەسەر بڕیاری سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان لە (تشرینی یەکەمی ١٩٦٨) لەناوچە ئازادکراوەکانی شۆڕش لە چۆمان دامەزراوە. یەکەم بڕیار بۆ دەستپێکردنی خوێندن لەو پەیمانگەیە لە (١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٦٨) درا، هەر لەو ڕۆژەدا دەست بەخوێندن کرا. یەکەم دەستەی قوتابیانی (٣٢) کەس بوون کە لە گشت لقەکانی حیزبی و لەشکری هاتبوون. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئاری فاروق نانەکەلی، دامەزراوەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و شۆڕشی ئەیلول لە نێوان ساڵانی ١٩٦١– ١٩٧٥، هەولێر، ٢٠١٦، ل٧٤.

٦٠٧ – K21 (گۆڤار)، ژ(٢٠)، کانوونی دووەمی ٢٠١٤، ل١٨٣.

٦٠٨ – یۆنان هورمز، س.پ، ل٧٧.

٦٠٩ – سیامند البنا، م. س، ص١٢٧.

## تەوەری دووەم: بایەخدانی بارزانی بە ڕاگەیاندن بۆ گەشەپێدانی بنەماکانی هزری نەتەوەیی

مێژوونووس عەبدولفەتاح بۆتانی پێی وایە هزری نەتەوەیی کوردی ئەو کاتە زەق بەدیارکەوت، کاتێ کوردەکان بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی، هەستیان بە گرنگی ڕاگەیاندن کرد، ئەمیش لە ڕێگەی دەرکردنی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی بە ناوی کوردستان[٦١٠]. ئەو جۆرە تێگەیشتنە سەبارەت بە گرنگی و بایەخی ڕاگەیاندن بۆ بڵاوکردنەوە و گەشەپێدانی هزری نەتەوەیی، پاڵنەرێکی بەهێز بوو بۆ مستەفا بارزانی تا ئامانجەکانی شۆڕشی کوردستان و داخوازییەکانی گەلی کورد لە دید و تێڕوانینە سیاسییەکانی خەست بکاتەوە و بەشێکی لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی کوردیدا بخاتە ڕوو. هەر لەو ڕێگەیەوە هەوڵی وەڵامدانەوەی هەموو ئەو بانگەشانەی داوە لەبەرەی نەیارەکانیدا هەبوون، بەئامانجی ناشیرینکردن و لەکەدارکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد[٦١١].

لە ڕاپەڕینی دووەمی بارزان( ١٩٤٣_١٩٤٥)، مەلا مستەفا سوودی لە ڕاگەیەنراوەکانی لیژنەی ئازادی وەرگرتووە بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو پڕوپاگەندانەی لەلایەن حکومەتی عێراقی دژ بە بزاڤەکە بڵاودەکرانەوە، بەتایبەتی لە وێناکردنی ڕاپەڕینی دووەمی بارزان، وەک جوڵانەوەیەکی هۆزگەرایی و ناوچەیی. بۆیە لە ڕاگەیەنراوی دامەزراندنی لیژنەی ئازادی لە (١٥ی شوباتی ١٩٤٥) بارزانی ڕایگەیاند:"من دەزانم حکومەت هەوڵئەدات ئەو پڕوپاگەندەیە بڵاوبکاتەوە، کە جوڵانەوەی بارزان و جوڵانەوەی کوردی دوو شتی جیاوازن، بەڵام ئێمە دژی ئەوەین و ئامانجمان ڕزگارکردنی کوردستانە"[٦١٢].

دوای تێپەڕبوونی ئەو قۆناغە و لە ماوەی بەشداریکردنی لە کۆماری کوردستان، بارزانی سوودی لە ڕۆژنامەی کوردستان وەرگرتووە بۆ خستنەڕووی تێزە نەتەوەییەکانی، بۆ نمونە لەوتارێکی سیاسی کە محەمەد مەحمود

---

٦١٠ -. عبدالفتاح البوتاني، بدايات الشعور القومي الكوردي، ص٣٥.

٦١١ - محەمەد عەلی سوڵتانی، س.پ، ل١١٨-١٢١.

٦١٢ - عثمان علي، م.س، ص٦٩٩.

ئەفەندی(١٩٢١_١٩٤٧)[٦١٣]،لە (٦ی ئاداری١٩٤٦) لە جیاتی بارزانی لە بەردەم قازی محەمەد پێشـــکەشـــی کرد و دەقەکەی لە ڕۆژنامەی کوردســـتان بڵاوکراوەتەوە، دەڵێت:"پشـــتی فەرهەنگ بگرن بە پەروەردەکردنێکی گیانی دیموکراتیەوە، پارێزگاری لە دیموکراتی بفەرمون، کە کاریگەری پێشـخسـتنی گەل و سـەربەخویی نیشـتمان و ڕوپشـــتەبەری وەیە"[٦١٤]. ئەم وتارە گوزارشـــت لە کرۆکی بیری نەتەوەیی مســـتەفا بارزانی دەکات، تێیدا داوای پەرەپێدانی گیانی دیموکراســـی دەکات بۆ پێشـــخســـتنی فەرهەنگی پێکەوە ژیان. هەر ئەو دیموکراســـییەش بە زامنی پێشـــکەوتنی گەل و سەربەخۆیی نیشتمان دەزانێ.

دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کورد لە (١٦ی ئابی ١٩٤٦)، کەناڵێکی ڕاگەیاندنی نوێی کردەوە بۆ گەیاندنی دەنگی سەکردایەتی سیاسی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد بە جەماوەری کوردستان، لەڕێگەی ڕۆژنامەی (ڕزگاری)، کە ئەو کاتە زمانحاڵی پارتەکە بوو[٦١٥]. لەپێناو ئاراستەکردنی کۆمەڵگەی کوردی لە باشووری کوردستان، بەتایبەتی دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان و پەرینەوەی بارزانی و بەشێکی شۆڕشگێرانی لەگەڵیدا بوون بۆ یەکێتی ســـۆڤیەت. چونکە مســـتەفا بارزانی لە (کانونی دووەمی ١٩٤٨) لەگەڵ حکومەتی سۆڤیەت ڕێککەوت بۆ پەخشکردنی وتارە سیاسییەکانی لە (ئێزگەی ئازەربێجانی دیموکراتی )، ڕۆژنامەی (ڕزگاری)ش ســـوودی لەو ئێزگەیە

٦١٣ – بەپێی بەدواداچوونی ڕۆژنامەنووس (بەدران حەبیب)ی بەڕێوەبەری دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ئەم ناوە مولازم ( محەمەد مەحمود قودسی) یە. ناوبراو یەکێک بووە لەو ئەفسەرە ئازادیخوازانەی ئەندامی حیزبی هیوا بووە، لە ڕاپەرینی دووەمی بارزان پشتگیریی لە مستەفا بارزانی کرد و بەشداری شۆڕشەکەی کرد. دوای شکستهێنانی شۆڕش، لەگەڵ مستەفا بارزانی پەڕیەوە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و لە ساڵی ١٩٤٦ بەشداری کۆماری کوردستانی کرد. پاشان دوای ڕووخانی کۆمار، گەڕایەوە عێراق و لە ڕۆژی (١٩ی حوزەیرانی١٩٤٧) لەلایەن حکومەتی عێراقییەوە لە سێدارە درا. بڕوانە: ڕۆژنامەی کوردستان(مەهاباد ١٣٢٤-١٣٢٥ی هەتاوی ١٩٤٦ی زاینی)، دەزگای ئاراس،هەولێر،٢٠١٠.

٦١٤ – بۆ درێژەی وتارەکە، بڕوانە: نطقی محمد محمود افندی لە ڕۆژی هاتنی مەلا مصطفی لە حضوری حضرتی پێشوای کوردستاندا، کوردستان(ڕۆژنامە)، ژ(٢٣)، ٦ی مارسی ١٩٤٦، ل٣.

٦١٥ – د. ئەحمەد حەمەدئەمین، پارتی دیموکراتی کورد- عێراق بەرەی پیشکەوتوو(١٩٥١-١٩٥٦)، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٧، ل١١١.

وەرگرت بۆ گواستنەوەی وتارەکانی و بڵاوکردنەوەی لەسەر لاپەڕەکانی خۆی[٦١٦].
بەپێی ئەو زانیارییانەی لە ڕۆژنامەی ڕزگاریدا هاتووە، مستەفا بارزانی سەرەتای وتارە سیاسییەکانی لە ڕۆژانی (٢١و ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٨) لە ئێزگەی ئازەربێجان پەخشکرد، تیایدا هانی گەلی کوردی داوە، لەسەر خەباتی نەتەوەیی بەردەوام بن و ڕووبەڕووی ئەو دۆخە ببنەوە، کە ئامانجی سڕینەوەی بیری نەتەوەییە[٦١٧].

بارزانی لە بەشێکی وتاری یەکەمیدا کە لە ڕۆژی(٢١ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٨) پەخشکرا، خەڵکی کوردستانی لە پیلانەکانی حکومەتی عێراقی بەرامبەر جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد ئاگادارکردەوە و ڕایگەیاند:"حکومەتی عێراقی کۆنەپەرست، ئەمڕۆ هەوڵئەدات جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە عێراقدا لەناو ببات بەناوی شیوعیەتەوە، بە سوود وەرگرتن لە ئەحکامی عورفی لە وڵات...بەڵام ڕای گشتی دەزانێ مەبەستی ئەو تۆمەتانە و ئەو جووڵانەوەی ئێستا لە کوردستان، پوخت جووڵانەوەیەکی ڕزگاریخوازی نیشتمانییە، ئامانجی ڕزگاربوونە لە چەوسانەوەی نەتەوەیی"[٦١٨]. بەم شێوەیە لەم وتارەدا بارزانی وێڕای ئەوەی پەیامی بەردەوامی شۆڕشی کورد بە جەماوەری کوردستان گەیاند، هاوکات لەوە ئاگاداری کردنەوە کە پروپاگەندە و سیاسەتەکانی حکومەتی عێراقی بەرامبەر بەم بزاڤە نەتەوەییە، ئامانج لێی بەلاڕێدابردن و شاردنەوەی ڕووی ڕاستی ئامانجەکانی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردە، کە خۆی لە ڕزگاری گەلی کورد و خاکی کوردستانەدا دەبینێتەوە.

بەسەرنجدان لە وتاری دووەمی مستەفا بارزانی کە لەشەوی (٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٨) پەخشکرا، دەبینین بارزانی دید و تێڕوانینی تازە بەراورد بەوانەی پێش خۆی بەئامانجی گەشەپێدانی بیری نەتەوەیی کوردی دەخاتەڕوو، لە ڕێگەی جەختکردنەوەی لەسەر هەرسێ لایەنی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی، لە فۆرمێکی نوێدا. بەشێوەیەک لە بەشی یەکەمی وتارەکەدا باس لە سیاسەتی حکومەتی

---

٦١٦ – نەوشیروان مستەفا ئەمین، چەند لاپەڕەیەک لە مێژوی ڕۆژنامەوانی ی کوردی (١٩٣٨– ١٩٥٨) ڕۆژنامەوانی ی نهێنی، بگ٣، ب١، سلێمانی، ٢٠٠٤،ل١٩٥.
٦١٧ – بڕوانە: ڕزگاری (جريدة)، ع(٢)، تشرين الاول ١٩٤٨، ص٦.
٦١٨ – م.ن، ص٦.

عێراقی دەکات بۆ لەناوبردنی زمانی کوردی لەڕێگەی بێبەشـــکردنی ڕۆڵەکانی گەلی کورد لەفێربوون و خوێندن بە زمانی دایک، وەک ڕێگەیەک بۆ سڕینەوەی ناسنامە و تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانیان، لەو سـۆنگەوە دەڵێت:" کوردەکان کە یەکێک لە نەتەوە سـەرەکیەکان لە عێراق پێکدەهێنن، ئەمڕۆ ئازار بە دوو کار دەکێشـن لە ئەنجامی ئەو سیاسـەتەی هەوڵی سـڕینەوەی نەتەوەی کورد دەدات لە عێراق، کە دەتوانرێ تێبینی بکرێ بە ڕوونی. لە بوارەکانی ڕۆشـــنبیری و کۆمەڵایەتی. کوردەکان بێ بەشـــن لە خوێندن بە زمانی خۆیان لە قوتابخانە ناوەندیەکان، تەنانەت لە قۆناغی سـەرەتایی لە هەندێک ناوچە کوردیەکانی وەک موســڵ، خوێندن لە قۆناغی ناوەندی بە زمانی عەرەبییە لە ناوەندی سـلێمانی، ئەمیش یەکێکە لە گرنگترین شـارەکانی کوردسـتانی عێراق، ئەو دۆخە هاوشـــێوەیە لە فەرمانگەکانی حکومەت، زمانی فەرمی لە ناوچە کوردییەکان عەرەبییە"[٦١٩].

سـەبارەت بە پێگە و پشـکی گەلی کورد لە هاوکێشـە ئابووریەکانی عێراقدا، کە لەژێر هەژموونی ئیســتعماری بەریتانی و کۆمپانیا قۆرخکارییەکانیدا بوون، بارزانی بەدوو دێر لەم وتارەدا گوزارشـت لە دۆخ و گوزەرانی گەلەکەی دەکات و دەڵێت:" لە ڕووی ئابووری، قەیرانەکە لە ناوچە کوردییەکان گەیشـــتۆتە ئەوپەڕی، بەهۆی ئەو سیاسەتەی ئامانجی برسیکردن و دەربەدەرکردنی گەلی کوردە لە عێراق"[٦٢٠].

لەلایەکی دیکە گەڵاڵەکردنی مافە سیاسییەکانی کورد، بەشێکی دیکەی وتارەکەی بارزانی پێکهێنا، ئەو کاتەی تیشـکی خسـتە سـەر بارودۆخی سـیاسـی لە عێراقدا. ئەو ڕێبەرە فەرامۆشکردنی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردی وەک پێکهاتەیەکی سەرەکی لەم وڵاتەدا بەســـتایەوە، بە ڕادەی لاوازی و خۆبەســـتانەوەی حکومەتی عێراقی بە پاشـکۆیەتی ئیسـتعماری ڕۆژئاوایی. لەو سـۆنگەوە وێرای ڕەخنەکانی لە سـیاسـەتی حکومەت بەرامبەر بەکورد، داخوازییەکـانی بۆ بەشـــداریکردنێکی ڕاســـتەقینە لەدەســـەڵات، لە تێزێکی نوێدا خســـتەڕوو، کاتێک گوتی: " لە ڕووی ســـیاســـییەوە، بەشـداریپێکردنی کورد لە حکومەت پێویســتە. لە پەرلەمانی عێراق ژمارەیەک نوێنەر هەن، ژمارەیان گونجاو نییە لەگەڵ ژمارەی کورد لە عێراق. ئەوان هەڵنابژێردرێن بەڵکو دادەمەزرێن. ئەوانەی توانیویـانە متمـانەی بـاڵیۆزخـانەی بریتـانیـا و چینی

٦١٩ – رزگاری (جريدة)، ع(٢)، تشرين الاول ١٩٤٨، ص٧.

٦٢٠ – م.ن، ص٨

بورجوازی دەســـەڵاتدار بەدەســـت بێنن. وەزیرە کوردەکانیش لە حکومەت، لە دوو زیاتر نینە لەنێو هەمووان، لەوانەشـــن کە نازانن بە زمانی کوردی قســـە بکەن و جگە لەوەی دوژمنـایەتی ڕاســـتەوخۆیـان بۆ گەلی کورد و دۆزی کورد هەیە"[٦٢١]. ئەم دەربڕینانەی بارزانی ڕەهەندی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سـیاسـی لەخۆگرت، بۆیە زیادبوونێکی نوێ بوون لەســـەر هزری نەتەوەیی کوردی، پێشـــتر بەو شـــێوەیە نەخرابوونە ڕوو.

ئەم وتـارانەی ڕۆژنـامەی ڕزگـاری و هەروەهـا ئەو ئێزگەیەی بـاکۆی پـایتەختی ئـازەربێجـانی ســـۆڤیەت، هەرچەنـدە لە ڕووی نێوەڕۆکەوە کوردانی بـاشـــووری کوردستانی دەگرتەوە، بەڵام کاریگەرییان لەسەر گەلی کورد بەگشتی هەبوو، ئەمەش ئێرانییەکانی نارەحەتکرد، بەهۆی دڵەراوکێ و مەترســـییەکانیان لە ســـیاســـەتەکانی یەکێتی ســـۆڤیەت بەرامبەر وڵاتەکەیان، بۆیە باڵیۆزی ئێران لە مۆســـکۆی پایتەختی ســـۆڤیەت، یاداشـــتی نارەزایی حکومەتەکەی بەرامبەر بە ڕەفتارەکانی حکومەتی ئازەربێجان و پاڵپشـــتیان لە ســـەرکردە کوردەکان و هاوکاریکردنیان بۆ گەیشـــتنی دەنگیان بە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردســـتان، دایە دەســـتی حکومەتی یەکێتی سۆڤیەت، بەئامانجی دوورخستنەوەیان لە خواستە نەتەوەییەکانی مستەفا بارزانی. ئەوە جگە لە چەندین یاداشـــتی دیکە، کە لەلایەن وەزارەتی دەرەوەی ئێران دراوەتە باڵیۆزی سۆڤیەت لە تاران[٦٢٢].

لەلایەکی دیکە هەر بە هۆکاری کاریگەریی وتارە سیاسییەکانی مستەفا بارزانی لەســـەر کوردانی ڕۆژهەڵاتی کوردســـتـان، ڕۆژنـامەگەری ئێرانی بە ڕێنمـایی حکومەتەکەیان، دەســـتیان بەهەڵمەتێکی پروپاگەندەی ســـیاســـی لە دژی حکومەتی ســـۆڤیەت کرد، بۆ نمونە لە ســـەروتاری ڕۆژنامەی ئیتلاعاتی ئێرانی لە ڕۆژی(٣١ی ئاداری١٩٤٩) سەبارەت بەو بابەتە هاتووە:"حکومەتی سۆڤیەت هەوڵئەدات لە ڕێگەی دەوەنەکردن، بەیارمەتی ڕۆڵی ئێزگەکان، کار بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی بکات لە کوردستانی ئێران یان لە یەکێتی سۆڤیەت، بۆ ئەوەی پەردە بدات بەسەر ئەو شکستەی لە بازنەی نێودەوڵەتی ڕووبەڕووی بۆتەوە "[٦٢٣].

---

٦٢١ – رزگاری (جريدة)، ع(٢)، تشرين الاول ١٩٤٨،ص٨.

٦٢٢ – د. ك. و، (٣١١/٧٣٧)، البلاط الملكي، المفوضية الملكية العراقية(طهران)، ع(٢١٣/١/٢)، ١٩٤٨/٧/١.

٦٢٣ – بروانە: اطلاعات(روزنامه)، ش(٨٦٩٦)،٣١ مارس ١٩٤٩، ص ١.

سـەرەڕای ئەوەش دەتوانین بڵێین ئەو هەوڵانەی بارزانی لە باکۆی پایتەختی ئازەربێجان ئەنجامیدا، کاریگەری ڕاستەوخۆیان هەبوو لەسەر کرانەوەی حکومەتی ئێرانی ئەگەر بە ڕادەیەکی کەمیش بێ، بە ڕووی مافە ڕۆشنبیرییەکانی گەلی کورد لەم وڵاتەدا. بە جۆرێک لە پەرچەکرداری ئەم دۆخەدا، شـای ئێران راستەوخۆ بودجەیەکی تەرخانکرد بۆ گەشەپێدانی کوردستان و ڕێگەیدا بە پەخشی ئێستگەیی لە ئێران بە زمانی کوردی[٦٢٤].

پێشهاتە سیاسییەکانی نێوەخۆیی یەکێتی سۆڤیەت بەهۆی مردنی ستالین لە ساڵی ١٩٥٣، دەرفەتی باشتریان بۆ مستەفا بارزانی رەخساند بۆ گرنگیدانی زیاتر بە ڕاگەیاندنی کوردی، وەک ئامرازێک بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی و گەشەپێدانی لەنێو کوردانی دانیشتووی ئەم وڵاتە، بەتایبەتیش کوردانی ناوچەکانی ئەرمینیا. بەو مەبەستە بارزانی پەیوەندی بە ڕۆشنبیرانی کورد کرد لەو ناوچانە. بەئامانجی برەودان بە ڕۆشنبیری کوردی و بەگڕخستنەوە و بەرەو پێشەوەبردنی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن. لەنێویشیاندا ڕۆژنامەی (ریاتازە) زمانحاڵی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمونیستی ئەرمینیا، کە یەکەم ژمارەی لە (٢٥ی ئاداری ١٩٣٠) لە لایەن ڕۆشنبیرانی کوردی سۆڤیەت بڵاوکرابۆوە، دواتریش بەهۆی سیاسەتەکانی ستالین بەرامبەر کەمایەتییە نەتەوەییەکان لە (ئاداری ١٩٣٨) ڕاگیرا بوو[٦٢٥]. بەڵام دوای مردنی ئەو سەرۆکە، لەسەر بڕیاری لیژنەی ناوەندی حزبی شیوعی ئەرمەنی لەڕۆژی (١٧ی ئەیلولی ١٩٥٤) جارێکی تر بواری چاپ و بڵاوکردنەوەی پێ بەخشرایەوە[٦٢٦]، پاشان یەکەم ژمارەی لەخولی نوێدا لە (١ی شوباتی١٩٥٥) دەرچوو[٦٢٧]. بەو هۆیەوە بارزانی لەسەردانەکەیدا، کە لە (پایزی ١٩٥٦) بۆ ناوچە کوردییەکانی ئەرمینیا ئەنجامیدا، بەمەبەستی پیرۆزبایی کردن، سەردانی نووسینگەی ڕۆژنامەی (ریاتازە) ی لەیەریڤان کرد. هەر لەو شارەدا بارزانی سەردانی نووسینگەی ئێزگەی کوردی کرد، لەو ئێزگەیە بۆ ماوەیەکی درێژ باسی لەگرنگی پەخشی ڕادیۆیی بە زمانی

---

624- О.л. Жигалина, предыдущий источник, с.117.

٦٢٥ – فەخرەدین تاهیر، ریاتازە بەتەمەنترین ڕۆژنامە لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیدا(بەدواداچوون و ڕاستکردنەوە)، ڕۆژنامەنووس(گۆڤار)، ژ(٧)، بەهاری ٢٠٠٦، ل١٤٩–١٥٦.

٦٢٦ – ئۆردیخانی جەلیل، یەریڤان خەڤەردده( بیرەوەرییەکانم لەمەڕ دامەزراندنی ڕادیۆی کوردی لە ئەرمەنستان)، ئا: نامق هەورامی،هەولێر، ٢٠٠٨، ل١١.

٦٢٧ – فەخرەدین تاهیر، س.پ، ل١٦٠.

کوردی بۆ بیانییەکان و کوردە پەنابەرەکان کرد[٦٢٨]. ئۆردیخانی جەلیل[٦٢٩] کاتێک باس لە سەردانەکەی بارزانی بۆ ئێزگەی یەریڤان دەکات، دەڵێت:"مەلا مستەفا بارزانی چوو بوو ڕێداکسییا رادییۆا کوردی. پڕ کێفخۆش ببوو، مەرەمێ وی ئەو بوو وەکی دەنگێ کوردێ سۆڤیەتی بگێژە کوردێ چەکدار. ڤێ پرسێدا ڕادییۆا بیرێڤانێ ڕۆڵەکە مەزن دلیست"[٦٣٠].

بارزانی لەئێزگەی یەریڤان لەگەڵ ئەوانە کۆبوویەوە، کە سەرپەرشتی دامەزراوەکەیان دەکرد، بەپێی بەڵگەنامەیەکی حکومەتی بریتانیا، مەلا مستەفا هانی دامەزراندنی ئێزگەی کوردیی داوە[٦٣١]. بۆیە ئەو کاتەی سەردانی ئێزگەکەی کرد بە سەرپەرشتیارانی دەزگایەکەی ڕاگەیاند، ئامادەیە هەرچی لەتوانایدا هەبێ بۆ خزمەتکردنی وشە و زمانی کوردی و بەرەو پێشەوەبردنی ڕۆڵی ئەو ئێزگەیە ئەنجامی بدات. خەلیل جاجان مورادوف(١٩٢٤_١٩٨١) یەکێک بوو لەوانەی ئامادەی دیدارەکەی مەلا مستەفا بارزانی بوو، دەیگێڕێتەوە ئەو کاتە بە خۆی و عەرەبی شەمۆ چوونە ژوورێک و بەیەکەوە کۆبوونەوە، پاشان نامەیەکیان بە زمانی روسی نووسی، کە داواکارییەک بوو بۆ زیادکردنی پەخشی ئێزگەکە و دایانە دەستی بارزانی بۆ ئەوەی بیگەیەنێتە دەستی کاربەدەستانی سۆڤیەت، دوای سێ مانگ بە مۆڵەتی حکومەتی سۆڤیەتی کاتی پەخشی ڕۆژانەی ئێزگەکە بۆ سێ بەرامبەر زیادکرا، بەشێوەیەک لە نیو سەعات کرایە یەک سەعات و نیو[٦٣٢]. بەم شێوەیە کورد لە دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت بەتایبەتی لە کوردستان گوێبیستی ئێزگەی کوردی لە یەریڤان دەبوون[٦٣٣].

---

628- О.л. Жигалина, предыдущий источник, С.123.

٦٢٩ – نووسەرێکی کوردە، لە (٢٤ی ئابی ١٩٣٢) لە یەریڤان لەدایک بووە. ساڵی ١٩٥٨ دەچێتە پەیمانگای ڕۆژهەلاتناسی لە لینگراد لەوێ نامەی دکتۆراکەی لەسەر(قەلای دمدم) پێشکەش دەکات. دواتریش لەگەڵ باوکی ئێزگەی کوردی لە یەریڤان دادەمەزرێنن. لە (٢٠ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٧) لە لینگراد کۆچی دوایی کردوە. ئۆردیخانی جەلیل، س.پ، ل٩.

٦٣٠ – هـ س،ل٢٨.

٦٣١ – کەمال مەزهەر، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە ...،ب٢، ل٤٩١.

٦٣٢ – سالار عوسمان، دەنگی کوردستان( نیو سەدە پەخش)، چاپخانەی ڕۆشنبیری ، هەولێر، ٢٠١٣، ل٤٥.

٦٣٣ – وزيري أشو، م.س، ص٥٠.

بارزانی بەگەڕانەوەی لەیەکێتی سۆڤیەتەوە بۆ عێراق لەساڵی ١٩٥٨، دەرفەتی زیاتری بۆ ڕەخسا بۆ پێشخستنی ڕۆژنامەگەری کوردی. چونکە لە ئەنجامی ئەو گۆڕانە ئەرێنییەی لە سیستەمی سیاسی عێراقدا ڕوویدا بەهۆی سەرکەوتنی شۆڕشی (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨)حکومەتی عێراقی بە ڕووی مافە ڕۆشنبیرییەکانی کورد کرایەوە و وەزارەتی ئیرشاد رەزامەندیدا بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەیەک بەناوی (خەبات) کە بەهەردوو زمانی (کوردی و عەرەبی) دەربچێ[٦٣٤]، یەکەم ژمارەی ئەو ڕۆژنامەیە لە ڕۆژی شەممە ڕێککەوتی(٤ی نیسانی ١٩٥٩) بە زمانی کوردی بڵاوکرایەوە و لەسەروتاریدا، ڕایگەیاند، کە سیاسەتی پشتگیریکردنە لە داخوازییە نەتەوەییەکانی گەلی کورد[٦٣٥].

لە سەرەتای دامەزراندنیدا، ئەو ڕۆژنامەیە ئاراستە و ئایدیای مارکسی بە سەریدا زاڵبوو، بەهۆی کاریگەریی هەمزە عەبدوڵا، کە سەرپەرشتی ڕۆژنامەکەی دەکرد، ئەو بابەتەش بەتێروانینی بارزانی دوورکەوتنەوە بوو لە ئامانج و ئاراستە نەتەوەییەکەی لەپێناویدا دامەزراوە. بەو هۆیە و چەند هۆکارێکی دیکە، لەڕۆژی (٦ی تەموزی ١٩٥٩) لەگەڵ ژمارەیەک لە پێشمەرگەکانی، چووە ناو بارەگای ڕۆژنامەی خەبات و هەمزە عەبدوڵلا و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، لە ڕۆژنامەکە دوورخستنەوە و جەلال تاڵەبانی لەشوێنی دامەزراند[٦٣٦].

ڕۆژنامەی خەبات لە ماوەیەکی کورت، لە شارەکانی باشووری کوردستان بەنێوەندەکانی جەماوەری بڵاوبوویەوە و زۆرێک لە نێوەندەکانی کۆمەڵگەی کوردی وەک وەرزشوانان و سەندیکا جەماوەرییەکان و فرۆشگا بازرگانییەکان و گەڕەکە میللیەکان بەناوی (خەبات) کران. ئەو ڕۆژنامەیە جگە لە عێراق و ناوەخۆی شارەکانی باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و باکووری کوردستان، لە (١٥) وڵاتی بیانی بڵاوکرایەوە[٦٣٧].

---

٦٣٤ – عبدالفتاح علي البوتاني، التطورات السياسية الداخلية في العراق ١٤ تموز ١٩٥٨– ٨ شباط ١٩٦٣، مطبعة خاني، دهوک، ٢٠٠٧، ص١٩٦.

٦٣٥ – فرهاد محمد أحمد، جريدة خەبات، النضال(١٩٥٩– ١٩٦١) دراسة تاريخية، دهوک، ٢٠٠٨، ص١٥٥.

٦٣٦ – فرهاد محمد أحمد، م.س، ص٥٩.

٦٣٧ – م.ن، ص ص٦٩-٧١.

دواجار بەهۆی تێکچوونی پەیوەندییەکانی سەرکردایەتی کورد لەگەڵ حکومەتی عێراقی، لە (٢٨ی ئاداری١٩٦١) مۆڵەتی بەئاشکرا کارکردنی ڕۆژنامەی خەبات هەڵوەشایەوە[٦٣٨]. بەڵام ئەوە ڕێگر نەبوو لەبەردەم هەوڵەکانی بارزانی و سەرکردایەتی کورد بۆ بەردەوامیدان بە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی خەبات لە شاخ. ئەوەبوو ژمارە (٤٦٥)ی ئەو ڕۆژنامەیە لە سەرەتای (نیسانی ١٩٦٢) بڵاوکرایەوە، کە لەسەروتاریدا هاتووە:"خەبات بۆ درێژەدان بە تێکۆشان دژی ئیمپریالیزم و دکتاتۆرییەت و لەڕێی ڕزگاری و دیموکراسی و ئاشتی و لەپێناو مافە نەتەوایەتییەکانی گەلی کورد هاتۆتەوە مەیدان"[٦٣٩].

دامەزراندنەوەی ڕۆژنامەی خەبات یەکەم هەنگاوی کردارەکی سەرکردایەتی کورد بوو بە ڕێبەرایەتی مستەفا بارزانی بۆ بەگەڕخستنی دامەزراوەکانی ڕاگەیاندنی شۆڕش لە پێناو ڕووبەڕووبوونەوەی پروپاگەندەکانی ڕۆژنامەگەری عێراقی، کە ئامانجیان لەکەدارکردنی شۆڕشی کورد بوو[٦٤٠]. ئەو هەوڵانەش هەرچەندە سست بوون بەهۆی بارودۆخی شەڕ، بەڵام بەردەوام بوون. هەر لەو ماوەیەدا مستەفا بارزانی ئەو بیرۆکەیەی لە هزریدا گەلالە بوو، کە ئامرازی دیکەی ڕاگەیاندن بەتایبەتیش بیستراو زیاد بکات[٦٤١]، بۆیە لە (٢٠ی ئابی١٩٦٣) یەکەم ئێزگەی لە مێژووی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد بەناوی (ئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراق) دامەزراند[٦٤٢]. بەم جۆرە بارزانی دەرگایەکی دیکەی کردەوە، بۆ گواستنەوەی هەواڵەکانی شۆڕش و هاندانی جەماوەر بۆ پشتگیریکردنی ئامانجەکانی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد.

لەیەکەم ڕۆژی دەستپێکردنی پەخشی ئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراق، عەزیز شەمزینی[٦٤٣] بە بۆنەی کردنەوەی ئێزگە، وتەیەکی بارزانی بەزمانی کوردی

---

٦٣٨ – ئازاد عوبێد سالح، کاریگەریی شۆڕشی ...، ل٣٦.

٦٣٩ – بروانە: خەبات(جريدة)، ع(٤٦٥)، اوائل نيسان١٩٦٢،ص١.

٦٤٠ – بروانە: الشعب (جريدة)، ع(٤٧)، ١١ حزيران ١٩٦٣، ص١.

٦٤١ – سالار عوسمان، س.پ، ل٧٩.

٦٤٢ – خەبات(جريدة)، ع(٤٧٠)، ايلول ١٩٦٣،ص١.

٦٤٣ – عەزیز شەمزینی نەوەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهرییە. لەساڵی ١٩٤٣- ١٩٤٥ بەشداری ڕاپەڕینی دووەمی بارزانی کرد. دوای شکستهێنانی شۆڕشەکە، یاوەری بارزانی کرد بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان و بەشداری لە حکومەتی کوردستان لە مەهاباد کرد. خوێندنی لەیەکێتی سۆڤییەت تەواوکرد. شەمزینی

خوێندەوە، تیایدا هات:" لەم ڕەوشــەدا کە دوژمن هێرشــێکی دڕندانە و زاڵمانە دەکاتە سـەر گەلی کوردمان و کوردسـتانی نیشـتمانمان، داواتان لێ دەکەم، لە هەموو کاتێک زیاتر یەکڕیزیی نیشــــتیمانی بپارێزن، چونکە یەکڕیزی گەلەکەمان، بناغەی بەهێزی هەر ســەرکەوتنێکە، کە بەدەســتی دەهێنن، بۆیە پێویســتە لەســەر هەموو کوردێکی شـــەرەفمەند، لە جەنگی مان و نەمانی میللەتەکەماندا بەشـــداری بکات، ئەو جەنگەی دوژمن بە دژی گەلی کوردمان و بە مەرامی داگیرکردنی کوردســـتانی نیشـــتمان بەرپای کردووە و بواری بۆ هیچ کەسێک نەهێشتووەتەوە دەستەوەستان بوەستێت، پێویستە لەسەر هەر ڕۆڵەیەکی بەجەرگی ئەم نیشتمانە، بەسەر و ماڵ بەشداریی ئەم شۆڕشە بکات"[٦٤٤].

بارزانی بایەخی تایبەتی بە ئێزگە و کارمەندانی داوە، چ وەک ئاگاداربوون لە بەرنامە و پەخش و جۆری وتار و بابەتەکانی، چ وەک لایەنی حەوانەوە و گوزەرانی کارمەندانی و بەتەنگەوە هاتنی ژیان و بژێوی ڕۆژانەیان، تەنانەت خۆشـی سـەردانی دەکردن و لە حاڵ و گوزەرانیانی پێچاوەتەوە. ئەمە ســـەرەڕای ئەوەی ڕێنمایی و ئامۆژگاری و چاوڕوونی پێداون، بۆ نمونە هەر لەســـەرەتاکانی کارکردنی ئێزگە بە کارمەندەکانی دەڵێت:" ئێمە دوژمنی هیچ گەلێک و هیچ حزبێک نین و پێویسـتیمان بە دۆســـتایەتی هەموو کەس هەیە"[٦٤٥]. ئەم دەربڕینەش ئاراســـتەکردنی ڕاگەیاندنی شۆڕشە بۆ پاراستنی دۆست و بێ دەنگکردنی نەیارەکانی .

بەدرێژایی ساڵانی شۆڕشی ئەیلول، بارەگای ئێزگەی دەنگی کوردستان لە نزیک بارەگای بارزانی بووە[٦٤٦]. ئەمەش بەڵگەیەکە لەســەر ئەوەی بارزانی درکی بە گرنگی ئێزگە کردووە، وەک باشـــترین ڕێگە بۆ پەیوەندیکردن بە جەماوەر، بەتایبەتی لە کۆمەڵگەیەکـدا، کە ڕێژەیەکی زۆری خەڵکەکەی نەخوێنـدەوار بوون، هەروەهـا بۆ ئەوەی ببێتە دەربڕێک بۆ خواستەکانی گەلی کورد و بەشداربێ لە دەرخستنی ڕووی

---

بڕوانامەی دکتۆرای لەسەر کورد بەدەستهێناوە. بڕوانە: عەزیز شەمزینی، جوڵانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان، و: فەرید ئەسەسەرد، چ٣، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی،سلێمانی،١٩٩٨، ل٣-٤.

٦٤٤ – بڕوانە دەقی وتەکەی مستەفا بارزانی بە زمانی عەرەبی لە:خەبات(جریدة)، ع(٤٧٠)، ایلول ١٩٦٣،ص٨.

٦٤٥ – سالار عوسمان، س.پ، ل٧٨.

٦٤٦ – هـس، ل٧٩.

ڕاستەقینەی شۆڕش و ڕەتکردنەوەی بانگەشەکانی حکومەتی عێراقی لە دژی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد لە باشووری کوردستان[٦٤٧].

ئەو هەوڵانەی بارزانی بۆ هۆشیارکردنەوەی جەماوەری کوردستان بە پرسە نەتەوەییەکەی لە ڕێگەی دامەزراوەکانی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوانی، لە دوای بەدەستهێنانی سەرچاوەی مرۆیی زیاتر بەهۆی پشتگیری بەشێکی زۆری ڕۆشنبیرانی کورد، لە قۆناغ و وێستگەکانی دیکەی خەباتی نیشتمانی و نەتەوەیی کورد بە ڕێبەرایەتی مستەفا بارزانی زیاتر گەشەی کرد، بۆیە لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦٥_١٩٧٠) چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی ئاشکرا و نهێنی بە پشتگیری و پشتیوانی مستەفا بارزانی و سەرکردایەتی شۆڕشی کوردەوە دەرچوون، لەمانەش ڕۆژنامەی (ئەخبار کوردستان)، کە یەکەم ژمارەی لە نیسانی ١٩٦٥ بڵاوکرایەوە. بابەتەکانی ئەو ڕۆژنامەیە زیاتر بریتی بوون لەو بروسکانەی مستەفا بارزانی ئاراستەی فەرماندە سەربازی و بەرپرسانی حزبی و دەزگاکانی شۆڕشی دەکرد. پاشان گۆڤارێکی دیکە بەناوی (دەنگی پێشمەرگە) بڵاوکرایەوە. کە بەشێوەیەکی مانگانە دەردەچوو ، زیاتر گرنگی بەکاروباری سیاسی و چالاکییە سەربازییە سەرکەوتووەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان داوە، بۆ بەرزکردنەوەی ورە و بەدەستهێنانی متمانەی خەڵکی کوردستان بە شۆڕش[٦٤٨].

تێکۆشانی بارزانی بۆ گەشەپێدانی ڕاگەیاندنی شۆڕش بەردەوام بوو، بەو هۆیەوە لەسەر ڕاسپاردە و ڕێنماییەکانی ئەو ڕێبەرە، پارتی دیموکراتی کوردستان لە ئاداری ساڵی ١٩٦٦، ڕۆژنامەیەکی دیکەی وەک ئۆرگانی حزب بەناوی (خەباتی کوردستان)[٦٤٩] دەرکرد[٦٥٠]. پاشان مەلا مستەفا سوودی لە دیدارەکەی لەگەڵ

---

٦٤٧ – شێرزاد زکریا محمد، س.پ، ل ل٣٥-٣٦.

٦٤٨ – وریا جاف، مێژووی ڕۆژنامەگەری پارتی دیموکراتی کوردستان(١٩٤٦- ١٩٩٦)، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی ڕۆشنبیری و راگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان، چاپخانەی خەبات، دهۆک، ١٩٩٦، ل٣٦

٦٤٩ – بەپێی زانیارییەکانی ژێدەرێک، ژمارە (٣) ئەو ڕۆژنامەیە لە مانگی مایسی ١٩٥٧ وەک ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق چاپکراوە. بۆ زانیاری زیاتر بروانە: کەمال مەزهەر، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە ...،ب٢، ل٣١١.

٦٥٠ – برایەتی(١٩٧٠- ١٩٧١) دووەمین گۆڤاری سیاسی ئاشکرای پارتی دیموکراتی کوردستان، ئا: ئاری نانەکەلی، هەولێر، ٢٠٢٠،ل٢٤.

سـەرۆكی عێراق عەبدولڕەحمان محەمەد عارف[٦٥١] لە (٢٨ی تشـرینی یەكەمی١٩٦٦) لە ڕەواندوز وەرگرت[٦٥٢]، بۆ دەركردنی ڕۆژنامەیەكی دیكە بە زمانی عەرەبی بەناوی (التاخي) (١٩٦٧_١٩٧٤)[٦٥٣]. لەپێناو تێگەیاندنی شـەقامی عەرەبی لەناوەخۆی عێراق و نێوەندە عەرەبیەكانیش لە داخوازییەكانی كورد، ژمارە(١)ی ئەو ڕۆژنامەیە لەدوای وەرگرتنی مۆڵەت لە حكومەتی عێراقی، لە (٢٩ی نیســـانی ١٩٦٧) بەزمانی عەرەبی وەک زمانحاڵی پارتەكە لە شاری بەغدا بە ئاشكرا بڵاوكرایەوە. دوای دەرچوونی (٧) ژمارەی ڕۆژنامەی(التاخي)، ڕۆژنامەیەكی دیكە وەک پاشــكۆ بە زمانی كوردی و بەناوی (برایی) لە (٦ی ئایاری ١٩٦٧) بڵاوكرایەوە[٦٥٤].

مســـتەفا بارزانی لە پیرۆزبایی نامەیەكدا بەبۆنەی دەرچوونی بۆ (ڕۆژنامەی برایی) نووســیویەتی:"لەبارەی ڕۆژنامەكەوە هیوام پێشــكەوتن و ســەركەوتنیەتی لە ڕێی خزمەتكردنی گەلی عێراق و یەكێتی نیشتمانییەكەیدا. وە داوا لە برایانم ڕۆڵەكانی گەلی خۆشـــەویســـتی عێراق ئەكەم، یەكتریان خۆش بوێت و برایەتی یان بەتین

٦٥١ – عەبدولڕەحمان عارف(١٩١٦– ٢٠٠٧): ئەفسەرێكی عێراقی بووە. لە بەغدا لەدایک بووە. لە كۆلێژی سەربازی خوێندوویەتی، لەساڵی ١٩٣٦ بە پلەی ئەفسەر دەرچووە. بەشداری شەڕی عێراق–بریتانیای لە ساڵی (١٩٤١) و شەڕی فەلەستینی لەساڵی (١٩٤٨) كردووە. بۆتە ئەندام لە ڕێكخستنی ئەفسەرانی ئازادیخواز و بەشداری شۆڕشی(١٤ی تەمموزی ١٩٥٨)ی عێراقی كردووە. دواتر بۆتە سوپاسالاری عێراق لەسەردەمی حوكمرانی برایەكەی عەبدولسەلام عارف. پاشان لە نیسانی ١٩٦٦ بۆتە سەرۆک كۆماری عێراق تا كودەتای بەعسییەكان لە (١٧ی تەمموزی ١٩٦٨). لەدوای پرۆسەی ئازادكردنی عێراق لەساڵی (٢٠٠٣) چۆتە ئوردن و تێیدا نیشەجێ بووە، تا مردنی. سعدون حمادي، أوراق سعدون حمادي ( مذكرات و تأملات)، المركز العربي للآبحاث و دراسة السياسات، بيروت، ٢٠٢٢، ص٨٧.

652 - LE GÉNÉRAL AREF A RENCONTRÉ LE CHEF DES REBELLES KURDES, Le Monde, 31 octobre 1966.

٦٥٣ – ژێدەرێک باس لەوە دەكات بەپێی ئەو ڕێككەوتنەی كە لە نێوان سەركردایەتی كورد و حكومەتی عێراقی لەسەر بنەمای بەیاننامەی (٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦) ئەنجامدرا، بارزانی بڕیاری ڕاگرتنی پەخشی ئێزگەی دەنگی كوردستانی عێراقیدا. لەبەرامبەردا مەسعود بارزانی كوڕی مەلا مستەفا لە (ئاداری ١٩٦٧) سەردانی سەرۆک كۆماری عێراق عەبدولڕەحمان عارفی كرد و توانی ڕەزامەندی وەربگرێ بۆ دەركردنی ڕۆژنامەیەک بەناوی (التاخى) لەبەغدای پایتەختی عێراق بە زمانی عەرەبی. صلاح الخرسان، م.س،ص١٤٩.

٦٥٤ – صبرية جرجيس عبدالرحمن ئيمينكي، جريدة ألتأخي/ دراسة تأريخية في موقفها من التطورات السياسية ١٩٦٧– ١٩٧٤، دهوک، ٢٠١٣،ص٤٠.

بکەن"[٦٥٥]. لەم پەیامەدا بارزانی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ داوا لە پێکهاتەکانی عێراق ئەکات، بیری نەتەوەیی نەگەیەننە ڕادەی دەمارگیری و پارێزگاری لە ژیانی دۆستانەی نێوانیان بکەن.

هەستیاری کاری ڕۆژنامەوانی و کاریگەریی لەسەر پەیوەندییە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی کورد، هەمیشە پاڵنەری بەهێز بووە بۆ بارزانی تا خۆی بڕیار لەسەر دامەزراندنی سەرپەرشتیارانی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی شۆڕش بدات، بۆ نمونە ئەوانەی سەرپەرشتی ڕۆژنامەی (التاخي) یان دەکرد، لەلایەن مستەفا بارزانی خۆی دەستنیشانکران و دامەزران. لە نێو ئەوانیشدا خەڵکی پارتی و ناسیۆنالیست و شیوعی و ناسری و ئاشووری و تورکمان هەبوون، بێگومان ئەوەش هەنگاوێک بوو بۆ بەرجەستەکردنی ناوونیشان و دروشمی ڕۆژنامەکە، لەپێناو بەهێزکردنی برایەتی لە کۆمەڵگەی عێراقدا[٦٥٦].

هەر لەسەر ڕاسپاردەی بارزانی بۆ گەشەپێدانی بواری ڕۆژنامەگەری، پارتی دیموکراتی کوردستان لەساڵی ١٩٦٧ ڕێگەی بە ئۆرگانەکانی حزبدا ڕۆژنامەی تایبەت بەخۆیان دەربکەن[٦٥٧]. لەم سۆنگەوە لقەکانی پارتی سوودیان لەو بڕیارە وەرگرت و چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەیان بە یارمەتی کادیرەکانی خۆیان دەرکرد و بڵاوکردەوە، وەک گۆڤاری (صوت کردستان)ی لقی یەکی دهۆک[٦٥٨] و (سەفین)ی لقی دووی هەولێر و (مەشخەڵ)ی لقی سێی کەرکوک[٦٥٩] و (ڕزگاری)ی لقی چواری سلێمانی[٦٦٠].

هەوڵەکانی بارزانی بەهاوکاری سەرکردایەتی شۆڕش و توێژی ڕۆشنبیرانی نیشتمانپەروەر بۆ گەشەپێدانی بنەماکانی هزری نەتەوەیی کوردی لەڕێگەی گرنگیدان بە بواری ڕۆشنبیری کوردی بەتایبەتی ڕۆژنامەگەری لە دوای ڕێککەوتنامەی ئاداری ١٩٧٠ گەشەسەندی زیاتری بەخۆیەوە بینی. لەبەرئەوەی ئەو ڕێککەوتنە

---

٦٥٥ – برایی(ڕۆژنامە)، ژ(٨)، ١٩٦٧/٥/٦، ل١.

٦٥٦ – صبرية ئيمينكي، م.س،ص٣٧–٤٠.

٦٥٧ – محەمەدی مەلا قادر، سەفین لە بیرەوەریەکانم دا، بەشێک لە ئەرشیفی گۆڤاری سەفین لە سەردەمی شاخدا،ب١، ئا: لقی دوو– مەکتەبی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن، هەولێر،٢٠١٦،ل١٤.

٦٥٨ – بڕوانە: صوت كردستان(جريدة)، ع(٣)، كانون الثاني ١٩٦٨، ص١.

٦٥٩ – بڕوانە: مەشخەل(ڕۆژنامە)، ژ(٢)،١٩٦٩/١/١،ل١.

٦٦٠ – بڕوانە: ڕزگاری(ڕۆژنامە)، ژ(٥)، ٢/ئاب/١٩٦٧،ل١.

دەرفەتی زیاتری رەخساند بۆ دەرکردنی گۆڤار و ڕۆژنامەی دیکە بەزمانی کوردی، وەک دەستپێک دوای ئەم پێشهاتە سیاسییە ژمارە (١)ی گۆڤاری (برایەتی) لە (١ی حوزەیرانی ١٩٧٠) بە بەرگێکی ڕەنگاورەنگ بڵاوکرایەوە[٦٦١]. ئەم گۆڤارە مانگی جارێک بە زمانی کوردی لە شاری بەغدا و پاشان لەشاری سلێمانی دەرچوو. بەڵام تا حوزەیرانی ١٩٧٢ بەردەوام بوو[٦٦٢].

هەوڵەکانی مستەفا بارزانی بۆ برەودان و سوود وەرگرتن لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بەردەوامیان هەبوو تا لە (١ی کانونی دووەمی١٩٧٤) بۆ یەکەمجار لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیدا، ڕۆژنامەیەکی سیاسی ڕۆژانە بەزمانی کوردی بەناوی ڕۆژنامەی (برایەتی) لەلایەن دامەزراوەی ڕاگەیاندنی شۆڕشی کورد بڵاوکرایەوە. دوای ئەوەی بارزانی بڕی (٣٠) هەزار دیناری لە نێو خەرجییەکانی شۆڕش بۆ تەرخانکرد[٦٦٣]. پاشان بە بۆنەی دەرچوونی ژمارە (سفر)ی ڕۆژنامەکە، لە پیرۆزبایی نامەیەکدا کە ئاراستەی ڕۆژنامەکەی کرد، بارزانی دەڵێت:" دەرچونی ئەم ڕۆژنامەیە جگە لەوەی کە لە ڕووی سیاسییەوە هەنگاوێکی گرنگی هەرە سوودبەخشە، هاوکات ئەو ڕۆژنامەیە هۆیەکە بۆ خزمەتکردنی زمان و کوولتوور و وێژەی کوردی"[٦٦٤].

ئەو بارودۆخە سیاسییە ئاڵۆزەی لەئەنجامی پابەند نەبوونی حزبی بەعسی دەسەلاتدار لەبەغدا بە ڕێککەوتنامەی ئاداری ١٩٧٠ لە نێوان حکومەتی عێراقی و سەرکردایەتی کورد دروست بوو، لەدوای ڕاگەیاندنی یاسای ئۆتۆنۆمی لە (١١ی

---

٦٦١ – لەبەرگی ئەو ژمارەیە هەڵەکراوە و ڕێککەوتی دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤارەکە نووسراوە(١ی کانوونی دووەمی١٩٧٠)، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە یەکەم ژمارەی ئەو گۆڤارە لە (١ی حوزەیرانی ١٩٧٠) دەرچووە. بڕوانە: برایەتی (گۆڤار)، ژ(١)، ١٩٧٠/٦/١.

٦٦٢ – وریا جاف، س.پ، ل٦٥.

٦٦٣ – ئەم زانیارییە وەرگیراوە لە لاپەرە(٢٥)ی (دانەی ڕەسەن)ی کتێبی (برایەتی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی سیاسییە) بەر لە چاپکردنی. بەداخەوە لەکاتی چاپکردنی لەساڵی(٢٠١٧) بنکەی ژین ئەم لاپەرەی چاپ نەکردوە، ئێمە لە ئەرشیفی ئامادەکاری کتێبەکە ڕۆژنامەنووس عەبدوڵڵا زەنگەنە دەستمان کەوت.

٦٦٤ – برایەتی (ڕۆژنامە)، ژ(.)، ١٩٧٤/١/١، ل١؛ وەرگیراوە لە: برایەتی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی سیاسییە ژمارە(٠– ٣٦) (١٩٧٤/١/١– ١٩٧٤/٢/٧) ژمارە(٨٣–٨٦) (١٩٧٤/٢/١٦– ١٩٧٤/٣/٢)، ئا: عەبدوڵڵا زەنگەنە، سدیق سالح، ڕەفیق سالح، پرۆژەی هاوبەشی زانکۆی زاخۆ و بنکەی ژین، دهۆک، ٢٠١٧، ل٥٣.

ئاداری ١٩٧٤)[٦٦٥]، مستەفا بارزانی ناچارکرد داوا له کارمەندانی ڕۆژنامەی (التاخي) بکات بارەگاکەیان له شاری بەغدا دابخەن و ڕووبکەنه ناوچەی چۆمان و بارەگای نوێیان لەوێ دابمەزرێنن[٦٦٦].

هەر ئەم دۆخەی له پێشەوە ئاماژەمان پێکرد، کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر ئەوەی سەرکردایەتی سیاسی کورد بڕیار لەسەر دامەزراندنی ئەمینداریێتییە گشتییەکان بدات، لەو نێوەندەشدا له پێشینەی هەموو دامەزراوەکاندا، (ئەمینداریێتی گشتی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری و لاوان)ی دامەزراند و به هۆیەشەوە ڕاستەوخۆ بڕیاری لەسەر بەگڕخستنەوەی پەخشی ئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراق دا، که پێشتر به پێی ڕێککەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ ڕاگیرابوو[٦٦٧]. دوای ماوەیەکی کورت ئەم ئەمینداریێتییە (سێ) بەڕێوەبەرایەتی گشتی دامەزراند، که بریتی بوون لەبەڕێوەبەرایەتیە گشتیەکانی ( ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری و لاوان ). پاشان فەرمانگە و بەشەکانی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری دامەزراند. که سەرپەرشتی دامەزراوەکانی ڕاگەیاندنی شۆڕشی دەکرد. ئەو دامەزراوەیە دوای دەستبەکاربوونی لەسەر فەرمانی بارزانی بریاری دامەزراندنەوەی (ئێزگەی دەنگی کوردستان)یاندا له ناوچەی چۆمان[٦٦٨]. سەرەتای پەخشی ئێزگە جارێکی دیکە به وتارێکی مەلا مستەفا بارزانی له (١١ی ئاداری ١٩٧٤) دەستی پێکردەوە[٦٦٩]. بەڵام ئەمجارە پەخشی ئێزگەکە ڕووبەر و پانتاییەکی فراوانتری دەگرتەوە، جیاواز لەگەڵ قۆناغەکانی دیکەی پێشووتری. چونکە له ڕێگەی شەش شەپۆڵ پەخشی دەستپێکرد. (سێ) شەپۆڵی کورت و (سێ) شەپۆڵی مامناوەندی. گوێگرانی له هەموو عێراق و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گوێبیستی پەخشی دەبوون. بەپێی زانیارییەکانی ڕۆژنامەی (مردم)ی ئێرانی، پەخشی ئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراق له (شاری وان) له ڕۆژهەڵاتی تورکیا گوێبیست بوونە. هەواڵی بەرەکانی شەڕی پێشمەرگەی لەگەڵ هێزەکانی حکومەتی عێراقی

---

٦٦٥ – بروانه: الجمهورية العراقية، منشورات وزارة الاعلام، قانون الحكم الذاتي ....، ص٨-٢٣.

٦٦٦ – فللک الدين كاكەيي ، صفحات من أعلام الپارتي منذ عام ١٩٧٤ حتى انتفاظة أذار ١٩٩١، متين(مجلة)، ع(٥١)، نيسان ١٩٩٦، ص٧١.

٦٦٧ – پەیامی ئەیلوول(گۆڤار)، ژ(٣)، بەهاری ٢٠٠٨، ل١٤-٢٠.

٦٦٨ – فللک الدين كاكەيي ، م.س، ص٧١.

٦٦٩ – پەیامی ئەیلوول(گۆڤار)، ژ(٣)، بەهاری ٢٠٠٨، ل١٤-٢٠.

بڵاوکردۆتەوە[٦٧٠]. ئەمەش بۆ ئاگادارکردنەوەی جەماوەر بوو لە ســـەرکەوتنەکانی هێزی پێشـمەرگەی کوردسـتان بەرامبەر بە سـوپای عێراقی، لەپێناو بەرزکردنەوەی وورە و دروستکردنی ئومێد بە سەرکەوتنی شۆڕشی کورد.

فەلەکەدین کاکەیی(١٩٤٣_٢٠١٣) لە ڕوونکردنەوەی بارودۆخی ئەو ســـاتانەی ڕاگەیاندنی شـــۆڕش و گرنگیدانی بارزانی بە تەوەر و بابەتەکانی لە ئێزگەی دەنگی کوردســـتانی عێراق بڵاودەکرانەوە، باس لەوە دەکات، کە بارزانی هەمیشـــە جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە لە ڕاگەیاندن پابەندی مکۆمیەتی و ڕاستگۆیی بین و لە وتار و وشـــەی نەشـــیاو دووربکەوینەوە. بەگوتەی ئەو ســـەرچاوەیە، بارزانی یەکێک بووە لەوانەی گوێگرێکی بەردەوامی ئێزگەکە بووە. بۆیە ئەو کـاتەی یەکێتی ســـۆڤیەت بەهۆی بەرژەوەندییە سیاسی و ئابوورییەکانی پشتیوانی لە حکومەتی عێراقی دەکرد و دژی ئامانجە نەتەوەییەکانی کورد ڕاوەســـتا، ڕۆژنامەی (براڤدا)[٦٧١]هێرشـــی توندی کردە سەر سەرکردایەتی کورد و بەکۆنەپەرست و پاشکۆی ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوایی دەیبەســـتانەوە[٦٧٢]، بەو هۆیەوە ئێزگەی دەنگی کوردســـتان کەوتبووە ســـەنگەری بەرگریکردن لە شۆڕشی کورد، بەڵام بـارزانی ڕێنماییەکانی بۆ ڕاگەیاندن بەتایبەتیش ئێزگە وابوو، کە نابێ بچنە خانەی ڕووبەڕووبوونەوە و شـــەڕی ڕاگەیاندن، لەگەڵ ڕۆژنامەیەکی نێودەوڵەتی وەک براڤدا[٦٧٣].

لەکاتی ڕووداوی بۆمبارانکردنی زانکۆی ســـلێمانی لە (٢٤ی نیســـانی ١٩٧٤)[٦٧٤]، بارزانی جارێکی دیکە ســـەرنجەکانی بە کاربەدەســـتانی ئێزگە گەیاند و ئاگاداری

٦٧٠ – پیش مرگ های کرد ٣٠٠ سرباز عراقی راکشتند ، مردم (روزنامه)،ش(١٩٦)، ٢٩/اب/١٩٧٤، ص١.

٦٧١ –براڤدا: زمانحاڵی کومیتەی ناوەندی پارتی کومونیستی سۆڤیەتیە، یەکەم ژمارەی لە (٥ی ئایاری١٩١٢) لە شاری (سانت بتروسبورگ) دەرچووە. یەکێک لە دامەزرێنەرانی ئەو ڕۆژنامەیە، (ڤلادیمیر لینین) بووە. ڕۆژنامەکە لە ڕۆژی (١٤ی ئاداری ١٩٩٢) ڕاگیراوە. محمد حمدي، قاموس التواريخ- يوميات الاحداث( الجداول الزمنية) و قوائم مرجعية تاريخية، مج٢، القاهرة، ٢٠١٤، ص١١١.

٦٧٢ – بروانە: البرافدا تدين تمرد القيادة الرجعية في كردستان، الجمهورية(جريدة)، ع(٢٠٠٤)، ٢٧ نيسان ١٩٧٤،ص١.

٦٧٣ – فلك الدين كاكەيي ، م.س، ص٧٤.

٦٧٤ – سەبارەت بە ڕووداوی بۆردومانکردنی زانکۆی سلێمانی لە قەڵادزێ، بروانە: عومەر هەمزە ساڵح، کارەسات و بۆردوومانی قەڵادزێ لە ٢٤-٤-١٩٧٤ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و جوگرافی بۆردومانی قەڵادزێ و ڕاپەڕینەکانی کوردستانە،چ٢، هەولێر، ٢٠١٧، ل٥٢-١١٢.

کردنەوە، کە ئەو وتارە سۆز ئامێزانەی پەخشی دەکەن رابگرن، لەبەرئەوەی ڕەنگە کاریگەریی لەسەر ورەی پێشمەرگە دروست بکات، ئەو لەم بارەیەوە گوتی:" تا شۆڕش بەردەوام بێ، ڕەنگە ڕووداوی لەمەش نارەحەتر ڕووبدات، بۆیە دەبێ ڕۆحی بەرەنگاری و ڕووبەڕووبوونەوە لە هزری خەڵک بچەسپێنین نەک بیانڕوخێنن"[٦٧٥].

حەبیب محەمەد کەریم لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا، بۆماوەیەکی درێژ کاری ڕۆژنامەوانی ئەنجامداوە، کاتێک باس لە ڕادەی گرنگیدانی بارزانی بە پەیامە سیاسییەکانی ڕاگەیاندنی شۆڕش دەکات دەڵێت:" ماوە ماوە ئەگەر پێویست بوایە لە بڵاوکراوەکانی حزب باسمان لەوە دەکرد کە پێویستە گەلی کورد بە مافە ڕەواکانی بگات هاوشێوەی ئەو دەوڵەتانەی کە لەچەندین نەتەوە پێکهاتوون، بەڵگەشمان بۆ قسەکانمان بەو نەتەوانە دەهێنایەوە کە لەیەکێتی سۆڤیەت دا بوون، وەک باشترین نمونە بۆ باسەکەمان. بەڵام بارزانی جارێک گوێبیستی ئەو دەستەواژە بوو، ئاگاداری کردینەوە کە پێویستە واز لەو نمونەیە بێنن، لەبەرئەوەی نەتەوەکان لەیەکێتی سۆڤیەت مافە نەتەوەییەکانیان بەشێوەیەکی تەواو پیادە ناکەن، وەک ئێوە دەیبینن"[٦٧٦]. ئەمەش نیشانەی تێگەیشتنی مستەفا بارزانی بووە لە بارودۆخی سیاسی نێودەوڵەتی و چۆنییەتی گونجاندنی ئەو تێگەیشتنە بووە بۆ بەرجەستەکردنی لە گوتاری سیاسی ڕۆژنامەگەری کوردی شۆڕشگێڕدا.

## تەوەری سێیەم : ڕۆڵی مستەفا بارزانی لە گەشەپێدانی ڕۆشنبیریی کوردی

بوارەکانی ڕۆشنبیری بەتایبەتی پەروەردە و زمان و ئەدەب، بە بناغەی سەرەکی گەشەپێدانی بیری نەتەوەیی دادەنرێن. هەر نەتەوەیەک دەتوانێ لە ڕێی دەستگرتنی بەم بنەمایانە، تایبەتمەندی نەتەوەیی خۆی بپارێزێ و داکۆکی بکا لە مافەکانی. بەتایبەتی لە قۆناغی خەباتکردن لەپێناو ڕزگاربوون لەژێر دەستەیی و پاشکۆیەتی داگیرکەران، بۆیە ڕێبەرانی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد لە نێویشیاندا مستەفا بارزانی ئەم لایەنەیان فەرامۆش نەکردووە. ئەم ڕێبەرە کاتێک گەلەکەی لەبەردەم هەڕەشەی سڕینەوەی شوناس و مێژووی نەتەوەییدا بینییەوە. کاری لەسەر پاراستن و

---

٦٧٥ – فلك الدين كاكەيي ، م.س، ص٧٤.

٦٧٦ – حبيب محمد كريم، حول الترث الوطني للبارزاني الخالد، الحيزب الديمقراطي الكردستاني، العراق(قسم الاعلام)، ١٩٩١، ص٢٠.

گەشەپێدانی لایەنی ڕۆشنبیریی کوردی کرد و ئەم پرسەی خستە خانەی داخوازییە نەتەوەییەکانی.

لەم تەوەرەیەدا تیشک دەخەینە سەر ئەو لایەنانەی کە لەبواری ڕۆشنبیریدا جێگەی بایەخی مستەفا بارزانی بوون، لە دەستپێکیشدا قسە لەسەر ڕۆڵی ئەو پێشەوایە لە گەشەپێدانی ئاستی ڕۆشنبیری تاکی کورد دەکەین لە ڕێگای گرنگیدانی بە خوێندن و فێربوون وەک هۆکارێک بۆ بەرزکردنەوەی توانا کەسییەکانی تاک لە کۆمەڵگەی کوردیدا، سەرباری هەوڵە بەردەوامەکانی لەسەر پێویستی بەڕێوەچوونی ئەو پرۆسەیە بە زمانی کوردی لە باشووری کوردستان، کە لەپێشتردا وەک زیادبوونێکی نوێ لە گەشەپێدانی بیری نەتەوەیی خراوەتەڕوو، لێرەشدا پراکتیزەکردنی ئەو تێزە لە ژیانی سیاسی ئەو ڕێبەرە باس دەکەین:

## باسی یەکەم: پەروەردە و فێرکردن

مستەفا بارزانی لەتەمەنی منداڵییەوە، لەسەر بنەمای ڕێبازێکی ئایینی دیاریکراو فێری ئەوە کرا، چۆن گرنگی بە گەشەپێدانی توانا ڕۆشنبیرییەکانی بدات. لەو ماوەیەدا لە قوتابخانەی ئایینی بارزان خوێندویەتی، فێری ئەوە بوو چۆن بتوانێ هاوکاربێ بۆ قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری و ڕۆڵ ببینێ لە هاندانی ڕۆڵەکانی گەلی کورد بۆ فێربوون و پشتگیریکردنی خواستەکانی بۆ خوێندن[٦٧٧]. هەر بۆیە تەنانەت لەو کاتانەی لەناوچەی بارزان دوورخرایەوە لەماوەی نێوان سالانی (١٩٣٣_ ١٩٤٣)، بارزانی دەستبەرداری خوێندنی ئایینی نەبوو، ئەو لە موسڵ و ناسرییە و سلێمانی، لەژێر دەستی گەورە زانایانی ئایینی ئەو سەردەمە، هەوڵی گەشەپێدانی توانا ڕۆشنبیرییەکانی خۆی داوە[٦٧٨].

بارزانی لە میانەی خەباتی سیاسی و چەکداریشدا ڕۆشنبیری بەهەند وەرگرتووە، لە ژێدەرێکدا باسی ئەوە کراوە، کە یەکێک لە هۆکارەکانی هەڵگیرسانی ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٤٣)ی بارزان، دەگەڕێتەوە بۆ خراپی بارودۆخی ڕۆشنبیری لەناوچە کوردییەکان، بەتایبەتیش ئەوەی پەیوەندی بە کردنەوەی قوتابخانە و خوێندن

---

٦٧٧ – أيوب بارزاني، المقاومة الكردية للاحتلال...،ص٦٤.

٦٧٨ – بروانە: دینیس کوماروف، م.س، ص٣٤؛ عەبدوڵڵا زەنگەنە س،پ، ل٢٤٣؛ ئاکۆ شوانی، س.پ،ل٧٤.

به زمـانی کوردی هەبوو، ئەو ژێدەرە بـاس لەوە دەکـات، کە ئەو ســـەردەمە لە باشووری کوردستان بێجگە لە شارە سەرەکییەکان ، تەنها (٢) قوتابخانەی ناوەندی هەبوو لەگەڵ (٣٠) قوتابخانەی سـەرەتایی. لەنێو ئەم قوتابخانانەش تەنها لە قوتابخانە ســەرەتاییەکاندا ڕێگا بە خوێندنی کوردی درابوو، ئەمیش بەشـێوەیەکی سـنووردار، چونکە زۆربەی کـاتژمێرەکـانی وانە گوتنەوەی هەفتـانە، بەزمـانی عەرەبی بوو. ســـەرەڕای ئەوە لەهەموو کوردســـتان تەنها (١٤٠٠) قوتابی هەبوو، کە بە زمانی کوردی دەیانخوێند[٦٧٩].

ئەگەرچی مستـەفا بارزانی لە ڕاپەڕینی دووەمی بارزاندا ئامانجە سـیاسـییەکەی نەپێکا، بەڵام دوای دامەزراندنی حکومەتی کوردســـتان لە کانونی دووەمی ١٩٤٦ لە شـــاری مەهاباد، دەرفەتێکی گونجاوی بۆ ڕەخســـا، تا لەســـەر کۆشـــشـــەکانی بۆ گەشەپێدانی ڕۆشنبیری و بیری نەتەوەیی بەردەوام بێ. بەشێوەیەک دوای پێکهێنانی حکومەتی کوردســتان، قوتابخانەکانی شــاری مەهاباد، دەســتیان بەخوێندنی کوردی کرد. زۆربەی کتێبە فارسییەکانی خوێندن وەرگێڕدرانە سەر زمانی کوردی و بەسەر قوتابیان دابەشـــکران[٦٨٠]. بەڵام یەکێک لەم کێشـــانەی دامەزراوەکانی پەروەردە و فێرکردن لە حکومەتی کوردســتان هەیانبوو، کەمی ژمارەی مامۆســتا و وانەبێژ بوو. بەو هۆیەوە و بەئامانجی پاراســـتنی ئەو دەســـتکەوتە نەتەوەییە، مســـتەفا بارزانی هەوڵیدا لە ڕێگای هاندانی بەشـــێک لەو پێشـــمەرگانەی لەگەڵیدا بوون و توانای وانەگوتنەوەیان هەبوو، پشـــتگیری خۆی بۆ بەردەوامبوونی پرۆســـەی خوێندنی کوردی لە قوتابخانەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردســـتان دەربڕێ. لەســـەر ئەم بنەمایە و بە داواکاری بارزانی، بەشێک لە پێشمەرگەکانی یاوەری بارزانی بوون لە مەهاباد، بوونە مامۆســـتا لەم شـــارە و دەســـتیان بە وانە گوتنەوە کرد[٦٨١]. پاشـــان بەمەبەســـتی دەستخۆشی لێکردنیان، وەک لە هەواڵێکی ڕۆژنامەی (کوردستان)دا هاتووە، بارزانی لە ڕۆژی(٢ی ئاداری ١٩٤٦) ســـەردانی قوتابخانەکانی ناوەندی (مەهاباد) و (گەلاوێژ و کوردســـتان)ی ســـەرەتایی کرد[٦٨٢]. لە قوتابخانەی (ناوەندی مەهاباد)، بارزانی

---

٦٧٩ – دینیس کوماروف، م.س، ص٣٥.

٦٨٠ – هوزان سليمان الدوسكي، جمهورية كوردستان(دراسة تاريخية-سياسية)،أربيل،٢٠٠٥، ص١١٧-١١٨

٦٨١ – م.ن، ص١٠٦.

٦٨٢ – کوردستان(ڕۆژنامە)، ژ(٢٧)، ٢٥ی ئاداری ١٩٤٦، ل٣.

وتەیەکی پێشـــکەشـــی قوتابیان کرد و داوایکرد دژایەتی ئیســـتعمار بکەن و لە پێناو نەتەوە و نیشتمانەکەیان گیانیان بەخت بکەن[٦٨٣]. هەر ئەم ڕۆژە سەردانی قوتابخانەی (گەلاوێژی ســـەرەتایی)کرد و لەگەڵ مامۆســـتایانی ئەم قوتابخانەیە کۆبوویەوە و خۆشـــحاڵی خۆی بە پێشـــکەوتنی دۆخی خوێندن و فێرکردنی کوردی لە مەهاباد دەربڕی. دواجار لە هەمان ڕۆژدا سەردانی قوتابخانەی (کوردستانی سەرەتایی) کرد و بەناو پۆلەکاندا گەڕا و لەهەر پۆلێک قوتابیان بە سـروودی نیشـتمانی پێشـوازیيان لێکرد[٦٨٤]. بۆ ڕۆژی دواتر بارزانی ســـەردانی چاپخانەی (کوردســـتان)[٦٨٥]ی کرد و چاوی بە (ئاغای قادری مودەریسـی) بەڕێوەبەر و کارمەندانی چاپخانەکە کەوت. لەو ســـەردانەدا ســـوپاســـگوزاری خۆی پێشـــکەشـــکردن، بۆ ئەو هەوڵ و کۆشـــشـــانەی بەئامانجی بەردەوامبوون و پێشخستنی ڕۆشنبیریی کوردی ئەنجامی ئەدەن[٦٨٦].

لەلایەکی دیکە هەر بەئامانجی بەرزکردنەوەی ئاســتی زانســتی قوتابیانی کورد. ئەو کاتەی بەشـــێک لە فێرخوازانی باشـــووری کوردســـتان، خواســـتی خۆیان بۆ درێژەدان بە خوێندن لە زانکۆی (تەبرێز) خســـتەڕوو، بارزانی پشـــتگیری کردن، لەڕێگای ئەو کارئاسانییەی بۆیانی ئەنجامدا، لە وەرگیرانیان لە بەشەکانی سیاسی و سەربازی لەو زانکۆیە[٦٨٧]. سەبارەت بەو بابەتە، ولیەم ئیگلتن دەڵێ لە (نیسانی ١٩٤٦) ژمارەیەک قوتابی کورد بۆ خوێندن بەدەســـتپێشـــخەری لیژنەی مەرکەزی حزبی شـیوعی ئازەربێجان ڕەوانەی باکۆ کران. بەشـێکی دیکەشـیان ڕەوانەی قوتابخانەی ســـەربازی (تەبرێز) کران[٦٨٨]. دیارە عزەت ســـلێمان بەگ دەرگەڵەیی(١٩٣٢_٢٠٢٠) یەکێک بووە لەو قوتابیانەی بە پاڵپشـــتی و پشـــتیوانی مســـتەفا بارزانی لە بەشـــی سیاسی زانکۆی تەبرێز وەرگیراوە، ئەو لە یاداشتەکەی خۆیدا دەڵێت:"زانکۆی تەبرێز

---

٦٨٣ – هوزان سليمان الدوسكي، م.س، ص١٠٦.

٦٨٤ – کوردستان(ڕۆژنامە)، ژ(٢٧)، ٢٥ی ئاداری ١٩٤٦، ل٣.

٦٨٥ – چاپخانەی کوردستان لەلایەن حیزبی دیموکراتی کوردستان لە یەکێتی سۆڤییەت کڕاوە و لەشاری مەهاباد دامەزراوە. چەند کارمەندێکی باشووری کوردستان کاریان لێکردوە. ئەم چاپخانەیە گۆڤاری کوردستان و ڕۆژنامەی کوردستانی چاپ و بڵاوکردۆتەوە. هوزان سليمان الدوسكي، م.س، ل٣٣.

٦٨٦ – کوردستان(ڕۆژنامە)، ژ(٢٧)، ٢٥ی ئاداری ١٩٤٦، ل٣.

٦٨٧ – شانێک بەبنباری نیشتمانەوە....ل٣٣.

٦٨٨ – أيغلتن الابن، م.س، ص١٥٤.

بەشی سیاسی و سەربازی کردەوە لە ئازەربێجانی ئێرانی و (٢٠) کورسیان بۆ قوتابیانی کۆماری کوردستان تەرخانکرد. بڕیارماندا هەریەکەمان لەلای خۆیەوە داوا لە بارزانی بکەین داواکەمان بە پێشەوا[مەبەستی قازی محەمەدە] بفەرمووێ، چەند قوتابییەکی کوردستانی ئەم دیویش[مەبەستی باشووری کوردستانە] شانسی خوێندنیان لەو کورسییە تەرخانکراوانەی تەورێزێ پێ بدرێ و بتوانین بخوێنین. باوکم بە بارزانی گوتبوو، کە عزەت ئارەزووی هەیە بخوێنێ، جەنابی بارزانی پێشنیازەکەی پەسەند کرد و باش بوو بەفەرمی داواکەی گەیاندە پێشەوا، ئەمیش ڕەزامەندی لەسەر فەرموو. نزیکەی(١٥٠) قوتابی وەرگیراین، زۆربەیان هی دەوروبەری تەورێز بوون"[٦٨٩].

دوای وەرگیرانی ئەم قوتابیانە لە زانکۆی تەبرێز، بارزانی نوێنەرێکی خۆی، کە (میرحاج ئەحمەد) بوو، ڕەوانەی ئەو شارە کرد بۆ سەرپەرشتیکردن و دابینکردنی پێداویستییەکانیان، پاش تێپەڕبوونی ماوەیەک لەسەر دەستپێکردنی خوێندن، بارزانی دەچێتە شاری تەبرێز و چاوی بە چەند قوتابییەک دەکەوێ و ڕێنمایی نوێنەرەکەی دەکات بۆ ئەوەی کاروباری قوتابییە کوردەکان لەو شارەدا ڕێکبخات[٦٩٠].

گومانی تێدا نییە لایبکردنەوەی مستەفا بارزانی لە قوتابیانی کورد بۆ فێربوونی زانستەکانی ئەو سەردەمە، لەو قۆناغە هەستیارەی خۆی و هەڤاڵەکانی پێیدا تێدەپەڕین لە ژیانی ئاوارەیی و دۆخی ناسەقامگیری سیاسی، کۆششەکانی دەخەنە خانەی هۆشیاری نەتەوەیی و تێگەیشتنی لەسەر پێویستی بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد بە کەسانی شارەزا و پسپۆڕ لە بوارە جیاجیاکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی. بەو هۆیەوە لەنێو پەیڕەو و پرۆگرامی پارتی دیموکراتی کوردستان دوای دامەزراندنی لە (١٦ی ئابی ١٩٤٦)، ئەو ئامانجە نەتەوەییە ڕەنگدانەوەی هەبوو، ئەوەبوو جەختیان لەسەر پێویستی ڕووبەڕووبوونەوەی نەخوێندەواری و بڵاوکردنەوەی خوێندنی باڵا و دامەزراندنی زانکۆکان و چەسپاندنی زمانی کوردی لە قوتابخانە کوردییەکاندا کردەوە[٦٩١].

---

٦٨٩ – شانێک بەبنباری نیشتمانەوە...، ل٣٨.

٦٩٠ – هـ.س، ل٤٣.

٦٩١ – جلال طالباني، م.س، ص٨٩.

ڕووخانی کۆماری کوردســـتان و پەڕینەوەی مســـتەفا بارزانی و ژمارەیەک لە هاوسەنگەرانی بۆ یەکێتی سۆڤیەت، ئەو ڕێبەرەی لە خواستەکانی بۆ بەرزکردنەوەی توانا ڕۆشـــنبیرییەکانی ڕۆڵەکانی گەلی کورد دوور نەکردەوە. ئەوەی ئەم تێڕوانینە بەهێز دەکـات، ئەو ســـەرنجەیەتی، کە لەکۆبوونەی دامەزرانـدنی حکومەتی کـاتی کوردی لە بـاکۆی پـایتەختی ئـازەربێجـان لە(١٩ی کـانونی دووەمی١٩٤٨)، لەبـارەی پلانی بۆ گەشـــەپێدانی ڕەوشـــی پەروەردە و فێرکردن، لە ئەگەری دروســـتبوونی قەوارەیەکی کوردی ســەربەخۆ خســتیەڕوو. کاتێک دەڵێت:"پێویســتە لە کوردســتاندا تەرەقی بە عیلم و ســـەواد بدرێ و هەتاکو ســـنفی شـــەشـــەم خوێندن دەبێ ببێتە ئیجبـاری و بۆ تەربییەی منـداڵان دەبێ بـاغی منـداڵان بکرێتەوە بۆ ئەوەی ژن لە حەیاتی ئیجتماعی ئیشـتراک بکا، پێویسـتە مەکتەبی کچان بکرێتەوە و بەسـەوادبکرێن، هەروەها پێویستە لە کوردستاندا مەکتەبی عالی بکرێتەوە و خوێندن و عیلم وەرگرتن بۆ وڵاتانی دیموکراســی زۆر تەلەبە بنێردرێن و دەبێ خوێندن بەزمانی کوردی بێت، ئەهەمیەت بدرێتە ئەدەبیاتی کورد"[٦٩٢].

ئامانجەکانی مســـتەفا بارزانی بۆ گەشـــەپێدانی لایەنەکانی ڕۆشـــنبیری بەتایبەتی پەروەردە و فێرکردن، لە کۆنگرەی ســـێیەمی پارتی دیموکراتی کوردســـتان، کە لە (٢٦ی کانونی دووەمی ١٩٥٣) لەشــاری کەرکووک ڕێکخرا، وێڕای ئامادەنەبوونی، لە پەیڕەو پرۆگرامی کۆنگرەکەدا بەرجەســـتە بوو. دوای ئەوەی لەم کۆنگرەدا بڕیـار لەســـەر دامەزراندنی (یەکێتی قوتابیانی کوردســـتان) لەپاڵ چەند ڕێکخراوێکی دیکەی جەماوەری کوردی درا[٦٩٣]. ئەمە ســـەرەڕای ئەوەی ســـەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان لە نێو کۆنگرەدا، لە چوارچێوەی بەرنامەیەکی سیاسی ڕێکخراو بڕیاریدا، کـاربکـات بۆ قەڵاچۆکردنی نەخوێنـدەواری و ســـەپـانـدنی خوێنـدنی زۆرە ملێ لە قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و زیادکردنی کردنەوەی قوتابخانە دواناوەندییەکان و پیشەییەکان و کردنەوەی کۆلیج و پەیمانگا باڵاکان لە کوردستان وەک پێشەکییەک بۆ کردنەوەی زانکۆی کوردســتان و چەسـپاندنی زمانی کوردی وەک زمانی فەرمی خوێندنی (ئەدەب و مێژووی کورد) لە قوتابخانەکانی کوردستاندا[٦٩٤].

---

٦٩٢ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد(١٩٣١– ١٩٥٨)، ل٣٥٧.

٦٩٣ – جلال طالباني، م.س، ص١٠٢.

٦٩٤ – م.ن، ص١٧٢.

ئەم بەرنامە و بڕیارانەی لە کۆنگرەی پارتی پەسـەندکران، بوونە هۆی ئەوەی لە (ئاداری ١٩٥٣) بارزانی لیستی ناوی (١٠٤) کەسی لەو پێشمەرگانەی یاوەری بوون لە سـۆڤیەت هاوپێچی داواکارییەک بکات و پێشـکەشـی کاربەدەسـتانی ئۆزبەکسـتان کرد. داواکارییەکە قبوڵکرا و قوتابییەکان لە زانکۆکانی( سـاراتوف، تامبوف، گورکی، ئیفانوفسـکی) لەم وڵاتە دەسـتیان بە خوێندن کرد. لەکاتی چوونیان بۆ زانکۆ، بارزانی پێی گوتن:" بۆ خوێندنی زانست و بەدەستهێنانی مەعریفەت، هەر توانایەکی هەتانە بۆ ڕزگارکردنی گەلەکەتان لە نەخوێندەواری بەکاری بهێنن"[٦٩٥].

بارزانی لە سۆڤیەت لە دوای مردنی ستالین و هاتنی خرۆتشۆف بۆ دەسەڵات، خۆی لەبەردەم بەرپرسـیارەتیەکی گەورەتر و فراوانتر لە قۆناغەکانی پێشـووتری دۆزییەوە، ئەو کاتەی حکومەتی سـۆڤیەت دەرفەتی بۆ رەخسـاند، وەک پێشـەوای گەلی کورد، سەردانی هەرێم و ناوچەکانی کۆماری ئەرمینیا بکات. سەردانی بارزانی لە سـاڵی ١٩٥٦ بۆ ئەم ناوچانە و هاوکات کرانەوەی حکومەتی سـۆڤیەتی بەڕووی بەشـێکی مافە ڕۆشـنبیرییەکانی گەلی کورد، بواری بۆ بارزانی رەخسـاند لەو سـەردانەیدا چاوی بە یاریدەدەری سـەرۆکی زانکۆی (ئەلمائتا) بکەوێ و سـەردانی زانکۆی (ئەتینسک)ی پایتەختی کۆماری کازاخسـتان بکات[٦٩٦]. نووسـەرێکی ڕوس لە گێرانەوەی ڕووداوی ئەو سەردانەی بارزانیدا دەڵێ:" من لەو کاتەدا تازە پێگەیشتبووم، چاوم بەو هەموو جۆش و خرۆشە کەوت، کە کوردەکانی سۆڤیەت لە پێشوازیکردنی بارزانی نیشـانیاندا. مسـتەفا بارزانی لەو سـەردانەیدا وێڕای بینینی ژمارەیەکی ڕۆشـنبیران، چاوی بە ژمارەیەکی دیکە لە قوتابیانی کوردی بەشـێک لە قوتابخانەکان کەوت. ئەو کاتە بینیم بارزانی چەندە خۆشـحاڵ بوو بە ئاسـتی بەرزی ڕۆشـنبیرانی کورد"[٦٩٧].

هەوڵەکانی مسـتەفا بارزانی بۆ بەرزکردنەوەی توانا زانسـتییەکانی تاکی کورد بەئامانجی گەشـەپێدانی لایەنی ڕۆشـنبیری کوردی، ئەگەر سـنوورداریش بوو، لە سـۆڤیەت کۆتـایی نەهـات، بەڵکو ئەو کـاتەی لەگەڵ هەڤاڵەکانی گەرایەوە عێراق، هەرچەندە دەسـەڵاتدارانی نوێی بەغدا، بەهۆی ئەو گۆڕانە سـیاسـییەی لەئەنجامی شۆڕشی (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) هاتەکایەوە، تا ڕادەیەک بەڕووی مافە نەتەوەییەکانی

---

695- О.л. Жигалина, предыдущий источник, С.121.
696- тот же источник, С.123.
697- О.л. Жигалина, предыдущий источник, С.123.

گەلی کورد لەوانەش مافە ڕۆشنبیرییەکانی کرانەوە، دوای جێگیرکردنی ماددەی(٣) لە دەستووری کاتی عێراق، کە تێدا کورد و عەرەبی لەم وڵاتەدا بە هاوبەش ناساند[٦٩٨] و بڕیاریاندا بەڕێوەبەرایەتییەک بەناوی بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی گشـــتی بۆ خوێندنی کوردی دابمەزرێنن، هەروەها بواریان ڕەخســـاند بۆ قوتابیانی کورد لە قوتابخانە ســـەرەتاییەکانی باشـــووری کوردســـتان بەزمانی کوردی بخوێنن. بەڵام بارزانی خواستی زیاتری هەبوو[٦٩٩].

ئەو کۆشـــشـــانەی ئەم ڕێبەرە لەتەمەنی خەباتی سـیاسـی خۆیدا کردی، بەلای قوتابیانی کورد بەتایبەتی بەشـــێکی ئەو توێژە، کە لە وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەورووپا دەیانخوێند، جێگەی بایەخ و گرنگی پێدان بوو، ئەمەشـــیان لە (٢ی کانونی دووەمی ١٩٥٨) لەنامەیەکدا بۆ بارزانی دەربڕی، کاتێک بۆیان نووســـی:" ئەم دەرفەتە بە هەڵ دەزانین، کە ســـوپاس و ڕێزی خۆمان بنێرین بۆ ئێوە و کردەی فیداکاریتان لە پێناو کوردســتاندا، ســەرکردایەتیتان بۆ نیشــتمانی کورد لە کوردســتانی عێراقدا و بۆ هێزە کوردە چەکدارەکان لە کۆماری کوردســـتانی ئێراندا و ســـیاســـەت و تێروانینتان بۆ کێشـــەی کورد و کێشـــەی گەلانی دراوســـێی کوردســـتان، بابەتێکن ســـەربەرزی و شانازی زۆڵ لە دڵی هەموو کوردێکدا دەخولقێنی. ئێمە و هەموو کوردێکی بەشەرەف، هەرگیز تۆمان لەبیرناچێت لە هەرجێیەکی کوردستان بین"[٧٠٠].

ئەم دڵخۆشییەی توێژی ڕۆشنبیر و جەماوەری میللی و سەرکردایەتی سیاسی کوردســـتان بەو دەســـتکەوتانەی لەدوای شـــۆڕشـــی(١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) لەدەستووری کاتی عێراق و لەخانەی چەند بڕیارێکی حکومەتی عێراقیدا هاتنەکایەوە، بەردەوام نەبوون، لەبەرئەوەی ئەم بڕیارانە و چەندین بەڵێنی دیکەی حکومەت، لە دوای ئاڵۆزبوونی پەیوەندیەکانی نێوان سەرکردایەتی کورد و دەسەڵاتدارانی بەغدا بە خەمســـاردییەوە لەلایەن حکومەتی عێراقییەوە جێبەجێ دەکران[٧٠١]، بەو هۆیەوە لە

---

٦٩٨ – مسعود بارزانی، بارزانی...(شۆڕشی ئەیلوول١٩٦١-١٩٧٥)،ل٣٠.

٦٩٩ – بڕوانە: خەبات(جريده)ع(٢٩٨)، ٢٦/اب/١٩٦٠، ص١؛وەرگیراوە لە: فرهاد محمد أحمد، م.س، ص٢٣٨.

٧٠٠ – بڕوانە دەقی نامەکەی لیژنەی قوتابیانی کورد لە ئەورووپا لە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٩٣١- ١٩٥٨)، دهۆک، ١٩٩٨، ل٣٦٥.

٧٠١ – بڕوانە: عمری جلال اغای حوێزی محامی، مدیریەتی معارفی کوردستان دەنگی هەیە ڕەنگی نیە، صوت الاکراد(جریدة)، ع(٣)،١٢ اذار ١٩٦٠،ص١؛ وەرگیراوە لە: صوت الأكراد- دەنگی کورد یەکەمین

(٢٢ی ئایاری ١٩٦٠) مەلا مستەفا بارزانی بەسەرۆکایەتی شاندێکی سەرکردایەتی کورد، کە پێکهاتبوون لە ئیبراهیم ئەحمەد[٧٠٢] سکرتێری لیژنەی مەرکەزی پارتی و عومەر مستەفا (دەبابە)[٧٠٣] و عەلی عەبدوڵلا[٧٠٤] ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، سەردانی وەزارەتی مەعاریفیان کرد و داوایانکرد پەلە لە جێبەجێکردنی یاسای بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی گشتی بۆ خوێندنی کوردی بکرێ، بە شێوەیەک جێبەجیکردنەکە گونجاوبێ لەگەڵ دەقی دەستووری کاتی و مافە ڕۆشنبیرییەکانی گەلی کورد[٧٠٥].

ئەو دۆخە سیاسییە ئاڵۆزەی کەوتە نێوانی سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراقی وەک پێشتریش باسکراوە، لەشەوی(١٥_١٦ی شوباتی ١٩٦٠) مستەفا بارزانی ناچارکرد بەغدای پایتەختی عێراق بەرەو بارزان جێ بهێڵی[٧٠٦]، ئەمەش باری

---

ڕۆژنامەی سیاسیی کوردیی سەربەخۆیە بە زمانی کوردی و عەرەبی دەرچووە(٩شوبات-٢٥ تشرینی دووەم ١٩٦٠)، ئا: عەبدوڵلا زەنگەنە، هەولێر، ٢٠٢٢، ل٢١٢.

٧٠٢ – ناوی تەواوی(ئیبراهیم کوڕی ئەحمەد کوڕی فەتاح کوڕی مستەفا)یە. لە ساڵی ١٩١٤ لە گەڕەکی گۆیژەی شاری سلێمانی لەدایک بووە. لەساڵی (١٩٣٧) کۆلێجی یاسای لە زانکۆی بەغدا تەواوکردووە. لە (٨ی نیسانی ٢٠٠٠) مردووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئامانج حەسەن ئەحمەد، برایم ئەحمەد/ ڕۆڵی لە بزاڤی ڕزگاریخوازی و ڕووناکبیریی گەلی کورددا، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی، ٢٠٠٩،ل١٣.

٧٠٣ – ناوی عومەری کوڕی حاجی سۆفی مستەفای کۆیی یە. بنەماڵەکەیان لە بنەچەدا موکریانین و لە مەهابادەوە ڕوویان کردۆتە شاری کۆیە و لێی نیشتەجێ بوون. لە ڕۆژی (١٦ی ئابی ١٩٢٣) لە گەڕەکی قەلات لە کۆیە لەدایک بووە. لە (١٦ی ئابی ١٩٤٦) بۆتە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان. لە (٢٩ی کانونی دووەمی ١٩٩٢) لە شاری سلێمانی مردووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ڕزگاری گۆڤاری برایەتی کوردو عەرەبە یانی چی؟ ئا: عەبدوڵلا زەنگەنە، هەولێر، ٢٢ی نیسانی ٢٠٢٢، ل٨٤.

٧٠٤ – ساڵی ١٩٢٦ لە شاری کۆیە لەدایک بووە. ساڵی ١٩٤١ هەر لەو شارەدا، پەیوەندی بە حیزبی هیوا کردووە. ساڵی ١٩٤٦ لەیەکەم کۆنگرەی پارتی دیموکراتی کوردستان، بۆتە ئەندامی کۆمیتەی جێبەجێکاری ناوەندی، دواتر بۆتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی و ساڵی ١٩٨٩ لە کۆنگرەی (١٠) یەمی پارتی، سیفەتی جێگری سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی پێبەخشراوە. ساڵی ١٩٩٣ لە کۆنگرەی(١١)ی ئەو حزبە، کراوەتە جێگری سەرۆکی حیزبەکە. لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٧ لە شاری هەولێر مردووە. پارتی پیدیا، ئینسکلۆپیدیای پارتی دیموکراتی کوردستان. https://partipedia.org/ku/articles.

٧٠٥ – خەبات، ژ(٢٢٥)، ٢٤ی ئایار ١٩٦٠، ل١.

٧٠٦ – د. بورهان حاتەم گۆمەتاڵی، مستەفا بارزانی لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی عێڕاقدا(١٩٤٧-١٩٧٠)، هەولێر،٢٠٢٢، ل١١٧.

ناجێگری ڕۆشنبیری کوردی لەو سەردەمە گەراندەوە خاڵی سەرەتا و جارێکی دیکە ڕووبەڕووی فەرامۆشکردن و تەنانەت زەفتکردنی بەشێکی دیکەی کردەوە[٧٠٧].

لەلایەکی دیکە لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی کورد، حکومەتی عێراقی دەستیکرد بە دەستگیرکردن و ڕاوەدوونانی هەموو ئەوانەی لە شارەکانی کوردستان نیشتەجی بوون و پەیوەندییان بە شۆڕشی کوردەوە هەبوو، بەو هۆیەوە بەشێک لە قوتابیانی دەستگیرکران و سزای بەندکردن و دوورخستنەوەیان لە خوێندن بە سەردا سەپاندن. ئەو کاتە مستەفا بارزانی لە ڕێگای دۆستەکانیەوە هەوڵی رزگارکردنی بەشێک لەو قوتابیانەی دا. بۆ نموونەش لە(١٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٤) سەبارەت بە دۆخی قوتابییەکی کورد لە کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی بەغدا دوای ئەوەی بەپێی بریاری دادگای عورفی بەساڵێک زیندانیکردن سزا درا، نامەیەک بۆ (مەسعود محەمەد)[٧٠٨] دەنووسێ. لەو نامەیەدا بارزانی دەڵێت:" هیوادارم هەوڵبدەن بۆ لابردنی ئەو حوکمە لەسەر ئەو کوڕە، چونکە ئەگەر حوکمەکە بکێشێت، مەکتەبەکەی لە کیس ئەچێت، وە ئەگەر مەکتەبەکەیشی لە کیس بچێت، خەسارەتە، چونکە دکتۆرێکمان لە کیس ئەچێت"[٧٠٩]. لەو نامەیەدا دیارە بارزانی دورکەوتنەوەی ئەو قوتابییە لە خوێندن، بە زیانی گەورە بۆ داهاتووی شۆڕش و کوردستان دەبینێ. ئەمەش گوزارشت بوو لە ڕادەی بایەخدانی ئەو ڕێبەرە بە دروستکردنی بنەمایەکی مکوم و پێشکەوتووی زانستی لەو قۆناغە مێژووییەی گەلی کورد، لەبەرئەوەی لەم ڕووەوە کۆمەڵگەی کوردی تا ڕادەیەکی زۆر دواکەوتوو بوو، بەهۆی بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری، کە کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر لاوازی هۆشیاری نەتەوەیی.

ئەم دۆخەی هاتە پێشەوە ئەرکی مستەفا بارزانی قورسترکرد، لەکاتێکدا سەنگەرەکانی پێشمەرگە ڕووبەڕووی هێرش و پەلاماری سوپای عێراقی دەبوونەوە، خەڵکی ناوچە ئازادکراوەکانیش، ڕۆڵەکانیان ڕووبەڕووی دابران و دوورکەوتنەوە لە خوێندن دەبوونەوە. بەڵام لە ساڵی (١٩٦٤)دا، بارزانی مەسەلەی فێرکردن و خوێندنی

---

٧٠٧ – دانا ئادەم شمیدت، س.پ، ل١٤٢.

٧٠٨ – مەسعود محەمەد جەلیزادە(١٩١٩-٢٠٠٢)ی ئەدیب و نووسەری کورد ڕەوانەکرابێ لەبەرئەوەی ناوبراو لە (١٨ی حوزەیرانی ١٩٦٤ تا ١٥ی ئایاری ١٩٦٥) وەزیری ئاوەدانکردنەوە بووە لە حکومەتی عێراقی. بروانە: خەبات(جريده)، ع(٤٧٦)، شباط١٩٦٥، ص٣٠.

٧٠٩ – بۆ بینینی دەقی نامەکە، بروانە: پاشکۆی ژمارە(١٥).

هێنا پێشــەوە[٧١٠]، بۆیە دەســتکرا بە نۆژەنکردنەوە و دامەزراندنی چەند قوتابخانەیەک لەو گوندانەی کەوتبوونە ســنووری دەســەڵاتی هێزەکانی شــۆڕشــی کورد[٧١١]. بەو هۆیەوە یەکەم قوتابخانەی شۆڕش لە ساڵی ١٩٦٤ بە هاوکاری کۆمەڵێک مامۆستای خۆبەخش بەناوی قوتابخانەی (بارزانی ســەرەتایی) لە شــارۆچکەی تەویڵە کرایەوە. ئەو قوتابخانەیە لە پۆلی یەکەم تاوەکو پۆلی شــەشــەمی تێدابوو. پاشــان چەند قوتابخانەیەکی دیکەی ســەرەتایی لە گوندەکانی (توتمە، بالیســان، ناوپردان، دەربەند، هیران، مەمەنداوە، شــاخۆلان، شــێخ شــێروان، بەرەکە، زیارەت، ســماقولی، بێراوە، ســماقولی گرتک، بارزان) دامەزران ، جگە لەچەند قوتابخانەیەکی دیکە لە ناوچەکانی (بیارە، خورماڵ، ســوســەکان، خەرپانی، هاوار، گوڵپ، ســەرگەت، زەڵم، ئەحمەد ئاوا، بەلخە، نارجەلە). دوو قوتابخانەی دیکەش بەناوەکانی (ناوەندی گەڵالە) و (ناوەندی بــارزان) کرانەوە[٧١٢]. لە بەردەوامی ئەم هەوڵانەدا، لەمــاوەی نێوان ســــاڵانی (١٩٦٦_١٩٦٨) توانرا (٢٠٠) قوتابخانەی دیکەی ســــەرەتایی و (١) قوتابخانەی دوا ناوەندی دابمەزرێنن[٧١٣].

لەلایەکی دیکە و هەر لەبواری پەروەردە و فێرکردندا ســەرکردایەتی شــۆڕشــی کورد لە کۆتایی ساڵی (١٩٦٧) لەسەر فەرمانی مستەفا بارزانی، دەستی بە هەڵمەتی قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری کرد لەریزەکانی پێشــمەرگە و خەڵکی دیکەی ئاســایی لەناوچە ئازادکراوەکان. بۆ ئەم مەبەســـتەش چەندین قوتابخانەی دیکە کرانەوە. بەشێوەیەکی گشتی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد تا ساڵی (١٩٧٠)، توانی نزیکەی (٤٠٠) بنکەی نەهێشتنی نەخوێندەواری بکاتەوە[٧١٤].

---

٧١٠ – شکیب عقراوی، م.س، ص٢١٧.

٧١١ – مەسعوود بارزانی، بارزانی...(شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١–١٩٧٥)، ل٤٣٧–٤٣٩.

٧١٢ _ عەبدولغەنی عەلی یەحیا، مەکتەبی زانیاری و قوتابخانە و مامۆستایانی شۆڕش لە چەند لاپەرەیەکی بیرەوەریماندا، پەیامی ئەیلوول(گۆڤار)، ژ(١)، پایزی ٢٠٠٧، ل٢٢؛ گۆران ئەحمەد ئیسماعیل، بۆچی پێمان دەگوترا مامۆستای شۆڕش، پەیامی ئەیلوول(گۆڤار)، ژ(٣)، بەهاری ٢٠٠٨، ل٣٦؛ هاوار مورتکەیی، ڕۆڵی مامۆستایانی شۆڕش لەبەردەوامبوونی پرۆسەی خوێندن لە شۆڕش و پێشمەرگایەتیدا، پەیامی ئەیلوول(گۆڤار)، ژ(١)، پایزی ٢٠٠٧، ل٥٨.

٧١٣ – مەسعوود بارزانی، بارزانی...(شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١–١٩٧٥)،ل٤٣٧–٤٣٩.

٧١٤ – ئازاد عوبێد سالح، کاریگەریی شۆڕشی ئەیلوول، ل٨٢٨٤.

هەوڵەکانی مســـتەفا بارزانی بۆ ڕێکخســـتنی کاروباری پەروەردە و فێرکردن، پێویستی بەدامەزراوەیەک هەبوو سەرپەرشتی بکات، لەو سۆنگەوە لە ساڵی ١٩٦٨، بەســـوود وەرگرتن لەبڕگەی (١) لەماددەی (٢٦) لەدەســـتوری هەموارکراوی ســـاڵی ١٩٦٨ی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق، لەڕێگای مەکتەبی تەنفیزییەوە، لە (٢٣ی ئەیلولی ١٩٦٨) بڕیـاری لەســـەر دامەزرانـدنی بەشـــی (خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی)دا[٧١٥]. ئەم دامەزراوەیە لە دوو مەکتەب پێکهـاتبوو، کە بریتی بوون لە مەکتەبەکانی( زانیاری و تەندروستی). مەکتەبی زانیاری سەرپەرشتی بەڕێوبەرایەتییەکانی (پەروەردەی هەولێر، پەروەردەی دهۆک، پەروەردەی کەرکوک و سلێمانی)دەکرد[٧١٦].

یەکێـک لە گرفتەکـانی مەکتەبی زانیـاری بریتی بوو لە کەمی وانەبێژان، بۆ چارەســـەرکردنی ئەو دۆخە، لەســـەر فەرمانی مســـتەفا بارزانی، لە ئەیلولی ١٩٦٨ (پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی) دامەزرا[٧١٧]، یەکەم دەستەی مامۆستایان لە(٣١ی ئابی١٩٦٩) لەو پەیمانگەیە دەرچوون[٧١٨]. ئەوە ســـەرباری ڕێکخســـتنی چەند خولێکی ئامادەکاری بۆ فێرکردنی ژمارەیەک لە پێشـــمەرگە و کادیرانی پارتی دیموکراتی کوردســـتان لەســـەر چۆنییەتی وانەگوتنەوە. بەو هۆیەوە پاش بەدەنگەوە هاتنی بانگەوازی ســـەرکردایەتی شـــۆڕشـــی کورد لە ئێزگەی دەنگی کوردســـتانی عێراق، ژمارەیەک لە پێشمەرگە و کادیرانی پارتی بە پێوەری زانستی بەشی زانیاری تێپەڕین و بوونە مامۆستای شۆڕش[٧١٩].

مەکتەبی زانیاری بۆ دابینکردنی پێداویستی قوتابخانەکان، سوودی لە ڕێکخستنە نهێنییەکانی پارتی دیموکراتی کوردســـتان لەناو شـــار و شـــارۆچکەکانی باشـــووری

---

٧١٥ – دستور مجلس قيادة الثورة لكردستان العراق (بشكله المعدل) كما اقره الاجتماع الرابع للمجلس في ٢٣/ايلول/١٩٦٨، مطبعة خبات، كوردستان، د.س، ص١٢ .

٧١٦ – محەمەد عەلی مستەفا، مەکتەبی زانیاری، پەیامی ئەیلوول(گۆڤار)، ژ(٢)، زستانی ٢٠٠٨، ل٤١.

٧١٧ – هوژین مسعود سەرنی، س.پ، ل١٧٠.

٧١٨ – ١١ ايلول(مجلة)، ع(١)، ايلول ١٩٦٩، ص٢٥؛ وەرگیراوە لە: دارا عەتار، بژاردەیەکی ئەنتۆلۆژی ئارشیفی کورد لە ئەوروپا، هەولێر، ٢٠٢٠، ل٣١٩.

٧١٩ – حەیدەر شەریف فەتاح، بیرەوەری شۆڕشی ئەیلوول، پەیامی ئەیلوول(گۆڤار)، ژ(١)، پایزی٢٠٠٧، ل٣٨؛ عەبدولواحید دیبەگەیی، مامۆستایانی شۆڕشی ئەیلول کێن؟ پەیامی ئەیلوول (گۆڤار)، ژ (١)، پایزی ٢٠٠٧،ل٦٤.

کوردســتان وەرگرت[٧٢٠]. بەڵام ئەو هەوڵانە نەیانتوانی ڕێژەی پێویســتی پێداویســتی قوتابخانەکان دەستەبەر بکەن. ئەوە سەرباری ئەوەی بەشێکی زۆری قوتابخانەکانی شــۆڕش هۆڵی شــیاوی خوێندن و ژووری مامۆســتایان و تەختەی دانیشــتنیان بۆ قوتابیان تێدا نەبوو. هاوکات بەهۆی شــۆڕش و پرۆســە ســەربازییەکانەوە، ناوچە ئازادکراوەکان بەردەوام ڕووبەڕووی هێرشــی ئاسمانی فرۆکە جەنگییەکانی سوپای عێراق دەبوونەوە. بەو هۆیەوە هەندێ جار قوتابیان بە ناچاری لەنێو ئەشــکەوتی شاخەکاندا بەردەوامیان بە خوێندن داوە[٧٢١].

شیاوی باســە مستەفا بارزانی لە دوای ســەرهەڵدانی شۆڕشــی ئەیلول، هەمیشــە بانگهێشــتی جەماوەری کوردســتانی دەکرد بۆ بەشــداریکردن و پشــتگیریکردنی شــۆڕشــی کورد، بەڵام لەو هەوڵەدا فێرخوازانی کوردی بەدوورگرتوە بێنە ریزەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، بۆیە ئەو کاتەی ژمارەیەک لە قوتابیان پەیوەندییان بە شــــۆڕش کرد، لەلایەن بــارزانی ئــامۆژگــاری کران بگەڕێنەوە قوتــابخــانەکــانیــان و بەردەوامی بە خوێندنیان بدەن و لەریزی پێشمەرگەدا قبوڵی نەکردن[٧٢٢].

لەلایەکی دیکە هەرچەنــدە بەهۆی ئەو ڕێکــارانەی لەلایەن مەکتەبی تەنفیزی گیرانەبەر لە ناوچە ئازادکراوەکان، پرۆسەی خوێندن و فێرکردن بەردەوام بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشــدا ســەرکردایەتی شــۆڕشــی کورد بەدرێژایی دانوســتانەکانی لەگەڵ حکومەتە عێراقییەکــانــدا، هەوڵی بەردەوامی هەبوو بۆ گێڕانەوەی دامەزراوەکــانی پەروەردەی حکومەتی عێراقی بۆ نــاوچە ئــازادکراوەکــان. دواجــار بەشــــێکی داواکــارییەکــانی مســــتەفــا بــارزانی و ســــەرکردایەتی کورد لە بەیــاننــامەی (٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦)ی حکومەتی بەزاز جێگــای بۆ کرایەوە. وەک فەراهەمکردنی خوێندن بە زمانی کوردی لە ناوچە کورد نیشینەکان[٧٢٣]. بەڵام ئەم ڕێکارە سیاسییەی حکومەتی عێراقی نارەزایی ژمارەیەک کۆنەپەرســتی لێکەوتەوە، کە فەرماندەی باڵای

---

٧٢٠ - عەبدولغەنی عەلی یەحیا، س.پ،ل٢٢.

٧٢١ - پەیامی ئەیلوول(گۆڤار)، ژ (١) پایزی ٢٠٠٧، ل٥٣.

٧٢٢ - ولیم أیغلتن الابن، م.س، ص١٠١.

٧٢٣ - بروانە: الاستاذ البزاز یتلو بیان الحکومة حول سیاستها في شمال الوطن، العرب(جریدة)، ع(٦١٣)، ٣٠ حزیران ١٩٦٦، ص١.

ســــەربازی بوون، بەو هۆیەوە ڕاگەیەنراوەکە جێبەجێ نەکراو بەهەڵپەســــێردراوی مایەوە[٧٢٤].

دوای هاتنە ســەر دەســەڵاتی حزبی بەعســی عەرەبی لە بەغدا لە تەممووزی ١٩٦٨، لە ڕۆژی (٩ی تشــــرینی یەکەمی١٩٦٩)[٧٢٥]، لە ڕێگای ئەنجوومەنی ســــەرکردایەتی شــــۆڕش لە عێراقدا، بڕیاریاندا خوێندن لە هەموو قوتابخانە و پەیمانگە و زانکۆ و خانەی مامۆســــتایانی کوڕان و کچان لە ناوچە کوردییەکان بە زمانی کوردی بێت، هەروەها بڕیاریاندا، ڕێگەبدەن بە بڵاوکردنەوەی نووســراو و کتێبی دانراوی کوردیی زانستی و ئەدەبی و سیاسی، وێڕای بڕیاردان لەسەر دامەزراندنی خانەیەکی چاپ و بڵاوکردنەوە بەزمانی کوردی و پێکهێنانی بەڕێوەبەرایەتییەکی گشـتی بۆ ڕۆشـنبیری کوردی و بەپارێزگابوونی دهۆک[٧٢٦].

بە بڕوای دیڤد مکداول ئەم بڕیـارانەی حزبی بەعس، ئـامـانج لێی لاوازکردنی هەژموونی مستەفا بارزانی بوو، بۆ ئەوەی وا نیشانی شەقامی کوردی بدات، حزبەکە ئامادەیە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد دەســــتبەر بکات، بەبێ ڕێککەوتن لەگەڵ سەرکردایەتی کورد. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەبوو، ئەم بابەتە تەنها چەواشەکاری بوو. دیارە بەعســــییەکان نەیانتوانی ئەو ئامانجە بپێکن و بنکەی جەماوەری بارزانی لە شــۆڕش و بەرخودانی کورد دووربخەنەوە، بەهۆی پشــتگیری بەهێزی گەلی کورد لەم ڕێیەرە. لە ئەنجامدا لە( ١١ی ئاداری١٩٧٠) بەناچاری ڕوویانکردە پیادەکردنی میکانیزمێکی دیکە بۆ یەکلاییکردنەوەی پرســــی کورد، لە ڕێگای ڕێککەوتن لەگەڵ مستەفا بارزانی[٧٢٧].

بەپێی ڕێککەوتنامەی (ئاداری١٩٧٠)، حکومەتی عێراقی هەندێ بڕیاری دیکەی بۆ فراوانکردنی دەزگـا پەروەردەییەکـانـدا[٧٢٨]. وێڕای گێڕانەوەی ئەو قوتـابیـانەی

---

٧٢٤ – جليلي جليل وأخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، مؤسسة اراس، اربيل، ٢٠١٣، ص ٣٨٠.

٧٢٥ – الجمهورية العراقية، القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة(١٩٦٨–١٩٧٧)،مج١،مطبعة العاني، بغداد،١٩٧٩.

٧٢٦ – بڕوانە: مسعود بارزانی، بارزانی...(شۆڕشی ئەیلوول١٩٦١–١٩٧٥)، ل٣٣٧.

٧٢٧ – دیفید مکدول، م.س،ص٤٩٠.

٧٢٨ – بڕوانە خاڵی(٩) لە ڕێکەوتنامەی ١١ی ئادری ١٩٧٠ لە : جووڵانەوەی نەتەوەیی باشوری کوردستان( ١٩٦١– ١٩٨٢)لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا، ئا: شەریف عەلی، و: یاسار شێرکۆ، دهۆک،٢٠٢١، ل٣٣.

دەرکرابوون یان ئەوانەی بەناچاری وازیان لە خوێندن هێنابوو بەهۆی ڕووداوەکانی شـۆڕشـی کورد بۆ قوتابخانەکانیان، بێ گوێدانە تەمەنیان[٧٢٩]. سـەرباری کردنەوەی قوتابخانەی زیاتر لە ناوچەکانی باشـووری کوردسـتان و وەرگرتنی قوتابیانی کورد لە زانکۆ و پەیمانگە و کۆلێژی سـەربازی[٧٣٠] و دانانی ڕێژەیەک بۆ قوتابی کورد بۆ ناردنیان بۆ دەرەوەی عێراق بەمەبەسـتی درێژەدان بە خوێندن[٧٣١]. ئەوە سـەرباری جێبەجێکردنی بڕیارەکانی ڕۆژی (٩ی تشرینی یەکەمی١٩٦٩)[٧٣٢].

لەدوای ڕێکەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ و هاتنە پێشـەوەی ئەو دەرفەتەی حکومەتی عێراقی لەچوارچێوەی ڕێککەوتننامەکەدا ڕەخسـاندنی بۆ بواری ڕۆشـنبیریی کوردی بەشێوەیەکی گشتی و پەروەردە و فێرکردن بەشێوەیەکی تایبەتی ، مستەفا بارزانی هەوڵیدا زۆرترین سـوودی لێ وەربگرێ. لەم سـۆنگەوە لە وتارێکیدا لە کۆنگرەی سـێیەمی مامۆسـتایاندا کە لەڕۆژی (٥ی ئابی ١٩٧٠) ڕێکخرا، بارزانی گوتی:" بە باشترین شێوە چەکی زانست بخەنە کار، بە جۆرێکی وا، کە لەگەڵ باری وڵاتەکەماندا بگونجێ و بەپێی پێویستیەکانی پێشکەوتنی بێ"[٧٣٣].

سـەرەڕای هەنگـاوە بەراییەکـانی حکومەتی عێراقی دوای ڕاگەیـانـدنی ڕێککەوتننامەی (ئاداری ١٩٧٠)، سـەبارەت بەلایەنی ڕۆشـنبیریی کوردی، بەڵام ئەو ڕێکارانە لە ئاسـت خواسـتەکانی بارزانی نەبوون بۆ برەوادان بە کەرتی خوێندن و پەروەردەدا ، بەو هۆیەوە بارزانی لە یاداشـتێکیدا بۆ حکومەتی ئەمریکا لەسـەرەتای (ئاداری ١٩٧٢)، داوایکرد چەند کورسـییەکی خوێندنی باڵا، لە زانکۆکانی ڕۆژئاوای ئەورووپا بۆ قوتابیانی کورد برەخسێنن[٧٣٤].

---

٧٢٩ – برایەتی(گۆڤار)، ژ(١)، خوولی دووەم(١٩٧٠/٦/١)،ل٦.

٧٣٠ – أحمد الزيدي، البناء المعنوي للقوات المسلحة العراقية، دار الروضة للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٩٠، ص٢٠٨.

٧٣١ – هـ.س، ل٧.

٧٣٢ – د. ڕەمزیە سابیر محمد، کاریگەری ڕێککەوتنامەی (١١)ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ لەسەر بوژانەوەی بزاڤی ڕۆژنامەگەری کوردی، کۆنگرەی یادەوەری سەد ساڵەی بارزانیی نەمر، ل٥٣٣.

٧٣٣ – برایەتی(گۆڤار)، ژ(٤)، ساڵی ١، خوولی دووەم، ئەیلوولی ١٩٧٠،ل١٤.

734 - **F.R.U.S**, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc- 302). Memorandum from the Director of Central Intelligence (Helms) to the President’s Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Secretary of State Rogers, and Secretary of Defense Laird,

لەلای خۆشــیانەوە لەبەردەوامی ئەو هەوڵانەدا هەندێ لە ڕۆشــنبیرانی کورد لە ڕۆژەکانی(٢٦ و ٢٧ی تەمووزی ١٩٧٣) کۆڕێکیان بۆ لێکۆلینەوە لە کتێبی خوێندن بە زمانی کوردی لە شەقڵاوە ڕێکخست. لەم کۆڕەدا جگە لەوانەی باس و لێکۆلینەوەیان ئامادەکردبوو، ژمارەیەکی زۆریش لە مامۆســـتایان و شـــارەزایانی زمانی کوردی بەشدارییان کرد. لەمیانەی ئەم لێکۆلینەوە زانستییانەی لە کۆڕبەندەکە پێشکەشکران، بەشـــداربوون چەند بڕیارێکیان ســـەبارەت بە دواڕۆژی خوێندن لەقوتابخانە کوردییەکاندا دەرکرد. بەر لە کۆتایهاتنی کۆبوونەوەکەش بروســـکەیەکی بارزانی بۆ بەشداربووانی کۆڕبەندەکە خوێنرایەوە و لەوەڵامی ئەو بروسکەیەدا، بەشداربووان بۆ مستەفا بارزانییان نوسی:"هیوادارین ئەم کۆڕە خزمەتێکی مەزن بە زمان و ئەدەب و زانستی کورد بکات"[٧٣٥].

دواجار هەموو ئەو دەســتکەتانەی لە بواری پەروەردەدا بە هەوڵ و کۆشـــشـــە ســیاســییەکانی مســتەفا بارزانی و شــۆرگێرانی کورد دەســتەبەرکرابوون، تووشــی ئاستەنگی مەترسیدار بوونەوە، لەئەنجامی دەستپێکردنەوەی کردە سەربازییەکان لە ئاداری ١٩٧٤دا، چونکە ئەم پێشـــهاتە هۆکاربوو بۆ داخســـتنی ژمارەیەکی زۆری دامەزراوەکانی پەروەردە و فێرکردن لەناوچەکانی باشـــووری کوردســـتان[٧٣٦]، دوای ئەوەی(٤٢٥) قوتابی زانکۆی ســـلێمانی لەگەڵ (٣٦) مامۆســـتا و (٣٢) فەرمانبەری هونەری و (٥٦) فەرمانبەری کارگێری و (١٦٠٠) مامۆســـتای ســـەرەتایی و (٢٥٠) مامۆســـتای دواناوەندی و (١٠٠٠) قوتابی قۆناغەکانی ســـەرەتایی و ناوەندی و تەواوی کچانی خانەی پێگەیاندنی مامۆســـتایانی دهۆک لەگەڵ مامۆســـتاکانیان و قوتابی و مامۆستاکانی خانەی پێگەیاندنی مامۆستایانی کوڕانی هەولێر، کە ژمارەیان (٥٠٠) کەس دەبوو، بەیەکەوە پەیوەندییان بە شۆڕش کرد[٧٣٧].

. سەبارەت بەو داواکارییەی بارزانی ، بڕوانە پاشکۆی Washington, March 29, 1972, p.4 ژمارە(١٦)

٧٣٥ – بڕوانە: دەنگوباسی کوردستان(ڕۆژنامە)، ژ(١٦)، تەمووزی ١٩٧٣، ل٦.

736 - **F.R.U.S**, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, Telegram from the Interests Section in Baghdad to the Department of State, Baghdad, April 11, 1974, p.685.

٧٣٧ – کریس کوتشیرا، م.س، ص٦٦.

بۆ چارەسـەرکردنی بارودۆخەکە، مسـتەفا بارزانی بەهاوکاری سـەرکردایەتی شۆڕشی کورد لەناوەڕاستی (ئاداری١٩٧٤) بڕیاری لەسەر پێکهێنانی دامەزراوەکانی بەڕێوەبردن دا، کە بریتی بوون لە ئەمینداریێتیە گشتییەکان لەناوچە ئازادکراوەکان. لە پێشەوەی هەموو دامەزراوەکانیش، ئەمینداریێتی گشتی پەروەردە و فێرکردن دامەزرا، کە لەلایەن دارا توفیق(١٩٣٢_١٩٨١) بەڕێوەدەچوو. ئەم دامەزراوەیە بڕیاریدا بە دامەزراندنەوەی زانکۆی سلێمانی لە شارۆچکەی قەڵادزە، وێڕای کردنەوەی دەرگای قوتابخانەکانی ناوچە ئازادکراوەکان بە سـوود وەرگرتن لەو مامۆسـتایانەی پەیوەندییان بە شۆڕشی کوردەوە کرد بوو[٧٣٨]. بەڵام لە ئەنجامی نسکۆی شۆڕشی کورد لە(ئاداری ١٩٧٥)، کۆتایی بە پرۆسـەی پەروەردە و فێرکردنی ژێر دەسـەڵاتی شـۆڕشـی کورد هات، بەو هۆیەوە حکومەتی عێراقی بەردەوامیدا بە سـیاسـەتەکانی سـەبارەت بە فەرامۆشـکردنی زمانی کوردی لە دامەزراوەکانی پەروەردە و فێرکردن لە باشووری کوردستان تا ماوەیەکی درێژ[٧٣٩].

## باسی دووەم: زمان و ئەدەبی کوردی

زمان و ئەدەب، لە کۆڵەگە سـەرەکیەکانی شـوناسـی نەتەوەیین. بۆیە هێزە داگیرکەرەکان دوای دەست بەسەرداگرتنی خاکی هەر نەتەوەیەک، هەوڵی کاڵکردنەوە و تەنانەت هەندێکجار هەوڵی سـڕینەوەیان دەدەن. گەلی کوردیش، کە هەمیشـە ڕووبەڕووی داگیرکاری چەند وڵاتێکی ئیسـلامی و عەرەبی بۆتەوە، هەریەک لەمانە بە فاکتەری ئایینی و نەتەوەیی، هەوڵی تواندنەوەی بیری نەتەوەیی کوردییان داوە لە ڕێگای سـەپاندنی زمان و ئەدەبی بیانی، بۆ لاوازکردنی ئەم بوارە ڕۆشـنبیرییانەی مۆرکی نەتەوەییان بەسەردا زاڵ بوو[٧٤٠].

لە ئەنجامی هەموو ئەمانە مسـتەفا بارزانی وەک درێژە پێدەری ڕێبازێکی خۆبەسـتاوە بە شـوناسـی نەتەوەیی، کاتێک خەباتی سـیاسـی خۆی لەباشـووری کوردسـتان دەسـتپێکرد. ئامانجەکانی لەیەکەم دانوسـتانی لەگەڵ ماجید مسـتەفای

٧٣٨ – فلك الدين كاكةيي ، م.س، ص٦٩.

٧٣٩ – بڕوانە: د. سنوور صباح صديق، خوێندنی فەرمی لەشاری هەولێر(١٩٥٨–١٩٨٠)، نووسینگەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠٢٢، ل٣٤٢.

٧٤٠ – بڕوانە: د. أبراهيم محمد علي مرجونة، الكرد في العصر العباسي(دراسة سياسية حضارية)، دار التعليم الجامعي، الاسكندرية، ٢٠٢٠، ص٢٩.

نوێنەری حکومەتی عێراقی لە (شــــوباتی ١٩٤٤) لە چەند داواکارییەکی نەتەوەیی چڕ کردەوە کە یەکێک لەمانە مســۆگەرکردنی ئازادی ڕۆشــنبیری بوو بۆ گەلی کورد لە عێراقدا[٧٤١].

بارزانی خواســتە ڕۆشــنبیرییەکانی ئاوێتەی کردە ســیاســیە نەتەوەییەکانی کرد، بۆیە ئەو کاتەی بەمەبەســتی درێژەپێدانی دانوســتانەکان لەگەڵ حکومەتی عێراقی لە (٢٢ی شوباتی ١٩٤٤) سەردانی شاری بەغدای کرد، لە دوای چەند ڕۆژێک مانەوەی لەو شــــارەدا، لە (٢٦ی شـــوباتی١٩٤٤) دەرفەتی وەرگرت و ســــەردانی (یانەی ســەرکەوتنی کوردان)ی[٧٤٢]کرد، کە ژمارەیەک گەنجی ڕۆشــنبیری نیشــتمانپەروەری کورد لە دەوری کۆببوونەوە و ئامانجیان پێشــخســتنی ئەدەب و زمانی کوردی بوو. لەو سەردانەدا بارزانی پەیامی پشتگیری و پشتیوانی خۆی و شۆڕشگێرانی بەئەندام و ســەرۆکی ئەو یانە ڕۆشــنبیرییە گەیاند، لە پێناو ســەرخســتنی هەوڵەکانیان بۆ پاراســتن و گەشــەپێدانی زمان و ئەدەبی کوردی[٧٤٣]. بەو بۆنەیەش باوەڕپێکراوی گشــتی یانەکە (مەعرووف جیاووک)[٧٤٤] وێڕای دەربڕینی خۆشــحاڵیان بە هاتنی بارزانی، وتارێکی مێژوویی لەبارەی مێژوو و ڕەسەنایەتی گەلی کورد خوێندەوە[٧٤٥].

بارزانی لەو بۆنەیەدا ئاشــنایەتی لەگەڵ ژمارەیەک لە گەنجانی ڕۆشــنبیری کورد دروستکرد و هەوڵیدا سوودیان لێ وەربگرێ لە چوارچێوەی کۆششە نەتەوەییەکانی. لەلای خۆشــییەوە ئەوەندەی دەرفەتی هەبووبێ، هەوڵیداوە ســوود لەو ئەدەبە پێشکەوتووەی لەو سەردەمەدا بەلای گەنجانی کوردی ڕۆشنبیرەوە جێگەی بایەخ و

---

٧٤١ – اوراق من ذاكرة العراق(مجلة)، ع(٣٧)، ١٥ ايار ٢٠١٥،ص٦.

٧٤٢ – ئەو یانەیە وەک ناوەندێکی ڕۆشنبیریی کوردی ساڵی ١٩٣٠ لەلایەن دەستەیەک لە ڕۆشنبیر و کەسایەتییە ناسراوەکانی کورد لە بەغدا دامەزرا. دواتر لە ساڵی ١٩٦٣ داخراوە. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم یانەیە بڕوانە: هۆشەنگ ساڵح محەمەد شەریف نەجار، بزاڤی ڕۆشنبیریی کوردی لە شاری بەغدا ( ١٩٥٨– ١٩٧٥) لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە، تێزی دکتۆرایە لەبەشی مێژووی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠١٩، ل١٠٢،١٠٣.

٧٤٣ – بڕوانە: عبدالفتاح البوتاني، ملا مصطفى البارزاني قائد الثورة الكوردية و ملهمها، ص١٩.

٧٤٤ – مەعرووف کوڕی عەلی ئەسغەر ئەفەندی کوڕی حاجی مەولوود ئەسعەد بەدیعوزەمانە، ساڵی(١٨٨٥) لە بەغدا لەدایک بووە، ساڵی (١٩٥٨) مردووە. بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: سەرجەمی بەرهەمی مەعرووف جیاووک، ئـا: د. ئازاد عوبێد ساڵح، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠١١، ل٥–٢٣.

٧٤٥ – ئەحمەد باوەر، ڕۆژنامەی کوردستان و شوێنی گەرمیان لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیدا(١٨٩٨_١٩٦٨)، هەولێر، ٢٠٢١،ل١٣٥.

گرنگی پێـدان بوون وەربگرێ. وەک خۆی گێراویەتییەوە، ئەو یەکێـک بووە لە خوێنەرانی بەرهەمە ئەدەبییەکـانی شـــاعیرانی کورد لە نموونەی ئەحمەدی خانی(١٦٥٠_١٧٠٦)[٧٤٦]، سەرباری ئەوەی ئاشنایەتی باشی لەگەڵ بەرهەمی شاعیر و نووسەرانی وەک حافزی شیرازی(١٣٢٦_١٣٨٩ز) و فردەوسی و جەلالەدینی رۆمی هەبووە[٧٤٧]. خوێندنەوەی بەرهەمی ئەو شاعیرانە، خواستێکی ئەدەبی مستەفا بارزانی بوو، لەبەرئەوەی بەرهەمە ئەدەبیەکان لەخانەی ئەدەبی نەتەوەیی بوون، لە نموونەی ئەحمەدی خانی، کە لەداستانی (مەم و زین) دا بۆیەکەمین جار بوو، ئەدەبی تێکەڵ بە پرسی نەتەوەیی گەلەکەی کرد[٧٤٨].

ئەم تێگەیشـــتنە لە گرنگی و بایەخی ئەدەبی کوردی بۆ گەشـــەپێدانی هزری نەتەوەیی، پاڵنەرێکی بەهێز بووە بۆ بارزانی دۆسـتایەتی باشـی لەگەڵ ژمارەیەک لە دەســـتەبژێرانی ئەم بوارەدا هەبێ. ئەو کاتەی لەماوەی ســـاڵانی (١٩٣٧_١٩٤٣) بۆ ســــلێمانی دوورخرابوویەوە، ئەوەندەی دەرفەتی هەبووە هاورێیەتی ئەدیبانی ئەو شارەی کردووە. وەک خۆی باسیکردووە، زۆرکات چۆتە دەرمانخانەی ئەسکەندەر، کە پیـاوێکی ئەرمەنی بووە و لە دەرمـانخـانەکەیـدا چـاوی بەشـــاعیرانی وەک قـانع(١٨٩٨_١٩٦٥) و بێ کەس(١٩٠٥–١٩٤٨)[٧٤٩] کەوتووە، ئەم شـــاعیرانە لەو ســەردەمە لە دیارترین شــاعیرانی کورد بوون[٧٥٠]. لەدوای شـکسـتهێنانی ڕاپەڕینی دووەمی بارزانیش کاتێک دەپەڕێتەوە مەهاباد، دۆســـتایەتی نزیک لەگەڵ شـــاعیرانی ڕۆژهەڵات لەنموونەی هێمن(١٩٢١_١٩٨٦)وهەژار موکریانی(١٩٢٠_١٩٩١) دروسـت دەکات، کە لەو سەردەمە بە (شاعیرانی نەتەوەیی کوردستان)ناسرابوون. سەبارەت

---

٧٤٦ – شیعرەکانی ئەحمەدی خانی کە تێکەڵێکە لە رۆحانییەت و نیشتمانپەروەری، بەتایبەتی بانگەوازی ئەحمەدی خانی بۆ یەکێتی و یەکگرتوویی کورد، وێڕای شیعرەکانی تەسەوفی(مەلای جزیری) لە قوتابخانەی بارزان گرنگیان پێدراوە، لەبەرئەوەی بەشێک بوون لە تەعالیمی تەریقەتی سۆفیگەریی نەقشبەندی. أیوب بارزاني، المقاومة الكردية للاحتلال ١٩١٤–١٩٥٨، ص٦٣.

747- О.л. Жигалина. предыдущий источник, С.122.

٧٤٨ – سەبارەت بە داستانی (مەم و زین) بروانە: عەلائەدین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٥٢، ل١٨٩–٢١٣.

٧٤٩ – ناوی فایقی کوڕی عەبدوڵڵابەگی کوڕی کاکە حەمەیە، لەساڵی ١٩٠٥ لە ئاوایی(سیتەک)لەدایک بووە. بە شاعیرێکی نەتەوەخواز و نیشتمانپەروەر دادەنرێ. لە (١٨ی کانوونی یەکەمی١٩٤٨) لە هەڵەبجە مردووە. بۆ زانیاری زیاتر بروانە: عەلائەدین سەجادی، س.پ، ل٥١٥.

٧٥٠ – محسن دزەیی، م.س، ص١٥١.

بەو دۆســـتایەتییە هەژار موکریانی دەڵێت:"بۆ یەکەمجار بوو چاوم بەبارزانی کەوت، زۆرم دەگەڵ ڕووخۆش بە ئیلتیفات بوو. ئیتر ئەو خۆشـــەویســـتییە دەوامی کرد تا بارزانی چوونە وڵاتی ڕووسان و کە هاتیشنەوە عێراقێ، تا بارزانی وەفاتی کرد هەر زۆر لوتفی دەگەڵما بوو"[٧٥١].

لە ســۆڤیەت، بارزانی توانی ئاشــنایەتی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری ڕۆشــنبیرانی کوردی ئەرمینیا دروســـت بکات، دوای ئەو ســـەردانەی لەســـالی١٩٥٦ بۆ هەرێمە کوردییەکان ئەنجامیدا. لەو سـەردانەدا بارزانی چاوی کەوت بە ژمارەیەک لە پسـپۆڕ و شـــارەزایـانی زمـانەوانی و مێژووی کورد لە نمونەی ( نـادو مەحمودوڤ) و (سـیامەندۆڤ) و زانای ڕۆژهەڵاتناس حاجی جوندی(١٩٠٨-١٩٩٠) و (مەمەدۆف) و (چەتۆییڤ) و (میرزوییڤ)[٧٥٢].

ژێدەرێک پێی وایە ئەو ســـەردانەی بارزانی بۆ هەرێمە کوردییەکانی ئەرمینیا، لەگەڵ ئەو دەرفەتەی حکومەتی ســۆڤیەت بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆشــنبیریی کوردی لە وڵاتەکەیدا ڕەخســـاندی، بوونە هۆی ئەوەی چەندین دامەزراوەی ڕۆشـــنبیری بۆ گرنگیدان بە کوردۆلۆجیا دابمەزرێن، وەک ناوەندی توێژینەوەی کوردی لەهەریەک لە لینینگراد و یەریڤان. هەروەها لە ساڵی ١٩٥٩ لقی دیراساتی کوردی لە ئەکادیمیای زانســـتی ســـۆڤیەتی دامەزرا. وێڕای دامەزراندنی لقی یەکێتی نووســـەرانی کورد لە یەریڤان لە چوارچێوەی یەکێتی نووسـەرانی ئەرمینیا. لەلایەکی دیکە لەنێو ئەکادیمیای زانســـتی ئەرمینیا. زانایان ســـەرقاڵی کوردۆلۆجیا بوون و چەندین کتێبیان لە بواری کوردۆلۆجیا بڵاوکردەوە[٧٥٣].

ئەو هەوڵانەی مســـتەفا بارزانی بۆ پاراســـتن و گەشـــەپێدانی زمان و ئەدەبی کوردی، کاریگەری لەســـەر بەرهەم و کۆشـــشـــە ئەدەبییەکانی نووســـەرانی کوردی دروسـتکرد و ڕەنگدانەوەی لەبەرهەمە ئەدەبییەکانی وەک شـیعر، چیرۆک، پەخشـان، وتـار و لێکۆلینەوە هەبوو[٧٥٤]. بۆ نمونە لەکـاتی گەڕانەوەی بـارزانی لەیەکێتی سۆڤیەتەوە بۆ عێراق، هێمن موکریانی، کە شاعێرێکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، لە

---

٧٥١ – بڕوانە: هەژار، چێشتی مجێور، ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبی میهرگان،چ٢، ٢٠٠٧.ل٦٦.

752- О.л. Жигалина, предыдущий источник, С.123.

٧٥٣ – وەزیری أشو، م.س، ص٥٠.

٧٥٤ – د. عەبدوڵڵا ئاگرین، کاریگەری بیری نەتەوەیی لە گەشەسەندنی کورتە چیرۆکی کوردیی کوردستانی عێراقدا(١٩٦١- ١٩٧٠). هەولێر، ١٩٩٩، ل٤٦.

خانەی شیعرێکی کلاسیکیدا گوزارشتی لە خۆشەویستی گەلی کورد بۆ بارزانی و خەباتی لەپێناو سەرخستنی دۆزەکەی کرد و گوتی:"

ئەی بابی کوردی، ڕۆڵەی ئازا و قارەمان          کاوەی زەمان و هەڵۆی کێوی بارزان
نەتخوارد فریوی جێ و مەقام و دراو و چەک          عومرێکە بۆ نەجاتی وەتەن دات نەناوە چەک
ئازادی خوازی کۆڵنەدەری لاگری حەقی          زۆر لە مێژە لە ڕێگای هەقا مەردانە چەقی[٧٥٥].

تێکەڵبوونی بەرهەمی ئەدیب ونووسەرانی کورد بە خەباتی سیاسی و هەوڵدانی هەندێکیان بۆ نووسینی بەرهەمانێک، کە خزمەت بەدۆزی گەلی کورد بکات، لەدیدی مستەفا بارزانییەوە مایەی بایەخ و گرنگیپێدان بوو. لەو سۆنگەوە لەساڵی ١٩٥٩ لە پێشەکی کتێبی (کردستان المناضلە)، بۆ نووسەری کورد محەمەد توفیق وردی[٧٥٦] دەنووسێ:" کتێبەکەتم خوێندەوە...بینیم گەلی کورد لە قۆناغە مێژووییە جیاوازەکان لە خۆدەگرێ، بە شێوازێکی ئاسان نزیک لە بیری خوێنەری ئاسایی، ئەوە هەوڵێکی باشە لە تۆ بۆ ناساندنی کورد و مێژووەکەیان، نیشتمانەکەیان، سەرچاوە سروشتیەکانیان، شۆڕشە ئازادیخوازەکانیان بۆ برا عەرەبەکانیان بە کورت و پوختی، کە لەسوودەکەی کەم نەکردۆتەوە. هیوام وایە کۆششی زیاتر بکەیت لە گەران و نووسین لە داهاتوو، بەرهەمی پێگەیشتنی بیرتان بۆ نەوەی پێگەیشتووی ئاشنا بە جیهان و ڕۆشنبیری نوێ وەک بەهێزترین پاڵپشتیکەر بۆ بۆنیادنانی شارستانیەتی پێشکەوتوو"[٧٥٧].

لەلایەکی دیکە بارزانی لە ڕێگای بڵاوکراوە ئەدەبییەکانەوە، پەیامی بۆ تەواوی نووسەرانی نیشتمانپەروەری کورد ناردووە، کە خەباتی ڕۆشنبیریان وەک خەباتێکی پیرۆز سەیردەکات، لەسەر ئەم بنەمایە داوایان لێ دەکات کۆششەکانیان

---

٧٥٥ – رەسوڵ پیش نماز، بارزانیم چۆن ناسی،کۆنگرەی یادەوەری سەد ساڵەی بارزانیی نەمر، ب٢، هەولێر، ٢٠٠٣،ل١١٩٤.

٧٥٦ – محەمەدی کوڕی توفیق کوڕی رەشید کوڕی فەرهاد ئاغایە. ناسراوە بە (وردی) . ساڵی (١٩٢٣) لە شاری کۆیە لەدایک بووە و لەتەمەنی ٥٢ ساڵیدا لە(٢ی کانونی دووەمی١٩٧٢) لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردوە. یەکێک بووە لە ئەدیب و نووسەرانی کورد و لەنێوەندی ڕۆشنبیری و ئەدەبی کوردی و عەرەبیدا لە ساڵانی چلەکاندا ناسراو بووە، ساڵی ١٩٤٥ پەیوەندی بە کۆماری کوردستان لە مەهاباد کردوە و لەیەکێک لە قوتابخانەکانیدا مامۆستا بووە. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم ئەدیب و نووسەرە بروانە: محمد علي الصويركي الكردي، م.س، ص٧٦-٧٧.

٧٥٧ – محمد وردي، كردستان المناضلة، مطبعة اللواء، بغداد، ١٩٥٩، ص٤.

بخەنە خانەی خزمەتکردن بە زمانی کوردی، بە ئامانجی هێنانەدی ئاواتە نەتەوەییەکان. بارزانی ئەم پەیامەی لە پیرۆزبایی نامەیەکدا بۆ نوسەرانی گۆڤاری نەورۆز نوسی بەبۆنەی دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤارەکە، کەتێیدا هاتبوو:" بە بۆنەی دەرچوونی گۆڤاری نەورۆزی خۆشەویستەوە، پیرۆزبایی لە نوسەر و خوێندەوارانی ئەکەم. وە هیوادارم هەمیشە سەرکەوتووبن لە خەباتی پیرۆزیان دا بۆ پاراستنی جمهوریەتی عێراقی خۆشەویستمان... وە بۆ جێبەجێکردنی هەموو ئاواتەکانی کورد و کوردستان و گەلی عێراق، وە پێشخستنی زبانەکەمان"[٧٥٨].

مستەفا بارزانی قەلەمی ئەدیب و نووسەرانی کوردی وەک چەکێکی کاریگەر بینیوە لە بەرگریکردن و پارێزگاریکردن لە شوناسی نەتەوەیی، بەو هۆیەوە ستایشی هەڵوێستی کردوون بەتایبەتی قەڵەمە پێشەنگەکانی خزمەتیان بە دۆزی کورد کرد. بۆیە لە یادی (١٠)ساڵەی کۆچی دوایی (فائق بێکەس)ی شاعیری هاوڕێیدا، لە نامەیەکدا بۆ ڕێکخەرانی ئەو بۆنەیە دەنووسێ:" هەرچەندە کوردستان تا ئیمڕۆ زۆر شاعیری نیشتمانپەروەری لێ هەڵکەوتووە، بەڵام بێکەس لەناویاندا جێگەیەکی تایبەتی دیاری هەبوو. بێکەس لە کوردایەتی دا ڕاست و نەبەز بوو، ئازار و ڕووداوی ئیستعمار و نۆکەرانی بەندیخانە و مەنفا دورەکانیان، قەد نەیتوانی ئەوەندەی تۆزێک کاربکاتە گیانی جوامێرانەی، بەڵکو زیاتریان هاندەدا بۆ خەبات لە پێناوی میللەت و نیشتمانی خۆی دا، بۆیە بێکەس لە دڵی هەمومانـدا جێگایەکی بەرزی بۆ خۆی گرتووە"[٧٥٩]. لەم پەیامەدا بارزانی وێنای قەبارەی قوربانییەکانی ئەو شاعیرەی کردووە و بە هێمای بەرخودانی ڕۆشنبیرانی داناوە.

خواستی بارزانی بۆ پاراستن و گەشەپێدانی زمان و ئەدەبی کوردی، خواستی زۆرێک لە ئەدیب و نووسەرانی کورد بوو، بەتایبەتی لەدوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١، ئەو کاتە بەشێک ڕۆشنبیرانی نیشتمانپەروەری کورد نەک بەرهەمەکانیان خستە خزمەتی گەشەپێدانی ڕۆشنبیری کوردی، بەڵکو هەوڵیاندا بەو شیعر و بەرهەمە ئەدەبیانەی پێشکەشی دەکەن، هانی جەماوەری کوردستان بدەن

---

٧٥٨ – نامەی تێکۆشەری خۆشەویستمان بۆ گۆڤاری نەورۆزی خۆشەویست، نەورۆز(گۆڤار)، ژ(١)، نەورۆزی ١٩٥٩، ل٢.

٧٥٩ – رزگاری(گۆڤار)، ژ(١)، ١٠ی شوبات ١٩٥٩، ل٣؛ وەرگیراوە لە: رزگاری گۆڤاری برایەتی کوردو عەرەبە یانی چی؟ ئا: عەبدوڵلا زەنگەنە، هەولێر، ٢٢ی نیسانی ٢٠٢٢، ل١٠٥.

پشتگیری لە شۆڕشی کورد بکەن[٧٦٠]. بەم شێوەیە بەرهەمی ئەدەبی لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦١_١٩٧٠) گەشەسەندنی سۆز و خۆشەویستی خاک و هەست و بیری نەتەوەیی بووە و هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلولی کوردستانی عێراق، ڕۆڵی هەرە سەرەکی و بەهێزی لە گەلالەکردن و خەملاندنی بەرهەمە ئەدەبی و فیکرییەکاندا هەبووە[٧٦١].

هەر لەم ماوەیەدا بەهۆی گەشەکردنی بزووتنەوەی نەتەوایەتی، سەرجەم لقەکانی ئەدەبی کوردی کەوتنە دۆخی بەرەنگارییەوە[٧٦٢]. بەتایبەتیش شیعر، کە لە بازنەی ئەدەبی شۆڕشگێری و بەرەنگاربوونەوەی نەیارانی شۆڕش، دەرفەتی زیاتری بۆ ڕەخسا بۆ بزواندی هەستی نەتەوەیی کۆمەڵگەی کوردی ئەو سەردەمە. بۆ نمونە هەژار موکریانی شاعیری کورد، لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلول، یەکێک بووە لەو کەسایەتییانەی نزیک بووە لە مستەفا بارزانی و زۆریش کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەو ڕێبەرە و بیرە نەتەوەییەکەی، بۆیە لە یەکێک لە شیعرەکانی خۆیدا، باسی لە پێویستی ئەو قۆناغە مێژووییە بەو سەرکردەیە کردووە و تێیدا هاتووە:

ئەگەر دوژمن پراوپڕی دونیا بێ شەپۆڵ بداتەوە... وەکو دەریا بێ
چەکی دەسی لە ئێمە زۆر زۆرتربێ لەگش دڕندە... وەحش و پیاوخۆرتربێ
خۆیان لەناو زرێ پۆشان وەشارن بۆمبا لەبن فڕۆکەیان دابارن
لە کوردستان تۆمان هەبی بەسمانی بۆ پێشەوە پێشمان کەوە بارزانی[٧٦٣].

هەژار موکریانی لەم هەڵبەستیدا هەوڵیداوە دەروونی شۆڕشگێران و هەموو کوردێکی دڵسۆز بۆ نیشتمانەکەی دەرببڕی. بە باوەڕی ئەو، وەک لە هۆنراوەکەیدا هاتووە، لەو ڕۆژگارە پێشەوای دڵسۆز بۆ گەلی کورد تەنها مستەفا بارزانییە.

لەلایەکی دیکە بەشێکی چیرۆکنووسە کوردەکان، لەو بەرهەمە ئەدەبیانەی پێشکەشیان کردووە، هەوڵیانداوە خۆشەیستی (کوردستان) و (بارزانی) ئاوێتەی یەک

---

٧٦٠ - ئەحمەد میرە، کاریگەریی بزووتنەوە رۆشنبیری و ئەدەبییە کوردییەکان لەسەر کۆمەڵگای کوردی باشووری کوردستان(١٩٧٠-٢٠٠٣)، سلێمانی، ٢٠١٢، ل١٢٦.

٧٦١ - عەبدوڵڵا ئاگرین، س.پ، ل٨٣.

٧٦٢ - عومەر مەعروف بەرزنجی، لێکۆلینەوەو بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی(١٩٢٥-١٩٦٩)، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨، ل١٤٣.

٧٦٣ - برایەتی (گۆڤار) ، ژ(١)، ساڵی (١) ، خوولی دووەم ١٩٧٠/١/١، ل ١٠.

بکەن[٧٦٤]. سەربارى ئەمەش کۆششی ئەدەبیان هەبووە بۆ گواستنەوەى دۆخی نارەحەتی خەڵکی کوردستان، کە لەدەرئەنجامی هەڵگیرسانی شۆڕش ڕووبەڕووی بوونەوە. لەو سۆنگەوە حسێن عارف[٧٦٥]کە یەکێکە لەو چیرۆکنووسانەی بە قەڵەم و بەهرە ئەدەبییەکەی بە کاریگەریی هۆشیاری نەتەوەیی لەڕێگای چیرۆکەکانییەوە، لەبەرەی شۆڕشگێرانی کورد دابوو، لەبەرهەمەکانیدا گوزارشتی لە هەستی کوردانەی خۆی کردووە بە وێناکردنی دۆخی شاری سلێمانی، لەو کاتەی هێز و لەشکری حکومەتی عێراقی لە(٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣) هەڵدەکوتنە سەر دانیشتوانی سڤیلی ئەو شارە[٧٦٦].

ئەو ئەدەبە شۆڕشگێرییە، یەکێک لە ئامانجەکانی پاراستنی زمانی کوردی بووە، بەو هۆیەوە هەردوو بوار خۆیان بە پرسی نەتەوەییە بەستاوەتەوە. لەو سۆنگەوە مستەفا بارزانی زیاتر لە هەموو بوارەکانی دیکەی ڕۆشنبیری، گرنگی بە زمانی کوردی داوە. گرنگیدانی مستەفا بارزانی بەو بوارە لە چوارچێوەی تێگەیشتنی نوێ بۆ بیری نەتەوەیی و هۆکارەکانی گەشەپێدانی لەڕێگای هەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنی مافە ڕۆشنبیرییەکانی کورد بووە، بەو هۆیەوە لەنێو تەواوی دانوستانەکانی لەگەڵ کاربەدەستانی بەغدا ئەنجامی داوە، داخوازییەکانی بۆ ئەنجامدانی خوێندن بە زمانی کوردی لەناوچە کوردییەکاندا لە باشووری کوردستان خستووەتەڕوو[٧٦٧]. لەم سۆنگەوە ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی (دانا ئادەم شمیدت) دەڵێت:" لەوانەیە وابێتە بەرچاو لەباری ڕۆشنبیرییەوە، زمانی کوردی مەزنترین ئەو کێشە هەستەوەر و وردانە بێ بەلای کوردەوە. پێشەوای کورد سکاڵای لەوە دەکرد، کە بەڵێنەکانی حکومەت بە دانانی زمانی کوردی بە زمانی فەرمی لە فەرمانگە فەرمییەکانی ناوچە کوردییەکاندا بە کردەوە بەدی نەهاتووە"[٧٦٨].

---

٧٦٤ – عەبدوڵڵا ئاگرین، س.پ، ل١٦٩.

٧٦٥ – حسێن عارف، چیرۆکنووس و ڕۆماننووسێکی کوردە. لە(٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٣٦) لە سلێمانی لەدایک بووە.یەکێک لە بەرهەمە ئەدەبییە بەناوبانگەکانی ڕۆمانی(شار)ە. شاڵاو حەبیبە، یادی ٨٤ ساڵەی لەدایکبوونی حسێن عارف. www.cirok.net، لە٢٣ی کانونی یەکەمی ٢٠٢٢ بینراوە.

٧٦٦ – حسێن عارف، لە ڕۆژێکی سەختا بوو، برایەتی (ڕۆژنامە)، ژ(٥)، ٣/١٩٦٧/٦، ل٤. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم ڕووداوە، بڕوانە: دیفید مکدول، م.س،ص٤٧٨.

٧٦٧ – بڕوانە: دیفید مکدول، م.س،ص٤٩٤.

٧٦٨ – دانا ئادەم شمیدت، س.پ، ل١٤٢.

ئەو سـکالایەی بارزانی هۆکاری ئەو پشـتگوێ خسـتن و فەرامۆشـکردنەوەی زمانی کوردی بوو بە تایبەتی لە ناوەندەکانی خوێندن. بە جۆرێک ئەگەر دەستووری عێراق زمانی کوردی وەک زمانی فەرمی لە عێراقدا ناسـاندبوو، بەڵام تەنها قوتابخانە سەرەتاییەکان لە باشووری کوردستان بەزمانی کوردی دەیانخوێند، ئەو قوتابیانەی لە قوناغی ناوەندی بوون ئەو مافەیان پێ نەدرابوو. ئەم دۆخە لە لیوای(پارێزگا)ی موسـڵ خراپتر بوو، بە جۆرێک خوێندن لە هەموو قۆناغەکان بە زمانی عەرەبی بوو[٧٦٩].

کاتێکیش هەوڵەکانی بارزانی لە رێککەوتننامەی (ئاداری ١٩٧٠) گەیشـتە ئەنجام. لە خاڵی یەکەمی ڕاگەیاندنی ئەو ڕێککەوتننامەیەدا ئاماژە کرابوو بەوەی زمانی کوردی، شـان بەشـانی زمانی عەرەبی زمانێکی فەرمی دەبێ لەو ناوچانەدا، کە زۆرینەی دانیشـتوانیـان کوردن. ئەبێ کوردی زمـانی وانە گوتنەوە بێ، وە لە هەموو ئەو ناوچانەی بەکوردی قسەدەکەن، وانەی زمانی عەرەبیش بوترێتەوە وەک چۆن وانەی زمـانی کوردییش دەگوترێتەوە لە نـاوچەکـانی تری عێراقـدا، وە بەزمـانی دووەم دائەنرێ. لەو چوارچێوەی یـاسـا دیـاری دەکـات[٧٧٠]. هەروەهـا پەلە بکرێ بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی سـەرکردایەتیی شـۆڕش لە بارەی زمان و مافە ڕۆشنبیرییەکانی گەلی کوردەوە[٧٧١].

بەپێی ئەو ڕێککەوتنەی ئەنجامدرا، حکومەتی عێراقی رەزامەندی نیشاندا لەسەر دامەزراندنی کۆڕی زانیاری[٧٧٢] و یەکێتی ئەدیب و نووسـەرانی کورد[٧٧٣]، کە هەردوو

---

٧٦٩ – هـ.س، ل١٤٢.

٧٧٠ – بۆ دەقی بەیاننامەی(١١ی ئاداری ١٩٧٠) بڕوانە: مسعود بارزانی ک بارزانی...(شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١-١٩٧٥)،ل١٣٧،٣٣٤.

٧٧١ – برایەتی(گۆڤار)، ژ(١)، خوولی دووەم(١/٦/١٩٧٠)،ل٦.

٧٧٢ – قانون المجمع العلمي الكردي، الوقائع العراقية،ع(١٩١٧)، ٨ أيلول ١٩٧٠، ص١.

٧٧٣ – بەپێی هەواڵێکی ڕۆژنامەی هاوکاری، حکومەتی لە سەرەتای شوباتی ١٩٧٠ بەر لە ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی ئادار بڕیاری دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کوردی داوە. بەڵام لەنێوەڕۆکی تێزەکەماندا ئاماژەمان بۆ ئەوە کردوە کە دانوستانەکانی نێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراقی لە کانونی دووەمی ١٩٧٠ دەستیان پێکرد، بۆیە ئەم دەستکەوتە ڕۆشنبیرییە دەچێتە خانەی گفتوگۆیەکانی هەبوون بۆ پێدانی مافە ڕۆشنبیرییەکان بە گەلی کورد لە عێراقدا. بڕوانە: هاوکاری(ڕۆژنامە)، ژ(٦)،١٣ی شوباتی ١٩٧٠،ل١.

مەڵبەند کاریان لەسەر پاراستن و دەوڵەمەندکردنی زمان و مێژووی کورد دەکرد، زیاتر لەمەش حکومەتی عێراقی ڕەزامەندی نیشاندا لەسەر دامەزراندنی بەڕێوەبەرایتیەکی گشتی ڕۆشنبیری کوردی و دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی هەفتانە و گۆڤارێکی مانگانەی بەزمانی کوردی، وێڕای ئەوەی هەر لەو ڕێککەوتنەدا حکومەتی عێراقی جەژنی نەورۆزی وەک جەژنێکی نیشتمانی ناساند[٧٧٤].

مستەفا بارزانی توانی لەو ڕێگەیەوە، دامەزراوەکانی ڕاگەیاندنی خوێنراو و بیستراو بکاتە ئامرازێکی کاریگەر بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی. دوای ئەوەی هەریەکێک لەمانە، پانتاییەکی فراوانی بۆ کۆششی ئەدیب ونووسەرانی کورد تەرخانکرد، بۆ بڵاوکردنەوەی کۆششە ئەدەبییەکانیان، لەو ڕێگەیەوە دەیان بەرهەمی ئەدەبی ناوازە بڵاوکرانەوە، کە تێیدا کۆی بیروباوەڕی نەتەوەییان خستەڕوو، بەمەش تەکانێکی گەورەیان بە هزری نەتەوەیی و بەرهەمی ئەدەبی دا.

لەبارەی زمانی کوردیشەوە دەستکەوتێکی گرنگ بەدەستهێنرا، کاتێ لە ساڵی خوێندنی (١٩٧٠_١٩٧١) لە هەر دوو پارێزگای سلێمانی و هەولێر، هەروەها لە (١٨) قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندی لەپارێزگای کەرکووک و لە (٥) قوتابخانەی قەزای خانەقین، دەستکرا بە خوێندنی کوردی لە قۆناغی دواناوەندیدا. زمان و ئەدەبی کوردی لە هەموو پلەکانی دواناوەندی لەو ناوچانەدا دەخوێنرا، کە بەر خوێندنی کوردی دەکەوتن. لە زانکۆکانیش دوو بەشی کوردی هەبوو یەکێکیان لە زانکۆی بەغدا و ئەوی دیکەیان بڕیاردرا لە زانکۆی سلێمانی بکرێتەوە[٧٧٥].

دوای ماوەیەکی کورت حکومەتی عێراقی بۆ خۆدزینەوە لە چارەسەرکردنی دۆزی کورد لە چوارچێوەی ئەو ڕێککەوتنەی ئەنجامیدا بوو، لە (٢٩ی ئەیلولی١٩٧١)، هەوڵی تیرۆرکردنی مستەفا بارزانیدا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو[٧٧٦]. ئەم ڕووداوە کاریگەریی لەسەر ڕۆشنبیرانی کورد دروستکرد بەتایبەتی توێژی ئەدیب و نووسەران. لەو سۆنگەوە شاعیری کورد (عەبدوڵا پەشێو) لەژێر کاریگەریی ئەو ڕووداوەدا، بە هۆنراوەیەک گوزارشتی لە ناخی خۆی کرد و نووسی:"

---

٧٧٤ – بڕوانە خاڵەکانی ڕێکەوتنی سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی لەئاداری ١٩٧٠ لە: حل المشكلة الكردية(أنهاء القتال في شمال العراق و تحقيق الوحدة الوطنية)، الاهرام (صحيفة)، ع(٣٠٤٠٧)، ١٩٧٠/٣/١٢، ص٧.

٧٧٥ – مسعود بارزانی، بارزانی...(شۆڕشی ئەیلوول١٩٦١–١٩٧٥) ،ل١٣٩.

٧٧٦ – مسعود بارزانی، بارزانی...(شۆڕشی ئەیلوول١٩٦١–١٩٧٥)، ل٦٧.

ووتیان: وا گوندێک، گڕی تێبەربوو، گریانم نەهات،
ووتیان: منداڵێک بە نێزە و قەمەی، دوژمن بێ سەر بوو گریانم نەهات،
بەڵام کە ووتیان، زامی بارزانی لە دایک بوو،
دانی پیاوەتی و تۆڵە تێک چەقین،
لە چاوەکانما، دوو کارێز تەقین[٧٧٧].

ئەو دیدگایە نەتەوەییەی (پەشێو) لەو پارچە شیعرەدا بەرجەستەی کردووە، ئەنجامی کۆششەکانی مستەفا بارزانی بوو لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی، لە ڕێگای بەستنەوەی بەرهەمی ئەدیب و نووسەرانی کورد بە پرسی کورد و خەباتی سیاسی ئەو قۆناغە، بە ئامانجی پارێزگاریکردن لە شوناسی نەتەوەیی. ئەمەش بەشداریکردنێکی کارای ئەدیب و نووسەرانی کورد بوو لە بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەییدا وەک لە ڕۆژی(١١ی کانونی دووەمی ١٩٧٤) لە کۆنگرەی چوارەمی خۆیاندا جەختیان لەسەر کردەوە و ڕایانگەیاند کە :"یەکێتی نووسەران هێزێکی شۆڕشگێرە لە هێزەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بەسەرکردایەتی پێشەوای نەتەوەی کورد مستەفا بارزانی"[٧٧٨].

ئەو ئاراستە نەتەوەییەی ئەدیب و نووسەرانی کورد هەڵیانبژارد، بەشێکی زۆری بەرهەمی ئەدەبی ئەو توێژەی خستە خانەی ئەدەبی شۆڕشگێری، بۆ نموونە شێرکۆ بێکەس(١٩٤٠_ ٢٠١٣)، خۆشەویستی نیشتمان و نەتەوەی ئاوێتەی خۆشەویستی ڕێبەری کورد مستەفا بارزانی کرد. بۆیە ئەو کاتەی دەیەوێ هەستی کوردانەی خۆی بە خۆشەویستی بۆ بارزانی دەربڕێ، دەڵێت:"
ئەمانەوێ وەک چەک بۆ پێشمەرگەکانمان...
ئەمانەوێ وەکوو پێشمەرگە بۆ کەژ و کێوەکانمان...
ئەمانەوێ وەک باران بۆ کێڵگەکانمان،
ئەمانەوێ. هەر بۆ (مەرگ ) ە نامانەوێ، ئەی بارزانی"[٧٧٩].

---

٧٧٧ – ڕۆژی کوردستان ( گۆڤار)، ژ(٢)، ١٩٧٢، ل٦٠.

٧٧٨ – نووسەرانی کورد پێشمەرگەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردن بەسەرکردایەتی پێشەوا مستەفا بارزانی، برایەتی(ڕۆژنامە)، ژ(٥)، ١٩٧٤/١/١٣، ل٦.

٧٧٩ – شیرکۆ بێ کەس، بۆ بارزانی، دەنگی کوردستان(گۆڤار)، ژمارە(١)، کانوونی دووەمی ١٩٧٥، ل١٥٦،١٥٧.

بەم شـێوەیە ڕوون دیارە، ئەو بەرهەمە ئەدەبیانەی لەماوەی شـۆڕشـی ئەیلولدا بڵاوکرانەوە، زۆربەیان لە ڕووی ناوەڕۆکەوە ڕەنگدانەوەی دۆخی ئەو سـەردەمەی کوردسـتان بوون، کاریگەریی هەسـت و بیری نەتەوەییان پێوە دیاربوو[٧٨٠]. ئەم ئاراسـتە نەتەوەییەی ئەدیب و نووسـەرانی کورد گرتیانەبەر، وێڕای خزمەتکردن بە دۆزی نەتەوەیی گەلەکەیان، ئامانجی مسـتەفا بارزانی پێکا لە تێکەڵکردنی هەموو بوارەکانی ڕۆشـنبیری کوردی بە سـتراتیژی نیشـتمانی و بەکارهێنانیان وەک ئامرازێکی کاریگەر بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی.

٧٨٠ – عەبدوڵڵا ئاگرین، س.پ، ل١٣٦.

## بەشی چوارەم: هەڵوێستی مستەفا بارزانی بەرامبەر سیاسەتەکانی دەسەڵاتدارانی عێراق

هەڵوێستەکانی مستەفا بـــــارزانی لەبەرامبەر حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق لەسەردەمی پادشایەتی و کۆماریدا، پەیوەست بووە بە سیاسەتەکانی ئەو حکومەتانە و ڕادەی وەڵامدانەوەیان بۆ داخوازییە نەتەوەییەکانی گەلی کورد. بە شێوەیەک ئەو کاتانەی مافە نەتەوەییەکانی کوردیان فەرامۆش کردبێ، ڕووبەڕووی شۆڕش و بەرخودانی کردوونەتەوە. ئەوانەشی لەدۆخێکی دیاریکراودا، بەهەر هۆکارێک بووبێ، ئامانجیان ڕێککەوتن و سازان بووبێ، ئەوە کاری هاوبەشی لەگەڵیاندا ئەنجامداوە، بە ئامانجی بەرقەرارکردنی ئاشتی و ڕێگریکردن لەڕوودانی شەڕ[٧٨١]. بەم شێوەیەی لە خوارەوە ووردکارییەکانی دەخەینەڕوو:

### تەوەری یەکەم: سیاسەتی زەبری هێز و چڵە زەیتون[٧٨٢]

مستەفا بارزانی سەرەتا بە ئاراستەیەکی نەتەوەیی خەباتی سیاسی خۆی دەستپێکرد. بۆیە لە ڕاپەڕینی دووەمی بارزاندا، داواکارییەکانی لەخانەی دامەزراندنی قەوارەیەکی کوردی سەربەخۆ لەچوارچێوەی عێراقدا دەرخست[٧٨٣]. دوای ڕووخانی ڕژێمی پادشایەتی و دامەزراندنی ڕژێمی کۆماری، لەسەر هەمان ئاراستە بەردەوام بوو، بەڵام بە ئاوێتەکردنی لەگەڵ ڕێبازێکی دیموکراتی، بەئامانجی بەدیهێنانی دەستور و سیستەمێکی دادپەروەرانە، لەگەڵ پێداگریکردن لەسەر مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد.

#### باسی یەکەم: سەردەمی عەبدولکەریم قاسم ( ١٩٥٨_ ١٩٦٣)

لە سەرەتای سەردەمی کۆماریدا، حکومەتی عێراقی سیاسەتێکی ئەرێنی بەرامبەر بە کورد و مافەکانی گرتەبەر، هەر چەند ڕۆژێک دوای سەرکەوتنی

---

٧٨١ – بروانە: د. عبدالفتاح علي البوتاني، دراسات و مباحث في تاريخ الكورد والعراق المعاصر، مطبعة حاجي هاشم، أربيل،٢٠٠٧، ص٣٧٢.

٧٨٢ -. لقێکی زەیتون وەک نیشانەی سەرهەڵدانی ژیانی نوێ. ئەو کۆترەی کە لقێکی زەیتونی هەڵگرتووە، تا ئێستاش بە هێمای ئاشتی دادەنرێت.

٧٨٣ – سەبارەت بە داخوازیەکانی بارزانی، بروانە: وديع جويدة، الحركة القومية الكردية نشأتها و تطورها، ت: مجموعة من المترجمين، أربيل، ٢٠١٣، ص٥٤٧.

شۆڕشی(١٤)ی تەمموز، بەدیاریکراوی لە(٢٠)ی ئەو مانگەدا، بڕیاری لێبوردنی گشتی بۆ ئەو کوردانەی لەسەردەمی پادشایەتی بە هۆکاری سیاسی دەستگیر کرابوون، دەرکرد[٧٨٤]، لە ڕۆژی دواتر شێخ ئەحمەدی بارزانی و گیراوە سیاسییەکانی دیکەی ئازاد کرد[٧٨٥]، لەوەش گرنگتر ئەوەبوو لە برگەی دووی ماددەی سێیەمی دەستوری کاتی عێراق کە لە(٢٧ی تەمموز) دەرچوو، ئاماژە درابوو بە هاوبەشیی کورد و عەرەب لە عێراقدا[٧٨٦].

ئەم ڕێکار و بڕیارانە، مستەفا بارزانی گەیاندە ئەو باوەڕەی عێراقی نوێ وڵاتی هەمووانە. لەم سۆنگەوە لە (٢٩ی ئاب) بەبۆنەی سەرکەوتنی شۆڕش، لە (براغ)ەوە نامەیەکی پیرۆزبایی ئاراستەی سەرۆک وەزیران عەبدولکەریم قاسم کرد و داوایکرد ڕێگا بە گەڕانەوەیان بۆ عێراق بدەن[٧٨٧]. لەبەرامبەردا سەرۆک وەزیران بەنامەیەک پێشوازی لەگەڕانەوەی بارزانی و هەڤاڵەکانی کرد[٧٨٨]. پاشان لە ڕۆژی (٤ی ئەیلول) عەبدولکەریم قاسم یاسای لێبوردنی گشتی بۆ هەموو ئەوانەی لەدەرەوەی وڵات بوون، دەرکرد[٧٨٩]. بەو هۆیەوە بارزانی لە (٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٨) گەڕایەوە عێراق[٧٩٠].

حکومەتی نوێ بێجگە لەو بڕیارانەی سەرەوە، هەندێ هەنگاوی تریشی هەڵێنا، کە لەئەنجامدا تێڕوانینێکی ئەرێنی لە دیدی بارزانی بۆ دەسەڵاتی نوێ دروستبوو[٧٩١]، بەتایبەتی دامەزراندنی کوردێک بەناوی خالید نەقشبەندی[٧٩٢]بە

---

٧٨٤ – سەبارەت بەدەقی بڕیاری لێبوردنی گشتی، بڕوانە: أتحاد الشعب(جريدة)، ع(٣٠)، ٢ أذار ١٩٥٩، ص١؛ نوري عبدالحميد العاني،م.س، ص١٩٠.

٧٨٥ – مسعود البارزاني،البارزاني...(الكرد و ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨) ، ص٥٣.

٧٨٦ – ئەم دەستوورە لە (٣٠) مادە پێکهاتبوو، دابەشی سەر چوار بەش و پێشەکییەک کرابوو. بۆ دەقەکەی بڕوانە: الوقائع العراقية(جريدة)، ع(٢)، السنة الاولى، ٢٨ تموز ١٩٥٨،ص٢.

٧٨٧ – د. عبدولخالق ناسر ئەلعامری، س.پ، ل١٤٠.

٧٨٨ – هـ.س، ل١٤٠

٧٨٩ – عبدالفتاح علي البوتاني، التطورات السياسية الداخلية ....، ص٧١.

790-CIA-RDP79T00975A004000230001-1, CENTRAL INTELLIGENCE BULLETIN, 1958-10-08, P.3. بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(١٧)

791 - Derk Kinnane,op.cit, p.60.

٧٩٢ – خالید عەبدولغەفار نەقشبەندی: ساڵی ١٩١٦ لە ناحیەی بامەرنێ سەر بەقەزای ئامێدی لەدایک بووە. خوێندنی لە موسڵ تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩٣٧ لەکۆلێجی سەربازی دەرچووە. ساڵی ١٩٤٥

ئەندامی ئەنجومەنی سەروەری[٧٩٣] بەشداریپێکردنی دوو وەزیری کورد لە حکومەت[٧٩٤]، سەرباری دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی گشتی خوێندنی کوردی و مۆڵەتدان بە چاپ و بڵاوکردنەوەی ژمارەیەک گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی و ڕێگەدان بە پارتی دیموکراتی کوردستان، بۆ ئەنجامدانی کاری سیاسی بەشێوەیەکی ئاشکرا[٧٩٥].

سەرۆک وەزیرانی عێراق بەو هەڵوێستەی بەرامبەر گەلی کورد نواندی، توانی پشتیوانی مستەفا بارزانی بۆ دەسەلات و حوکمڕانییەکەی بەدەستبێنێ[٧٩٦]. بەڵام ئەو هەلومەرجە زۆر بەردەوام نەبوو[٧٩٧]. چونکە دوای ماوەیەک قاسم چەندین گومانی بێ بنەمای لەسەر بارزانی دروستکرد[٧٩٨]، ئەوە سەرباری ئەوەی بەهۆی کوژرانی ئەحمەد ئاغای زێباری لە موسڵ لە (٤ی تشرینی دووەمی ١٩٥٩) پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا ئاڵۆزتر بوون[٧٩٩].

لەلایەکی دیکە سەردانی باڵیۆزی بریتانیا لە بەغدا (همفری تریفلیان- Humphrey Trevelyan) بۆ لای بارزانی لە (٢١ی شوباتی ١٩٦٠) و پاشان وەلامدانەوەی ئەو سەردانە لەلایەن بارزانی لە(٢٨ی شوباتی ١٩٦٠) بۆ باڵیۆزخانەی ئەم وڵاتە[٨٠٠]، گومانەکانی قاسمی زیاتر کرد، لەوەی نەوەک بارزانی بەدوای

---

کۆلێجی ئەرکانی تەواو کردووە. لەو کاتەی شۆڕشی(١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) بەرپابوو، ئەو پارێزگاری هەولێر بوو. لەساڵی ١٩٦١ کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: نوري عبدالحميد العاني و أخرون، م.س، ص٣٢.

٧٩٣ – عمار علي السمر، م.س، ص١٩٤،١٩٨.

٧٩٤ – د. عبدولخالق ناسر ئەلعامری، س.پ، ل١٤١.

٧٩٥ – بڕوانە: الحيزب الديمقراطي الكردستاني يظهر الى العلن، خەبات/ النضال (جريدة)، ع(١٦٧)، ١٠ شباط ١٩٦٠،ص١.

٧٩٦ – بڕوانە: عبدالفتاح علي البوتاني، التطورات السياسية الداخلية ...،ص١٩٧.

٧٩٧ – بڕوانە: أيوب بارزاني، الحركة التحررية الكوردية...، ص٦٤.

٧٩٨ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بگ٣،ب١(١٩٦١-١٩٧٥)، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠٢٠، ل١٢.

٧٩٩ – بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني...(الكرد و ثورة ١٤ تموز١٩٥٨)...، ص١٣٢.

٨٠٠ – بۆ بینینی بەڵگەنامەکانی باڵیوزخانەی بریتانیا لە بەغدا سەبارەت بە سەردانەکان بڕوانە: د. وليد حمدي، الكرد و كردستان في الوثائق البريطانية(دراسة تاريخية و ثائقية)، مطابع سجل العرب، ١٩٩٢، ص ص٢٧٣،٢٧٧.

بەدەستهێنانی پشتیوانی دەرەکی بێ، بۆ بەهێزکردنی پایە و پێگەی خۆی لە عێراقدا، لە کاتێکدا بەپێی ئەو زانیارییانەی لە بەڵگەنامەکانی حکومەتی بریتانیا سەبارەت بەهەردوو سەرداندا هاتووە، گومانەکانی قاسم لەسەر بارزانی لە جێی خۆیاندا نەبوونە، چونکە هیچ باسێکی لەو جۆرە لە بەڵگەنامەکاندا نەهاتووە[٨٠١]. تەنانەت بەپێی گوتەکانی باڵیۆزی بەریتانیا لە بەغدا کە لە بەڵگەنامەیەکدا هاتووە، مستەفا بارزانی لە دیدارەکەیدا دڵسۆزی بۆ حکومەتی عێراقی و عەبدولکەریم قاسم نیشانداوە[٨٠٢].

دواتر گومانەکانی قاسم زیاتر بوون، ئەو کاتەی بارزانی لە (٥ی تشرینی دووەمی ١٩٦٠) سەردانی مۆسکۆی کرد[٨٠٣]، بۆ بەشداریکرد لە مەراسیمی ساڵوەگەری شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆڤیەتی[٨٠٤]. بەڵام ئەو گومانەشی تا ڕادەیەک لەجێگەی خۆی نەبوو، لەبەرئەوەی بارزانی ئەو کاتەی لە (١٣ی کانونی دووەمی١٩٦١) لە مۆسکۆ گەڕایەوە[٨٠٥]، لە دیدارێکی کە لەگەڵ ڕۆژنامەی (النهضة)ی لوبنانی ئەنجامیدا و لەڕۆژنامەی کوردستان وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی، ئاماژەی بۆ ئەوە کرد :" ئەو خوازیاری بەدیهێنانی مافە ڕەواکانی گەلی کوردە، بەبێ ئەوەی ئەو خواستەیان کاریگەریی لەسەر سەلامەتی عێراق دروست بکات"[٨٠٦].

سەرەڕای ئەوەش، وەڵامی سەرۆک وەزیرانی عێراق سەبارەت بە پابەندی ڕێبەری کورد بە ئاشتی و بەیەکەوە ژیان، لە شوێنی خۆیدا نەبوو. چونکە بەر لەوەی

---

٨٠١ – بۆ دەقی ئەو تەوەرانەی لە گفتوگۆیەکانی بالیوزی بەریتانیا و بارزانی لە هەردوو سەردان باسیان لێکراوە، بروانە بەڵگەنامەی ژمارە(٨) لە: الكورد في وثائق الارشيف الوطني البريطاني(١٩٥٨-١٩٦٩)،ج٢، ص٣٩.

٨٠٢ – وليد حمدي، م.س، ص٢٧٨.

٨٠٣ – عبدالفتاح علي بوتاني، الحزب الديمقراطي الكردستاني في ظل قانون الجمعيات رقم(١) مسنة ١٩٦٠، متين(مجلة)، ع(٦٧)، دهوک، ١٩٩٧، ص٨١.

٨٠٤ – شۆڕشی بەلشەفی یان شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە (٢٥ی تشرینی دووەمی ١٩١٧) لە ژێر سەرکردایەتی فلادیمیر لینین بەرپابوو. بۆ زانیاری زیاتر بروانە: ليون تروتسكي، تاريخ الثورة الروسية،ج١، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، ١٩٧٨، ص٨٢.

٨٠٥ – مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية(٢)، ط٢، كاوا للثقافة الكردية، بيروت، ١٩٩٧، ص١١٢.

٨٠٦– کوردستان(ڕۆژنامە)، ژ(١)، ١٩٦١/٣/٤، ل٥، وەرگیراوە لە: د. هیمداد حسین و نەوزاد عەلی ئەحمەد، کوردستان ڕۆژنامەیەکی سیاسی ڕۆژانەیە، لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، چاپخانەی پیرەمێرد، سلێمانی، ٢٠١٩.

بارزانی بگەڕێتەوە بەغدا، خانوو، لەگەڵ ئۆتۆمۆبێلە تایبەتەکەی، کە هەر لەساڵی ١٩٥٨ بۆی دابینکرابوو، لەلایەن حکومەتەوە دەستی بەسەرگیرا[٨٠٧]، ئەمە وێڕای بڕینی ئەو یارمەتییە داراییەی بۆ خەرجی مانگانەی تەرخان کرابوو[٨٠٨]. نەبوونی متمانە و ئەو گومانانەی هەبوون، وایانکرد قاسم پشتگیری هۆزەکانی نەیاری تەقلیدی بارزانییەکان بکات و پارە و چەکیان پێبدات، بەئامانجی لاوازکردنی هێز و هەژموونی مستەفا بارزانی[٨٠٩].

ئەم هەڵوێست و کردارانەی حکومەتی عێراقی لەدژی بارزانی ئەنجامیدان. سەرباری نارەزاییەکانی بارزانی لە مادەی دووەمی دەستوری کاتی، کە ئاماژەی کردبوو بەوەی عێراق بەشێکە لەگەڵی عەرەب و هەروەها نەبوونی شیکردنەوەیەکی دروست بۆ ماددەی سێیەمی هەمان دەستور و دەرکردنی ئەفسەر و فەرمانبەرانی کورد لە سوپا و دامەزراوەکانی دەوڵەت بەتایبەتی لە شارە کوردیەکان[٨١٠]، سەرجەمیان بوونە هۆی ئەوەی مستەفا بارزانی لە (١٥_١٦ی شوباتی ١٩٦١) بەغدای پایتەختی جێبهێڵێ و بگەڕێتەوە باشووری کوردستان[٨١١].

دوای گەڕانەوەی بۆ کوردستان، مستەفا بارزانی کۆششە سیاسییەکانی لەبارنەی پڕۆژەیەکی سیاسی چڕکردەوە، کە تێیدا (ئۆتۆنۆمی) بۆ کوردستان لە چوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتدا بە چارەسەرێکی گونجاوی دۆزی کورد بینی. چونکە بۆی دەرکەوت، عەقلیەتی سەربازی و بیری ناسیۆنالیستی توندڕەوی عەرەبی لە هزری دەسەڵاتدارانی عێراق کاڵ نابێتەوە. وەک خۆی لەدیدارێکیدا لەگەڵ پەیامنێری ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی باسی دەکات و دەڵێت:" دوای ئەوەی بۆ گەلی کورد لە چەند ساڵێک ژیان لەگەڵ قاسم و غەیرە قاسم بەدەرکەوت، زەحمەتە بەڵکو مەحاڵە بە شێوازی کۆن لە ژیان بەردەوام بێ، ناچاربوو داوای

٨٠٧ – عبدالفتاح البوتاني، التطورات السياسية الداخلية...، ص٢٩٦.

808 – Israel State Archives, Israeli–Kurdish Relations, 1977,p.118

٨٠٩ – سەبارەت بە هێرشی زێباری و سورچییەکان بۆ سەر دەڤەری بارزان ، بڕوانە دەقی نامەی شێخ ئەحمەدی بارزانی لە(٢٨ی ئاياری ١٩٦٠) بۆ مەلا مستەفا لە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة ...(الكرد و ثورة ١٤ تموز١٩٥٨) ، ص٣٦٧.

٨١٠ – سەبارەت بەو کێشانەی لە نێوان کورد و حکومەتی عێراقیدا هەبوون، بڕوانە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة ...(الكرد و ثورة ١٤ تموز١٩٥٨)، ص١٣٨-١٤٩.

٨١١ – الجمهورية العراقية، مديرية شرطة لواء اربيل(القلم السري)، العدد(٣١٨)، التاريخ:١٩٦١/٢/١٨.

ئۆتۆنۆمی بکات لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراق، تاوەکو بۆ خۆی هەندێک ئازادی و سەقامگیری مسۆگەر بکات، لەبەرئەوەی من یەکێکم لە تاکەکانی ئەو گەلە، وە ئەو داواکارییە لە کرۆکی خواستی گەلی کورد بەگشتی دەرکەوتووە، من پشتگیری دەکەم و داوای جێبەجێکردنی دەکەم"[٨١٢]. لەپێناو بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش، بارزانی دەنگی خۆی خستە پاڵ دەنگی هێزە عێراقییەکانی داوای ئازادییە گشتییەکان و دەستوری دیموکراتی و کۆتاییهێنان بە حوکمی عورفی و ئەنجامدانی هەڵبژاردن و نوێنەرایەتی ڕاستەقینەیان لە ئەنجومەنی نوێنەران، کرد[٨١٣].

نووسەرێکی ناسیۆنالیستی عەرەب ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە:"لەو کاتەدا مستەفا بارزانی ئەوەندە ڕووچووبووە ناو بیری نەتەوەیی و ئامانجەکانی بۆ سەپاندنی هەژموون بەسەر باکوور و ناوچە کوردییەکانی دیکەی دەرەوەی عێراق، ئامادەبوو هەر کارێک ئەنجام بدات، بیگەیەنێتە ئەو ئامانجە"[٨١٤]. بێگومان ئەو نووسەرە بۆ شکاندنی بارزانی و ڕای گشتی شەقامی عەرەبی، ئەوەی نووسیوە، لە کاتێکدا دیارە ئەو ئامانجە نەتەوەیی یان دیموکراتییانەی هەر کەسێک خۆی بە شایستەی دەزانێ، بۆ بارزانی و گەلەکەشی مافێکی سروشتی بووە، هەر کاتێکیش ئەو مافە زەفت بکرێ، هەموو ڕێکارێک بۆ بەدەستهێنانەوەی تەنانەت ئەگەر بە شەڕ و شۆڕشی چەکداری بێت، لەبەرامبەر دەسەڵاتێک، کە بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە، ئامادەی دانپێدانانی نەبێ، لەنگی تێدا نییە.

لەگەڵ ئەوەشدا شەڕ و بەکارهێنانی هێز دوا بژاردەی بارزانی بووە، هەر بۆیە لەدوا هەوڵی بۆ بەردەوامبوونی ئاشتی و گفتوگۆی سیاسی، نامەیەکی بۆ قاسم نارد و بۆی نووسی:"کورد ناچار دەبن ئەو ڕێگایە بگرنەبەر، کە گەلی جەزائیر گرتییەبەر، ئەگەر حکومەت دۆزی کورد چارەسەر نەکات"[٨١٥]. بارزانی لەو نامەیەدا مەبەستی ئەوەبوو ئەو پەیامە بە قاسم بگەیەنێ، ئەگەر داخوازییە نەتەوەییەکانی کورد دەستەبەرنەکەن، ناچاردەبن وەک گەلی جەزائیری شۆڕش هەڵبگیرسێنین بۆ بەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکانیان. بەڵام قاسم پەیامەکەی بارزانی فەرامۆشکرد، ئەم

---

812 –Dana Adams Schmidt, Kurds' Guerrilla …,p.1.

٨١٣ – د. مجيد خدوري، العراق الجمهوري، بيروت، ١٩٧٤، ص١٤.

٨١٤ – وەرگیراوە لە: محمود الدرة، م.س، ص٢٩٩.

٨١٥ – عبدالفتاح البوتاني، منطقة بادينان(١٩٢٥–١٩٧٠)، ج٢(١٩٥٨–١٩٧٠)، ص٩٧.

هەڵوێستەشیان کاریگەری هەبوو لەسەر هەڵگیرسانی شۆڕشێکی دیکەی کورد لە باشووری کوردستان لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦١_١٩٧٥)[٨١٦].

بارزانی لە سەرەتای ئەو شۆڕشەدا داوای ڕووخانی حکومەتی قاسم و یەکگرتنی حزبە سیاسیە عێراقیەکانی کرد[٨١٧]. لەبەرامبەردا بەپلانێکی نەخشە بۆ دارێژراو، قاسم پەنای بۆ بەکارهێنانی هێز برد، بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد[٨١٨]و لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسی کە لە (٢٣ی ئەیلولی١٩٦١)ئەنجامیدا، تۆمەتی هەڵگەڕانەوەی خستە پاڵ شۆڕشگێرانی کورد، کاتێک گوتی:" لەسەر زاری من بە ڕۆڵەکانی گەل ڕابگەیەنن هەڵگەڕانەوەکە، ئامانجی جوداخوازییە"[٨١٩]. بەڵام لەدیدی مستەفا بارزانیدا، هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە عێراقدا پاڵنەری خۆی هەبوو، وەک لە وتارێکی کە لەڕۆژی(٦ی ئەیلولی١٩٦٣) بەبۆنەی ساڵیادی شۆڕشەکە ئاماژەی پێکرد و گوتی:" ئەوەی قاسم ناوی ناوە هەڵگەڕانەوە، بریتییە لە جوڵانەوەیەکی بەرگری لە دژی دیکتاتۆریەت و لەپێناو مافی گەلی عێراقی دیموکراتی و بەدیهێنانی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کوردە... خەباتی چەکداریمان لە پێناو عێراقیکی سەربەخۆی دیموکراتی و ڕژێمێکی پەرلەمانی تەندروستە. هەروەها خەباتە لە پێناو داواکاری دیموکراتی بۆ گەلی عێراق بەگشتی و بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمیە لە چوارچێوەی عێراقدا"[٨٢٠]. بێگومان ئەو خاڵانەی بارزانی لەم وتارەدا خستیەڕوو، گوزارشت بوون لە دۆخی ئەو ساتەی عێراق، کە بەئاراستەی تاکڕەوی و

---

٨١٦ – د.عزيز الحاج، القضية الكردية في العراق التاريخ والافاق، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، ١٩٩٤،ص٣١؛ عمار السمر، م.س، ص٢٣٣-٢٣٩.

٨١٧ – عزيز الحاج، م.س،ص٣٣.

٨١٨ – بروانە بەڵگەنامەی ژمارە(٢٠)، لە: الكورد في وثائق الارشيف الوطني البريطاني(١٩٥٨-١٩٦٩)،ج٢،ص٨٨.

٨١٩ – الثورة(جريدة)، ع(٧٠٧)، ٢٤ أيلول ١٩٦١،ص١؛ صوت الاحرار(جريدة)، ع(٨٠٦)، ٢٥ ايول ١٩٦١، ص٣.

٨٢٠ – بيان البارزاني الى الشعب العراقي بمناسبة مرور عام على الثورة الوطنية في كردستان، خبات(جريدة)، ع(٤٦٧)، أيلول ١٩٦٣،ص١. وەرگیراوە لە: نەوزاد عەلی ئەحمەدک خەبات ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان(نیسانی ١٩٦٢-کانوونی دووەمی ١٩٦٤)، بنکەی ژین، سلێمانی،٢٠٠٨،ل٥٩.

قۆرخکردنی دەســەڵات چوو، لەلایەن گروپێکی ســەربازی، کە باوەڕی بە هەڵبژاردن و دەستور و بنەما دیموکراتییەکان نەبوو[٨٢١].

بەردەوامبوونی عەبدولکەریم قاســم لەســەر ســیاســەتی فەرامۆشــکردنی داخوازییەکانی پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکان بۆ ئەنجامدانی چاکسازی لە ڕژێمی حوکمڕانیدا، دواجار بووە هۆکاری ئەنجامدانی کودەتایەکی سەربازی لەلایەن بەعسی و ناسرییەکان لە (٨ی شوباتی ١٩٦٣) و دوورخستنەوەی لەدەسەڵات[٨٢٢].

## باسی دووەم: سەردەمی هەردوو عارفی برا(١٩٦٣_١٩٦٨)

بەعسییەکان لە (٨ی شوباتی١٩٦٣) بە کودەتایەکی سەربازی دەسەڵاتیان لە عێراق گرتە دەست، ئەوان خوازیاری یەکگرتن و خۆبەستانەوەی عێراق بوون بە وڵاتانی دیکەی عەرەبی لە نمونەی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو. بۆیە یەکەم پڕۆژەی سیاسییان دوای کوشتنی قاسم، بەدیهێنانی ئەو خواستەیان بوو، کە پارتی بەعسی عەرەبی وەک ستراتیژی سیاسی سەیری دەکرد[٨٢٣].

مستەفا بارزانی لە هەمان ڕۆژی کودەتایەکە، فەرمانیدا بە ڕاگرتنی شەڕ لەهەموو بەرەکاندا[٨٢٤]. پاشان بەپێی زانیارییەکانی ڕۆژنامەی (مەعاریف)ی ئیسرائیلی لە(١٠ی شوباتی١٩٦٣)، بارزانی پیرۆزبایی لەئەنجومەنی کودەتا سەربازییەکەدا کرد[٨٢٥]. دواتر لە (٢٠ی شــوباتی١٩٦٣) جەلال تاڵەبانی وەک نوێنەری خۆی ڕەوانەی بەغدا کرد بۆ ئەنجامدانی دانوستان لەسەر بنەمای بەخشینی مافە نەتەوەییەکانی کورد، کە خۆی لە ئۆتۆنۆمی بۆ باشووری کوردستان دەبینییەوە[٨٢٦].

---

٨٢١ – سەبارەت بە شێوازی حوکمڕانی دەسەلاتی سیاسی لە عێراق لەم کاتەدا، بروانە: عزيز الحاج، م.س، ص٣٠.

٨٢٢ – منذر الموصلي، م.س، ص١٢٥.

٨٢٣ – سەبارەت بە گفتوگۆکانی یەکێتی عەرەبی سێ قۆڵی نێوان عیراق و سوریا و میسر، بروانە: أمين هويدي، كنت سفيرا في العراق(١٩٦٣– ١٩٦٥) الفرص الضائعة للوحدة العربية، مركز دراسات الوحدة العربية،ط٢، بيروت،٢٠١٧،ص٤٣–٩٣.

824- Dana Adams Schmidt,Kurd Chiefs Leaving Mountains For Peace Meetings in Baghdad,The New York Times,February 18, 1963..p.1,18.

825 (עיתון) למרחב (–, גיליון 2701(11,בפברואר 1963 עמ' 2.

826 -Une délégation des rebelles kurdes est arrivée à Bagdad, Le Monde, 22 février 1963.

ســـەرەتا (تاهیر یەحیا)[٨٢٧]ی ســـوپا ســـالاری عێراق ڕایگەیاند، کە پرەنســـیپی ئۆتۆنۆمی کورد لای حکومەت پەسەندکراوە[٨٢٨]. بەڵام دواتر حکومەتی عێراقی پرسی ئۆتۆنۆمی کوردی بە پرۆژەی یەکێتی عەرەبی بەســـتایەوە. بۆیە داوایان لە جەلال تاڵەبانی کرد، یاوەری شاندێکی حکومەت بکات بۆ دیداری سەرۆک کۆماری عەرەبی یەکگرتوو جەمال عەبدوڵناســـر لە میســـر[٨٢٩]. ئەوەبوو تاڵەبانی لە ڕۆژی (٢١ی شـــوباتی١٩٦٣) بۆ خســـتنەڕووی داواکارییەکانی ســـەرکردایەتی شـــۆڕشـــی کورد لەبەردەم جەمال عەبدوڵناسر، یاوەری شاندی حکومەتی عێراقی کرد لەگەشتەکەیاندا بۆ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو، کە چوار ڕۆژی خایاند[٨٣٠]، تیایدا جگە لە قاهیرە، ســـەردانی وڵاتی جزائیری کرد و لەڕۆژی (٢٥ی شـوباتی ١٩٦٣) گەڕایەوە بەغدا[٨٣١]. بارزانی لەو هەڵوێســـتەی تاڵەبانی نیگەران بوو، بۆیە لە دیدارێکی لەگەڵ پەیامنێری ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی ڕایگەیاند، کە ئەو داوای لەتاڵەبانی نەکردووە، بچێتە قاهیرە و جەزائیر[٨٣٢]. وەک پەرچەکردارێک هۆشـداری بە دەسـەڵاتدا تا ڕۆژی

---

٨٢٧ – تاهیر یەحیا محەمەد عگیلی، لەساڵی ١٩١٤ لە شاری تکریت لەدایک بووە. ساڵی (١٩٢٨_١٩٢٩) چۆتە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی. لە تشرینی یەکەم تا کانونی یەکەم ١٩٣٣ مامۆستا بووە لە قوتابخانەی ئەعزەمییەی سەرەتایی. پاشان لە (١٥ ئەیلولی ١٩٣٥) چۆتە قوتابخانەی سەربازی مەلەکی و لە ساڵی (١٩٣٦) بە پلەی مولازم دەرچووە. بەشداری شۆڕشی(١٤ی تەمموزی ١٩٥٨)ی کردووە. لەهەمان ڕۆژی شۆڕش بۆتە بەڕێوەبەری گشتی پۆلیس. لە دوای کودەتای (٨ی شوباتی ١٩٦٣) دەبێتە سوپا سالاری عێراق. لە ڕۆژی (٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣) لەلایەن عەبدولسەلام عارف تەکلیف کراوە بە دامەزراندنی حکومەت و تا (١٧ی حوزەیرانی ١٩٦٤) کابینەکەی بەردەوام بوو. بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: جمال صبحي طالب، طاهر يحيى و دوره في التاريخ العراق المعاصر(١٩١٤– ١٩٦٨)، رسالة ماجستير مقدمة الى قسم التاريخ في كلية التربية للبنات في جامعة تكريت، ٢٠١٥، ص٩-٣٩.

٨٢٨ – کەمال مەزهەر، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە ....، بگ١،چ٢ ، ل٣٩٦.

٨٢٩ – مجيد خدوري، م.س، ص٣٥٦– ٣٥٧.

٨٣٠ – محمود الدرة، م.س، ص٣١٥.

831 -Reprise des entretiens entre le gouvernement et les Kurdes, Le Monde, 28 février 1963.

832 - Dana Adams Schmidt, IRAQ PUTTING OFF KURD'S DEMANDS; Delay on Autonomy Move Causes Western Concern Kurdish Chief Impatient Arab Support Pledged, The New York Times, April 14, 1963, p.8.

(١ی ئاداری١٩٦٣) دوا مۆڵەتیان پێدەدا بۆ ڕاگەیاندنی ئۆتۆنۆمی، بە پێچەوانەوە لە ئەگەری جێبەجێنەکردنی داوایەکەی، پەنا بۆ هەڵگیرساندنەوەی شەڕ دەبات[833].

حکومەتی عێراقی پەیامەکەی بارزانی بەهەند وەرگرت و لە ڕۆژی(١ی ئادار) ڕایگەیاند ئامادەیە مافی کورد بدات[834]. لەم سۆنگەوە بەپێی زانیارییەکانی ڕۆژنامەی(لۆمۆند)ی فەرەنسی، لە ڕۆژی (٥ ی ئاداری ١٩٦٣) شاندێک، کە پێکهاتبوون لە تاهیر یەحیای سوپا سالار و بابا عەلی و فوئاد عارف هەردوو وەزیری کورد لە حکومەت و عەلی حەیدەر سلێمان باڵیۆزی عێراق لە واشنتن، لە (چوارقورنە) سەردانی مستەفا بارزانییان کرد[835].

بەپێی زانیارییەکانی (فوئاد عارف) کە یەکێک بووە لە ئەندامانی شاندەکەی حکومەتی عێراقی، (حەیدەر سلێمان) ڕەشنووسی پڕۆژەی حکومەتی عێراقی بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کوردی بۆ بارزانی خوێندەوە، بەڵام بارزانی پڕۆژەکەی ڕەتکردەوە و گوتی خۆمان پڕۆژەی خۆمان هەیە، وە ئێمە لە بنەڕەتدا داوای ئۆتۆنۆمی دەکەین و ئەو داوایەش جێگرەوەی نییە[836]. بۆیە لەسەر ئەم بنەمایە بارزانی یاداشتێکی ئامادەکراوی سەرکردایەتی کورد دەخاتە بەردەم شاندەکەی حکومەت و تێدا داوایکرد دەستبەجێ دانبنێن بە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و دانەیەکی ئەم دانپێدانانە و دەستوری نوێی کۆماری عێراق بنێرنە کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان و لە ئێزگەی بەغدا ڕاییگەیەنن و لەڕۆژنامەی فەرمی بڵاوی بکەنەوە. زیاتر لەوەش لەیاداشتەکەدا بارزانی سنووری جوگرافی ناوچەی ئۆتۆنۆمی دیاریکرد بەشێوەیەک لە باکوور تورکیا و لە ڕۆژهەڵات ئێران و لە ڕۆژئاوا سوریا و لە باشوور تا زنجیرە چیای حەمرین بوو، بەم شێوەیە بارزانی هەموو ویلایەتی کۆنی موسڵ جگە لە ناوەندی شارەکە نەبێ، لەگەڵ سنووری کەرکوک بە کانە نەوتییەکانییەوە خستە ناو جوگرافیای ناوچەی ئۆتۆنۆمی. ئەوە سەرباری ئەوەی

833 -Dana Adams Schmidt, Kurds Threaten To Resume Fight,The New York Times,March 2, 1963,pp.1,2.

834 -Bagdad accorde l'autonomie au Kurdistan irakien, , Le Monde, 12 Mars 1963

835 -Le chef de la rébellion kurde en Irak a reçu les émissaires de Bagdad, Le Monde, 08 Mars 1963؛ Iraq Sends Envoy to Kurds, The New York Times, March 6, 1963, P. 8.

٨٣٦ – مذكرات فؤاد عارف، ص٢٠٠.

داوایکرد زمانی کوردی له ناوچه کوردییه‌کان زمانی ســـه‌ره‌کی و فه‌رمی بێت و له ناوچه‌کانی دیکه‌ی عێراقیشـــدا زمانی دووه‌م بێ. جێگرێکی کوردیش بۆ ســـه‌رۆک کۆماری عێراق دابنرێ و کوردســـتانیش خاوه‌نی هه‌ردوو ئه‌نجومه‌نی یاســـادانان و راپه‌راندنی تایبه‌ت به‌خۆی بێ[٨٣٧].

ســه‌باره‌ت به‌هێزه چه‌کداره‌کانیش بارزانی داوایکرد له‌ناو ســوپای عێراقدا یه‌که‌ی ســه‌ربازی تایبه‌ت بۆ کورد هه‌بێ، به‌راده‌یه‌ک گونجاوبێ له‌گه‌ڵ ژماره و رێژه‌یان له‌م ولاته. هه‌روه‌ها داوایکرد له کوردســتاندا دامه‌زراوه‌ی ســه‌ربازی هاوشــێوه‌ی عێراق دروســـتبکرێ و تا پێکهێنانی ئه‌و هێزانه‌ش، هێزی پێشـــمه‌رگه وه‌ک خۆی له‌ژێر سه‌رپه‌رشتی سه‌رکردایه‌تی کورد بمێنێته‌وه. له کۆتاییش سه‌باره‌ت به داهاتی نه‌وت، داوای پشکی سێ یه‌کی داهاتی نه‌وتی کوردستانی له حکومه‌تی عێراقی کرد[٨٣٨].

ده‌ســـه‌ڵاتدارانی به‌غدا به داواکارییه‌کانی بارزانی رازی نه‌بوون، له‌به‌رئه‌وه‌ی به زیاتر له ئۆتۆنۆمیان بینی. بۆیه شـــاندێکی میللیان[٨٣٩] پێکهێنا و له رۆژانی ( ٧، ٨ی ئـاداری ١٩٦٣) له‌گه‌ڵ بـارزانی کۆبوونه‌وه[٨٤٠]. له کۆبوونه‌وه‌که‌دا بـارزانی پێداگری له‌سه‌ر پرۆژه‌ی ئۆتۆنۆمی کرد و شاندی حکومه‌تیش جه‌ختیان له‌سه‌ر (نامه‌ڵبه‌ندی_ لامه‌رکه‌زی) کرده‌وه. دواجار ئه‌م شـــانده له‌گه‌ڵ بارزانی به‌شـــێوه‌یه‌کی ســـه‌ره‌تایی له‌ســـه‌ر کارگێری نێوخۆیی(الادارة الذاتیة) رێککه‌وتن، تا هه‌ردوو لایه‌ن پرۆژه‌ی رێککه‌وتنه‌که ده‌خه‌نه به‌رده‌م لایه‌نه‌کانی خۆیان و رای خۆیان له‌سه‌ر ده‌رده‌برن[٨٤١].

له‌ســـه‌ر ئه‌م بنه‌مایه حکومه‌تی عێراق له رۆژی (٩ی ئاداری١٩٦٣) به‌یاننامه‌یه‌کی راگه‌یاند تێیدا هاتبوو:"کورد و عه‌ره‌ب به برایه‌تی ژیاون، یه‌ک خاک و یه‌ک باوه‌ر و یه‌ک به‌رژه‌وه‌ندی پێکه‌وه‌ی به‌ندکردون و له ئیمپریالیزم و نۆکه‌ران به‌و لاوه که‌س روونیی ئه‌م برایه‌تییه‌ی لێڵ نه‌کردووه... شۆرشی١٤ ی ره‌مه‌زان[ مه‌به‌ستی کوده‌تای

---

٨٣٧ – محمود الدرة، م.س، ص٣٠٨.

٨٣٨ – عمار علی السمر، م.س،ص٢٦٧.

٨٣٩ – شانده میللیه‌که پێکهاتبوون له (محمد رضا الشبیبي، فائق السامرائي، حسین جمیل، فیصل حبیب الخیزران، د. عبدالعزیز الدوري، زید أحمد عثمان). مسعود البارزاني، البارزاني والحرکة التحرریة الکردیة(ثورة ایلول ١٩٦١–١٩٧٥)، ج٣، ص٨٤.

٨٤٠ – فؤاد عارف، م.س، ص٢٠١.

٨٤١ – سه‌باره‌ت به‌و خاڵانه‌ی شانده میللییه‌که‌ی حکومه‌تی عێراقی له‌گه‌ڵ بارزانی به‌شێوه‌یه‌کی سه‌ره‌تایی له‌سه‌ری رێککه‌وتن، بروانه: محمود الدرة، م.س، ص٣١٣،٣١٠.

٨ی شـــوباتی ١٩٦٣یه] لای وایه هاوکاریی عەرەب و کورد و نەتەوەکانی تر بنەمای یەکێتیی عێراقە... ئەنجومەنی نیشـــتمانیی ســـەرکردایەتیی شـــۆڕش، لەســـەر بنەمای نامەڵبەندی دان بە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورددا دەنێ..."[٨٤٢].

مســـتەفا بـارزانی بڕیـاریـدا ڕای زۆرینەی خەڵکی کوردســـتـان لە ڕێگـای نوێنەرەکانیانەوە لەســـەر ئەم بەیاننامەیە وەربگرێ، لەبەرئەوەی بەیاننامەکە وەک مەسعود بارزانی دەڵێت:"شتێکی ئەوتۆی تێدا نەبوو هیچ کام لە ئامانجەکانی شۆڕشی کـورد بـهێـنێـتەدی"[٨٤٣]. لەم ســـۆنگەوە لە ڕۆژانـی (١٨-٢٢ی ئـاداری ١٩٦٣) کۆبوونەوەیەکی گەورەی ســیاســی لە (کۆیە) ڕێکخســت[٨٤٤]، تێیدا ژمارەیەکی زۆر لە نوینەرانی حزب و لەشـــکر و ســـەرۆک هۆز و پیاو ماقۆلان ئامادەبوون، لەگەڵ (١٦٨)کەســـی دیکە کە نوێنەرایەتی خەڵکی ناوچەکانی باشـــووری کوردســـتانیان دەکرد[٨٤٥]، وێڕای بەشداریکردنی(٦) ئافرەت[٨٤٦].

لەو کۆبوونەوەیە، بڕیاردرا لەســـەر پێکهێنانی لیژنەیەکی دانوســـتکار لە (٧) ئەنـدامی حزب و لیژنەیەکی هـاریکـار لە (٧) ڕاوێژکـار بەســـەرۆکـایەتی جەلال تاڵەبانی[٨٤٧]. شـــاندەکە لە (٣٠ی ئاداری١٩٦٣) گەیشـــتنە بەغدا و لە پێنج ڕۆژی بەردەوام(١-٥ی نیسـانی١٩٦٣)، چەندین کۆبوونەوەیان لەگەڵ شـاندێکی میللی عێراق ئەنجامدا[٨٤٨]. شاندەکە یاداشتێکیان خستەڕوو، تێیدا جەختیان کردەوە لەسەر ئەوەی میللەتی کورد خاوەنی تایبەتمەندی نەتەوەیی خۆیەتی، ئەگەر بڕیاربێ عەرەبەکان لە عێراقدا بچنە نـاو یەکێتی عەرەبی، کە ئەو خواســـت و ئـامـانجەیان لەلایەن گەلی کوردەوە ڕێزلێگیراوە، بەڵام مافی ئەوەشـــیان هەیە شـــوێنی خۆیان لەو هاوکێشـــە ســـیاســـییە نوێیەدا بزانن، لەبەرئەوەی گەلی کورد بەشـــێک نیە لە گەلی عەرەب لە عێراقدا، بەڵکو وەک نەتەوە بەشـــێکە لەوڵاتێک چەندین نەتەوە و ڕەگەزی جیاوازی

---

٨٤٢ – بڕوانە دەقی بەیاننامەکە لە: الجماهیر(جریدة)، ع(١١٨)، ٢٠ حزیران ١٩٦٣، ص٣.

٨٤٣ – بڕوانە: مسعود بارزانی، بارزانی...(شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١-١٩٧٥)، ل١٠٨.

٨٤٤ – فەرهاد عەونی، ڕۆژگارم ئاوا تێپەری(بیرەوەری)،چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٦، ل٧٢.

٨٤٥ – مجید خدوري، م.س، ص٣٥٩.

٨٤٦ – دانا ئادامز شمیدت، س.پ، ل٢٥٧.

٨٤٧ – سەبارەت بە ناوی ئەندامانی شاندی کوردی بۆ بەغدا بڕوانە: عبدالکریم فندي، م.س، ص٥٥.

٨٤٨ – مسعود بارزانی، بارزانی...(شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١-١٩٧٥)، ٢٠٢٠، ل٣١٣.

تێدایە، تەنها عەرەب لەعێراقدا نیە[٨٤٩]. لەسەر ئەم بنەمایە، جەلال تاڵەبانی سەرۆکی شاندی کوردی دانوستکار لەگەڵ حکومەتی عێراقی، سێ بژاردەی خستە بەردەم حکومەتی عێراق، ئەمانیش:

أ)ئەگەر عێراق بەو شێوەی هەیە بەبێ گۆڕانکاری بمێنێتەوە لە قەوارەیەکی سەربەخۆ، داخوازی کورد چڕ دەبێتەوە تەنها لە جێبەجێکردنی راگەیەنراوی کۆماری عێراق، سەبارەت بە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لەسەر بنەمای(لامەرکەزیەت).

ب)ئەگەر عێراق چووە ناو یەکێتی فیدرالی، پێویستە ئۆتۆنۆمی بە کورد بدات بە تێگەیشتنێکی دیار.

ج)ئەگەر عێراق لکێنرا بە وڵاتانی دیکەی عەرەبی بە شێوازێکی تەواو. گەلی کورد لە عێراق دەبێتە خاوەن هەرێمێکی سەربەخۆ، بەڵام دەبەسترێتەوە بە دەوڵەتی عێراق[٨٥٠].

دیارە بەشێکی خەڵک لە عێراق، بەهۆی مەترسییان لەوەی پرۆژەی یەکێتی عەرەبی، کە لە (١٧ی نیسانی١٩٦٣)لە نێوان عێراق و سوریا و میسر ئەنجامدرا[٨٥١]، نەوەک ببێتە هۆکارێک بۆ لەدەستدانی کوردستان، پشتگیریان لەو پرۆژەیە نەکرد. بەو هۆیەوە عەبدولسەلام عارف لە پرۆژەی یەکێتی عەرەبی کشایەوە[٨٥٢]، بەڵام کشانەوەی عێراق لەو پرۆژە نەتەوەییە، کاریگەریی نەرێنی لەسەر پەیوەندییەکانیان هەبوو لەگەڵ سەرکردایەتی کورد. لەئەنجامدا دانوستانەکانی نێوانیان هیچ ئەنجامێکی ئەرێنی بەدەست نەهێنا[٨٥٣].

شکستهێنانی دانوستانەکانی سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراقی، بیانوو بوو بۆ ئەوەی دوایی، تا بەیاننامەکەی ئاداری ١٩٦٣ جێبەجێ نەکات[٨٥٤]، تەنانەت لە (٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣) حکومەتی عێراقی، ساڵح یوسفی(١٩١٨_١٩٨١) و ئەندامەکانی دیکەی شاندی کوردی دەستگیرکرد[٨٥٥]، بەهەمان هۆکار بەپێی زانیارییەکانی

---

٨٤٩ – محمود الدرة، م.س، ص٣١٦.

٨٥٠ – جلال الطالباني، م.س، ص ص ٢٠٧-٢٠٨.

٨٥١ – سەبارەت بە ڕێککەوتننامەی (١٧ی نیسانی ١٩٦٣)، بڕوانە: أمين هويدي، م.س،ص٢٦٥.

٨٥٢ – مجيد خدوري، م.س، ص٢٧٨.

٨٥٣ – مام جەلال، دیداری تەمەن، ل٢٢٢.

854 – Lorenzo Kent Kimball, The changing pattern of political power in Iraq, 1958 to 1971, New York, 1972, pp111, 119.

٨٥٥ – عمار السمر، م.س،ص٢٧٥.

ڕۆژنامەی(نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی، حکومەتی عێراقی لە(١٠ی حوزەیرانی ١٩٦٣) شەڕی لەدژی کورد ڕاگەیاند[٨٥٦]، و لە (١٢ی حوزەیران) بە مەبەستی سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد، لە هەرسێ شاری (هەولێر و سلێمانی و کەرکووک) جوڵەی بە هێزەکانی کرد بە ئاراستەی ناوچەی ڕەواندز[٨٥٧].

ئەم بارودۆخە سەربازییە تا دوورکەوتنەوەی حزبی بەعس لە (١٨ی تشرینی دووەم ١٩٦٣) لەسەر دەسەڵات بەردەوام بوو[٨٥٨]. پاشان حکومەتێکی نوێ پێکهات، بەڵام ئەوانیش لە ڕەگەزەکانی خوازیاری یەکگرتن بوون لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو. لەو کاتەی پرۆسە سەربازییەکانی سوپای عێراقی لەناوچەکانی باشووری کوردستان لە دژی هێزی پێشمەرگە بەردەوام بوو. مستەفا بارزانی ڕێبەری کورد، پاشان سەرۆکی عێراق عەبدولسەلام عارف، بە دوو ڕاگەیەنراو هەریەک لەلای خۆیەوە لە(١٠ی شوباتی ١٩٦٤) بڕیاری ڕاگرتنی شەڕیان دەرکرد[٨٥٩]. وەک سەرەتایەک بۆ چارەسەرێکی دیموکراتی بۆ دۆزی کورد لە عێراقدا. بەڵام سەرەڕای ڕازیبوونی بە ڕاگەیاندنی ئاگربەست، بارزانی لە دیدارێکیدا لەگەڵ ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی، دوو دڵ بوو لەوەی عارف پابەندی ئەو بەڵێنانەبێ کە بەکوردی داوە[٨٦٠]. هەرچەندە وەک دەستپێشخەرییەک بۆ نیشاندانی نیەت پاکی خۆی، (٤٥٠) گیراوی سیاسی کوردی ئازاد کرد[٨٦١].

---

856 – Dana Adams Schmidt, Iraq Resumes War with Kurds; Demands Surrender in 24 Hours, The New York Times, June 11, 1963, P.4.

857 – Dana Adams Schmidt, Iraqi Troops Driving on Kurdish Rebels' Centers, The New York Times, June 13, 1963, P.7

٨٥٨ – أدمون غريب، م.س، ص٨١

٨٥٩ – بۆ بینینی دەقی ڕاگەیەنراوەکانی عەبدولسەلام عارف و مستەفا بارزانی ، بڕوانە: مذكرات صبحي عبدالحميد( العراق في سنوات الستينيات(١٩٦٠–١٩٦٨)، دار بابل للدراسات والاعلام، بغداد،٢٠١٠، ص٢٥٣،٢٥٤.

860 – Iraqi-Kurd Peace Still in Balance; Barzani Says Future Rests on Arif's Promises, The New York Times, March 1, 1964, Page 4.

861 – A Kurdish Leader Maintains Alert; Aide to al-Barzani Criticizes Truce with Iraqi Regime, The New York Times, March 2, 1964, p.4.

دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی کەم، دوو دڵی بارزانی لە پابەندنەبوونی عەبدولسەلام عارف بە بەڵێنەکانی، دروست دەرچوو. دوای ئەوەی بەپێچەوانەی ئەو ڕێکار و هەڵوێستە ئەرێنییانەی بۆ ئاشتی هەبوون، حکومەتی عێراقی لە (١٠ی ئایاری ١٩٦٤) دەستووری کاتی بڵاوکردەوە و جارێکی دیکە لە ماددەی یەکەمی دەستورەکەدا جەختی لەسەر ئەوە کردەوە گەلی عێراق بەشێکن لە گەلی عەرەب[٨٦٢]. لەلای خۆیەوە بارزانی داوای هەموارکردنی ئەو دەقەی کرد، بەشێوەیەک بگونجێ لەگەڵ ئەو ڕاستییەی کە چەند پێکهاتەیەکی جیاوازی نەتەوەیی لەو وڵاتەدا هەن. لەسەر ئەم بنەمایە، بەپێویستی زانی دەقێکی دیکە وەک شوێنگرەوە لە دەستوری کاتی جێگیر بکرێ و ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە: " گەلی عەرەبی لە عێراقدا بەشێکە لە نەتەوەی عەرەبی و ئەو دەستورە بڕیار لەسەر مافی نەتەوەیی گەلی کورد بدات لە چوارچێوەی یەکێتی عێراق"[٨٦٣].

ئەم داواکارییەی بارزانی بەلای حوکمڕانەکانی بەغدا قبوڵکراو نەبوو، بۆیە لە ڕێگای وەزیری ناوەخۆ سوبحی عەبدولحەمید(١٩٢٤_٢٠١٠) ڕایانگەیاند:" ئەو داواکارییە دەرچوونە لە ڕێککەوتنی ئاگربەستی نێوانیان و داوای دامەزراندنی دەوڵەتی کوردییە و بۆنی جوداخوازی لێ دێت"[٨٦٤]. لەلای خۆیەوە سەرۆکی عێراق عەبدولسەلام عارف هەڵوێستێکی توندتری نواند و لە وتارێکدا گوتی:" ئێمە هیچ شتێک لە خاک و نیشتمانمان نادەین و نیشتمانی عەرەب بۆ عەرەب دەمێنێتەوە"[٨٦٥]. لەگەڵ ئەم وتارانە، حکومەت دەستی بە کۆکردنەوە هێزەکانی کرد، بەو هۆیەوە هێزەکانی پێشمەرگە خۆیان بۆ هەموو ئەگەرێکی سەربازی ئامادەکرد. لەبەرئەوەی وەک ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی ( دانا ئادامس شمیدت) لە ڕاپۆرتێکیدا بۆ ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز) ئاماژەی پێکردووە، سەرکردە کوردەکان، پێشبینی ئەوەیان دەکرد

---

٨٦٢ – بڕوانە: الوقائع العراقية(جريدة)، ع(٩٤٩)، ١٠/٥/١٩٦٤.

٨٦٣ – سەبارەت بەتەواوی ئەو خاڵانەی لە یاداشتەکەی بارزانیدا هاتبوون بۆ سەرۆک کۆماری عێراق لە (١١ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٤) بڕوانە: مذكرات صبحي عبدالحميد، ص٢٥٧.

٨٦٤ – م.ن، ص٢٥٨.

٨٦٥ – سەبارەت بە دەقی یەکێک لە نووسراوەکانی حکومەتی عێراقی و وەڵامی بارزانی بۆ سەرۆک وەزیرانی عێراق، بڕوانە: خەبات(جريدة)، ع(٤٧٤)، تشرين الثاني ١٩٦٤، ص١،٢،٨ لە (١١) ژمارەی دەگمەنی ڕۆژنامەی خەبات١٩٦٤-١٩٦٦(ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستانی یە)، ئا: جەمال خەزنەدار، هەولێر، ٢٠١٩،ل٩،١٠،١٦.

حکومەتی عێراقی لە وەرزی بەهار شــەڕ دەســت پێبکاتەوە[866]. پێشــبینییەکانیشــیان دروســت دەرچوو، دوای ئەوەی پڕۆســە ســەربازییەکانی ســوپای عێراقی لە (٢ی نیســانی١٩٦٥) لەدژی هێزی پێشــمەرگەی کوردســتان دەســتپێکردەوە[867]. لە ســاتی بەڕێوەچوونی پڕۆسە سەربازییەکان، لە (٩ی کانونی دووەمی١٩٦٦)، ڕۆژنامەنووس و وێنەگری فەرەنســی ( جان لکود ســویر) دیدارێکی لەگەڵ مەلا مســتەفا بارزانی ئەنجامدا. لەو دیدارەدا بارزانی بە ڕۆژنامەنووســە فەرەنسیەکەی گوت: " ئەوان حەز بەخوێن ڕشــتن ناکەن، بەڵام ئەگەر مرۆڤ لەپێناو ژیاندا بمرێ، من ئەو جۆرە مردنە هەڵدەبژێرم"[868].

تەمەنی حوکمڕانی عەبدولســەلام عارف، هاوشــێوەی حوکمڕانەکانی پێش خۆی کورت بوو، ماوەی ســەرکوتکردنی شــۆڕشــی کوردی بۆ نەهێشــتەوە، چونکە لە ئێوارەی ڕۆژی(١٣ی نیســانی١٩٦٦) لەکاتی گەشــتێکیدا بە فڕۆکەیەکی ســەربازی لەنێوان ناوچەکانی قورنە و بەســرە لە ڕووداوێکی تەمومژاوی کەوتەخوارەوە و گیانی لەدەســتدا[869]. ئەم ڕووداوە دەرفەتێکی دیکەی بۆ کورد و حکومەتی عێراقی ڕەخســاند بۆ ڕاگەیاندنی ئاگربەسـت و گەڕانەوە بۆ سـەر مێزی گفتوگۆ، بارزانی لەو کاتەدا دەســتپێشــخەری ئاگربەســتی بۆ ماوەی یەک مانگ کرد، لە ڕێگای ئەو ڕاگەیەنـدراوەی لە ئێســتگەی دەنگی کوردســتانی عێراق لەدوای دامەزرانـدنی عەبدولڕەحمان عارف لە(١٦ی نیســانی ١٩٦٦) وەک ســەرۆکی نوێی عێراق، بڵاویکردەوە[870].

بە پێچەوانەی هەڵوێســتی ئاشــتیخوازی بارزانی، حکومەت وەڵامێکی توند و خێرای ئەو دەســتپێشــخەرییەی دایەوە، بە ئەنجامدانی هەڵمەتێکی ســەربازی لە(٢٨ی نیســان) تا (١٢ی ئایار١٩٦٥) ، بۆ ســەر ناوچەی پیرمەگرون. بە ئامانجی دەسـتگرتن

866 -Dana Adams Schmidt, Kurds Expect Iraqis to Resume War in Spring, The New York Times, March 8, 1965, p.8.

٨٦٧ – أوريل دان، م.س، ص٤٤٢.

٨٦٨ – از مطبوعات شوروى مسئله كردها در عراق، خواندنيها (مجله)، ش (٥٢)،(١٢مارس١٩٦٦)، ص٨.

٨٦٩ – زينب عبدالحسن الزهيري، عبدالرحمن عارف و دوره السياسي في العراق ١٩٦٦–١٩٦٨، دار أسامة للنشر والتوزيع، عمان– الاردن.٢٠١٢، ص٢٠.

٨٧٠ – بروانه: البرزاني يوقف القتال، العرب(جريدة)، ع(٥٥٣)، ٢٠ نيسان ١٩٦٦، ص١.

بەســـەر شـــاخی پیرمەگرون، بەتایبەتی بارەگای هێزی رزگاری لە گوندی زێوە و پاشـــان هەڵکشـــان بۆ ناوچەی جافایەتی. هەرچەندە حکومەت بۆ ماوەیەکی کاتی کورت دەســـتی بەســـەر زێوەدا گرت، بەڵام هێزەکانی پێشـــمەرگە گەڕاندیانەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. دواجار یەکێک لەشەڕە یەکلاییکەرەوەکان لە مێژووی شۆڕشەکە لە ناوچەی قەرەداغ ڕوویدا، بەهۆی نزیکی گۆرەپانی شـــەڕ لە کەرکوک و بیرە نەوتییەکان. لەڕۆژی (٤ی حوزەیران ١٩٦٥) شـــەڕ دەســـتی پێکرد، بەڵام ســـوپای عێراقی لەم هەوڵەشدا سەرکەوتوو نەبوو. دواجار شـەرێکی یەکلاییکەرەوە لە نێوان پێشـمەرگە و سـوپای عێراقی لەبەرەی رەواندوز ڕوویدا، بارزانی خۆی راسـتەوخۆ سـەرپەرشـتی بەرەی شـەڕی دەکرد و لە ڕۆژی(٢٣ی ئاب) شـەڕ بەسـەرکەوتنێکی گەورەی هێزی پێشمەرگە بەسەر سوپای عێراقی کۆتایی هات[٨٧١].

سـیمون موریس، کە ڕۆژنامەنووسـێکی بریتانی بوو، لەدوای ئەو سـەرکەوتنەی هێزی پێشـــمەرگە بەســـەر ســـوپای عێراقی، چاوی بە مســـتەفا بارزانی کەوت، ئەم ڕۆژنامەنووسە لە بەشێکی ئەو ڕاپۆرتەی ئامادەی کرد دەڵێت:" لەکاتێکدا ئەو دیدارەم لەگەڵ بارزانی کرد، پێشـــمەرگەکانی بەر لەچەند ڕۆژێک گەورەترین ســـەرکەوتنی ســـەربازییان بەدەســـت هێنابوو، بەڵام ئەو شـــانازی بە ســـەرکەوتنەکە نەدەکرد". لەدرێژەی باســـەکەیدا ئەو ڕۆژنامەنووســـە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، بارزانی پێی گوتوە:"کێشـەکان دەبێ چارەسـەر بکرێن بە شـێوەیەکی ئاشـتیانە و شـەڕ دەکەین تا دواسات، تا ئەوەی دەمانەوێ بەدەستی دەهێنین، یان سەردەکەوین یان دەمرین"[٨٧٢].

ئەم هەڵویســـتە نەگۆڕەی بـارزانی، حکومەتی عێراقی بۆ جـارێکی دیکە لە حوزەیرانی ١٩٦٦ ڕاکێشاوە بۆ سەر مێزی گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی کورد[٨٧٣] و بەپێی زانیارییەکانی پەیامنێری ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز) ی ئەمریکی لە بەیروتی پـایتەختی لوبنـان، عەبـدولڕەحمـان بەزازی ســـەرۆک وەزیرانی عێراق لە (٢١ی

---

٨٧١ – مسعود البارزاني، البارزاني ...(ثورة ايلول ١٩٦١-١٩٧٥)، ص ص١٥٩- ١٦٤.

٨٧٢ – اطلاعات(روزنامه)،ش(١١٩٩٣)، ( ١٢ / ژنوی/ ١٩٦٦)، ص١٣،١. شاندەکەی حکومەت کە لەبەغداوە لە (١٥ی حوزەیرانی ١٩٦٦) گەیشتنە گەلاڵە، پێکهاتبوون لە عەمیدی خانەنشین (مەجید عەلی) و (ئەحمەد کەمال) و (ئەکرەم جاف) و (زەید ئەحمەد عوسمان). بڕوانە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی.... (شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١-١٩٧٥)، ٢٠٢٠، ل٣٨٧.

٨٧٣ – بڕوانە: تسوية مشكلة الشمال، العرب(جريدة)، ع(٦٠١)، ١٦ حزيران ١٩٦٦، ص٨،١.

حوزەیرانی١٩٦٦) لەگەڵ مستەفا بارزانی لەسەر ڕاگەیاندنی ئاگربەست گەیشتنە ڕێککەوتن[٨٧٤].

بارزانی هەموو ئەو چەواشەکارییانەی ڕەتکردەوە، کە بە کەسێکی جوداخواز وێنایان کردبوو، ئەو بەحکومەتی عێراقی ڕاگەیاند:" ئەو جوداخواز نییە، ئەوەندە نەبێ داوای تەواوی مافەکانی دەکات و دەیەوێ لەعێراقدا کورد و عەرەب لەژێر حوکمێکی دیموکراسیدا بەیەکەوە بژین"[٨٧٥]. ئەو وتانەی بارزانی وەک (توماس ئاف برادی) لەڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکیدا باسی دەکات، دەرگایەکی نوێی بەڕووی پەیوەندیەکانی نێوان هەردوولا کردەوە[٨٧٦].

دواجار سەرۆک وەزیرانی عێراق عەبدولڕەحمان بەزاز دوای ئازادکردنی ژمارەیەک لە گیراوە سیاسییەکانی کورد[٨٧٧]، لە(٢٩ی حوزەیرانی١٩٦٦) پڕۆژەیەکی سیاسی بۆ بەدیهێنانی ئاشتەوایی و چارەسەرکردنی دۆزی کورد لە عێراقدا لە بەیاننامەیەکی(١٢) خاڵی خستەڕوو[٨٧٨]. دوای ئەو شکستە گەورەی لە ڕووی سەربازییەوە بەرامبەر پێشمەرگە ڕووبەڕووی سوپای عێراقی بویەوە.

ئەو هەنگاوەی سەرۆک وەزیران، پێشەوەچوونێکی ئەرێنی بوو لەپەیوەندیەکانی نێوان کورد و حکومەتی عێراقی بۆ گێڕانەوەی متمانە لە نێوان هەردوولا، هاوکات ئومێدێکی بە مەلا مستەفا و سەرکردایەتی کورد بەخشی بۆ گەیشتن بەمافە

874 –Thomas F. Brady, Kurdish Accord Believed Likely, The New York Times, June 22, 1966, p.14.

٨٧٥ – أبراهيم ألراوي، من الثورة العربية ألى العراق الحديث،ط٢، مطبعة دار الكتب، بيروت، ١٩٧٨، ص٣٧.

876 - Thomas F.Brady, Kurdish Accord Believed Likely; Barzani, Rebel Chief, said to Ease Demands on Iraq, the New York Times, June 22, 1966, p. 14

٨٧٧ – أطلاق سراح معتقلين بسبب قضايا الشمال، الفجر الجديد(جريدة)، ع(١٣٢٥)، ٢٠ حزيران ١٩٦٦، ص١.

٨٧٨ – بروانه: الاستاذ البزاز يتلو بيان الحكومة حول سياستها في شمال الوطن، العرب(جريدة)، ع(٦١٣)، ٣٠ حزيران ١٩٦٦، ص١.

ڕەواکانی گەلی کورد[879]. بەو هۆیەوە بارزانی پێشـــوازی لەو ڕاگەیەنراوە کرد[880]، لەبەرئەوەی باوەڕی بەوە هەبوو، لە ناچاری نەبێت بۆ بەرگری لە خۆکردن، ئەوە بە شەڕ ناتوانێ سەربەخۆیی بەدەستبێنێ و میللەتەکەی زیاتر ماندوو دەکات[881]. بۆیە لە بروســـکەیەکی بۆ ســـەرۆک کۆمار و ســـەرۆک وەزیرانی عێراق، کە دەقەکەی لە ڕۆژنامەی (العرب) بڵاوکراوەتەوە، بارزانی ئاماژەی بۆ ئەوە کرد:" ئەو بەیاننامەی بەڕێز سەرۆک وەزیران ئەمڕۆ ئێوارە سەبارەت بەسیاسەتی حکومەت لە باکووری نیشتمان پێشکەشی کرد و ئەو بەرنامەی لەخۆی گرتبوو، گوزارشتێکی ڕاستگۆیانەیە لە خواسـتی ڕۆڵەکانی گەل بەگشـتی بە عەرەب و کوردەوە بۆ بەدیهێنانی ئاشـتی و برایەتی و گەشـــەســـەندن و یەکێتییەکی نیشـــتمانی. ئێمە پشـــتگیری دڵســـۆزانە لەنـاوەڕۆکی بەیـاننـامەکە دەکەین و لەلای خۆمـانەوە کـاردەکەین بۆ بەدیهێنـانی ئامانجەکانی تێیدا هاتووە"[882].

ئەم دەربڕینەی مســتەفا بارزانی خواســتێکی گشــتی بوو بۆ بەدیهێنانی ئاشــتی، بەڵام پێداگریکردنی بەشـــێک لە ناســـیۆنالیســـتە عەرەبە توندڕەوەکان و هاوکات خواســـتی بەشـــێک لە فەرماندە ســـەربازییە باڵاکانی عێراق بۆ ســـەرکوتکردنی جووڵانەوەی ڕزگـاریـخوازی کـورد[883]، ڕێـگـربـوون لەبەردەم جـێبەجـێـکـردنـی بەیاننامەکەی حکومەتی بەزاز. بەو هۆیەوە جارێکی دیکە لاپەڕەی دۆســـتایەتی و نزیکبوونەوەی نێوان هەردوولا ئـاوەژۆ بوو. دوای ئەوەی لە(٦ی ئـابی١٩٦٦) عەبدولڕەحمان بەزاز دەسـتی لەکارکێشـایەوە[884]، بەر لەوەی دەرفەتی جێبەجێکردنی بەیـاننـامەکەی هەبێ، یەکێـک لە ئەفســـەرەکـانی ســـوپـای عێراقی کە نـاجی تالب(١٩١٧_٢٠١٢) بوو کرایە ســـەرۆک وەزیران. ئەوەی دوایی هەرچەندە ڕایگەیاند

---

879 -Hasan Tevfik Güzel,Kurdish Movement in Iraq during the Cold War and Mullah Mustafa Barzani, HISTORY STUDIES, ISSN: 1309 4173 (Online) 1309-4688 (Print) Volume 10 Issue 4, June 2018, p.131.

٨٨٠ – البارزاني يتجاوب و سياسة الحكومة، العرب(جريدة)، ع(٦١٣)، ٣٠ حزيران ١٩٦٦، ص١.

881 -NA-FCO 51/191, Research Middle East (The Kurdish Problem in Iraq 1963-1971),1971, p.10.

٨٨٢ – بروانە: العرب(جريدة)، ع(٦١٣)، ٣٠ حزيران ١٩٦٦، ص١.

٨٨٣ – أحمد الزيدي، م.س، ص٢٠٢.

٨٨٤ – سيف الدين الدوري، عبدالرحمن البزاز أول رئيس وزراء مدني في العراق الجمهوري، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، ٢٠٠٦، ص٦.

ڕێز لە بەرنامەی کاری حکومەتەکەی پێش خۆی دەگرێ، بەڵام بارزانی باوەڕی پێی نەبوو. وەک پەیامنێری ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز) لە (٢٥ی ئەیلولی ١٩٦٦) لە ڕاپۆرتێکیدا ئاماژەی پێکردووە و دەڵێت:" بارزانی پێی وایە حکومەتی نوێی عێراق، شکستی هێناوە لە جێبەجێکردنی بەرنامەی ئاشتی حکومەتی بەزاز"[٨٨٥].

بەم شێوەیە جارێکی دیکە پەیوەندیەکانی نێوان کورد و دەسەڵاتدارانی بەغدا ئاڵۆز بوو. بۆ چارەسەرکردنی ئەم ئاڵۆزییە سەرۆکی عێراق عەبدولڕەحمان عارف لە (٢٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٦) سەردانی بارزانی کرد[٨٨٦]. ئەمەش یەکەم دیداری سەرۆکی عێراق بوو لەگەڵ بارزانی[٨٨٧]. لەو دیدارەدا عارف بەڵێنی بە بارزانیدا، چەند خاڵێک لە پلانەکەی بەزاز جێبەجێ بکات[٨٨٨]. بەپێی زانیارییەکانی ڕۆژنامەی (داڤار)ی ئیسرائیلی، بارزانی لە کۆبوونەوەکەدا بۆ دڵنیاکردنەوەی عارف لەوەی هیچ خواستێکی بۆ جیابوونەوە نییە، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە ئەو مەبەستی دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ نییە و ئەو سەربەخۆییەی سەرکردایەتی کورد مەبەستییەتی بەدەستی بێنێ، سەربەخۆیی نێوخۆییە لە چوارچێوەی عێراقدا[٨٨٩].

سەرەڕای ئەوەش دانوستانەکان نەگەیشتنە ئەنجام[٨٩٠]، سەبارەت بە هۆکارەکەشی، بارزانی لە دیدارێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی برایی دەڵێ:" نەبوونی شێوازی حوکمڕانی دیموکراتی و درێژەدان بەماوەی گواستنەوە و دوورکەوتنەوەی حوکمڕانی لە میللەت، هۆ سەرەکیەکانی ئەو گیروگرفتانەن"[٨٩١]. بەم جۆرەش

885 - Thomas F. Brady ,Kurds' Mistrust of New Regime Said to Slow Pacification Plan, The New York Times,September 25, 1966,pp20,25.

٨٨٦ – المنار (جريدة)، ع(٣٥٤٥)، ٢٩ تشرين الاول ١٩٦٦، ص١.

887 -Baghdad Says Kurdish Chief Meets With Iraqi President, The New York Times ,October 29, 1966,pp.5,29.

٨٨٨ – أدمون غريب، م.س، ص٩٥.

٨٨٩ – داڤاری ئیسرائیلی (ڕۆژنامە)، ژمارە (١٢٩٢٦)، ٨ی کانونی دووەم ١٩٦٧، ل٨.

٨٩٠ – سەبارەت بە هۆکارەکانی ڕێکنەکەوتنی سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراقی، بڕوانە یاداشتی مەلا مستەفا بارزانی بۆ سەرۆک کۆماری عێراق عەبدولڕەحمان عارف و سەرۆک وەزیران ناجی تاڵیب لەسەر بەیاننامەی(٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦) لە(٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٦) لە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزوتنەوەی... (شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١–١٩٧٥)، ٢٠٢٠، ل٣٩٦–٤٠١.

٨٩١ – بارزانی نەخشە ئەکێشێ بۆ چارەکردنی گیروگرفتەکانی ناوخۆ، برایی(ڕۆژنامە)، ژ(٧٥)، ١٩٦٧/٧/١٥، ل١.

ڕێکنەکەوتنی سەرکردایەتی کورد لەگەڵ حکومەتی عێراقی، بووە هۆکاری ئەوەی بۆ جارێکی دیکە ئاڵۆزی و پەشێوی و هەندێک بەریەککەوتنی سەربازی لەنێوان هەردولا سەرهەڵبداتەوە. ئەم دۆخەش تا کودەتای (تەممووزی١٩٦٨)ی بەعسیەکان لە عێراق بەردەوامی هەبوو[٨٩٢]

## باسی سێیەم: سەردەمی حزبی بەعس (١٩٦٨_ ١٩٧٥)

کودەتای سەربازی (١٧ی تەممووزی ١٩٦٨) لەعێراق، قۆناغێکی دیکەی سەردەمی شەڕ و ئاشتی لەنێوان کورد و حکومەتی نوێی بەعسیەکان هێناکایەوە. حزبی بەعس لە ڕووی تیۆرییەوە بانگەشەی ئەوەی کرد کوردستانی عێراق، بەشی تەواوکەری نیشتمانی عەرەبییە، ئەمەش وەک بنەما سەبارەت بە مافی پێکهاتە نەتەوەییەکان مامەڵەی لەگەڵدا کرا[٨٩٣]. لەگەڵ ئەوەشدا ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆک کۆماری عێراق، لە (٣ی ئابی١٩٦٨) بەناوی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ڕایگەیاند، بەپشت بەستن بە بەیاننامەی (٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦) کە لە(١٢) خاڵ پێکهاتبوو، بڕیاریداوە بەشێوەیەکی ئاشتیانە پرسی کورد لە عێراقدا چارەسەربکات[٨٩٤].

لەلای خۆیەوە مستەفا بارزانی جەختی لەسەر جێبەجێکردنی بەیاننامەی (٢٩ی حوزەیرانی١٩٦٦)ی بەزاز کردەوە، بەبڕوای ئەو، مافە نەتەوایەتییەکانی کورد لەو ڕاگەیەندراوەدا شوێنی بۆ کراوەتەوە ، بۆیە سازشی لەسەر ناکەن[٨٩٥]. بەڵام حکومەتی عێراقی هیچ هەنگاوێک لە جێبەجێکردنی بڕیارەکانی نەچووە پێشەوە، بەو هۆیەوە وەک پەیامنێری ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی لەبەیروت (توماس ئف برادیز) لەڕاپۆرتێکیدا، کە لە (١٨ی ئابی ١٩٦٨) بە پشت بەستن بە چەند سەرچاوەیەکی کوردی ئامادەی کردووە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات پەیوەندیەکانی نێوان حکومەتی عێراقی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بە ڕێبەرایەتی مستەفا بارزانی

---

٨٩٢ – أدمون غريب، م.س، ص٩٥.

٨٩٣ – ديفيد مكدول، م.س،ص٤٨٨.

894 - New Regime In Iraq Backs Kurdish Plan, The New York Times, August 4, 1968,pp.4,24..

895 -- NA, FCO 51/358, Resarch Department Memorandum the Kurdish Problem in Iraq, 1963-1971, 6 December,1971.

لە سەرەتای مانگی ئابەوە تا ڕادەیەکی زۆر ئاڵۆزبوو[896]. بۆیە لە پاییزی هەمان ساڵ شەڕ لەنێوان هەردوولا دەستی پێکردەوە[897].

حکومەتی بەعس بەشـێوەیەکی گشـتی باوەڕی بەدیالۆگ و دانوسـتان نەبوو لەگەڵ کورد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا، باڵێکی سـیاسـی لەنێو حزبەکە هەبوو، دیالۆگی بەتەنها چارەسـەر دەبینی بۆ یەکلایی کردنەوەی پرسـی کورد و بەرقەرارکردنی ئاشتی لە عێراقدا[898]. ئەو باڵە سیاسییە، دوای سەرنەکەوتنی هێزەکانیان لەناوچەکانی باشـووری کوردسـتان لە پێکاندنی ئامانجە سـەربازییەکانی، هەڵوێسـتی بەهێزتربوو لەجاران، بەڵکو تا ڕادەیەکی زۆر توانیان باوەڕ بەسـەرکردایەتی حزبەکەیان بێنن، لەسەر پێویستی ئەنجامدانی دیالۆگ و دانوستان لەگەڵ مستەفا بارزانی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ[899].

لەسـەر ئەم بنەمایە، گفتوگۆیەکانی نێوان سـەرکردایەتی سـیاسـی کورد و حکومەتی عێراقی لە (١٨ی کانونی یەکەمی١٩٦٩) دەسـتیان پێکرد[900]، دواجار سـەدام حوسـێن دوای گەڕانەوەی لە باشـووری کوردسـتان لەبەیانی ڕۆژی(١١ی ئاداری١٩٧٠) ڕایگەیاند:"شـەڕ لەباکووری عێراق کۆتایی هات". پاشـان لەڕاگەیەندراوێکی فەرمی حکومەتی عێراقی، کە لەلایەن ئەحمەد حەسـەن بەکر(١٩٦٨_١٩٧٩) سـەرۆکی عێراق لە کاتژمێر(٧،٣٠)ی ئێوارە لە هەریەک لە ئێزگە و تەلەفزیۆنی بەغدا و ئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراق و ئێزگەی هێزە چەکدارەکان،

---

896 -Thomas F. Bradyspecia,New Rift Reported Between Baghdad and Kurds; Link to Rumors of a Plot to 'Liberate Syria' Seen Nationalist Group Believes Baghdad Marks Time, The New York Times, August 19, 1968,p.3,19

897 - Kimball, op.cit, p. 155.

898 -F.R.U.S, 1969–1976, Volume E–4, Documents on Iran and Iraq, 1969–1972, Iraq's Role in The Problems Of The Middle East, Washington, 1972, p.7.

899 – NA, FCO 51/358,Resarch Department Memorandum The Kurdish Problem In Iraq, 1963-1971, 6 December,1971.

٩٠٠ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد(شۆڕشی ئەیلوول١٩٦١–١٩٧٥)،ل٢٣.

پەخشـــكرا. ســـەرۆكی كۆمار ڕایگەیاند حكومەتی عێراقی لەگەڵ كورد گەیشـــتە ڕێككەوتن[٩٠١].

لە نێوەڕۆكی ئەم وتارە ئەحمەد حەســـەن بەكر دەڵێت:" شـــۆڕش بڕوای بەوە هەیە مـافی نەتەوایەتی لە جەوهەردا مـافێكی دیموكراتیـانەیە، وە زمـان و نەریت و بەكارهێنانی خواسـتی سـەربەسـتانە، بڕوای بەوە هەیە كە چەسـپاندنی ئەم مافانە لە نێوان نەتەوە جیاوازەكاندا بەتایبەتی لەیەک نیشـــتماندا، پێویســـتی بە بوونی ڕێگەی ئاراسـتەكراو هەیە بەرەو ڕێكخسـتنی پەیوەندییەكانی نێوان ئەم نەتەوانە بەو جۆرەی یاریدەی پێشكەوتنی هەموویان بدات"[٩٠٢].

دوای ڕاگەیاندنی بەیاننامەكەی حكومەتی عێراقی، مسـتەفا بارزانی بروسـكەیەكی بۆ ســـەرۆكی كۆمار ئەحمەد حەســـەن بەكر نارد و تێیدا هاتبوو:" لە قوڵایی دڵەوە پیرۆزبایی لە ئێوە و خۆمان و گەلی عێراق ئەكەم بەناوی خۆم و پارتی دیموكراتی كوردســـتـان و كۆمەڵانی گەلی كوردمـانەوە، بە بۆنەی دەرچوونی ئەو بەیـاننـامە مێژووییە، كە شـانازی بەشـداربوونی دانانەیان هەیە و چارەسـەری ئاشـتیخوازانەی دیموكراتیـانەی مەســـەلەی كوردی زامن كرد و بـاوەڕی هێنا بە مـافی نەتەوایەتی ڕاست و ڕەوانی كۆمەڵانی گەلەكەمان بە حوكمی زاتیەوە"[٩٠٣].

ڕۆژنـامەی (الـدســـتور)ی ئوردنی لە بەدواداچوونی بڕگە و مـادەكـانی ئەو ڕێككەوتنـامەیەدا، ئـامـاژەی بە چەند خـاڵێک كرد لە مـانەش، دامەزرانـدنی جێگرێكی كورد بۆ ســەرۆک كۆمار و بەشـداریكردنێكی ڕێژەیی كورد لەپەرلەمان و حكومەتی عێراقی[٩٠٤]. وێڕای ئەوەی چەندین ماف و جیاوگی نەتەوەیی دیكەی بۆ گەلی كورد لەخۆگرتبوو، وەک ڕۆژنامەی (الاهرام)ی میسـری ئاماژەی پێكردووە، ئەم ڕێككەوتنە لەســـەر بنەمای دانپێدانانە بەمافە نەتەوەییەكانی كورد و پێشـــخســـتنی تایبەتمەندییە نەتەوەییەكانیەتی، لەچوارچێوەی یەكێتی گەل و نیشتمان و دەستور[٩٠٥].

---

٩٠١ – الاهرام (جريدة)، ع(٣٠٤٠٧)، ١٩٧٠/٣/١٢، ص١.

٩٠٢ – بۆ دەقی بەیاننامەی (١١ی ئاداری ١٩٧٠)ی سەرۆكی عێراق بڕوانە:بيان تأريخي لمجلس قيادة الثورة، الجمهورية(جريدة)،ع(٧٠٤)، ١٢ أذار ١٩٧٠، ص١،٥.

٩٠٣ – هاوكاری (ڕۆژنامە)، ژ(١٠)، ساڵی (١)، شەممە ٢١ ئاداری ١٩٧٠،ل٢.

٩٠٤ – أنتهت المشكلة الكردية، الدستور(جريدة)، ع(١٠٤٨)، ١٢ أذار ١٩٧٠، ص١.

٩٠٥ – حل المشكلة الكردية، الاهرام (جريدة)، ع(٣٠٤٠٧)، ١٩٧٠/٣/١٢، ص١.

ئەوەی جێگای تێڕامانە لەم ڕێککەوتنە ڕازیبوونی ســـەرکردایەتی کورد بوو بە داواکـاری حکومەتی عێراق بۆ دواخســـتنی ڕاگەیـانـدنی ڕێکەوتنـامەکەی نێوان هەردوولا بۆ ماوەی چوارســـاڵ، تا کۆتایی بەکاری ئەو لیژنانە دێت، کە لە دوای ڕاگەیاندراوێک سـەبارەت بە ڕێکەوتنەکە دەست بەکاردەبن بۆ جێبەجێکردنی بڕگە و مادەکانی ڕێکەوتنەکە، بۆ ســـاخکردنەوەی ســـنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی، دوای ئەنجامدانی ســـەرژمێری لەعێراقدا[٩٠٦]. ئەمەش کاریگەریی نەرێنی لەســـەر ئەنجامی ڕێککەوتنەکەدا هەبوو. چونکە ئەم ڕێککەوتنە دۆزی کوردی لە عێراقدا بە یەکجاری چارەسەر نەکرد[٩٠٧].

ژیدەرێک سـەرباری ئەوەی ئەو ڕێککەوتنە بە سـەرکەوتنێکی سیاسـی مسـتەفا بارزانی دەناسێنی، بەڵام لەهەمان کاتیشدا دیاریکردنی ماوەی چوارساڵ بەهەڵەیەکی ســـیاســـی دەبینێت، چونکە بەبڕوای ئەو لە ڕووی هونەرییەوە دەکرا بەیەک ســـاڵ پڕۆژە یاســـایەک ئامادە بکرێ[٩٠٨]. بەڵام بە بڕوای توێژەر، ســـەرکردایەتی کورد بەهاوبەشـی بڕیاری لەسـەر ئەو پڕۆژە سیاسـییە داوە نەک بارزانی بەتەنها، تەنانەت دکتۆر مەحمود عوســـمان، کە یەکێک بوو لە ئەندامانی دانوســـتکاری کورد لەگەڵ حکومەتی عێراقدا، ڕوونیکردەوە، کە سەرکردایەتی کورد لەکاتی دانوستانەکاندا داوای دەســـتبەجێ دەرکردنی یاســـای ئۆتۆنۆمی کرد، بەڵام لەبەرامبەردا حکومەتی عێراقی داوای هەشـت سـاڵ مۆڵەتیکرد بۆ دەرکردنی یاسـایەکە، تا دەرفەت هەبێ لەبەردەم لیژنەکانی پەیوەندیدار بە پڕۆژە یاسایەکە، کاروبارەکانیان تەواو بکەن، بۆیە هەردوولا وەک چارەســەرێکی مام ناوەندی، بڕیاریاندا دەرفەتی چوار ســـاڵ بە لیژنەکان بدەن، ئینجا پڕۆژە یاسای ئۆتۆنۆمی ڕابگەیەنن[٩٠٩].

بەو هۆیەوە چارەســـەری کۆتایی دۆزی کورد بەهەڵپەسـێردراوی مایەوە، چوار ساڵیش دەرفەتدان بۆ جێبەجێکردنی ڕێککەوتنەکە، مۆڵەتێکی درێژ بوو بۆ حکومەتێک،

---

906 -NA, FCO 51/191, Research Middle East (The Kurdish Problem in Iraq 1963-1971),1971, p.16.

٩٠٧ – سەبارەت بەو کێشانەی بەهەڵپەسێردراوی مانەوە لە ڕێککەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠، بڕوانە: کریس کوتشیرا، م.س، ص٢٣–٣٣.

٩٠٨ – دینیس کوماروف، م.س، ص٧٤.

٩٠٩ – مەحمود عوسمان (دیدار)، هەولێر، ١٢ی شوباتی ٢٠٢٣.

کە بارزانی لە بنجدا باوەڕی بە بەڵێنەکانیان نەبوو[٩١٠]. ئەوەش دوای ساڵێک بەدیارکەوت، بەهۆی پاشگەزبوونەی حکومەت لەو هەنگاوە سیاسییەی بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد هەڵیهێنابوو[٩١١]، هەرچەندە بڕیاری لێبوردنی گشتیان بۆ گیراوە سیاسیەکان دەرکرد و پێنچ وەزیری کوردیان لە کابینەیەکی نوێی حکومەتدا دامەزراند و لەبوارەکانی کولتوور و پەروەردەدا چەند کارێکیان ئەنجامدا[٩١٢]، بەڵام کێشەی دامەزراندنی کوردێک وەکو جێگری سەرۆک کۆمار[٩١٣] و هەروەها دروستکردنی ئەنجومەنێکی نیشتمانی تا ساڵی ١٩٧١ چارەسەر نەکرا[٩١٤]. ئەوە سەرەڕای مانەوەی کێشەی ئەنجامدانی سەرژمێری و دیاریکردنی سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی[٩١٥] بەهەڵپەسێردراوی[٩١٦].

بەپێی زانیارییەکانی گۆڤاری(الصیاد)ی عێراقی، مستەفا بارزانی ئەنجامدانی سەرژمێری لەناوچەکانی سنووری ئۆتۆنۆمی ڕەتکردۆتەوە، کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ئاداری ١٩٧٠ئەنجام بدرێ، بەهۆی گۆڕینی دیموگرافیای ناوچە کوردییەکان، کە لەئەنجامی پرۆسەی بەعەرەبکردن لەساڵی(١٩٦٣) بەدواوە گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتبوو، بارزانی دەیگوت تاوەکو دۆخەکە نەگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی و عەرەبە هاوردەکان نەگەڕێنرێنەوە بۆ

---

٩١٠ – بڕوانە: نامەی سەدام حوسێن بۆ مستەفا بارزانی لە (١ی ئابی ١٩٧٠) لە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی... (شۆرشی ئەیلوول ١٩٦١–١٩٧٥)، ٢٠٢٠، ل٤٥٣.

911 - F.R.U.S, 1969–1976, Volume E–4, Documents on Iran and Iraq, 1969–1972, Iraq's Role in The Problems Of The Middle East, Washington,1972,p.7.

٩١٢ – خطوات تنفيذ اتفاق بغداد، الاهرام(جريدة)، ع(٣٠٤٠٩)، ١٩٧٠/٣/١٤، ص١.

٩١٣ – کاندیدی مستەفا بارزانی بۆ پۆستی جێگری سەرۆک کۆمار (حەبیب محەمەد کەریم) بوو، کە کوردێکی فەیلی بوو، بەڵام حکومەتی عێراقی ڕەتیکردەوە، لەبەرئەوەی پێی وابوو پەیوەندی لەگەڵ ئێران هەیە. الصیاد(مجلة)، ع(١٥٤٠)، ٢٢–٢٩ أذار ١٩٧٤، ص١٦.

914 -NA-FCO 51/358, Research Department Memorandum the Kurdish Problem in Iraq, 1963-1971, 6 December,1971.

٩١٥ – کێشەی سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی لەسەر کەرکوک بوو لە نێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراقی، کە ئایا کەرکوک دەکەوێتە نێو سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی یان نا. بڕوانە: م.ن، ص١٦،

916 -NA-FCO 51/358,Resarch Department Memorandum The Kurdish Problem In Iraq, 1963-1971, 6 December,1971.

ناوچەکانی خۆیان و دانیشتوانی کوردیش نەگەڕێنرێنەوە سەر زەوییەکانی خۆیان، نابێ سەرژمێری بکرێ[917].

دەسەڵاتدارانی حزبی بەعس بۆ خۆڕزگارکردن لەم دۆخە و پابەندییە سیاسییەکانی هەیانبوو، لە ئێوارەی ڕۆژی چوارشەممەی (٢٩ی ئەیلولی ١٩٧١) پەنایان بۆ هەوڵی تیرۆرکردنی مستەفا بارزانی برد[918]، لەبەرئەوەی باوەڕیان وابوو، پرسی کورد لە عێراقدا، بەنەمانی ئەو ڕێبەرە کۆتایی پی دێت، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون لە هەوڵەکەیاندا[919].

ئەو سستی نواندنەی حکومەتی عێراقی لە جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠، لە کاتێکدا خەریکی پلانێکی سیاسی نەتەوەیی بوون بۆ دروستکردنی قەوارەیەکی عەرەبی یەکگرتوو لەگەڵ هەریەک لەوڵاتانی میسر و سوریا، بووە هۆی ئەوەی بارزانی هۆشدارییەکی توند بداتە دەسەڵاتدارانی عێراق، کە لە ئەگەری سەرگرتنی ئەو ئامانجەی حزبی بەعس کاری بۆ دەکات، کوردەکان ڕاستەوخۆ خودموختاری ڕادەگەیەنن[920].

حکومەتی عێراقی لەپێناو زاڵبوون بەسەر پرۆژە نەتەوەییەکەی مستەفا بارزانی، لە(ئاداری ١٩٧٢) پرۆژەیەکی بەناونیشانی (بەرەی نیشتمانی) خستە بەردەم سەرکردایەتی کورد. بۆ ئەوەی هەر سێ پارتی سیاسی(حزبی بەعسی عەرەبی و پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی شیوعی عێراقی) بەیەکەوە حکومەتێکی نیشتمانی پێکبهێنن بەسەرکردایەتی حزبی بەعس[921]. بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش، شاندێکی دیپلۆماتکارانی سۆڤیەت لە( ٢٨ی شوباتی١٩٧٢) سەردانی بارەگای

---

٩١٧ – الصياد(مجلة)، ع(١٥٤٠)، ٢٢-٢٩ آذار ١٩٧٤، ص١٦.

٩١٨ – بۆ ووردەکاری ڕووداوی هەوڵی تیرۆرکردنی مستەفا بارزانی بڕوانە: برایەتی (ڕۆژنامە)، ژ(٥)، ١٩٧١/١٠/٧، ل١؛ الاهرام (جريدة)، ع(٢٠٩٧٨)،١٩٧١/١٠/٤، ص٩،١ .

٩١٩ – به دستور ملا مصطفى در نزيكى او ٥٠ نارنجك منفجر كردند، اطلاعات (روزنامه)، ش(١٣٦١٢)،(٢ اكتبر ١٩٧١)،ص١.

٩٢٠ – بروانە: ملا مصطفى خواستار خودموختاری فوری شد، اطلاعات(روزنامه)، ش(١٣٧٥٧)، (٢٨ مارس ١٩٧٢) ، ص٢.

921 - **F.R.U.S**, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc- 299). Memorandum from the Chief of the Near East and South Asia Division of the Central Intelligence Agency (Waller) to the Assistant Secretary of State for Near Eastern and South Asian Affairs, Washington, March 9, 1972, p.2.

بارزانییان کرد[922]. بەڵام بارزانی ئەم پرۆژەی قبوڵنەکرد[923]. هۆکاری قبوڵنەکردنی پرۆژەکەشی بۆ ئەزموونی سەرنەکەوتووی کورد گەڕاندەوە لەگەڵ حزبی بەعس، باشترین بەڵگەشی وەک خۆی باسیکرد، هەوڵی پوچەڵی تیرۆرکردنی بوو، کە لەلایەن بەعسییەکانەوە لە (ئەیلولی ١٩٧١) لە بەرامبەری ئەنجامدرا[924]. بێگومان ئەم هەڵویستەی بارزانی، کاریگەریی هەبوو لەسەر گۆڕانی هەڵویستی حزبی بەعس لە ڕێککەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠. دواجار ئەم دوورکەوتنەوەیەی لە نێوان پارتی و حزبی بەعس دروستبوو، بووە هۆی ئەوەی حکومەتی عێراقی بێ گوێدانە ئەم داخوازیانەی هەبوون، لە(١١ی ئاداری ١٩٧٤) بەبێ گەڕانەوە بۆ سەرکردایەتی کورد، یاسای ژمارە (٣٣) ی ئۆتۆنۆمی ڕابگەیەنێ[925]، دوای ئەم هەنگاوە سیاسیەش ڕۆژنامەی (النهار)ی لوبنانی لەسەر زاری بەرپرسانی عێراقدا بڵاویکردەوە کە:"باکوور[مەبەستی باشووری کوردستانە] گەڕایەوە بۆ باوەشی نیشتمان و هەر کارێک پێچەوانەی یاسا و ڕژێم ئەنجام بدرێ، سەرپێچیکردنە لەسەر نیشتمان"[926].

ئەو هەڵویستەی حکومەتی عێراقی لەلایەن بارزانی و سەرکردایەتی کورد و بنکە جەماوەرییەکەی، وەک پێشتر ئاماژەمان پێکردووە ڕەتکرایەوە، دواجار بارزانی

922- **F.R.U.S**, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, 301. Memorandum from Harold Saunders of the National Security Council Staff to the President's Deputy Assistant for National Security Affairs, Washington, March 27, 1972, p.5 سەبارەت بە سەردانی شاندی سۆڤیەتی بۆ لای بارزانی بڕوانە: پاشکۆی ژمارە (١٨)

923 - **F.R.U.S**, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc- 299). Memorandum from the Chief of the Near East and South Asia Division of the Central Intelligence Agency (Waller) to the Assistant Secretary of State for Near Eastern and South Asian Affairs, Washington, March 9, 1972, p.2.

924 -**F.R.U. S**, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, 303. Memorandum from the Director of Central Intelligence (Helms) to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Secretary of State Rogers, and Secretary of Defense Laird, Washington, March 31, 1972, p.2. بڕوانە پاشکۆی ژمارە(١٩).

٩٢٥ – الجمهورية العراقية، منشورات وزارة الاعلام، قانون الحكم الذاتي لمنطقة كردستان، السلسلة الوثائقية(٣٣)، ١٩٧٤، قانون رقم (٣٣) لسنة ١٩٧٤، ص٨–٢٣.

٩٢٦ – بغداد ستوجه ضربة صاعقة الى الاكراد أذا رفضوا قانون الحكم الذاتي، النهار (جريده)، ١٩٧٤/٣/١٨، ص١٤.

سەرکردایەتی دوا قۆناغی شۆڕشی کوردی کرد [٩٢٧]. تا لەکۆتاییدا بە سازشکردنی حکومەتی عێراقی لەسەر بەشێک لەخاکەکەی بۆ بەرژەوەندی ئێران لە ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە (٦ی ئاداری١٩٧٥)، شۆڕشی کورد کۆتایی هات[٩٢٨]، چونکە ئێران بەهۆی ئەو ڕێککەوتنەی ئەنجامیدا، سنوورەکانی بەڕووی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان داخست[٩٢٩].

## تەوەری دووەم: سیاسەتی دووبەرەکی نانەوە

دروستکردنی دووبەرەکی و ئاژاوە لە چوارچێوەی پیادەکردنی سیاسەتی پەرتکە و زاڵبە، یەکێک بووە لەو ڕێکارانەی لە ئاست و بواری جیاواز لە لایەن حکومەتە عێراقییەکان پیادە کراوە، بە ئامانجی لاوازکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد. مستەفا بارزانی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دۆخە، هەڵوێست و دیدی سیاسی و کۆمەڵایەتی تایبەت بەخۆی هەبووە، وەک لە خوارەوە دەیخەینەڕوو:

### باسی یەکەم: دوو بەرەکی لە نێوان کورد و عەرەب

لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتی عێراق، کورد و عەرەب بەیەکەوە ژیاون[٩٣٠]. هەندێ لە حکومەتەکانی حوکمرانی ئەم دەوڵەتەیان کردووە، بە ئامانجی لاوازکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد، کاریان لەسەر لێکدابڕاندنی ئەم دوو نەتەوە کردووە. یەکێک لەو ڕێکارانەی بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش پیادەیان کردووە، بریتی بووە لە وێناکردنی شۆڕشەکانی کورد وەک یاخیبوون و هەڵگەڕانەوە لە دەوڵەت، لەبەرچاوی کۆمەڵگەی عێراقیدا[٩٣١]. بەڵام مستەفا بارزانی لە پێناو نیشاندانی ڕووی ڕاستەقینەی بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد، کاریکردووە بۆ ڕوونکردنەوەی خواستەکانی لەو ڕاپەڕین و شۆڕشەی لە باشووری کوردستان هەڵیگیرساندوە، بۆ جیاکردنەوەی عەرەب وەک گەل و نەتەوە، لە کێشە و گرفتە سیاسییەکانی نێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتە عێراقییەکان. لەو سۆنگەوە لە دیدارێکی ڕۆژنامەوانی، باس

---

927-Michael M. Gunter, the Kurds of Iraq …, p.18.
928 - Eric Pace, op.cit, p.1.
٩٢٩ – وأخيرا أتفق العراق و أيران، الرأي (جريدة)، ع(١٢٩٧)، ٧ أذار ١٩٧٥، ص١.
٩٣٠ – عقاب يحيى، العراق في زمن الاستثناء، دار الكتاب العربي، الجزائر، ١٩٩٩، ص١٢٤.
٩٣١ – بروانە: عبدالكريم فندي، م.س، ص٥٧.

لەهۆکارەکانی سـەرهەڵدانی ڕاپەڕینی دووەمی بارزان دەکات و دەڵێت:" تێکۆشـانمان پارچەیەک بوو لە تێکۆشـانی گەلی عێراق بە هەردوو نەتەوەکەیەوە(کورد و عەرەب) لە ڕێگای ڕزگاری و دیموکراتیدا... من شـەڕ لەگەڵ گەلی عێراق ناکەم، کە من یەکێکم لەو گەلە، بەڵام شەڕم لەگەڵ ئیمپریالیست و کۆنەپەرستیی زۆردار کردووە" [٩٣٢].

لە بەردەوامی ئەو هەڵوێسـتەدا، مسـتەفا بارزانی ئەو کاتەی لە یەکێتی سـۆڤیەت ژیاوە، بە ناردنی پەیامی سیاسی بۆ ناوەخۆی عێراق، هەوڵیداوە سوود لە پەیوەندی برایانەی نێوان کورد و عەرەب وەربگرێ بۆ ڕزگارکردنی ئەم وڵاتە لە پاشـــکۆیەتی ئیمپریالیزم. ئەم ئامانجەشـــی لە وتارێک خســـتەڕوو، کاتێک دەڵێت:"من بانگەواز بۆ گەلی عەرەب و کورد دەکەم، یەکبگرن و کۆششەکانیان یەکبخەن لە خەباتی هاوبەش بۆ ڕزگاری" [٩٣٣]. ئەوە سەرباری ئەوەی لە قۆناغە بەراییەکانی ژیانی سیاسی خۆیدا، بارزانی بەردەوام جەختی لەسەر بنەماکانی پێکەوە ژیان کردۆتەوە. لەو ڕێگەیەوە بۆ یەکەمجـار لە مێژووی خەبـاتی نیشـــتمـانی کوردی، ڕێبـازێکی گشـــتگیری بۆ خزمەتکردنی ئامانجی هەردوو گەلی عەرەب و کورد دانا و لەیەک کاتیشـــدا دژایەتی جیابوونەوە و بەستنەوەی بە زۆرە ملێی کرد. ئەمەشی بە پەیامی سیاسی لە ساڵی (١٩٥٧) لە ڕێگای ڕۆژنامەی (خەباتی کوردستان) خستەڕوو، کاتێک گوتی:" من ئەم بانگەم بۆ هەردوو گەلی کورد و عەرەبە، بۆ ئەوەی شـان بە شـانی یەک بوەسـتن و کۆشـــشـــیان یەکبخەن و لەخەباتی یەکگرتوودا بۆ بەرهەڵســـتیی دوژمنی هەردوولا، ئیمپریالیزم و نۆکەرانی تاوەکو هەر گەلە لە نیشـــتمانیی خۆیدا بە ســـەربەســـتی و ئازادی و بەختیاری بژیەت" [٩٣٤].

ئەو هەڵوێســـت و تێڕوانینەی بارزانی بۆ یەکگرتن و یەکبوون، لە دیدی گەلانی عێراق بەهەموو پێکهـاتەکـانییەوە، لە کـاتی گەڕانەوەی لەیەکێتی ســـۆڤیەتەوە، وەڵامدانەوەی ئەرێنی هەبوو. کاتێک لە کەرنەڤاڵێکی جەماوەری لە بەغدا بەدروشمی:( بارزاني أهلا بيك...شـــعب العراق يحييك) پێشـــوازییان لێکرد [٩٣٥]. ئەمەش لەدیدی نوێنەرانی دیبلۆماســی وڵاتێکی وەک بەریتانیا لە عێراقدا پێشــوەچونێکی باش بوو لە

---

٩٣٢ - گفتوگۆی تێکۆشەر مستەفا بارزانی، ژین(ڕۆژنامە)، ژ(١٥٠٧)، ١٩٦٠/٢/١، ل١٠٦.

٩٣٣ - عهد و ميثاق، رزگاری(جريدة)، ع(١٧ و ١٨)، كانون ٢ و شباط ١٩٤٨، ص١.

٩٣٤ - بڕوانە: خەباتی کوردستان(ڕۆژنامە)، ساڵی ١، ژ(٣)، مایسی ١٩٥٧، ل١.

٩٣٥ - مسعود البارزاني، البارزاني ...(الكرد و ثورة ١٤ تموز١٩٥٨)...، ص٥٨.

پەیوەندییەکانی کورد و عەرەب لەم وڵاتەدا، بەتایبەتی دوای ئەوەی مســـتەفا بارزانی دروشـــمی (برایەتی کورد و عەرەب)ی بەرزکردووە[٩٣٦]. بەو هۆیەوە وەک یەکێک لە سەرچاوەکان ئاماژەی پێدەکات، مەلا مستەفا لەو کاتەدا لەدوای عەبدولکەریم قاسمی سەرۆک وەزیران، وەک دووەم کەسایەتی بەهێزی سیاسی لە عێراقدا دەرکەوت[٩٣٧].

ئەم نزیکبوونەوەی بارزانی لە عەبدولکەریم قاسـم، هاندەربوو بۆ ئەوەی بارزانی پشتیوانی و پارێزگاری لە رژێمی نوێی عیراق بکات. لەسەر ئەم بنەمایە، دوای ئەوەی لە رۆژی(٨ی ئاداری ١٩٥٩) بزووتنەوەیەکی سەربازی لە دژی قاسم بە پێشەوایەتی عەبدولوەهاب شـــەواف بڕیاردەری شـــاری موســـڵ ئەنجامدرا. بەپێی زانیارییەکانی ژێدەرێک بنکە جەماوەری و حیزبی و تەنانەت مســـتەفا بارزانی خۆشـــی، لەبەرەی بەرگریکارانی دەســـەڵات وەســـتان، لە بەرامبەر جوڵانەوەکە. ئەمەش هۆکارێکی کاریگەربوو لە ســـەرکوتکردنی بزووتنەوەی ســـەربازییەکەی شـــەواف لە عێراق. بەشـــێوەیەک ئەو ژێدەرە باس لەوە دەکات نزیکەی پێنچ هەزار چەکداری کورد بۆ پاڵپشـــتی لە کۆمار و قاســـم وەدەرکەوتن. چونکە ســـەرکەوتن بەســـەر قاســـم لە بەرژەوەندی کورد و عەرەبیشـــدا نەبوو. بۆیە جەماوەری کورد بەرگرییان لە قاســـم کرد، بگرە ئەفســـەران و ســـەربازانی کورد ڕۆڵیان لە دامرکاندنەوەی جوڵانەوەکەدا هەبوو[٩٣٨]. ژێدەرێکی دیکە ســـەرباری ئەوەی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، لەم دۆخەدا بارزانی و پارتی و گەلی کورد لەگەڵ قاســـم بوون و لە بەرژەوەندی کورد و گەلی عێراق نەبوو عەبدولکەریم قاسـم لەناوبچێ و بەرگرییان لە قاسـم و شـۆڕشـی ١٤ی تەمموز کرد. بەڵام ئەو ڕووداوانەی دوای لەناوچوونی جووڵانەوەی شەواف لەسەر دەســـتی لایەنگرانی قاســـم لە موســـڵ ڕوویاندا، هەرگیز بە ئاگاداری هەموو ســـەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردســـتان نەبوو، تەنانەت بارزانی بەتوندی سەرکۆنەی ئەو تاوانانەی کرد، کە لەموسڵ ئەنجام دران[٩٣٩].

دۆسـتایەتی بارزانی و قاسـم بەو شـێوەیە بەردەوام نەبوو، بەڵکو خۆدزینەوە لە جێبەجێکردنی مـاددەی (٣)ی دەســـتووری کـاتی عێراق(١٩٥٨) لەلایەن حکومەتی

---

٩٣٦ – بروانە: کەمال مەزهەر، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە...،ب٢، ل٤٩١.

٩٣٧ – بروانە:فاضل البراک، مصطفى البارزاني الاسطورة والحقيقة، بغداد، ١٩٨٩،ص١٥٧.

٩٣٨-د. عبدولخالق ناسر ئەلعامری، س.پ، ل١٨٦.

٩٣٩ – مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية(الكرد و ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨)/ ١٤ تموز ١٩٥٨– ١١ ايلول ١٩٦١ ، ج٢، ط٢، كاوا للثقافة الكردية، بيروت، ١٩٩٧، ص٨٩.

عێراقی، کە جەختی لەســـەر هـاوبەشـــی کورد و عەرەب دەکردەوە، کـاریگەری ڕاســتەوخۆی لەســەر گۆڕانی هەڵوێســتی مســتەفا بارزانی بەرامبەر دەســەڵاتدارانی بەغدا دروستکرد، دوای ئەوەی هەوڵەکانی بارزانی بۆ ئاشتی و سەقامگیری سەری نەگرت، بەو هۆیەوە لە ئەیلولی ١٩٦١ شــۆڕشــێکی دیکەی کوردی لە باشــووری کوردستان هەڵگیرسا[٩٤٠].

حکومەتی عێراقی هەوڵیداوە شـۆڕشـی کورد بە هەوڵێک بۆ جیابوونەوە لەدیدی عەرەب لە عێراقدا وێنا بکات. مســـتەفا بارزانی لەپێناو ڕوونکردنەوەی ئامانجەکانی شۆڕشی کورد دەڵێت:"ئەو بەندوباوەی بڵاوئەکرێتەوە دەربارەی بوونی بیروباوەری جیابوونەوە لە ڕیزی بزووتنەوە نیشـــتمانیەکەماندا، درۆ و دەلەســـەی ئیمپریالیزم و حکومەتە کۆنەپەرستەکانە، بەو نیازە هەڵی دەبەستن، عەرەب بە خەباتی گەلی کورد بترســـێنن. ئەو خەباتەی کە لەپێناوی مافە نەتەوایەتییە ڕەواکانی خۆیا درێژەی پێ ئەدا. ئەوەش تا عەرەب بەرهەڵســـتی هێنانەدی ئەم مافانەی کورد بکەن و کوردیش لەعەرەب زوێربن و بکەونە شـــکەوە لە نیازی عەرەب، بۆ ئەوەی برایەتی کورد و عەرەب و یەکێتی ڕاســتەقینەی عێراق بێ هێز بکەن، چونکە ئەمانە کۆسـپ و ڕێگری سەرکەوتنی پیلانەکانی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستانن"[٩٤١]. بەم شێوەیە بارزانی کرۆکی سیاسەتی دژایەتیکردنی پرسی نەتەوەیی کوردی ئاشکرا کرد، بۆ وشیارکردنەوەی عەرەب لەو پیلانانەی لە ئارادابوون بۆ لەباربردنی یەکریزی گەلانی عێراق، بە مەرام و ئامانجێکی سیاسی، دژ بە بەرژەوەندییەکانی کورد و عەرەب بەیەکەوە لە عێراقدا.

مستەفا بارزانی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو چەواشەکارییانەی حکومەتی عێراق دروســـتی دەکردن بۆ جیاکردنەوەی کورد و عەرەب لە یەکتری بە ئامانج و مەرامی سیاسی لە پێناو لاوازکردنی شۆڕشی کورد، بە ڕێکار و شێوازی سیاسی جیا جیا، بەردەوام کاری لەســـەر پاراســـتنی یەکڕیزی کورد و عەرەب کردووە، باشـــترین بژاردەشی هەمیشە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی نێو خۆیی و دەرەکی بووە. لەو سۆنگەوە ســـوود لە دیدارێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی لە ســـاڵی (١٩٦٢)

---

٩٤٠ – بروانە: بيان البارزاني الى الشعب العراقي الكريم بمناسبة مرور عام على الثورة الوطنية في كردستان، خەبات(جريدة)، ع(٤٦٧)، أوائل أيلول ١٩٦٣، ص١.

٩٤١ – کوردستان(ڕۆژنامە)، ژ(١)، ١٩٦١/٣/٤، ل٥. وەرگیراوە لە:کوردستان ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەیە، کاری هاوبەش، ئامادەکردن و پێشەکی: پ.د. هیمداد حوسێن ، لێکۆڵینەوە: نەوزاد عەلی ئەحمەد،چاپخانەی پیرەمێرد، ٢٠١٩. ل٢٩.

وەردەگرێ و دەڵێت:" ئەو دیدارە بەدەرفەت دەزانم ڕوونکردنەوەیەک بۆ برا عەرەبەکانمان بدەم لە عێراق و پێیان بڵێم، ئێمە دوژمنی ئەوان نین، وە شۆڕشی ئێمە دژی ئەوان نییە، بەڵکو دژی دوژمنی هاوبەشمانە، دکتاتۆری عێراق عەبدولکەریم قاسمە، ئەو داواکاریانەی داوامان کردووە، بەگشتی عێراقییە، کە بەرژەوەندی عەرەبی زیاتر لە کورد تێدایە"[٩٤٢].

مستەفا بارزانی لەڕێگای ئەو پەیامە سیاسییانەی لەپێناو پاراستنی یەکڕیزی و برایەتی کورد و عەرەب دووپاتی دەکردنەوە، توانی جۆرێک لە تێگەیشتن دروست بکات لەگەڵ بەشێک لە هۆزە عەرەبییەکانی ناوچەکانیان کەوتبوونە نزیک ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگە، بەتایبەتی گەورە هۆزێکی عەرەبی وەک (هۆزی شەممەر) ، ئەو تێڕوانینەشمان لە یاداشتی بەڕێوەبەری دەزگای هەواڵگری سەربازی حکومەتی عێراقی لەسەردەمی عەبدولکەریم قاسم بەدیکرد، کاتێک باس لەوە دەکات لەساڵی ١٩٦٢ سەرۆک وەزیران ڕایسپاردووە بڕێک پارە بۆ (شێخ مەشعان)ی گەورە شێخی هۆزەکە ببات وەک قەرەبووی ئەو زیانانەی هۆزەکەیان لەئەنجامی چالاکییە سەربازییەکانی مستەفا بارزانی بەریانکەوتووە، بەڵام شێخی شممەر پارەکە ڕەت دەکاتەوە و وەریناگرێت[٩٤٣]. پێدەچێ ئەم هەڵوێستەی شێخی هۆزی شەمەر وەڵامدانەوەی ئەو پەیام و هەڵویستە دۆستانەی مستەفا بارزانی بوو، کە هەر لەسەردەمی ئاوارەیی و دوورخراوەیی لەساڵی ١٩٣٤ لەگەڵ هۆزەکەیدا لە موسڵ دروستیکرد بوو.

مستەفا بارزانی بەردەوام ڕوونکردنەوەی پێویستی بە گەلی عەرەب لەعێراق داوە، بۆ سەلماندی ئەو ڕاستییانەی پەیوەندییان هەبوو بە هۆکارەکانی هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە باشووری کوردستان دژی حکومەتی عێراقی، لەم سۆنگەوە لە ساڵیادی شۆڕشی ئەیلول، جارێکی دیکە لە (٦ی ئەیلولی١٩٦٣)، بارزانی ڕوویکردە گەلی عەرەب و لە ڕاگەیەنراوێکدا گوتی:" خەباتی چەکدارییمان لە پێناو عێراقێکی سەربەخۆی دیموکراتی و ڕژێمێکی پەرلەمانی تەندروستە، هەروەها خەباتە لە پێناو

---

٩٤٢ - تصريحات سيادة البارزاني الى مراسل جريدة (نيويورك تايمز) الامريكية، خبات(جريدة)، ع(٤٦٨)، تشرين الاول ١٩٦٢،ص١.

٩٤٣ - (أنا والزعيم)، مذكرات العقيد محسن الرفيعي مدير الاستخبارات العسكرية في عهد الزعيم عبدالكريم قاسم، أعداد و تحرير:د. ستار جبار الجابري، بغداد، ٢٠١٠، ص٨٤

داواکاری دیموکراتی بۆ گەلی عێراق بەگشـــتی وە بەدەســـتهێنانی ئۆتۆنۆمییە لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا، کە تەنها یەکریزی و برایەتی ڕاســـتگۆیانە لە نێوان کورد و عەرەب دروســـتی دەکات "[944]. ئاشـــکرایە ئەم داواکارییـانەی بـارزانی خســـتیەڕوو، پەیوەندی بە ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگەی عێراقی هەبوو بە شـــێوەیەکی گشتی، سەرباری هەوڵەکانی بۆ چەسپاندنی دیموکراسییەت، لە شوێنی حوکمڕانی تاکڕەوی سەربازی.

خواســـتە ســـیاســـییەکانی مســـتەفا بارزانی بۆ ڕزگاربوون لەو دەســـەڵاتە ســـەربازییەی دوور لە بنەما دیموکراســـییەکان دەســـەڵاتی گرتبووە دەســـت و بۆ بەهێزکردن و قایمکردنی دەسەڵاتەکانی، ئامادەی ئەوەبوو هەموو ڕێکاریک بگرێتەبەر بۆ لاوازکردنی بەرە نەیارەکانی لە نێو کورد و عەرەبدا، لەلایەن زۆرێک لە هێز و کەسایەتییە نیشتمانپەروەرەکانی عێراقی پێشوازی لێکرا، لەڕێگای شکستپێهێنانی ئەو هەوڵانەی دەســـەڵات خســـتیەگەر بۆ بەکارهێنانی لایەنێک لەدژی ئەوەی دیکەیان. بۆ نمونە ئەو کاتەی دانوســـانەکانی ســـاڵی ١٩٦٤ لەگەڵ ســـەرکردایەتی کورد نەگەیشـــتنە ئەنجام و شـــەڕ لە باشـــووری کوردســـتان دەســـتی پێکردەوە، عەبدولســـەلام عارف پەنـــای بۆ ڕێبەری گەورەی شـــیعە موحســـین حەکیم(١٨٨٩_١٩٧٠) برد بۆ بەشـداریکردن لە کۆنگرەیەک بە مەبەسـتی شـەرعییەتدان بەشـەڕەکەی لەگەڵ کورد، کە لەســـاڵی ١٩٦٥ لە بەغدا ڕێکیخســـت، ئەو کاتە فوئاد عارف بەنوێنەرایەتی کورد چووە نەجەف و چاوی بە موحسین حەکیم کەوت، داوای لێکرد هاوکاریێ بۆ ئەوەی هیچ هەڵوێســـتێکی دژ بەکورد لەلایەن شـــیعە دەرنەچێ، لەوەڵامدا ڕێبەری گەورەی شـــیعە لە عێراق گوتی:" چۆن فەتوا دەدەین بۆ شـــەڕکردن لەگەڵ کورد، کە ئەوان برامانن لە نیشتمان و ئایینیدا"[945].

بەم شـــێوەیە مســـتەفا بارزانی توانی لە ڕێگەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ بەشـــێک کەســـایەتیە ســـیاســـی و کۆمەڵایەتیەکانی عەرەب لە عێراقدا، تا ڕادەیەک شـــکســـت بە هەوڵەکانی دەسەڵات بێنێ، بۆ بەکارهێنانی ڕەگەزی نەتەوەی عەرەب بۆ دژایەتیکردنی

---

٩٤٤ – بروانە: بيان البارزاني الى الشعب العراقي الكريم بمناسبة مرور عام على الثورة الوطنية في كردستان، خەبات(جريدة)، ع(٤٦٧)، أوائل أيلول ١٩٦٣، ص١.

٩٤٥ – د. وسن سعيد الكرعاوي، السيد محسن الحكيم دراسة في دوره السياسي والفكري في العراق ١٩٤٦–١٩٧٠، مؤسسة أفاق للدراسات والابحاث العراقية، بغداد، ٢٠٠٩، ص١٩٨.

شـۆڕشـی کورد، لە ڕێگەی گرێدانی بەرژەوەندییە گشـتییەکانی هەردوولا بەیەکتری، ئەمەشی لە وتارێکدا لە (١٥ی نیسانی١٩٦٧) لە کۆنفرانسـی پێشـمەرگەدا خسـتەڕوو، کاتێک گوتی:"ئێمە لە سـەوورەی خۆمان مەسـەڵەحەتی عێراقمان ئەوێ، ئەوەل بۆ عەرەب، ثـانیەن بۆ کورد و بۆ هەموو خەڵکی عێراق... ئێمە ئەمـانەوێ حکومەتێکی عادلی دیموکراتی بە ئینتخاباتەکی حور بەبێ زەغت و ئیکراهـ و زوڵم و تەعەددا لە عێراق هەبێ، یاسـایەکی پڕ عەداڵەتی وا هەبێ کە میللەتی عێراق بۆ خۆی بۆخۆی دابنێ، هەر ڕۆژە عەسـکەرێک نەڵێ(قررنا مایلی)، وە بە ئارەزووی نەفسـی خۆ و ئەنانییەت حوکم لەسەر میللەتی عێراق بکا، وە میللەت نەتوانێ و نەوێرێ مەحاسبەی بکات"[٩٤٦].

مسـتەفا بارزانی هەوڵیداوە پارێزگاری لە پەیوەندییەکانی کورد لەگەڵ عەرەب و پێکهاتەکانی دیکەی عێراق بکات و ئەمەش ڕەنگدانەوەی هەبوو لەسەر بەشداریکردنی بەشێکی عەرەبەکان لە شۆڕشی کورد لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦١_ ١٩٧٥)[٩٤٧].

دواجار لەدوای ڕاگەیاندنی ڕێککەوتنامەی(١١ی ئاداری١٩٧٠). بارزانی پەیامێک بۆ گەلی عێراق بە کورد و عەرەبەوە دەنێرێ کە دەقەکەی لە ڕۆژنامەی (الدستور)ی ئوردنی بڵاوکراوەتەوە، تێیدا دەڵێت:" داوا لە گەلی عێراق دەکەم بە کورد و عەرەبەوە لاپەڕەیەکی نوێ هەڵبدەنەوە و هۆشـیاربن لە پیلانگێری ناحەزان و هەوڵەکانیان یەکبخەن لە پێناو بەرژەوەندی گشتی بە عەقل و حیکمەت"[٩٤٨].

## باسی دووەم: هاندانی کورد لە دژی کورد

کۆمەڵگەی کوردی بەدرێژایی مێژوو، خاوەنی سـیما و تایبەتمەندی خۆی بووە. کە هەندێکیان ئەرێنی و هەندێکیشـیان نەرێنی بوون. یەکێک لە تایبەتمەندیە خراپ و نەرێنییەکانی، بریتی بووە لە ناتەبایی و نەبوونی کۆدەنگی و یەکڕیزی لەسـەر پرسـە نەتەوەییەکانی. وەک شـەرەفخانی بەدلیسـی لە پێشـەکی کتێبی شـەرەفنامەدا

---

٩٤٦ – بڕوانە: وتاری بارزانی لە کونفرانسی سەربازی کانی سماق لە (١٥ نیسان ١٩٦٧) لە: مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية(ثورة ايلول ١٩٦١–١٩٧٥)، ج٣، ص٥٦٠.

٩٤٧ – نداء من الضباط الاحرار العرب الملتحقين بفصائل الانصار الوطنية في كردستان، خەبات(جريدة)، ع(٤٧٢)، تشرين الثاني ١٩٦٣، ص٢.

٩٤٨ – نداء من البرزاني لتدعيم الوحدة الوطنية في العراق، الدستور(جريدة)، ع(١٠٦٨)، ١ نيسان ١٩٧٠، ص٦.

نووســـــیویەتی:" کورد ئەوەتەی هەیە، لە وتەی شـــــادە و ئیماندا نەبێ، یەکتریان نەگرتووە"[949]. دیارە ئەمەش ڕەگو ڕیشــەیەکی درێژی هەبوو، بۆیە مێژوونووسـێکی عەرەب لەسەدەی چواردەهەمی زاییندا دەڵێت:" کورد بوونەوەرێکی بێشومار زۆرن و نەتەوەیەکن لە ژمار نایەن ؛ ئەگەر شــمشــێری فیتنە لە نێوانیادا نەبوایە، بۆ ئەوەی خەوتووەکانیان ئاگادار بکاتەوە، ئەوا دەســتیان بەســەر وڵاتاندا دەگرت، بەڵام بیر و بۆچوونەکانیان وقســـەکانیان دژی یەکن، تا ئێســـتاش شـــمشـــێرەکانیان خوێنی لێدەچۆڕی، شـوێنی فرمێسـکیان وشـک نەبۆتەوە"[950]. ئەم خاڵە لاوازەی کورد، بۆتە ئـامـانجی نەیـارەکـانی بۆ لاوازکردن وســـەرکوتکردنی ئەو بزاڤە ڕزگـاریخواز و سەربەخۆیی خوازانەی لەناویاندا سەریهەڵداوە[951]. وەکو لێرە بەدوا باسی دەکەین:

### آ) بەکارهێنانی هەندێ لە هۆزە کوردییەکان دژی بارزانی

لەو قۆنـاغە مێژووییەی مســـتەفـا بـارزانی ڕێبەرایەتی بزاڤی ڕزگـاریخوازی نەتەوەیی کورد کردووە، یەکێک لە هۆکارە کاریگەرەکانی سەر ئەو بزاڤە، بریتی بووە لە نەبوونی هاوهەڵوێســتی گشــتی لەنێو پێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردی کە زۆرینەیان لەو ماوەیەدا لە هۆزەکان بوون[952]. بە تایبەتی هەندێ لە هۆزە کوردیەکان، بە هۆی ئەو نـاکۆکییە مێژووییەی لەگەڵ ئێلی بـارزان هەیـانبوو، هەڵوێســـتیـان نەرێنی بوو بەرامبەر شـــۆڕشـــەکانی مســـتەفا بارزانی، لە کاتێکدا ناکۆکی ئەو هۆزانە لەگەڵ بارزانییەکان، لە بنجدا لە پێناو سەپاندنی هەژموون و دەسەڵات بووە، دوور لەئایدیا و ســتراتیژێکی نیشــتمانی و نەتەوەیی[953]. بەڵام ڕێبەرانی بارزان هەر لەســەردەمی شـێخ عەبدولسـەلامی دووەم و پاشـان برایەکەی شـێخ ئەحمەد، بیروباوەڕی ئاینییان

---

٩٤٩ – میر شەرەف خانی بدلیسی، شەرەفنامە ( مێژووی ماڵە میرانی کوردستان)، و: مامۆستا هەژار، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چ٣، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٣٩.

٩٥٠ -أحمد بن يحيى بن فضل الله القرشي العدوي العمري،التعريف بالمصطلح الشريف،عني بتحقيقه وضبطه وتعليق حواشيه: محمد حسين شمس الدين، دار الكتب العلمية ، بيروت، ١٩٨٨ ،ص٥٨.

٩٥١ – باسيیلي نيكيتين، م.س،ص٢٩٤.

٩٥٢ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی...(١٩٦١-١٩٧٥)، ٢٠٢٠، ل٣٣.

٩٥٣ – سەبارەت بەدیارترین ئەو هۆز و کەسایەتی و لایەنانەی لە ڕاپەڕینی دووەمی بارزان دژایەتی مەلا مستەفا بارزانییان کرد، بڕوانە: د. عبدالخالق ناصر العامري، البارزاني مصطفى والقضية الكوردية في العراق(١٩٣١- ١٩٧٥)، دار الجواهري، بغداد، ٢٠١٧، ص١١٤.

بەخۆشەویستی نەتەوە بەستایەوە. بۆ ئەمەش کاریان لەسەر یەکخستنی هۆزەکانی دەوروبەریان کرد و فیدراسیۆنێکی هۆزایەتییان لە بارزان پێکهێنا، وەک هەنگاوی بەرایی بۆ یەکخستنی هەموو کورد لە خانەی پرۆژەیەکی نەتەوەیی گشتگیردا[٩٥٤].

مستەفا بارزانی میراتگری ئەو کولتوور و ستراتیژە نیشتمانی و نەتەوەییەی شێخانی بارزان بووە. بێگومان ئەوەش کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر هەژموونی بەشێکی زۆری هۆزە کوردییەکان هەبوو، لەبەرئەوەی بەهاتنە پێشەوەی بیری نەتەوەیی و نیشتمانی، هەژموونی ئەوان بە ئاغا و شێخەکانیشیانەوە لاواز و تەنانەت لەناودەچوو[٩٥٥].

بارزانی لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕاپەڕینی دووەمی بارزان، داوای لەهۆزەکان کرد ئەو نەخشە و سنوورەی بەپیلانی دوژمنانی گەلی کورد تۆخکراوە و لەنێو یەک نیشتمان و لەگەڵ یەک گەلدا لێک جیاکراونەتەوە، یەکبخەنەوە. ئەو پەیامە نەتەوەیی و نیشتمانییە چەندە مەترسی هەبوو بۆسەر هەژموونی هۆز و سەرۆکە بەرژەوەندی خوازەکانیان، زۆر لەوە زیاتر کاریگەریی لەسەر حکومەتی عێراق و دراوسێیەکانیشی هەبوو. بۆیە هۆزەکان، لەگەڵیشیاندا حکومەتە عێراقییەکانی یەک بەدوای یەکداهاتن، هەموو توانا ماددی و مرۆییەکانی خۆیان بۆ ڕێگریکردن لەگەشەکردن و بەردەوامبوونی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد خستەگەڕ. لێرەوە بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی نێوان ئەو هۆزە کوردییانە و حکومەتی عێراق، دەرفەتی گونجاویان بۆ بەردەوامیدان بە سیاسەتی پەرتکە و زاڵبە ڕەخساند، کە هەر لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانییەوە، دژی هەوڵەکانی کورد بۆ سەربەخۆیی پەیڕەوکراوە[٩٥٦].

یەکێک لەو پاڵنەرانەی بوونە هۆی نزیکبوونەوەی مستەفا بارزانی لەپارت و ڕێکخراوە سیاسییە کوردییەکان بەر لە سەرهەڵدان و پاشان لەماوەی بەرپابوونی ڕاپەڕینی دووەمی بارزان، سەرباری بیری پێشکەوتخوازانەی ئەو ڕێبەرە و کارکردنی بۆ تێکەڵاوکردنی بزاڤەکە بە ستراتیژێکی نیشتمانی و نەتەوەیی، نائومێدی بووە لە پشتیوانی ئەو هۆزانەی لەدەڤەرەکەیدا خاوەن هێز و توانای سەربازی

٩٥٤ –بروانە: ڕاپەرینەکانی بارزان لە بەڵگەنامە...، ل١٠.

٩٥٥ – بروانە: کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی فەرەنسا و بەریتانیادا(١٨٧٩-١٩٦٣)،ل٢١٧.

٩٥٦ – بروانە: هوگر طاهر توفیق، الكرد والمسألة الارمنية١٨٧٧-١٩٢٠، دار آراس للطباعة والنشر،آربیل، ٢٠١٤، ص٤٨.

بوون[957]. لەسەر ئەم بنەمایە حکومەتی عێراق بۆ بەهێزکردنی سەنگەری نەیارانی بارزانی و بزووتنەوە ڕزگاریخوازییەکەی، دالّدەی هەموو ئەو هۆزە کوردییانەیدا و پارە و چەک و دەسەلاّتی پێ بەخشین[958]. ئەمانیش لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان، چوونە بەرەی پێشەوەی سەنگەرەکانی سوپای عێراق، دژ بەهێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان. دواجار ئەو هۆزە کوردیانە بوونە بەشێک لەو هۆکارانەی کاریگەریان لەسەر سەرنەکەوتنی ڕاپەرینەکە هەبوو[959].

مستەفا بارزانی لەدوای گەڕانەوەی لە سۆڤیەتەوە بۆ عێراق لە ساڵی ١٩٥٨، هەوڵی چارەسەرکردنی ئەو خاڵە لاوازەی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیدا، وەک لە بەڵگەنامەیەکی حکومەتی بریتانیاندا هاتووە، بارزانی هەوڵیدا ئاشتەوایی لەگەڵ تەواوی ئەو هۆزانە بکات، کە نەیاری مێژوویی بارزانییەکان بوون، بەو هۆیەوە کەشێکی برایانەی لەپەیوەندیی نێوان هۆزە کوردییەکان دروستکرد. بەم جۆرەش توانی زۆربەی هۆزەکان یەکبخات[960]. بەلاّم ئەم دۆخە تەواوی هۆزەکانی نەیاری بارزانییەکان بوون نەگرتەوە، بۆیە سەرۆک وەزیرانی عێراق عەبدولکەریم قاسم دوای ئەوەی لەسەر چەند پرسێکی سیاسی کەوتە ململانێ لەگەڵ مەلا مستەفا، دەستیکرد بە تەیارکردنی ئەو هۆزانەی دژی بارزانی بوون[961]. وەک ئەو هەوڵەی لەگەڵ هۆزەکانی سورچی و هەرکی  و برادۆست ئەنجامیدا، بۆ هاندانیان لە دژی بارزانی[962].

ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکا(CIA)، کاتێک ئاماژە بەو سیاسەتەی حکومەتی عێراق بەرامبەر بارزانی دەکات، دەیگەڕێنێتەوە بۆ مەترسی دەسەلاّتدارانی عێراق بەرامبەر خواستە نەتەوەییەکانی ئەو ڕێبەرە. بۆیە بەئامانجی کاڵکردنەوەی

---

٩٥٧ – بروانە: جوناثان راندل، م.س، ص١٦٩.

958 - Michael G. Lortz, p.38.

٩٥٩ – ديفيد مكدول، م.س،ص٤٤٣.

٩٦٠ – وليد حمدي، م.س، ص ٢٧٠.

٩٦١ – بۆ ئاشنابوون بە ناوی هەموو ئەو هۆزانەی لەماوەی نێوان ساڵانی(١٩٥٨– ١٩٧٥) دژایەتی مستەفا بارزانییان کرد، بروانە: محمود الدرة، القضية الكردية ، ص٣٤٢–٣٤٣.

962 - Donald Bruce Disney, the Kurdish nationalist movement and external influences, Naval Postgraduate School, California, 1980, p.128. https://core.ac.uk/download/pdf/36710864.pdf

کاریگەرییەکانی بەســەر ڕژێمی حوکمرانی لەبەغدا، پشــتیوانیان لەو هۆزانە کرد، کە نەیاری تەقلیدی بارزانییەکان بوون[963].

فوئـاد عـارف لەو کـاتەی یەکێـک بووە لە وەزیرەکـانی حکومەتی عێراق، لە یاداشــتەکانی خۆیدا، قاســم بە (شــێخی پیلانگێری) ناودەبات و دەڵێ:" ئامانجی ســەرەکی لەو پیلانگێرییەی دژی بارزانی ئەنجامی ئەدا، لێکترازانی ڕیزەکانی کورد بوو، بۆیە هەمیشــە پشــتگیری لە هۆزەکانی نەیاری بارزانی دەکرد، بۆ لاوازکردنی هەژمون و کاریگەریی مســتەفا بارزانی لە مەیدانی ســیاســیدا"[964]. بەڵام توێژەرێک ئەنجـامی ئەو ســیاســەتەی حکومەتی عێراق بەرامبەر بـارزانی دەخـاتەڕو و نوســیویەتی:"عەبدولکەریم قاســم ســەرکەوتوو نەبوو لە ڕاکێشــانی هیچ لایەنێکی کوردی بۆ لای خۆی لە ململانێییەکانی لەگەڵ بارزانیدا، لە شــوێنی ئەوە لە ڕۆژی (٧ی ئایاری ١٩٦٠) پێشوازی لە شاندێکی ئاغا و سەرۆک هۆزە کوردییەکانی نەیاری بارزانی کرد، بە بیانووی ئەوەی هاتوون بۆ بەغدا بۆ ئەوەی دڵســۆزی خۆیان بۆ شــۆڕش دووپات بکەنەوە، بەڵام ئەو پارە و چەکی پێدان، بە ئامانجی دابڕاندنیان لە بارزانی و لاوازکردنی بنکە حزبی و جەماوەرییەکەی[965]. سـەرەڕای ئەوەش دڵنیایی پێدان، ئەگەر لەگەڵ بارزانی ڕووبەڕووی یەک ببنەوە، سوپاکەی تێکەڵیان نابێ"[966].

لە بەرامبەردا مســتەفا بارزانی لە پێناو ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ســیاســەتەی حکومەتی عێراق، سیاسەتی لە باوەشکردنەوەی بۆ هەموو پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی نێو کۆمەڵی کوردی پیادەکرد. ســەرەڕای نیگەرانی و نارەزایی بەشــێک لە ئەندامانی ســەرکردایەتی حزب، کە پێیـان وابوو، حزبەکە شــوێنی خەڵکە پـارێزگـارەکە و موڵکدارەکـانی زەوی و ســەرۆک هۆزەکـانی تێدا نـابێتەوە، لەبەرئەوەی حزبێکی پێشکەوتنخوازە و دژ بە دەرەبەگایەتی و سیستەمی هۆزایەتییە[967].

جەلال تاڵەبانی یەکێک بووە لە ســەرکردەکانی ئەو حزبە، ســەبارەت بەو بابەتە، باس لەوە دەکات لە کۆنگرەی (٥)ی پارتی دیموکراتی کوردســتان، کە لە(٥_١٠ی

963 - CIA, (FOIA) /ESDN (CREST):02000194, Iraqi Regime Acting against Communist, Central Intelligence Bulletin - 1961/02/13, p.5.

٩٦٤ – مذكرات فؤاد عارف، ص١٧٧.

٩٦٥ – عبدالفتاح البوتاني، وثائق عن الحركة ....، ص٧٠-٧١.

٩٦٦ – عبدالفتاح البوتاني، التطورات السياسية الداخلية ....، ص٢٩٢.

٩٦٧ – عبدالفتاح البوتاني، منطقة بادينان(١٩٢٥-١٩٧٠)،ج٢، ص١٩٣.

ئاياری ١٩٦٠) ڕێکخرا، بارزانی زۆر بەتوندی سەرکۆنەی یەکێک لە ئەندامانی حزبی کرد، بەهۆی ئەوەی ڕێگری لە (مینە ئاغا)[٩٦٨] کردووە بچێتە بارەگای حزبەکە لە شاری کۆیە، هەرچەندە ئەو سەرۆک هۆزێکی کورد بوو[٩٦٩]. بە بڕوای توێژەر هۆکاری ئەو هەڵوێستەی بارزانی دەگەڕێتەوە بۆ هەستیاری بارودۆخی شۆڕشی کورد، لە کاتێکدا حکومەتی عێراق، کاری بۆ ڕاکێشانی ئەو هۆزانە دەکرد بۆ لەناوبردنی شۆڕشەکە.

بۆیە هەر لە چوارچێوەی سیاسەتی لە ئامێزگرتنی هۆزە کوردییەکان، بارزانی لە ڕۆژانی (١٨_٢٢ی ئاداری ١٩٦٣) بە ئامادەبوونی زۆربەی توێژە کوردییەکانی (سیاسی و هۆزایەتی) کۆنگرەیەکی بەرفراوانی لەشارۆچکەی کۆیە ڕێکخست. ئەو کۆنگرەی کردە سەکۆی بەیەکگەیشتنی هەموو دۆست و ناکۆکەکان، ئەمەش سەرکەوتنێک بوو بۆ دیداری (کوردی_کوردی). لەسەر ئەم بنەمایە ژێدەرێک دەنووسێت:" بارزانی لەم کۆنگرەیە سەلماندی، کە بیرمەندێکی ئیستراتیژی سیاسییە"[٩٧٠]. لەبەرئەوەی وەک نووسەرێکی عەرەب باسی دەکات، کۆنگەرەکە وەرچەرخان بوو لە مەیدانی سیاسی کوردیدا، بەشێوەیەک پێشینەی نەبووە. دوای ئەوەی کۆنگرەکە کەشێکی گونجاوی بۆ هەموو لایەک دروستکرد، وێڕای ئاشتبوونەوەی لایەنە ناکۆکەکان لەگەڵ یەکتری، وە ڕەتکردنەوەی پەنا بردن بۆ بەکارهێنانی چەک لە دژی یەکتری، وەک پێشتر ڕووی دابوو. بەم شێوەیە دوای گفتوگۆیەکی زۆری داخراو، لە کۆنگرەکە بڕیاردرا، ئەو جیاوازی و کێشانەی هەبوون بەرفراوان نەکرێن و تەسک بکرێتەوە. هاوکات دەستبکرێ بە گفتوگۆی ناو بە ناوی بەردەوام لەسەر ئەو شێوازە و پەیوەندی بەهێزەکانی لایەنگیری حکومەتی عێراق بکرێ بۆ بەدەستهێنانی پشتگیریان بۆ دۆزی کورد، بەتایبەتی زێبارییەکان و هەندێک لەسەرکردە ئاینییەکانی وەک نەقشبەندییەکان[٩٧١].

---

٩٦٨ – ئەم کەسایەتییە، (مینە ئاغای گربداخی)یە. کە یەکێک بووە ئاغاکانی میراودەلی. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ناوبراو، بڕوانە نامەیەکی(ئەحمەد توفیق) بۆ (مەلا مستەفای بارزانی)، لە(٢٥ی ئەیلوولی ١٩٦٢)، لە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی...، بگ٣، ب١، (شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١–١٩٧٥)، ٢٠٢٠، ل٢٩٧–٢٩٨.

٩٦٩ – بڕوانە: سەلاح ڕەشید، س.پ، ل١٦٤.

٩٧٠ – شلومو نکدیمون، م.س، ص٨٥.

٩٧١ – منذر الموصلي ، م.س، ص١٤٥.

ئەم دۆخە هەرچەندە تا ڕێککەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ بەردەوامی هەبوو، بەڵام چونکە سەرکردایەتی کورد بەمەرجی ڕاگرتنی پشتگیری حزبی بەعس لە هۆز و لایەنە کوردییەکانی نەیاری شۆڕش، بە ڕێککەوتنەکە ڕازی بوو[٩٧٢]، بۆیە بەشێکی ئەم هۆزانە لە دوای بەئەنجام گەیشتنی ڕێککەوتنی سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراق، ڕوویانکردەوە بارەگای بارزانی و داوای هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی نوێ و ئاشتەواییان کرد و مستەفا بارزانیش وەک ڕێبەری کورد، دەرگای بەڕوویاندا کردەوە و لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا، سەرپشکی کردن لە هاتنە ڕیزی پێشمەرگە یان بۆخۆیان بە ئازادی و سەربەخۆیی لەناوچەکانی خۆیاندا بمێننەوە[٩٧٣]. بارزانی ئیدی لەو ماوەیەدا بەشێوەیەکی کاتی، کۆتایی بەو ناتەبایی و ناکۆکیانەی نێوان هۆز و لایەنەکانی دیکەی نێو کایەی سیاسی لە کوردستان هێنا، دوای لەباوەشگرتنی بەشێکی ئەو هۆزانە و سڕینەوەی لاپەڕەی ناکۆکی و ململانێی مێژووییان لەگەڵ بارزانییەکان. بەو هۆیەوە وەک بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی حکومەتی ئەمریکا ئاماژەی پێدەکات:" بارزانی پشتگیری هەموو هێزەکانی بەدەستهێنا بە دوژمنە تەقلیدییەکانی ئێلی بارزانیشەوە، کە پێکهاتبوون لە (لۆلان و هەرکی و بەشی زۆری زێبارییەکان)"[٩٧٤]. تەنانەت ڕۆژنامەی(داڤار)ی ئیسرائیلی ئەو زانیارییە پشتڕاست دەکاتەوە و لە هەواڵێکی ژمارەی ڕۆژی(١١ی حوزەیرانی ١٩٧٤) نووسیویەتی:" لەسەرەتای مانگی حوزەیرانی ١٩٧٤ هەردوو هۆزی (زێباری و هەرکی) چوونە ڕیزی هێزەکانی بارزانی لەبەرەکانی شەڕ لەبەرامبەر سوپای عیراق"[٩٧٥].

---

٩٧٢ - بروانە: نامەی سەدام حوسێن بۆ مستەفا بارزانی لە (١ی ئابی ١٩٧٠) لە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی...(شۆرشی ئەیلوول ١٩٦١-١٩٧٥)، ٢٠٢٠، ل٤٤٨.

٩٧٣ - شێخ حوسێنی کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی شێخ ڕەشیدی لۆلان(دیدار)، هەولێر، ١٠/ ئابی/ ٢٠٢٢. ناوبراو لە (٥ی ئاداری ١٩٦٢) لە لۆلان لەدایک بووە. ئیستاش لەگەرەکی ئازادی لە هەولێر دەژی.

974 - **F.R.U.S**, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, 304. Memorandum from Andrew Killgore of the Bureau of Near Eastern and South Asian Affairs, Department of State to the Assistant Secretary for Near Eastern and South Asian Affairs (Sisco), Kurdish Appeal U.S. Assistance, Washington, April 3, 1972, p.5. **بروانە**

**پاشکۆی ژمارە (٢٠)**

٩٧٥ - (٢٠) چەکداری کورد لە عێراق لە سێدارە دراون، داڤاری ئیسرائیلی(ڕۆژنامە)، ژمارە(١٥٠٠٨)، ١١ی حوزەیرانی ١٩٧٤، ل٣.

## ب) پشتیوانیکردنی باڵی جیابووەوەی پارتی

لەبەردەوامی هەوڵەکانیدا بۆ دروستکردنی دووبەرەکی لە ڕیزی شۆڕشگێرانی کورد، حکومەتی عێراق سوودی لە بیروڕای جیاوازی نێو سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ مستەفا بارزانی سەرۆکی پارتەکە وەرگرت[٩٧٦]. بەئامانجی جیاکردنەوەی زیاتری نێوماڵی کورد. بۆیە کاتێک باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان، لەساڵی ١٩٦٤ لەبەرەی شۆڕشگێرانی کورد جیابوونەوە[٩٧٧]. حکومەت هەستا بە دالدەدانی بەرەی نەیاری بارزانی، بەمەش توانیان بۆشاییەکی گەورە لە ڕیزی شۆڕشگێرانی کورد و بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی دروست بکەن. بەڕادەیەک دەسەلاتیان نەک بەسەر هۆزەکان، بەڵکو بەسەر بەشێکی سەرکردەکانی کورد، کە خۆیان بەباڵی پێشکەوتنخوازی بزاڤەکە دادەنا زاڵبوو[٩٧٨]. بەلام مستەفا بارزانی لە (تشرینی یەکەمی ١٩٦٤) ئەم بۆشاییەی لەنێو بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد دروست بوو، بە دامەزراندنی (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق) پڕکردەوە[٩٧٩]، کە لە پێشوودا باسکراوە.

سەرەڕای ئەوەی دوای ماوەیەکی کەم، ئەوانەی لە ڕیزی پارتی جیابوونەوە بەتایبەتی عەلی عەسکەری و پاشان جەلال تاڵەبانی، لە مانگی تەمموزی ١٩٦٥ گەڕانەوە لای بارزانی و ئەمیش لاپەڕەیەکی نوێی لەگەڵ هەڵدانەوە و ئاشتەوایی لەگەڵ کردن، تەنها ئیبراهیم ئەحمەد نەبێ، کە لەتاران مایەوە و نەگەڕایەوە[٩٨٠]. حکومەتی عێراق هەوڵیدا دووبارە سوود لەو بەرە نەیار و ناکۆکەی نێو پارتی لەگەڵ بارزانی وەربگرێ. وەک لە هەواڵێکی ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز) هاتووە، بەشێک لەو سەرکردانەی کورد بەهۆی بەردەوامبوونی ناکۆکییەکانیان لەگەڵ بارزانی، لە

---

٩٧٦ – لە بارەی ئەم جیاوازی و لێکترازانەی لە نێو پارتیدا ڕوویدا، بڕوانە: دیفید ادامسن و جرجیس فتح الله، الحرب الكردية و انشقاق ١٩٦٤، اربیل، ١٩٩٩.

977 - Peter J. Lambert, The United States and the Kurds: case studies in United States engagement, Naval Postgraduate School, Monterey, Calif., 1997, p.41. https://archive.org/details/unitedstateskurd00lamb/page/n1/mode/2up?q=Mustafa+barzani.

978 - Евгений Примаков, Бывший источник, с.329.

٩٧٩ – شێرزاد زکریا محمد، س.پ، ل٦٦-٧٠.

٩٨٠ – مسعود البارزاني، البارزاني...(ثورة أيلول١٩٦١-١٩٧٥)، ج٣، ص١٦٦؛ فرەنسۆ هەریری، بۆ ئەوەی مێژوو بە چەواشەیی نەنووسرێ، هەولێر، ١٩٩٥، ل١٥.

(کانونی دووەمی ١٩٦٦) چوونە بەرەی حکومەتی عێراق[٩٨١]. بۆیە دەسەڵاتدارانی بەغدا بۆ چەواشەکردنی ڕای گشتی، لە ڕۆژنامەکانیاندا ئەو سەرکردانەیان وەک نوێنەرانی کورد ناساند، لە نمونەی ئەو هەواڵەی لەیەکێک لە ڕۆژنامە عێراقییەکان لە (٢٠ی حوزەیرانی١٩٦٦) بڵاوکرایەوە، سەبارەت بە پێشوازیکردنی سەرۆک کۆماری عێراق لە جەلال تاڵەبانی و حیلمی عەلی شەریف[٩٨٢]. پاشان حکومەت چەک و پارەی بە نەیارەکانی بارزانی بەخشی و لە(ئاداری١٩٦٨) لەدژی هێزە شۆڕشگێرە کوردییەکان بەکاریان هێنان. بەو هۆیەوە وەک ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی ئاماژەی پێکردووە، مستەفا بارزانی هۆشداری بەحکومەتی عێراق داوە، کە ئەو لەشوێنی ئەوەی شەڕی هێزە کرێگرتەکانیان بکات، ڕەنگە ناچاربێ ئاگربەست بشکێنێ و شەڕی پارتیزانی لەدژی سوپای عێراق دەست پێ بکاتەوە[٩٨٣].

دوای کودەتای سەربازی (١٧ی تەمموزی ١٩٦٨)، حزبی بەعس بەردەوامی بەو سیاسەتەدا، بەئامانجی لاوازکردنی بارزانی و بەرەی شۆڕشگێرانی کورد[٩٨٤]. لەو سۆنگەوە چەک و پارەی زیاتری بە سەرکردە لادەرەکانی نێو بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد بەخشی و بۆ دژایەتیکردنی شۆڕشی کورد بەکاریهێنان، بەپێی زانیارییەکانی یەکێک لە فەرماندە سەربازییە باڵاکانی حکومەت چەند هێزیکیان لێ دروستکردن و لەشەڕەکانیان دژی شۆڕشگێرانی کورد سوودیان لێ وەرگرتن[٩٨٥]. سەبارەت بەو بابەتە، مستەفا بارزانی لە دیدارێکی کە لەگەڵ پەیامنێری ڕۆژنامەی (براڤدا)ی سۆڤیەتی ئەنجامیداوە و ڕۆژنامەی خەبات وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی،

---

981 -Quarrel Reported Splitting Kurdish Leaders in Iraq,The New York Times,March 23, 1966,pp.6,23.

٩٨٢ – بروانە: عارف يستقبل أمس جلال الطالباني و حلمي شريف، الفجر الجديد(جريدة)، ع(١٣٢٥)، ٢٠حزيران ١٩٦٦، ص١.

**983 - Thomas F. Brady, KURDS AND IRAQIS RESTIVE IN PEACE; They Shun War but Argue Over Their '66 Agreement, The New York Times, March 21, 1968, P. 25.**

٩٨٤ – ئارەش ڕەئیسینەژاد، شای ئێران، کوردی عێراق و شیعەی لوبنان(١٩٥٨-١٩٧٩)، و: شەفیقی حاجی خدر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٢٢، ل٢٤٧.

٩٨٥ – بروانە: اسماعيل تايه النعيمي، م.س، ص٧٨.

دەڵێت:" ئەو کۆمەڵەیە چالاکانە وەڵامی بەرژەوەندی ئەو هێزانە دەدەنەوە، کە دەیەوێ کار بکات بەپێی بنەمای پەرتکە و زاڵبە"[٩٨٦].

حزبی بەعسی عەرەبی لەسوریا لە بڵاوکراوەیەکی خۆیدا سەرکۆنەی ئەو سیاسەتەی دەسەڵاتدارانی عێراق کرد، کە دژ بە بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد پیادەیان دەکرد و ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، لە شوێنی ئەوەی هەنگاو بۆ چارەسەرکردنی ئاشتییانەی دۆزی کورد بنێن، بە پێچەوانەوە حزبی بەعس لە عێراقدا، لە(١٧ی تەمووزی١٩٦٨) کاریکردووە بۆ قوڵکردنەوەی جیاوازی و لێکترازانی ناو جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد و هەوڵئەدات گەشە بەو ناکۆکیانە بدات تا ڕادەی بەریەککەوتن لە نێوان خۆیاندا. ئەو حزبە بە پیلانگێری کاریکردووە بۆ پشتگیریکردنی جەلال تاڵەبانی و چەک و پارەی پێ بەخشیون و پاڵی پێوەنان بۆ شەڕکردن و ڕووبەڕووبوونەوەی لایەنگرانی بارزانی و ستراتیژی (با کورد یەکتری بکوژن) پیادە دەکات، بە ئامانجی کۆتاییهێنان بە دۆزی کورد لە عێراقدا[٩٨٧].

سەرکردە جیابووەکان لە ڕیزی شۆڕشگێرانی کورد، دوای ماوەیەکی کورت لە کارکردن لەگەڵ حزبی بەعسی دەسەڵاتدار پەشیمانبوونەوە لەو هەڵوێستەی دژی بارزانی وەریانگرت، دوای ئەوەی لەوە تێگەیشتن، کە حکومەتی عێراق تەنها مەبەستی بەکارهێنانیانە بۆ لاوازکردنی مستەفا بارزانی. وەک ئیبراهیم ئەحمەد باسی دەکات، لەکاتی نووسینی بابەتێک لە گۆڤاری(نور) بەبۆنەی (بڕیاری دامەزراندنی زانکۆی سلێمانی) لەلایەن حکومەتی عێراقییەوە. کە وەک دەستکەوتێکی خۆیان گوزارشتی لێکردبوو، لەلایەن وەزیری ڕۆشنبیری (عەبدوڵڵا سەلوم سامەرائی) سەرکۆنە دەکرێ، بەشێوەیەک بە پێی گێڕانەوەی ئیبراهیم ئەحمەد، وەزیری ڕۆشنبیری بە زمانێکی زبر و بە سوکایەتییەوە پێی گوتووە ئوستاز ئەحمەد ئەو وتارە چییە دوێنێ لە (نور) نووسیوتە، گوایە ئەوە دەستکەوتی ئێوەیە زانکۆی سلێمانی کراوەتەوە؟ سلێمانی وەکو هەموو پارێزگاکانی تر، پارێزگایەکی عێراقییە و حکومەتیش پێداویستی بۆ دابین دەکات، دەستکەوتی چی و ماندووبونی چی، بۆیە بەدوامدا ناردی هۆشداریتان پێبدەم، جارێکی دیکە ئەو جۆرە وتارانە بنووسی،

---

٩٨٦ – القضية الكردية في الصحافة العالمية(جريدة برافدا السوفياتية: في قلب شمال العراق)،خەبات( جريدة)، ع (٤٩٥)، أذار ١٩٦٧، ص٢.

٩٨٧ – عبدالفتاح علي البوتاني، م.س، ص١٤٣.

ڕۆژنامەکەشتان دادەخەم... لە درێژەی گێڕانەوەی باسەکەدا، ئیبراهیم ئەحمەد دەڵێت:" پێش ئەوەی هەڵی هیچ گفتوگۆیەکم لەگەڵ وەزیر هەبێ، دوو گەنج لە خوارەوە دانیشـتبوون ئاگاداری تەواوی ئەو قسـانەبوون کە وەزیر بەمنی گوت و ئەوانیش بە زمانێکی زۆر بازارییانە زیادەیەکیان خسـتە سـەر و گوتیان (**روحوا جيبوا ملا مالكم، بعدين أكتبوا عن أنجازاتكم**). بەو مانایەی بڕۆن مەلاکەتان[مەبەست لە مەلا مستەفایە] بۆمان بهێنن، ئەو کات بۆ ئێمە باس لە دەسـتکەوتەکانتان بکەن. وەک خۆی دەڵێت، من وەڵامی وەزیریشـم بە وەڵامی ئەو گەنجانە دایەوە و بەزمـانی عەرەبی پێم گوتن:"**ڕاسـت دەکەن، خۆزگە ئێسـتا تۆزی گەردەخۆڵێک دەبوین لەژێر پێی بارزانی، بەشـەرەفتربوو نەوەک لەنـاو سـوکایەتی ئێرە، هەرزەکـاری وەکو ئێوە پێمـان ڕابوێرێ**"[٩٨٨].

بارزانی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بە یاداشت و سکاڵاکردن بێ، یـان لەو گفتوگۆیـانەی لەگەڵ شـاندەکـانی حکومەتی عێراق ئەنجـامیـداون، ئەو سیاسەتەی حکومەتی عێراقی سەرکۆنە کردووە و داوای لێکردوون دەست هەڵبگرن لە بەکارهێنانی کورد لە دژی کورد. دواجار ئەو پێداگرییەی بارزانی لەسەر ئەو بابەتە بووە خـاڵێکی سـەرەکی و لە ڕێککەوتننـامەی(١١ی ئـاداری١٩٧٠) جێگیرکرا و حکومەتی عێراق بەڵێنیدا بە هەڵوەشـاندنەوەی یەکەکانی سـوارەی سـەلاحەدینی ئەیوبی[٩٨٩] و گروپەکەی جەلال تـاڵەبـانی. بەو هۆیەوە جـارێکی دیکە تـاڵەبـانی و ئیبراهیم ئەحمەد لە هاوینی١٩٧٠ گەڕانەوە لای بارزانی، ئەویش هەڵوێسـتێکی ئەرێنی پیشـاندان و تەنانەت کەسـێکی هاوچەرخی ڕووداوەکان باسـی ئەوە دەکات، بارزانی لەو دیدارەی لەگەڵ مام جەلال ئەنجامیدا، زۆر ڕێز لێگرت و شـوێنێکی بۆ لەناوپردان بۆ دابینکرد بۆ ئەوەی تێیدا نیشـتەجی بێت . پاشـان مام جەلال لە سـاڵی ١٩٧٣ بە

---

٩٨٨ – شانێک بەبنباری نیشتمانەوە...ل١٢٧. دیارە ئیبراهیم ئەحمەد دوای گەڕانەوەی بۆ لای بارزانی لە ساڵی ١٩٧٠، بەشێوەیەکی زارەکی ئەو قسانەی بۆ (عزەت سلێمان بەگ) کردوە، وەک لەسەرچاوەکەدا ئاماژەی پێکراوە.

٩٨٩ – ئەو هێزەش هەر ئەوەبوو کە لە کوردانی بەکرێگیراو پێکهاتبوون، کوردەکان پێیان دەگوتن (جاش) حکومەتی عێراقیش ناوی نابوون ( فرسانی سەلاحەدین). عبدالكريم فرحان، حصاد ثورة مذكرات تجربة السلطة في العراق(١٩٥٨–١٩٦٨)، ط٢، دار البراق، لندن، ١٩٩٦، ص٨١.

بڕیاری بارزانی لە نوێنەرایەتی شۆڕش لە بەیروت دەستی بەکارکردەوە[٩٩٠]. بێگومان ئەوەش بیرفراوانی و هەروەها لێبوردەیی بارزانی بەدیار دەخات.

## تەوەری سێیەم: بارزانی و سیاسەتەکانی حکومەت لە بوارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری

حکومەتی عێراق بەئامانجی گۆشەگیرکردن و لاوازکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد، جگە لە بواری سیاسی، کاری لەسەر بوارەکانی دیکەش کردووە لە نێوانیشیاندا هەردوو لایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و هەروەها لایەنی ڕۆشنبیریش. بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم سیاسەتە، بارزانی بە یارمەتی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد، بەرنامەیەکی سیاسی پیادەکردووە، کە لەمیانەی چەند باسێکدا، ووردکارییەکانی دەخەینەڕوو:

### باسی یەکەم: سیاسەتی ئابووری

هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی یەکسانی و کاڵکردنەوەی جیاوازیی چینایەتی و بەدەستهێنانی پشکی کورد لەداهاتی عێراق لە سەرچاوە سروشتییەکان، لەسەرەکیترین داواکارییەکانی مەلا مستەفای بارزانی بوو لەخەباتی ڕزگاریخوازی کوردیدا، وەک لەخوارەوە باسیان دەکەین:

#### آ) چاکسازی کشتوکاڵی و هەڵوێستی بارزانی

کۆمەڵگەی کوردی لەو قۆناغە مێژووییەدا، کۆمەڵگەیەکی کشتیاری داخراو بووە، چونکە پابەندی ئەو ڕژێمە بووە، کە دەوڵەتی عێراق لەسەرەتاوە لەسەری بونیادنرابوو، ئەمیش سیستەمی دەرەبەگایەتی بوو[٩٩١]. بێگومان ئەم سیستەمە خزمەتی بە چینێکی دیاریکراو دەکرد، کە چینی باڵا بوون، ئەمانیش سەرۆک هۆز و

---

٩٩٠ – فرەنسۆ هەریری، س.پ، ل١٨.

٩٩١ – بروانە: د. كمال مظهر أحمد، صفحات من تاريخ العراق المعاصر، منشورات مكتبة البدليسي، بغداد، ١٩٨٧، ص١٣-١٩.

دەرەبەگ و موڵکدارە گەورەکانی زەوی بوون[992]. بەم شێوەیە، سیستەمی ئابووری لەعێراقدا نەک خزمەتی بە کۆمەڵگەی کوردی نەدەکرد، بەڵکو ئاستەنگی گەورەی لەبەردەم پێشکەوتنیدا دروستکرد.

لەسەردەمی پادشایەتی لە عێراق وەک دیڤید ماکداول ئاماژەی پێدەکات، (٣٦) موڵکداری گەورەی زەوی هەبوون، لەمانە (١١)یان کورد بوون. حکومەت ئەمانەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بە بەرژەوەندییەکانی دەسەڵات بەستایەوە و لەپرسی نەتەوەیی دووری خستنەوە[993]. هەرچی مستەفا بارزانی بوو بۆ سەرخستنی پڕۆژە نەتەوەییەکەی، پێویستی بە یەکخستنی کۆمەڵگەی کوردی هەبوو. بەئامانجی دروستکردنی بەرەیەکی نیشتمانپەروەر بەرامبەر سیاسەتەکانی دەسەڵات، باشترین بژاردەش بۆ پێکاندنی ئەم ئامانجە، سوود وەرگرتن بوو لە بنەما سەرەکییەکانی بیروباوەڕی بارزان، کە لەسەر بنەمای یەکسانی و دادپەروەری بنیادنرابوو[994].

ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان دەرەبەگ و جووتیار لەلایەن شێخانی بارزان، یەکەم هەنگاو و قۆناغی یەکخستنی کۆمەڵگەی کوردی بوو، دوای کاڵکردنەوەی جیاوازییە چینایەتییەکانی نێوانیان. بە پیادەکردنی ئەم پڕۆژەیەش لەسەر بنەمای شەریعەتی ئیسلامی، جۆرێک لە یەکسانی و دادپەروەری لە نێو ئێلی بارزان هاتەکایەوە[995]. لەم ڕێگەیەوە شێخانی بارزان توانیان بەشێکی هۆزەکانی دەوروبەری بارزان، کە حەوت هۆز بوون لە کۆنفیدراسیۆنێکی هۆزایەتیدا کۆبکەنەوە. بەم جۆرەش یەکەم هەنگاوی یەکخستنی کۆمەڵگەی کوردیان لە دەڤەرەکەی خۆیان دەستپێکرد[996].

تێپەڕاندنی سنووری بارزان و پیادەکردنی چاکسازی کشتوکاڵی لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجێکی نەتەوەیی، لەنێو کۆمەڵگەیەک، کە بەشێکی زۆری لە نمونەی هۆزەکان، بەرژەوەندیەکانیان بەسیستەمی دەرەبەگایەتی و دەسەڵات بەسترابوویەوە، بۆ مستەفا بارزانی کارێکی هێندە ئاسان نەبوو. بۆیە ئەو بنەمایەی کە باوەڕی پێی هەبوو، لەهەموو کات و ساتێکدا پیادە نەکرد، بۆ نموونە کاتێ لە ساڵی ١٩٤٦ پارتی دیموکراتی کوردستانی دامەزراند، نەچووە ژێر باری داخوازی بەشێک لەوانەی لەنێو

---

٩٩٢ – صلاح الخرسان، م.س، ص٨٩–٩٠.

٩٩٣ – بڕوانە کتێبەکەی: تاريخ الاكراد الحديث،ص٤٥٠.

٩٩٤ – بڕوانە: فريد اسسرد، م. س، ص٦٥.

٩٩٥ – بڕوانە: ايوب بارزاني، المقاومة الكردية للاحتلال ١٩١٤–١٩٥٨، ص٦٢.

٩٩٦ – بڕوانە: حبيب مصطفى ابراهيم، س.پ، ل٤٦.

حزبەکەدا داوای دژایەتیکردنی سەرۆک هۆز و دەرەبەگەکانی زەویان دەکرد[997]، بەڵکو لە کۆنگرەی یەکەمی پارتەکە، پێشنیازی دوو کەسایەتی شۆڕشگێر و خاوەن پێگەی کۆمەلایەتی کرد، کە هەردووکیان موڵکداری زەوی بوون، ئەمانیش شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحمود[998] و کاکە زیادی مەحمود ئاغای کۆیە(١٩١٤-١٩٩١) بوون، وەک جێگرانی یەکەم و دووەمی سەرۆکی حزب، بۆئەوەی تاوەکو خۆی دەگەڕێتەوە عێراق، بتوانن پارێزگاری لە مانەوەی حزبەکە بکەن[999].

ئەم بنەمایەی مستەفا بارزانی باوەڕی پێی هەبوو، ئامانجی تواندنەوەی بەرژەوەندییە کەسییەکان بوو، لە بۆتەی بەرژەوەندییەکی گشتی نەتەوەییدا. دیارە ئەمەش لە قۆناغێکی زوودا لە بارزان جێبەجێکراوە، وەک لە نامەیەکیدا لە (١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٤٧) بۆ میر (جەعفەر باقرۆڤ)ی سکرتێری حزبی کۆمۆنیستی ئازەربێجان و بەرپرسی کاروباری گەلانی ڕۆژهەلات، خستییەڕوو، کاتێک لە بەشێکی نامەکەدا باس لەوە دەکات لە ئێلەکەی ئەودا دەرەبەگ نییە، خاوەنداریەتی زەوی بۆ جووتیارە، هەموو تاکێکی دەڤەرەکەی، خاوەن پارچە زەوی تایبەت بەخۆیەتی، بەو شێوەیەش سەردار و سەرکار لەبارزان بوونی نیە، ئەوانەی هەن موڵکداری زەوی و خاوەن بەرهەمی تایبەت بەخۆیانن[1000]. ئەم دەربڕینەی مستەفا بارزانی گوزارشت بوو لەوەی لەنێو ئێلی بارزاندا کاریان لەسەر کاڵکردنەوەی جیاوازی چینایەتی و پابەندکردنی جووتیار بە زەوی و بەرژەوەندی کەسی خۆی

---

٩٩٧ - دیڤید ادامسن و جرجیس فتح الله، م.س، ص٦١.

٩٩٨ - شێخ لەتیف شێخ مەحمودی حەفید(١٩١٧- ١٩٧٢): کوڕی بچووکی شێخ مەحمودی حەفید بووە. لە سلێمانی لەدایک بووە. لەساڵی (١٩٣١) بەشداریکردووە لەدامەزراندنی کۆمەڵەی (برایەتی)، ساڵی (١٩٥٦) دەستگیرکراوە و لە (بەسرە) بەندکراوە. دوای شۆڕشی (١٤ی تەمموزی ١٩٥٨) ئازادکراوە. دواجار لە ساڵی ١٩٧٤ لەنەخۆشخانەی (الراهبات) لەشاری بەغدا مردووە. د. محمد علي الصويركي الكردي، الموسوعة الكبرى لمشاهير الكرد عبر التاريخ، مج:٣، الدار العربية للموسوعات، بیروت، ٢٠٠٨، ص ٤٣٠.

٩٩٩ - دیڤید مکدول، م.س،ص٤٤٩.

١٠٠٠ - بۆ بینینی دەقی نامەکەی مەلا مستەفا بارزانی بۆ جەعفەر باقرۆڤ، بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە(٢) لە:مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بگ١(١٩٣١-١٩٥٨)، هەولێر،٢٠٢٠، ل٣٣٦.

کردووە لە نیشـــتمانێکدا، کە پێویســـت بوو بەرژەوەندی هەمووانی تێدا، بەیەکتری ببەستێتەوە.

ئەم بنەما جێگیرەی بیروباوەڕی مســتەفا بارزانی ســەبارەت بە ژیانی ئابووری کۆمەڵگەی کوردی لە چوارچێوەی پڕۆژەی چاکســازی کشــتوکاڵی، لەیەکەم دیداری نەتەوەیی لە کۆنفرانســـی بـاکۆ لە (١٩ی کـانونی دووەمی ١٩٤٨) لە چوارچێوەی پڕۆژەیەکی نەتەوەیی گشـــتگیر خرایەڕوو، کاتێک لە وتاری دامەزراندنی حکومەتی کاتی کوردی، گوتی:"پێویســـتە حاڵی میللەتی کورد بەتایبەتی دێهاتی و کرمانجی کورد، چـاک و خۆش و مەدەنی بکرێ، ئەو ئەڕازییـانەی کوردســـتـان کە لەلایەن دەوڵەتە ئشغالکەرەکانەوە داگیرکراوە و کراوە بە خاڵیسە، پێویستە لەسەر کرمانج و دێهاتی فەقیر تەوزیع بکرێ... بۆئەوەی مـحافەزەی حقوقی دێهاتی و کرمانج بکرێ، پێویستە بەپێی قانون بەینی کرمانج و ساحێب مولک مەعەیەن بکرێ. کە بەهۆی ئەو قـانونەشـــەوە دێهـاتی و کرمـانج مقـابـل بە زەحمەتی خۆیـان قســـمێکی کـافیی مەحســـووڵەکەیان بۆ خۆیان هەڵگرن... دەبێ جەنگەڵەکانی کوردســتان و زراعەت لە کوردســتاندا وە بەتایبەتی زراعەتی توتن لەســەر ڕێوشــوێنی فەنیی تازە چاک بکرێ وە لەپێناوی مەنافعی میللەت ئیســـتفادە لێ بکرێ"[1001]. ئامانج لە خســـتنەڕووی ئەم تێزە لەلایەن مستەفا بارزانییەوە، گەشەپێدانی بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کوردی بووە، لەڕێگای نزیککردنەوەی بیری نەتەوەیی کوردی لە ئایدۆلۆژیا جیاوازەکانی ئەو ســەردەمە، وێڕای هەوڵدانی بۆ بەدیهێنانی دادپەروەری و یەکســانی و کاڵکردنەوەی جیاوازی چینایەتی، لەژێر سایەی دەسەڵاتێکی نیشتمانی.

ئەم پڕۆژە ئابوورییەی مستەفا بارزانی لە خەباتی سیاسی خۆیدا هەوڵی بۆ دەدا لەگەڵ ڕووخانی ڕژێمی پادشایەتی لە عێراق و دامەزراندنی ڕژێمی کۆماری، ئومێدی بەدیهێنانی هاتەکایەوە، چونکە حکومەتی عێراق لە (٣٠ی ئەیلولی ١٩٥٨) یاســـای ژمارە(٣٠)ی تایبەت بە چاکسازی کشتوکاڵی پەسەند کرد[1002]. ئەم یاسایە لە بنەڕەتدا بە ئامانجی پێشخستنی بوارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی دەرکرا، ئامانجە ئابوورییەکەی بەشـــێوەیەکی ســـەرەکی، بەرزکردنەوەی ئاســـتی بەرهەمهێنانی

---

١٠٠١ – بۆ بینینی دەقی وتارەکەی مەلا مستەفا بارزانی، بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە(٤) لە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی...، بگ١(١٩٣١-١٩٥٨)، ٢٠٢٠، ل٣٧٢-٣٧٣.

١٠٠٢ – الوقائع العراقية(جريدة)، ع(٤٤)، السنة الاولى، ١٩٥٨/٩/٣٠.

کشـــتوکـاڵی و گۆڕینی بنچینەی پەیوەنـدییەکـانی بەرهەمهێنـان بوو، لەلایەنی کۆمەڵاتییشـەوە ئامانجی ڕزگارکردنی جووتیاران بوو لە پاشـکۆیەتی موڵکدارەکان و سـەرۆک هۆزەکان و بەرزکردنەوەی ئاسـتی گوزەران و ڕەوشـی تەندروسـتی و ڕۆشنبیریان. ئامانجە سیاسییەکانیشی هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی دەرەبەگایەتی بوو، بەشێوەیەک دەسەڵاتی سیاسییان لەناو ببات و ڕێگەنەدات بەپێی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان سیاسەتی دەوڵەت ئاراستە بکەن[١٠٠٣].

ئەم یاسـایە لەگەڵ بیروباوەڕ و ئامانجەکانی بارزانی دەهاتەوە بۆیە پشـتیوانی لێکرد. بەڵکو مستەفا بارزانی لە پێناو سەرخستنی پڕۆژەی چاکسازی کشتوکاڵی لە باشـووری کوردسـتان، ئامادەبوو ڕووبەڕووی ئاسـتەنگەکانی بەردەم جێبەجێکردنی ئەم پڕۆژە یاسایە ببێتەوە. تەنانەت سەرەتا پەنای بردەبەر ڕێکاری سەربازی لە دژی ئەو هۆزانەی دژایەتی پڕۆژەکەیان کرد، لە نمونەی شـێخ رەشـیدی لۆلان، کە لە سـەرەتای ئایاری سـاڵی ١٩٥٩ بەهۆی دەرکردنی یاسـای چاکسـازی کشـتوکاڵی، یەکەمین کەس بوو دژی ئەو یاسایە و دەسەڵاتی بارزانییەکان لە ناوچەکەدا وەستا، تەنانەت رەشید لۆلان توانیبووی هەستی ئایینی مورید و شوێنکەوتوانی دژی رژێمی نوێ بجولێنێت. لە کۆتاییدا بارزانی هێرشـی کردە سـەریان و توانی ناچاری بکات، کوردستان جێبهێڵێت و بپەڕێتەوە سنووری ئێران[١٠٠٤].

ئەم ڕێکـارانەی بـارزانی گرتییەبەر، لەبەرژەوەنـدی چینی زەحمەتکێشـی کوردسـتان، ئامانج لێیان ئەوەبوو لە جووتیاران بگەیەنێ، پەیوەندی بەتین لە نێوان داخوازی ئەوان و ئـامـانجەکـانی بزاڤی ڕزگـاریخوازی کورد هەیە. ئەمەش وایکرد جووتیاران وەک فریادڕەسێک سەیری بکەن و بە دروشـمێک پشـتگیریان بۆ کۆششـەکانی دەربڕن، کاتێک دەیانگوت:" **بژی بـابێ ئیدریسی، عەرد بە شدەکا بە گوریسی**"[١٠٠٥]. ئەم دروشـمە گوزارشـت بوو لە تێکەڵبوونی بەرژەوەندی تاک بە بەرژەوەندی نیشتمانێک، کە مستەفا بارزانی لەو ڕێگەیەوە، هەوڵیدا هەمووان پابەندی پاراستنی بکات.

---

١٠٠٣ – بورهان حاتم عثمان، بارودۆخی ئابووریی هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٥٨-١٩٧٥(لێکۆلینەوەیەکی مێژووییە)، تێزی دکتۆرا، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر ، ٢٠١٩، ل٤٦-٤٧.

١٠٠٤ – ڕەفیق ڕەحمان مام خول، س. پ، ل٩٤.

١٠٠٥ – عبدالفتاح البوتاني، منطقة بادينان ١٩٢٥–١٩٧٠...ج٢(١٩٥٨–١٩٧٠)، ص١٧.

مستەفا بارزانی بەرژەوەندییەکانی وەک ڕێبەرێکی نەتەوەیی، لە دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی گەلەکەی دەبینییەوە، وەک فوئاد عارف کە لەو کاتەی وەزیری کشتوکاڵ بوو لە حکومەتی عێراق باسی دەکات و دەڵێت:"بارزانی لەبەرئەوەی دەرەبەگ نەبوو، هیچ زەرەمەند نەبوو لەجێبەجێکردنی یاسـای چاکسـازی کشـتوکاڵی، چونکە ئەو سـەرکردایەتییەکەی لەسـەر بنەمای موڵکداری زەوی نەبوو. بەڵکو لە بەرژەوەندی بارزانی بوو، یاسـای چاکسـازی کشـتوکاڵی جێبەجێ بکرێ، بۆ لێدانی دەرەبەگە کوردەکان و سنووردارکردنی هەژموونیان"[١٠٠٦]. بەڵام گۆڕانی هەڵوێستی سیاسی حکومەتی عێراق بەرامبەر بارزانی و دۆزی کورد بەگشـتی، ڕێگرییان لە بەدیهێنانی ئەم ئامانجەیان کرد.

ئەو کاتەی عەبدولکەریم قاسم هەوڵی لاوازکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیدا، ڕاسـتەوخۆ پەنای برد بۆ ڕاکێشـانی ئەو هۆزانەی نەیاری بارزانییەکان بوون، دوای ئەوەی لە (٢٥ی حوزەیرانی ١٩٥٩) بڕیاری لێخۆشـبوونی بۆ دەرکردن[١٠٠٧]، تەنانەت چەک و موچە و دەسـتکەوتی دارایی بۆ دابینکردن، بۆ ئـامـادەکردنیـان لەپێنـاو ڕووبەڕووبوونەوەی هەر شـۆڕشـێکی چاوەڕوانکراوی کوردی[١٠٠٨]. بەو هۆیەوە یاسـای چاکسـازی کشـتوکاڵی لە باشـووری کوردسـتان بەشـێوەیەکی ڕێکوپێک جێبەجێ نەکرد[١٠٠٩]. ئەمەش یەکێک لەو خاڵانە بوو، کاریگەریی لەسـەر ئاڵۆزبوونی پەیوەنـدییەکـانی نێوان حکومەت و پـارتی دیموکراتی کوردسـتـان دروسـتکرد. لەبەرئەوەی ئاغاکان، هەژموون و پێگەی خۆیان بەدەسـتهێنایەوە و لەسـاڵی ١٩٥٩ بەدواوە دروشمیان دژی جووتیاران بەرزکردەوە[١٠١٠].

مسـعود بارزانی پێی وایە:" لەم یاسـایەدا چۆنیەتی باری کوردسـتان لەبەرچاو نەگیرابوو، چونکە خاوەنی هەزار دۆنم زەوی بەراو لە ناوچەکانی ناوەڕاسـت و خوارووداا، بەخاوەنی موڵکی مامناوەندی دەژمێردرا، کەچی لە کوردسـتاندا بەخاوەن

---

١٠٠٦ – مذكرات فؤاد عارف، م.س، ص١٨٠-١٨١.

١٠٠٧ – محمود رزوق أحمد، الحركة الكردية في العراق(دور البارزانيين في طريق الحكم الذاتي١٩١٨-١٩٦٨)، دار المعتز للنشر والتوزيع، عمان،٢٠١٤، ص١٦٣.

١٠٠٨ – ادمون غريب، م.س،ص٤٨.

١٠٠٩ – بروانە: كمال مظهر ، م.س، ص١٨.

١٠١٠ –د.عبدالفتاح علي البوتاني،منطقة بادينان ١٩٢٥-١٩٧٠دراسة في الوقائع والتطورات السياسية،ج٢(١٩٥٨-١٩٧٠)، أربيل، ٢٠١٧، ص١٨.

موڵکێکی زۆر زل دادەنرا. لەسەرەتادا یاسای چاککردن دەستێکی باشی لە دەرەبەگ وەشاند، بەڵام گۆڕانێکی بنەبڕی بۆ ژیانی جووتیارانی کوردستان بەدی نەهێنا"[١٠١١]. بۆیە پارتی دیموکراتی کوردستان پێشنیازی کەمکردنەوەی ڕووبەری موڵکدارێتییان کرد. ئەمەش بۆ وەدیهێنانی دادپەروەری و سوودمەندبوونی زیاتری جووتیاران و لاوازکردنی پێگەی دەرەبەگ و ئاغاکان[١٠١٢]. لەم سۆنگەوە مستەفا بارزانی پێی وابوو، ناکرێت پشکی موڵکدارێک شەش هێندەی جووتیارێک بێت[١٠١٣]. مەبەست لەمەش نیشاندانی ئەو جیاوازییە فراوانە بوو، کە یاساکە لە نێوان موڵکی جووتیارێک و موڵکدارێکی گەورەی زەوی لە کوردستان بەجێیهێشتبوو.

دانانی باجی نوێ بۆ زەوییەکان[١٠١٤]، و زیادکردنی ئەرکی جووتیاران بەرامبەر بەدەوڵەت لەو کاتەی بارودۆخی ئابووری کوردستان لەو پەڕی خراپی دابوو، بە جۆرێکی دیکە باری جوتیاری کوردی قورس کرد[١٠١٥]. بەو هۆیەوە نارەزاییی جووتیاران لە دەسەڵات و ئەو بڕیارەی دژی بەرژەوەندییەکانیان بوو، فراوان بوو. بەتایبەتی دوای ئەوەی شاندێک لە هۆزەکانی کورد سەبارەت بەم بابەتە لەبەغدا سەردانی عەبدولکەریم قاسمیان کرد، بەڵام ئەوەی دوایی ئامادە نەبوو چاوی پێیان بکەوێ[١٠١٦]، بۆیە شاندەکە گەڕایەوە کوردستان و بڕیاریاندا باج بە حکومەت نەدەن و ڕێگا لە جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی بگرن. ئەمەش بارودۆخی ئابووری سەختترکرد. لەبەرامبەردا حکومەت لە شوێنی ئەوەی هەوڵی چارەسەرکردن و دۆزینەوەی میکانیزمی دیکە بدات، بڕیاریدا نارەزاییەکان بەڕێکاری سەربازی سەرکوت بکات، دواجار ئەم دۆخە لە (١١ی ئەیلولی ١٩٦١) بووە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشێکی دیکەی کورد لە باشووری کوردستان [١٠١٧].

---

١٠١١ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد، بگ٢(١٩٥٨–١٩٦١)، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٢٠، ل٧٣.

١٠١٢ – بڕوانە: خەبات/النضال(جريدة)، ع(٣٢٦)، ١٩٦٠/٩/٣٠.

١٠١٣ – بورهان حاتم عثمان، بارودۆخی ئابووریی هەولێر ، ل٦١.

١٠١٤ – أوريل دان، م.س، ص٧٣.

١٠١٥ – ماجد عبدالرضا، القضية الكردية في العراق، بغداد، ١٩٧٥، ص١١٤.

١٠١٦ – ڕەفیق ڕەحمان مام خول، س. پ، ل١١٣.

١٠١٧ – عبدالخالق العامري، م.س، ص١٥٦.

کاتێک شۆڕش هەڵگیرسا، بەشێکی ئەو هێزانەی هاوسەنگەری سوپای عێراق بوون، لەبەرامبەر شۆڕشگێرانی کورد، هێزی ئەو هۆزانە بوون، کە لەبەرامبەر فەرامۆشکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی لە ناوچەکانی باشووری کوردستان و مانەوەی دۆخ و سیستەمی دەرەبەگایەتی، چوونە بەرەی دژە کورد[١٠١٨]. ئەو بارودۆخە سەرەڕای ئەوەی زیانی گەورەی بە بەرژەوەندی هاوڵاتیان و جووتیارانی کورد گەیاند، هاوکات لە ڕووی سیاسییەوە لێکترازانی گەورەی لەنێو ماڵی کورد دروستکرد، لە ئەنجامی دابەشبوونی خەڵکەکەی بەسەر دوو بەرەی شەڕی جیاواز لەیەکتری. بەو هۆیەوە لە (هاوینی١٩٦١) بارزانی هێرشی کردە سەر زێباری و ڕێکانی و برادۆستییەکان و لەناوچەکانی خۆیان دووری خستنەوە[١٠١٩]. بەڵام ئەم هەڵوێستەی بارزانی وایکرد ئەو هۆزانە زیاتر لە حکومەتی عێراق نزیکببنەوە، لەبەرئەوەی هەردوولا، ئامانجیان لەناوبردنی مستەفا بارزانی و شۆڕشی کورد بوو. ئەمەش وایکرد لە پێناو دوورخستنەوەی هۆزە کوردییەکانی دیکەی کورد لەبەرەی دەسەڵات، بارزانی بچێتە ناو دەرەبەگ و ئاغاکانی سلێمانی و داوایان لی بکات پشتگیری شۆڕش بکەن، وەک وەڵامدانەوەیەکی واقعییانەی ئەو دۆخەی، کە بارزانی بەهۆی هەڵگیرساندنی شۆڕش ڕووبەڕووی بویەوە[١٠٢٠]. لەم هەوڵەدا مستەفا بارزانی تا ڕادەیەک سەرکەوتوو بوو، چونکە توانی پشتیوانی بەشێک لە هۆزەکان بۆ شۆڕشی کورد بەدەستبێنێ[١٠٢١]. بەڵام عەبدولکەریم قاسم بۆ دوورخستنەوەی هۆزە کوردییەکان لە بارزانی، بڕیاریدا یاسای چاکسازی کشتوکاڵی تەنها لەناوچە شاخاوییەکاندا جێبەجێ بکات[١٠٢٢].

---

١٠١٨ – بۆ ناسینی ناو و ناونیشانی ئەم سەرۆک هۆز و کەسایەتییانەی لەدوای هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە (موسڵ ، هەولێر ، کەرکوک ، خانەقین) چوونە بەرەی حکومەتی عێراقی، بڕوانە: نعمان ماهر الكنعان، ضوء على شمال العراق، دار الجمهورية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٦٥، ص ٢٣–٤٧.

١٠١٩ – دانا ئادامز شمیدت، س.پ، ل١٤٧.

١٠٢٠ – ادمون غريب، م.س،ص٥٢.

١٠٢١ – بۆ ناسینی ئەم هۆزانەی لە سنووری سلێمانی پەیوەندییان بە شۆڕشی کورد کرد، بڕوانە: كمال مجيد، النفط والاكراد (دراسة العلاقات العراقية– الايرانية– الكويتية)، دار الحكمة، لندن، ١٩٩٧، ص٤٥.

١٠٢٢ – ادمون غريب، م.س،ص٤٨.

مستەفا بارزانی لە ساڵی (١٩٦٤) هەوڵیدا بەر لەم سیاسەتە دوو جەمسەرەی دەسەڵات بگرێ، لە ڕێگای پێکهێنانی دامەزراوەکانی شۆڕش لەناوچە ئازادکراوەکان و دەرکردنی دەستوری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق، بۆئەوەی لە ڕێگای ئەو یاسا بەرکارانەی لە دوای دەرچوونی دەستورەکە جێبەجێکران، کار بۆ جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی لە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی شۆڕشی کورد بکات، ئەمەش بە کردار ئەنجامدرا، بۆ نمونە لە (١٩ی تشرینی دووەمی ١٩٦٤) بەهۆی سکاڵای جووتیاران لە موڵکدارەکانی زەوی لە (٨) گوندی سەر بە ناحیەی قوشتەپە کە بریتی بوون لە:( چۆمە زەردەلە، برایمەلەک، سیبیران عەولا، هێلەوە، دووگردکان، سێبیران ئاغا خدر، پیرداود، قۆریتان)، بارزانی بەشێکی زەوی موڵکدارەکانی بەسەر جووتیاران دابەشکرد[١٠٢٣].

لەبەردەوامی ئەو هەوڵەدا، مستەفا بارزانی بەهاوکاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق، لەڕێگای هەموارکردنی دەستور لەساڵی(١٩٦٨)، کاریکرد بۆ گرتنەبەری ڕێکاری دیکە بۆ جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی لەناوچە ئازادکراوەکان[١٠٢٤]. بەڵام هەندێک ئاستەنگ لەبەردەم ئەم کارە دروست بوون، کە بەشێکیان پەیوەندییان بە پاراستنی هاوسەنگی هێز هەبوو، بەو هۆیەوە ئەنجامی ئەرێنی بەدەست نەهات، لەبەرئەوەی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد مەترسی هەبوو لەوەی هۆزە کوردییەکان بەهۆی جێبەجیکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی سەنگەر بگوازنەوە بەرەی دەسەلات. بەم شێوەیەش نەگونجا چاکسازی کشتوکاڵی لەناوچە ئازادکراوەکان بەڕێکوپێکی جێبەجێ بکرێ[١٠٢٥]، بۆیە بارزانی هەوڵیدا ئەم یاسایە لەلایەن حکومەتی عێراق جێبەجێ بکرێ، بۆئەوەی ڕووبەڕووی دۆخی سەنگەر گواستنەوەی هۆزەکان نەبێتەوە[١٠٢٦].

---

١٠٢٣ – بورهان حاتم عثمان، بارودۆخی ئابووریی هەولێر ، ل٥٧.

١٠٢٤ – بروانە: ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان... ل٣١،٦٨.

١٠٢٥ – د. كاظم حبيب، لمحات من نضال حركة التحرر الوطني للشعب الكردي في كردستان العراق، دار أراس للطباعة والنشر، أربيل، ٢٠٠٥، ص٣٥٢.

١٠٢٦ – الحيزب الديمقراطي الكوردستاني، طريق الحركة التحررية الكردية، التقرير السياسي المصادق عليه من قبل كونفرانس الحيزب المنعقد في اب ١٩٧٦ وقد اقره المؤتمر التاسع للحيزب الديمقراطي الكردستاني المنعقد في تشرين الثاني ١٩٧٩، د.م، د.س، ص٢٠.

شیاوی باسە سەرکردایەتی سیاسی کورد سەرباری ئەم دۆخە، بەردەوام بووە لەسەر پێداگرییەکانی، بۆ جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی لە ناوچەکانی کوردستان. دواجار بووە هۆی ئەوەی کاربەدەستانی بەغدا لە چوارچێوەی ڕێککەوتننامەی (١١ی ئاداری١٩٧٠)، بڕیار لەسەر جێبەجێکردنی یاسای نێوبراو لە ناوچەکانی باشووری کوردستان بدەن. دوای ئەوەی بڕگەیەکیان لەو ڕێککەوتنە تایبەت کرد بە چاکسازی کشتوکاڵی لە کوردستان کە تێیدا هاتووە:"دەسوبردکردن بۆ جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی لە ناوچەی کوردەواریدا لەگەڵ گۆڕینی بەجۆرێکی وا کە نەهێشتنی پەیوەندی دەرەبەگایەتیمان بۆ مسۆگەر بکا و پارچە زەویەکی باش دەست جووتیارە کوردەکان بخات، هەروەها لێخۆشبوون لە جووتیارە کوردەکان لەو خەرج و باجە کشتوکاڵییەی ئەم چەند ساڵە کەلەکەی کردووە لەسەریان"[١٠٢٧].

بەم شێوەیە، ئەم ڕێککەوتنە لەگەڵ ئامانجە سیاسییەکانی، توانی بەشێک لە ئامانجە ئابوورییەکانی سەرکردایەتی شۆڕش لە پێناو خۆشگوزەرانی خەڵکی کوردستان بێنێتەدی، ڕۆژنامەی (براڤدا)ی سۆڤیەتی لە ڕاپۆرتێکیدا ئاماژەی بەوە کردووە، ڕێبەری کورد مستەفا بارزانی خۆشحاڵە بەڕێککەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠، چونکە پێی وابوو ڕێککەوتنەکە هەنگاوێکی ئەرێنییە بۆ جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی لە باشووری کوردستان[١٠٢٨]. بۆ هەڵگرتنی ئاستەنگ و لەمپەرەکانی بەردەم جێبەجێکردنیشی، بارزانی لە دیدارێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی (الثورة)ی عێراقیدا دەڵێت:" ئێمە پشتگیری بەهێز لە جێبەجێکردنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی و دابەشکردنی زەوی بەسەر جووتیاران لەناوچەکانی باکوور دەکەین، هاوشێوەی ئەوەی لە ناوچەکانی دیکەی عێراقدا جێبەجێ دەکرێ، بۆ ڕزگارکردنی جووتیار لەژێر دەستی دەرەبەگەکاندا"[١٠٢٩].

لەڕاستیدا ڕێککەوتنامەی ئاداری ساڵی١٩٧٠، جێگیربوونێکی ڕێژەیی لە بواری ئابووریدا هێنایە دی، بەتایبەتی دوای ئەوەی یاسای چاکسازی کشتوکاڵی

---

١٠٢٧ – برایەتی(گۆڤار)، ژ(١)، خووڵی دووەم(١٩٧٠/٦/١)،ل٨٠٧.

1028–СОГЛАШЕНИЕ ОБ УРЕГУЛИРОВАНИИ КУРДСКОЙ ПРОБЛЕМЫ, ООПРАВДА, №: 72 [18850], 13 марта 1970 г, С.13.

١٠٢٩ – الثورة(جريدة)، ع(٤٧١)، ١٦ أذار ١٩٧٠، ص١.

ژماره(١١٧) لەهەمان ســـاڵ دەرچوو[١٠٣٠]، چونكە لە كاتی جێبەجێكردنیدا، زۆربەی ڕەهەندە ڕاستەقینەكانی خۆی لە باشووری كوردستان هێنایەدی[١٠٣١].

**ب) مستەفا بارزانی و مەسەلەی نەوت**

سیاسـەتی پەراوێزخسـتنی كورد كە حكومەتە عێراقییەكان پەیڕەویان دەكرد، لە هەڵسوكەوتەكانیاندا لەگەڵ كوردی كەركوك، لەسەردەمی پادشایەتییدا (١٩٢١_١٩٥٨) ڕوون و ئاشـكرا دیاربوو. هەر لە دەسـتپێكدا كەمترین كوردیان لە كۆمپانیای نەوت دامەزراند. پاشـــان لەســـەردەمی كۆماریدا حكومەتە یەک بەدوای یەكەكانی عێراق، بەتایبەتی حكومەتی بەعس، كاریكردووە بۆ وێرانكردنی ئاواییە كوردییەكانی نزیک كۆمپانیای نەوت و ڕاگوێزانی دانیشـــتوانەكان و دەركردنی كارمەندانی كورد لە كۆمپانیای نەوت و گواستنەوەی فەرمانبەرانی كوردی كەركوک بۆ دەرەوەی شار و پـارێزگـاكە. ئەم هەنگـاوە هـاوتەریـب لەگەڵ هێنـانی خەڵكی عەرەب بۆ كەركوك، فـاكتەری گرنـگ بـوون بۆ دابەزینی ژمـارە و ڕێـژەی كـورد لە كەركوک و بەرزبوونەوەی ژمارە و ڕێژەی عەرەب لە شوێنیاندا[١٠٣٢].

مســـتەفـا بـارزانی لەهەردوو ســـەردەمـدا، هەوڵی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم سـیاسـتەی داوە. ڕۆژنامەنووسـێكی ئەمریكی باسـی ئەم بابەتە دەكات و دەڵێت: " بارزانی دڵســـۆزی جێگیری بۆ هیچ لایەنێک نەبووە جگە لە كوردســـتان. ئەوانەی ڕەخنەیان لێدەگرت جەختیان لەسەر ئەوە دەكردەوە، پێناسەی بارزانی بۆ كوردستان لە ســـنووری هۆزەكەی زیاتر تێپەڕی نەدەكرد، بەڵام دەســـتگرتنی بەســـامانی

---

١٠٣٠ – قانون الاصلاح الزراعي رقم(١١٧) لسنة ١٩٧٠، الوقائع العراقية(جريدة)، ع(١٨٨٤)، ١٩٧٠/٥/٣٠.ئەم یاسایە كە لە(٥٠) ماددە پێكهاتبوو. سنووری موڵكداریێتی لەچاو یاساكەی دیكەی چاكسازی كشتوكاڵی كەمتر كردەوە. بەمەش ڕووبەرێكی زیتر لە زەوی دەستی بەسەرداگیراو، ژمارەیەكی زیتریش لە جووتیاران لە دابەشكردنی زەوی بەبێ بەرامبەر سوودمەندبوون. بورهان حاتم عثمان، بارودۆخی ئابووریی هەولێر، ل٥٩.

١٠٣١ – كێشەی زەوییە كشتوكاڵییەكان لە كوردستانی عێڕاقدا، دیراسە ژمارە(١٨)، پارتی دیموكراتی كوردستان(مەكتەبی سیاسی) مەكتەبی ناوەندیی دیراسات و توێژینەوە، چ١، لە بڵاوكراوەكانی مەكتەبی ناوەندی دیراسات و توێژینەوە، هەولێر، ١٩٩٦، ل ٤١.

١٠٣٢ – د. جەبار قادر، كەركووک و نەفرەتی نەوت و ستەمی دیمۆگرافیا، چ٢، كوردستان، ٢٠٢٢، ل٩٤.

کوردســتان لە پێشــەنگیشــیان نەوتی کەرکوک، یەکێک بووە لە دیارترین چەکەکانی خاوەنداریێتی دەکرد لە خەباتی خۆی لەپێناو نیشــتمانەکەی"[١٠٣٣]. تێڕوانینی ئەم ڕۆژنامەنووســـە پشـــتی بە داواکاری و پێداگرییەکانی بارزانی بەســـتووە، بۆ دەســتەبەرکردنی پشــکی کورد لە داهاتی نەوتی عێراق، کە لە دانوســتانەکانی لەگەڵ حکومەتی عێراق و دیدارە ڕۆژنامەوانییەکانی لەگەڵ ئاژانســـەکانی هەواڵی جیهانی دەیخستەڕوو[١٠٣٤].

بێگومان ئەو هەڵوێســـتەی مســـتەفا بارزانی، دەرئەنجامی ســـیاســـەتی فەرامۆشکردنی مافەکانی گەلی کورد بووە لەلایەن دەسەڵاتدارانی بەغدا. ئاشکرایە کە عێراق هەر لەســەرەتای دامەزراندنی لە ساڵی ١٩٢١، بەشی هەرە زۆری داهاتەکانی لە ڕێگەی نەوتەوە بوو، ئەویش بڕی هەرە زۆری لە بیرە نەوتیەکانی کەرکوک دەردەهێنرا[١٠٣٥]، بەڵام کاربەدەســتانی بەغدا لەشــوێن ئەوەی بەشــێکی ئەو داهاتە بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردســتان تەرخان بکەن، بەپارەی ئەم نەوتە ئەوەندەی دەرفەتیان وەرگرتووە بە ناوی شــەڕ و شــۆڕشــەوە، کوردســتانیان پێ وێران کردووە[١٠٣٦]. بەو هۆیەوە پرسی داهاتی نەوت و دابەشکردنی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە، یەکێک بووە

---

١٠٣٣ - جوناثان راندل، م.س، ص ١٨٠.

1034 – Nous détruirons le complexe pétrolier de Kirkouk si les bombardements se poursuivent " nous déclare le représentant du général Barzani, Le Monde, 03 juillet 1974.

١٠٣٥ - کانە نەوتییەکانی کەرکوک و خانەقین و عەین زاڵە، لە ساڵی ١٩٦١ بەڕێژەی (٨٠%) بەشداربوون لە بەرهەمهێنانی نەوت لە عێراق. لە کاتێکدا داهاتی ئەم وڵاتە لەم ساڵەدا (٩٠%) لە هەناردەکردنی نەوت بوو. لە ساڵی ١٩٧٥ کاتێک نرخی بەرمیلێک نەوت گەیشتە(١١،٢٥) دۆلار، داهاتی عێراق لە نەوت نزیکەی(٢٨٣٤) ملیۆن دینار بوو. ئەو کات بەرهەمی نەوتی کەرکوک و خانەقین و عەین زالە، نزیکەی(٧٥%) کۆی بەرهەمی نەوتییان پێکدەهێنا. بە شێوەیەک داهاتی عێراق لە نەوتی کوردستان ساڵی ١٩٧٤ گەیشتە (٥،٧٦٣) ملیۆن دۆلار. جیرارد جالیاند، شعب بدون وطن(الکرد و کردستان)، ت: عبدالسلام النقشبندي، دار اراس للطباعة والنشر، اربیل،٢٠١٢، ص٢٥١.

1036 –100 Towns Reported Destroyed in Kurds' Revolt Against Kassim, The New York Times, April 24, 1962, P. 1.

لەو بابەتانەی بەدرێژایی ماوەی ڕێبەرایەتیکردنی مستەفا بارزانی لە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیدا، داواکاری سەرەکی شۆڕش بووە[١٠٣٧].

مستەفا بارزانی لەسەرەتای خەباتی نەتەوەیی خۆیدا، تیژی خۆی سەبارەت بە سامان و سەرچاوە سروشتییەکانی خاکی کوردستان هەبوو. لەم سۆنگەوە لە کۆنفرانسی باکۆ لە (١٩ی کانونی دووەمی ١٩٤٨) دەڵێت:" هەموو مەعادنی ژێر عەرد وە بەتایبەتی مەعدەنی نەوت پێویستە ئیستحسال[بەدەستبهێنرێ] بکرێت"[١٠٣٨]. ئەو پەیامەی بارزانی بانگەوازێک بوو بۆ خۆماڵیکردن و دەرهێنانی ئەو سامانە نیشتمانییە لەژێر دەستی کۆمپانیا قۆرخکارییە بیانییەکان.

ڕەهەندە سیاسییەکەی پرسی نەوت، هاندەر بوو بۆ پارتی دیموکراتی کوردستانیش لە کۆنگرەی چوارەمی لەساڵی ١٩٥٩، بەرنامەی (خۆمالیکردنی نەوتی عێراق) و دابینکردنی پشکی کورد لەداهاتی نەوت و پیشەسازییە قورسەکانی، بخاتە ناو بەرنامەی کاری سیاسی خۆی[١٠٣٩]. پاشان پرسی نەوت، وەک داخوازی و بابەتێکی سیاسی لەلایەن مستەفا بارزانییەوە مامەڵەی لەگەڵ کراوە، بۆیە هەمیشە لە دانوستانەکانی لەگەڵ حکومەتی عێراق و پەیامە سیاسییەکانی بڵاوی دەکردنەوە، جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە دەبێ ڕێژەی کورد لە داهاتی نەوتی عێراق، بەپێی ڕێژەی دانیشتوانی کوردستان لەم وڵاتە دیاری بکرێ[١٠٤٠]. ئەم داخوازییەش بۆ ئەوە بووە کورد وەک نەتەوە سەنگ و هێزی ئابووری نیشتمانی خۆی بەدەستبێنی.

بەدرێژایی ئەو ماوە مێژووییە، حکومەتەکانی عێراق کە لەدوای شۆڕشی(١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) یەک بەدوای یەکدا هاتوون، نەچوونەتە ژێرباری ئەو خواستە نەتەوەییەی کورد، بەو هۆیەوە دەستەیەکی پارتیزانی هیزی پێشمەرگە لە شەوی(١١-١٢ی تشرینی دووەمی١٩٦٢) هێرشیان کردە سەر دامەزراوە نەوتییەکانی ( عەین

1037 -CIA-RDP79T00889A000900040001-6, Iraq Under Baath Rule, 1968-1976,November 1976, p.14.

١٠٣٨ - بۆ بینینی دەقی ووتارەکەی مەلا مستەفا بارزانی، بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە(٤) لە:مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی...، بگ١( ١٩٣١-١٩٥٨)، ٢٠٢٠، ل٣٧٣.

١٠٣٩ - مێژووی پارتی دیموکراتی کوردستان- کۆنگرە و کۆنفرانس( پرۆگرام و پەیڕەوی ناوەخۆ)، دەستەی ئینسکلۆپیدیای پارتی دیموکراتی کوردستان، بگ:١،هەولێر، ٢٠٢١، ل١٠٨.

1040 - NAA A1838,173/2/6/1, Part-1, Iraq- Political- States Kurds, 8 Feb 1963, p.2.

زاله ) و ماوەیەک پرۆسەی دەرهێنان و هەناردەکردنیان لەم کانە نەوتییانەدا پەکخست[١٠٤١]. مەسعود بارزانی سەبارەت بەو هێرشە نووسیویەتی:" ئەم هەڵمەت بردنە سەر عەین زاله و دەست بەسەرداگرتنی بۆ ماوەیەک، کارێکی بوێرانە و ورد نەخشە بۆ کێشراوی کەس نەکردە بوو"[١٠٤٢].

لێرەدا دەتوانین بڵێین، ئەم پەیامەی سەرکردایەتی سیاسی کورد لە ڕێگای تەقاندنەوەی کانەکانی نەوت گەیاندنی، ئەوەندەی پەیوەست بوو بە حکومەتی عێراق، بۆ بەدەنگەوەهاتنی داخوازییەکانی کورد، ئەوەندەش پەیوەندی هەبووە بەم وڵاتانەی بەرژەوەندییان لەگەڵ حکومەتی عێراق هەبوو، بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی کۆمپانیا نەوتییەکانیان پشکیان لە سامانی نەوتی عێراق هەبوو، لەسەرووشیانەوە بریتانیا، بۆ ئەوەی چیتر چەک بە حکومەتی عێراق نەفرۆشن، یان بێدەنگی لە قڕکردن و لەناوبردنی گەلی کورد نەنوێنن و کار بۆ ڕاگرتنی پرۆسە سەربازییەکانی حکومەتی عێراق بکەن بۆ سەر ناوچەکانی کوردستان. بەم جۆرە وڵاتە زلهێزەکان، لەوە تێگەیشتن کە بارزانی هەر کات مەبەستی بێت، دەتوانێ هەڕەشەی ڕاستەقینە لەسەر بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی عێراق و ئەوان دروست بکات[١٠٤٣]. بەڵام بارزانی تا ناچار نەبووبێ، دەستی بۆئەم کردارە نەبردووە، لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندیی گەلانی عێراق بەگشتی[١٠٤٤].

دوای کودەتای(٨ی شوباتی ١٩٦٣)، شاندێکی حکومەتی عێراق لە سەرەتای ئاداری ١٩٦٣ سەردانی بارەگای بارزانی کرد و مەلا مستەفایان بینی. لەو دیدارەدا بارزانی داوای تەرخانکردنی (٣/١) داهاتی نیشتمانی لە نەوت بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی کرد[١٠٤٥]. دوای ئەنجامدانی چەند کۆبوونەوەیەک لە نێوان هەردوولا، حکومەتی

---

1041 –NAA A1838,173/2/61, Part–1,Iraq– Political– States Kurds, 13 August 1963, p.4.

١٠٤٢ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی...(١٩٦١–١٩٧٥)، ٢٠٢٠، ل٩٥.

1043 –Les négociations entre le gouvernement et les rebelles kurdes seraient près d'échouer,LeMonde,02 mars 1963.p.3.

1044–NAA;A1838,173/2/6/1–Part1,Reserch Department Memorandum(The Kurdish Problem in Iraq 1958– 63), August 13,1963, p.8.

1045 –Dana Adams Schmidt, Kurds Threaten To Resume Fight, The New York Times,March 2, 1963,pp.1,2.

عێراقی پێشـــنیازی (دانپێدانان بە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لەســـەر بنەمای ئۆتۆنۆمی)ی خســـتەڕوو، بەڵام بـارزانی ڕێککەوتن و بەئەنجـام گەیشـــتنی دانوســـتانەکانی، بە یەکلاییکردنەوەی چارەنووســـی کەرکوکی لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی بەســـتـایەوە. لەبەرامبەردا حکومەتی عێراق ڕایگەیـانـد، بەهۆی پـابەنـدبوونی بە جێبەجێکردنی گرێبەستە نێودەوڵەتییەکانی نەوت، بەهیچ شێوەیەک ڕازی نییە پرسی کەرکوک بخرێتە نـاو دانوســـتـانەکانەوە[١٠٤٦]. بەردەوام بونیشـــیـان لەســـەر ئەم هەڵوێســـتەیان بەرامبەر بە کورد، وەک لە بەڵگەنامەیەکی ئەمریکادا هاتووە، دیارە لەلایەن حکومەتی ئەمریکا پشـــتگیری کراوە، لەبەرئەوەی حکومەتی ئەمریکا ئەم داخوازییەی مســـتەفا بـارزانییـان بەرامبەر بە حکومەتی عێراقی، بە هەوڵـدان بۆ دروستکردنی دەوڵەتێک لەناو دەوڵەتێکی دیکە سەیر کرد[١٠٤٧].

بەهۆی مەترســـی زلهێزەکـان لە داخوازییەکەی بـارزانی، ڕۆژنـامەنووســـێکی ئەمریکی بەمەبەستی ئەنجامدانی دیدارێکی ڕۆژنامەوانی، هەر لەم ماوەیەدا سەردانی بارزانی کرد و لێی پرســـی مەبەســـتت لە ئۆتۆنۆمی چییە؟ لە وەڵامدا بارزانی بە ڕۆژنامەنووسەکە ڕاگەیاند:" ئەو مەبەستی لە ئۆتۆنۆمی کوردستانە، بە یەک لەسەر ســـێی داهـاتی نەوتەکەیەوە، کە ڕێژەیەکی گونجاوە لەگەڵ ژمـارەی دانیشـــتوانی کوردســـتان. جگە لە داراییەکی تایبەت بەهەرێمەکە و پڕۆژەکانی گەشـــەپێدانی"[١٠٤٨]. لێرەدا بارزانی مەبەســـتی بوو ئەو پەیامە بەزلهێزەکان بدات، کە بەبێ ڕەچاوکردنی بەرژەوەنـدییەکـانی کورد، هەمیشـــە بەرژەوەنـدییەکـانی ئەوانیش دەکەوێتە ژێر هەڕەشـــەی لەناوچوون. لە ڕێگای تەقاندنەوەی بیرە نەوتییەکانی خاوەندارێتیان دەکرد. ئەم هەڵوێســـتەی بـارزانی دوای واژووکردنی یەکێک لە گرێبەســـتەکانی فرۆشتنی چەک هات، کە لە سـاڵی ١٩٦٣ لەنێوان هەردوو حکومەتی بریتانیا و عێراق ئەنجامدرا[١٠٤٩]. چونکە لە دوای واژووکردنی گرێبەستەکە، جەلال تاڵەبانی لەدیدارێکی لەگەڵ پەیـامنێرێکی ڕۆژنـامەی (نیویۆرک تـایمز)ی ئەمریکی ڕایگەیـانـد:"کوردەکـان هێلەکانی گواستنەوەی نەوت دەتەقێننەوە، ئەگەر بریتانیا بەردەوام بێ لە پێدانی چەک

---

١٠٤٦ – دیفید مکدول، م.س،ص٤٧٧،٤٧٦.

1047 – CIA-RDP79-00927A004800110003-7, THE KURDISH WAR—ROUND FOUR, WASHINGTON, April 23, 1965, p.3.

١٠٤٨ – دیفید ادامسن و جرجیس فتح الله، م.س، ص٢٦٤.

١٠٤٩ – دینیس کوماروف، م.س، ص٧٤.

به حکومەتی عێراقی"[١٠٥٠]. دواجار سـەرکردایەتی کورد قسـەکانی وەرگێڕا بۆ کردار و شـۆڕشـگێرانی کورد دوو بیرە نەوتی دیکەیان وەک پەرچەکردارێک بەرامبەر ئەم هەڵویسـتەی حکومەتی بریتانیا لە کەرکوک تەقاندەوە، کە خاوەندارێتییان دەگەڕایەوە بۆ کۆمپانیا بریتانییەکان[١٠٥١].

حکومەتی عێراقی سـەرباری ئەو هەڕەشـانەی ڕووبەڕووی دەبویەوە لەلایەن شـۆڕشـگێران لە وێرانکردنی سـەرچاوەکانی نەوت، بەڵام نەیتوانی بە داواکارییەی بارزانی سەبارەت بە کەرکوک و نەوتەکەی ڕازی بێت، ئەوان ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد، ئەم شـارە لەسـەرەتای ئەوسـەدەیە بەر لە دەرهێنانی نەوت، لە بنەڕەتدا شـارێکی تورکمـانی بووە، بەڵام دوو پێکهـاتەی دیکەی کوردی و عەرەبی تێـدا بووە[١٠٥٢]. بێگومـان ئەوەش لە ڕووی مێژووییەوە ڕاسـت نییە، چونکە لەو مـاوەیەدا هیچ سەرژمێرییەک نەکراوە و ئەوەی هەبووە تەنیا مەزەندە بووە.

تێکەڵکردنی پرسـی کەرکوک و ناوچە کوردییەکانی دیکەی دەوڵەمەند بە نەوت، بە دانوسـتانەکان بۆ بەڕێوەبردنی ئەم ناوچانە بەشـێوەی لامەرکەزیەت، کاریگەرییان لەسـەر سـیاسـەتی حکومەتی عێراقی دروسـتکرد، بۆ ئەوەی هەوڵبدەن لە ڕێگای پیادەکردنی سیاسەتی (بەعەرەبکردن)[١٠٥٣]خۆیان لە مەترسی لەدەستدانی ئەم ناوچانە ڕزگـاربکەن،[١٠٥٤]. بەو هۆیەوە پرۆسـەی بەعەرەبکردن لە کەرکوک و هەولێر دەسـتپێکرد. هەر لەم مـاوەیەدا حکومەتی عێراقی زیـاتر لە (٣٨) ئـاوایی لە نزیک هەردوو کێڵگەی (باباگوڕگوڕ) و (بای حەسـەن) وێرانکرد، ئەوانەشـی وەک پاسـەوان و کرێکار لەم کێڵگانە کاریان دەکرد، دوورخرانەوە و ڕاگوێزران. هاوکات دەسـتیکرد

---

1050 –Dana Adams Schmidt ,Iraqi Troops Driving on Kurdish Rebels' Centers, The New York Times, June 13, 1963.p.7,13.

١٠٥١ – دینیس کوماروف، م.س، ص٧٤.

١٠٥٢ – جوناثان راندل، م.س، ص١٩٠.

١٠٥٣ – سەبارەت بە وشە و دەستەواژە و شێوەکانی بەعەرەبکردن، بروانە: الشيخ أبراهيم اليازجي، اللغة والعصر– التعريب، دار الكتب العلمية، بيروت، ٢٠٢١، ص٧٨.

١٠٥٤ – ماريا خاروداكي، الكرد والسياسة الخارجية الامريكية ( العلاقات الدولية في الشرق الاوسط منذ ١٩٤٥)، دار أراس للطباعة والنشر، أربيل، ٢٠١٣، ص٢٧٦.

بە دەرکردنی کرێکار و کارمەندانی کورد لە کۆمپانیای نەوت. لەبەرامبەردا خەڵکی دیکەی لە دەرەوەی پارێزگای کەرکوک هێنا شوێنیان و کاری پێ کردن[1055].

ئەم بارودۆخەی لە کەرکوک و ناوچەکانی دیکەی کوردستـــان لە دژی گەلی کورد دەگوزەرا، بارزانی نیگەران کرد، ئەمەش لە کاتێکدا بوو، حکومەتی عێراقی لە (١٠ی شـــوباتی ١٩٦٤) لەگەڵ بـارزانی گەیشـــتبووە جۆرێک لە ڕێککەوتن. لەم سۆنگەوە لە (١١ی تشـرینی یەکەمی١٩٦٤) دوو نامەی بۆ هەریەک لە عەبدولسـەلام عارفی سـەرۆک کۆمار و تاهیر یەحیای سـەرۆک وەزیرانی عێراق نارد و لە یەکێک لەو خاڵانەی ئاماژەی پێکرد، نووسـی:" لە شـاری کەرکوک هەزاران خێزانی کورد لەماڵەکانیان دەرکراون، خێزانی عەرەب هاتونەتە شـوێنییان. بەشـێک لە بەرپرسـان گوتاری ئەوەیان داوە، کە ئەو پرۆسـەیە لەپێناو بەعەرەبکردنی عێراق ئەنجام دراوە، ئەمەش بە لە ناوبردنی کورد نەبێ بەدی نایەت"[1056]. لە بەردەوامی هەوڵەکانیشـیدا مستەفا بارزانی لە (٢٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٤) جارێکی دیکە نووسراوێکی دیکەی ئاراسـتەی سـەرۆک وەزیرانی عێراق (تاهیر یەحیا) کرد، لە نێو ئەو داواکارییانەی خستبیەڕوو، داوای گێڕانەوەی هۆزە عەرەبەکانی کرد، کە بەعسییەکان لە گوندەکانی کوردستان نیشتەجێیان کردن، بۆ ناوچە ڕەسـەنەکانی خۆیان و گێڕانەوەی خاوەنە شەرعییەکانیان بۆ ناوچەکانیان[1057]. بەڵام حکومەتی عێراقی داوایەکەی مەلا مستەفا بـارزانی ڕەتکردەوە و ڕایگەیـاند، کە تەواوی پـابەنـدیەکـانی خۆیـان بەرامبەر بە ڕێککەوتنی شوباتی ١٩٦٤ جێبەجێکردووە[1058].

وەک پەرچەکردارێک لەبەرامبەر ئەم هەڵوێسـتەی حکومەتی عێراقی بەرامبەر داخوازییەکانی کورد ، مسـتەفا بارزانی لە (١٢ی نیسـانی ١٩٦٥) پەیامێکی زارەکی لەڕێگای هەریەک لە (شـەمسـەددین موفتی)[1059] و (مەسـعود بارزانی)، گەیاندە

---

١٠٥٥ – جەبار قادر، س.پ، ل١١٢.

١٠٥٦ – بروانە یاداشتی بارزانی بۆ مشیر روکن عەبدولسەلام عارف سەرۆک کۆماری عیراق لە: دارا عەتار، س.پ، ل٣٣.

١٠٥٧ – خەبات(جريدة)، ع(٤٧٤)، تشرين الثانی ١٩٦٤، ص٨

١٠٥٨ – دیفید مکدول، م.س،ص٤٨١.

١٠٥٩ – کەسایەتییەکی نیشتمانپەروەری بنەماڵەی موفتییەکانی هەولێر بووە، ئەو کات بەناوی خوازراوی (ئەمیر قاسمی) نوێنەری شۆڕشی ئەیلول بووە لە تاران. لە کۆتایی ساڵی ٢٠١٢ لە سلێمانی

باڵیۆزخانەی حکومەتی ئەمریکا لە تارانی پایتەختی ئێران. لەو پەیامەدا بارزانی داوای هاوکاری(دارایی و سەربازی) لە حکومەتی ئەمریکا کرد، هاوکات داوایکرد حکومەتی ئەمریکا لە ڕێگای کۆمپانیا نەوتییەکانییەوە، هاوکاری گەلی کورد بکەن بۆئەوەی سوود لە نەوتی خۆی وەربگرێ[١٠٦٠] . بەڵام حکومەتی ئەمریکا لەبەرئەوەی بەدوای بەدەستهێنانی دەستکەوتی ئابووری بوو لە عێراقدا، داواکارییەکەی مستەفا بارزانی فەرامۆشکرد و بە بروسکەی ژمارە(٩٣٨) لە (١٤ی نیسانی ١٩٦٥) کە ئاراستەی باڵیۆزخانەکەیانی کردەوە، وەڵامی نوێنەرانی بارزانی دایەوە، کە سیاسەتی حکومەتی ئەمریکا ڕێگە بە دەستتێوەردان لە کاروباری عێراق نادات[١٠٦١]، لەبەرئەوەی کێشەی کورد لەگەڵ حکومەتی عێراقی، وەک کێشەیەکی نێوخۆیی سەیر دەکەن[١٠٦٢].

بێگومان حکومەتی ئەمریکا و وڵاتانی ئەوروپا، بەرژەوەندی ئابوورییان لەگەڵ حکومەتی عێراق هەبوو، هیچ کات بیرییان لەوە نەکردۆتەوە، هاوکاری کورد بکەن بۆ ئەوەی دەست بەسەر بیرە نەوتییەکانی باکووری عێراق بگرێ. ئەم ڕاستییەش (پاڤێل سودوپلاتۆف)ی گەورە ئەفسەری هەواڵگری سۆڤیەت، لە یاداشتەکەی خۆیدا باسی دەکات و دەڵێت:"هیچ وڵاتێکی ڕۆژئاوایی و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی عەرەبی نەیاندەویست کانە نەوتییەکانی موسڵ لە چوارچێوەی دەوڵەتی کوردی سەربەخۆ بێ و نەوت لەژێر کۆنترۆڵی کوردبێ"[١٠٦٣] .

---

کۆچی دوایی کرد. مەلا مستەفا بارزانی لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا، و: وریا ڕەحمانی، دەستەی ئینسکلۆپیدیای پارتی دیموکراتی کوردستان، هەولێر، ٢٠٢٣، ل٧٤.

1060 -F.R.U.S,1964–1968, VOLUME XXI, NEAR EAST REGION; ARABIAN PENINSULA, Document (172), Telegram From the Embassy in Iran to the Department of State, Tehran, April 12, 1965.p.384.

1061 - F.R.U.S,1964–1968, VOLUME XXI, NEAR EAST REGION; ARABIAN PENINSULA, Document (172), Telegram From the Embassy in Iran to the Department of State, Tehran, April 12, 1965.p.384.

1062 - F.R.U.S, 1961–1963, VOLUME XVIII, NEAR EAST, 1962–1963, Document (174), Circular Airgram From the Department of State to Certain Posts, Washington, March 2, 1963.p.385.

1063 -Павел Судоплатов, Разведка и Кремль. Воспоминания опасного свидетеля, 2016 ‹С.89.

مســـــتەفا بـارزانی لەهەوڵەکـانیـدا بۆ ڕازیکردنی حکومەتی عێراقی یـان وڵاتە زلهێزەکان بەداواکارییەکانی، ئامانجی دەســتەبەرکردنی پشـکی کورد بووە لە داهاتی عێراق، کە سـەرچاوە سـەرەکییەکەی لە سـنووری خاکی کوردسـتانی عێراقدا بوو. نەک دەست بەسەرداگرتن و زەفتکردنی نەوتەکەی. وەک لە دیمانەیەکی لەگەڵ دوو ڕۆژنامەنووســـی ئەلمانی لەســـاڵی (١٩٦٦) باســـی دەکات و لە گۆڤاری( تەهران مســـەوەر)ی ئێرانی وەرگێڕدراوەتە ســـەر زمـانی فـارســـی بڵاوکراوەتەوە و دەڵێت:"هەموو سـەرچاوەکانی نەوتی عێراق لەناوچە کوردیەکانە، ئێمە هەموو داهاتی نەوتمـان نـاوێ، بەڵام دەمـانەوێ ئەو داهـاتە دابەش بکرێ، ئێمە (٣) ملیۆن کوردین، ژمارەی عێراقیەکان (٥) ملیۆن کەســـە، پەیاممان ئەوەیە دەبێ داهاتی نەوت دابەش بکرێ بۆ هەشـــت بەش. (٣) بەشـــی بۆ کوردبێ و (٥) بەشـــی بۆ عەرەب[١٠٦٤]. بەو ڕێژەیە ئێمە دەتوانین خۆمان بەڕێوە ببەین"[١٠٦٥].

فەرامۆشـــکردنی داواکارییەکانی مســـتەفا بارزانی بۆ دیاریکردنی بەشـــی کورد لەلایەن دەســـــەڵاتدارانی بەغدا و بەردەوام بوونی بەشـــێک لە وڵاتانی ئەوروپی بە فرۆشتنی چەک بە سوپای عێراقی، سەرکردایەتی شۆڕشی کوردییان ناچارکرد، بیر لە بژاردەی دیکە بکەنەوە بۆ بەدەســـتهێنانی مافە نەتەوەییە کان، ئەمیش لە ڕێگای دروستکردنی هەڕەشەی سەربازی لەسەر بەرژەوەندییەکانی عێراق و وڵاتانی بیانی لەناوچە کوردییەکانی بوونە سەرچاوەی خێر بۆ هەموو لایەک، تەنها بۆ کورد نەبێت. لەم ســـۆنگەوە ڕێبەری کورد مەلا مســـتەفا بارزانی لە دیدارێکی ڕۆژنامەنووســـی بریتانی(سیمون موریسن) کە لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦ ئەنجامیداوە و لە ڕۆژنامەی (اطلا عات)ی ئیرانی وەرگێڕداروەتە ســـــەر زمانی فارســـــی، دەڵێت:" من نامەوێ بەرژەوەندی بیانییەکان زیانیان پێ بکەوێ، بەڵام من لەژێر فشاری ڕای گشتی کورد دام، ئەوانی دەڵێن ئەو نەوتەی عێراق هەناردەی دەرەوەی دەکات، بە پارەکەی چەکی

---

١٠٦٤ – ئەو ژمارەی پەیوەندی بە دانیشتوانی کوردستان و عێراق هەیە، لەم ماوە مێژووییەدا وورد نیە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ووردنەبوونی وەرگێرانی دیدارەکەی بارزانی لەگەڵ ڕۆژنامەنووسە ئەلمانەکان، لەلایەن ڕۆژنامە ئێرانییەکە. لەبەرئەوەی هیچ گومان لەوەدا نیە کە بارزانی زۆر بە ووردی زانیاری لەسەر ئەم بابەتەدا هەبووە. هەر بەو هۆیەوە ئێمە زۆر هەوڵماندا ڕۆژنامە ئەلمانییەکە بەدەستبێنین، بەڵام دەستمان نەکەوت.

١٠٦٥ – بڕوانە : ملاقات با گرگ کوهستان، تهران مصور(مجلة)، ش(١١٧١)،(١١ فوریه ١٩٦٦)، ص١.

پێ دەکرێ و لەدژی ئێمەدا بەکاری دێنێ. دواجار ئەم فشـارە بەردەوام بێ من ناچار دەبم بچمە ژێر باری ڕای گشـتی"[١٠٦٦]. دیارە بەشـێکی دیکەی هەر ئەو دیمانەیە لە گۆڤاری(ئاسـیای جوان)ی ئێرانی بڵاوکراوەتەوە، لەوێدا بارزانی زۆر ڕاشـکاوانە بە وڵاتانی ئەوروپا ڕادەگەیەنێ، ئەگەر ئەم دۆخە بەم شێوەی هەیە بەردەوام بێ، هێرش دەکەنە سەر دەزگا نەوتییەکان[١٠٦٧].

سـەرباری ئەم هەڵوێسـتەی بارزانی، کەچی حکومەتی عێراقی بەردەوام بوو لەسەر فەرامۆشکردنی داواکارییەکانی سەرکردایەتی کوردی لەسەر پرسی نەوت و پشـکی کورد. بارزانیش بەردەوام بوو لەسـەر هەڵوێسـتی خۆی، بۆیە لە (١ی ئاداری١٩٦٩)، گورزێکی سەربازی لەناکاوی لە (٣٦) خاڵ، کە لە جومگە سەرەکیەکەی ئابووری عێراق بوون، وەشـاند[١٠٦٨]. بەپێی بەڵگەنامەیەکی حکومەتی بریتانیا لە ڕێگای تەقاندنەوەی بیرە نەوتیەکانی کەرکوک لە گوندی (النمل) کە وێستگەی لابردنی کبریت بوو، وە ڕۆژانە (٥١) تەن نەوتی خاوی چارەسەر دەکرد[١٠٦٩]، بارزانی توانی پرۆسەی هەناردەکردنی نەوتی عێراق لەو بیرە نەوتیانەوە بۆ دەرەوەی وڵاتەکە پەکبخات[١٠٧٠].

ئەو گورزە سـەربازییەی هێزی پێشـمەرگە ئەنجامیدا، بەپێی زانیارییەکانی ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی، زیانەکانی لەسەر حکومەتی عێراقی، گەیشتە نزیکەی (١٠) ملیۆن دۆلار[١٠٧١]. چونکە هێرشـەکە (١٢) بیرە نەوتی کردە ئامانج، کە لە بایەخدارترین بیرە نەوتیەکانی عێراق بوون. دوای لەکارکەوتنی بیرە نەوتییەکان بۆ ماوەی یەک هەفتە. ڕێژەی هەناردەکردنی نەوت لە بۆرییە نەوتیەکانی (طرطوس) لە

---

١٠٦٦ _ من با ملا مصطفی بارزانی در جبهه ملاقات کردم، اطلاعات(روزنامه)، ش(١١٩٩٣)، ١٩٦٦/٦/٤، ص١٣،١.

١٠٦٧ – پیروزی پیش مرگ ها ملا مصطفی رهبر ٦٣ ساله کردهای عراق کفت. ما تاسیسات نفتی عراق رامنهدم می کینم، اسیای جوان(مجلة)، ش(٨)، ٨ ژوئن ١٩٦٦، ص١٨-١٩.

1068 – FCO 67/243, Baid on Kirkuk, 17 March 1969,

1069 – FCO 67/243, Sabotage Threat to Iraq Oil Production, 6 March,1969.

1070 – Attentat Au Mortier Contre Les Installations De l'irak Petroleum Company, Le Monde, 6 Mars 1969. p.1.

1071 –Kudish Unrest Unabated In Iraq, The New York Times, March 30, 1969, p.10.

ســـوریا و (طرابلس) له لوبنان بۆ نزیکەی نیوە دابەزی[١٠٧٢]. بەو هۆیەوە حکومەتی عێراقی تەنها بۆ چاککردنەوەیان نزیکەی (یەک) ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی پێویست بوو، دیارە بیرە نەوتییەکانی ژمارە (٦) و (١٢) بەتەواوی لەکارکەوتن. زیانی دارایی گەورەیان بەرکەوت و بەم جۆرەش ئابووری عێراق تووشـــی شـــلەژانێکی گەورە بویەوە، ئەوە ســـەرەڕای ئەوەی بەرژەوەندی وڵاتە زلهێزەکـان، زیـانی گەورەی بەرکەوت[١٠٧٣].

بەم شـێوەیە مسـتەفا بارزانی هۆشـداریەکی توندی بە زۆربەی وڵاتانی زلهێزدا، کە ئەگەر هەوڵی چارەسـەرکردنی دۆزی کورد لە عێراق نەدەن، هەمیشـە لەتوانای دا هەیە، هەڕەشـــەیەکی ڕاســـتەقینەبێ لەســـەر بەرژەوەندییەکانیان لە عێراق. بەتایبەتی دوای ئەوەی بارزانی جارێکی دیکە دووپاتی کردەوە، کە ئەگەر (ئۆتۆنۆمی) بەکورد نەدەن و بەشێکی داهاتی نەوت بۆ پێشخستنی کوردستان تەرخان نەکەن. هیچ دوو دڵی ناکەن لە دەستگرتن بەسەر پاڵاوگە نەوتییەکانی کەرکوک[١٠٧٤].

حکومەتی عێراقی دواجار لەژێر فشـــارەکانی بارزانی و بەتایبەتی دوای ئەو گورزە سـەربازییە، شـاندێکی سـەربازی ڕەوانەی بارەگای بارزانی کرد، بەئامانجی گەیشـتن بە ڕێککەوتنێک بۆ ڕاگرتنی شـەڕ و ئەنجامدانی دانوسـتانی سـیاسـی بۆ یەکلاییکردنەوەی پرسـی کورد لە عێراقدا. بەپێی ژیدەرێک، دانوسـتانە سـیاسـیەکانی نێوان حکومەتی عێراقی و سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لەسەرەتای کانونی یەکەمی ١٩٦٩ دەســـتیان پێکرد و دواجار بە ڕێککەوتنامەی(١١ی ئاداری ١٩٧٠) کۆتاییان پێ هات[١٠٧٥].

یەکێک لە خاڵەکانی کە حکومەتی عێراقی لەگەڵ بارزانی لەســـەری ڕێککەوتن، پەیوەندی بەپرســـی نەوت و داهاتەکەی هەبوو، بەشـــێوەیەک دوای ئەو ڕێککەوتننە پێویسـت بوو سـەرکردایەتی کورد کەسـێک دەسـتنیشـان بکات، بۆئەوەی حکومەتی عێراقی وەک نوێنەری کورد لە کۆمپـانیـای نەوتی عێراقی بەئەنـدامـانی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکە دایبمەزرێنێ. هەروەها حکومەتی عێراقی بەشـــێکی داهاتی

---

1072 – FCO 67/243, Shelling Cuts Oil Out Put by Half, 6 March 1969.
1073 – FCO 67/243, Sabotage Threat to Iraq Oil Production, 4 March 1969.
١٠٧٤ – شموئیل سیجف، م.س، ص٢٧٦.
1075 –Hasan Tevfik Güzel,op.cit, p.132.

نەوت بەپێی ڕێژەی دانیشتوانی کوردستان بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی تەرخان بکات، سەرەڕای بڕیاری قەرەبووکردنەوەی زیان لێکەوتوانی شەڕ و بونیادنانەوەی ناوچە خاپوورکراوەکان[١٠٧٦].

یەکێکی دیکە لەو خالانەی لە ڕێککەوتننامەی(١١ی ئادار) هاتبوو، بریتی بوو لەئەنجامدانی سەرژمێری لەماوەی یەک ساڵ بۆ دیاریکردنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی. جێبەجێکردنی ئەو خاڵە، چەندین دەسکەوتی بۆ کورد تێدا بوو، لەمانەش گواستنەوەی ناوچە نەوتییەکان لەکەرکوک بۆ ژێر دەسەلاتی ناوچەی ئۆتۆنۆمی[١٠٧٧]. بەلام حکومەتی عێراقی هەوڵی خۆدزیینەوەی لە ئەنجامدانی سەرژمێریدا، بەپێچەوانەوە بەشێوەیەکی نەخشە بۆ دارێژراو، بەردەوامیدا بە پڕۆسەی بەعەرەبکردنی ئەو ناوچانەی بارزانی داوایکرد بخرێنە سەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی بەتایبەتی کەرکوک و خانەقین و قەزا و ناحییەکانی دەوروبەری موسڵ[١٠٧٨]، لەبەرئەوەی ئەم ناوچانە سەرچاوەی سەرەکی داهاتی عێراقییان لە نەوت پێک دەهێنا. دیارە بارزانی هەرچەندە وەک لە پێشتردا باسمانکرد، لەگەڵ ئەوە نەبوو سەرژمێری بەهۆی گۆڕینی دیمۆگرافیای بەشێک لە ناوچە کوردییەکان، تاوەکو گێرانەوەیان بۆ دۆخی پێش ئەنجامدانی پرۆسەی تەعریبکردنی ئەنجام بدرێ. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دوای ئەوەی تێگەیشت ئەوەی حکومەتی عێراقی سەبارەت بەو بابەتە ئەنجامی ئەدات تەنها کات کوشتنە، بۆیە لە دیدارێکی لەگەڵ (کریس کۆچێرا)ی ڕۆژنامەنووسی فەرەنسی دەڵێت:"شارەکە لە ڕووی مێژووییەوە ناوچەیەکی کوردییە، پێویستی بە ڕاپرسی نیە بۆ زانینی ئەو بابەتە، تا ئەو کاتەی یەک خێزانی کورد لە کەرکوک مابێ، کەرکوک کوردییە"[١٠٧٩].

پرسی چارەنووسی کەرکوک و بەستنەوەی بە ئەنجامدانی سەرژمێری، وەک لە ڕێککەوتنامەی(ئاداری ١٩٧٠) هاتبوو، بە بڕوای مێژوونووسێکی کورد. هەڵەیەکی

---

1076 - CIA-RDP79T00889A000900040001-6, Iraq under Baath Rule, 1968-1976, November 1976, p.14.

1077 -FCO 51/358,Resarch Department Memorandum The Kurdish Problem In Iraq, 1963-1971, 6 December,1971.

١٠٧٨ – ديفيد مكدول، م.س،ص٤٩٣.

١٠٧٩ – بروانە: كريس كوتشيرا، مسيرة الكرد الطويلة(٤٠ سنة من التحقيقات الصحفية في كردستان)، أربيل، ٢٠١٤، ص٣٣.

مێژوویی سـەرکردایەتی کورد بوو[١٠٨٠].لەبەرئەوەی سـەرژمێری چارەنووسـی کەرکوکی بەهەڵپەسێردراوی هێشتەوە، بەهۆی ئەنجام نەدانی ئەم پرۆسـەیە لەلایەن حکومەتی عێراقەوە، ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ مەترسـی دەسـەڵاتدارانی بەغدا لە جێبەجێکردنی ئەو خاڵە[١٠٨١]. بەگوێرەی زانیارییەکانی دەزگای هەواڵگری ئەمریکا(CIA) لەدوای ڕێککەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ سـەرکردایەتی سـیاسـی کورد، وێڕای ئەوەی داوای پشـکی لەداهاتی نەوتی کەرکوک دەکرد، هاوکات داوایکرد کەرکوک ببێتە پایتەختی ناوچەی ئۆتۆنۆمی[١٠٨٢]. ئەوە سـەرباری داخوازییەکانی سـەبارەت بە (خانەقین) کە ناوچەی دۆزینەوەی نەوت بوو. لەم بارەیەوە کریس کۆچێرا دەڵێت، بارزانی بەمنی گوتووە:" (١٠) سـاڵ لە پێناو ئۆتۆنۆمی جەنگاوین، (٥) سـاڵیش لە پێناو کەرکوک دەجەنگین". ئەمەش دەرخەری ئەوەیە، کە بارزانی دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێک، نائومێد بووە لە ئەنجامدانی سەرژمێری و یەکلاییکردنەوەی پرسـی کەرکوک، کە هەسـتیارترین خاڵی نێو ڕێککەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ بوو. (کۆچێرا) باسـی ئەوە دەکات، کە دوای ئەو دیدارە ڕۆژنامەوانییەی لەگەڵ بارزانی ئەنجامیداوە، گەیشـتۆتە ئەو ئەنجامەی، کە کوردەکان نایشـارنەوە، هەرکات دان بەو ناوچەیە بنرێ وەک ناوچەیەکی کوردی و بخرێتە سـەر کوردستان، چاوخشـاندنەوە بەمەسەلەی نەوت دەکەن[١٠٨٣].

حکومەتی عێراقی وەک هەمیشە ئەمجارەش بەڵێنە سیاسیەکەی خۆی سەبارەت بەکورد جێبەجێ نەکرد، چونکە ئەنـدامە کوردەکەی لەکۆمپـانیـای نەوتی عێراق دانەمەزراند، بەڵکو هیچ هەنگاوێکیشـی هەڵنەهێنا بۆ وەڵامدانەوەی ئەو داواکاریانەی شۆڕشی کورد کە ڕێککەوتنی لەسەر کردبوو. بەپێچەوانەوە بەبێ ڕاوێژکردن لەگەڵ سـەرکردایەتی سـیاسـی کورد و بەپشـتگیری و هاندانی یەکێتی سـۆڤیەت، لە (١ی

١٠٨٠ – جەبار قادر، س. پ، ل٩.

1081 –FCO 51/358,Resarch Department Memorandum The Kurdish Problem In Iraq, 1963–1971, 6 December,1971.

1082 –CIA-RDP79T00889A000900040001-6, Iraq Under Baath Rule, 1968–1976,November 1976, p.14.

١٠٨٣ – کریس کوتشیرا، م. س، ص٣٣.

حوزەیرانی١٩٧٢) بڕیاری خۆماڵیکردنی نەوتی عێراقی دەرکرد[١٠٨٤]. بێگومان ئەو هەنگاوە، کاریگەری بەهێزی لەسەر بارودۆخی ئابووری عێراق هەبوو، لەبەرئەوەی داهاتەکانی حکومەت لە کێڵگەکانی کەرکوک لە (٢٣٠) ملیۆن پاوەند لە ساڵی ١٩٧١ دابەزی بۆ (١٣٠) ملیۆن پاوەند لەساڵی دواتر، ئەمەش کاریگەریی لەسەر خەرجیەکانی عێراق دروستکرد[١٠٨٥].

ئەو بڕیارە بەلای مستەفا بارزانییەوە دروست و گونجاو نەبوو، ئەمەشی لە دیدارێکیدا لەگەڵ پەیامنێری ڕۆژنامەی (واشنتن پۆست)ی ئەمریکی(جیم هوگلاند) خستەڕوو، کاتێک گوتی: "ئەو دژی خۆماڵیکردنی نەوتە لەناوچەی کەرکوک، وە ئەگەر ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا پاڵپشتی کوردەکانی عێراق بکات بە شێوەیەکی کاریگەر و پێویست لەدژی ڕژێمی بەغدا، کوردەکان دەست بەسەر بیرە نەوتیەکان دەگرن و نەوتی کەرکوک دەبەن و بەشێوەیەکی سەربەخۆ سوودی لێ وەردەگرن". زیاتر لەوە بارزانی دەڵێت:"ئەگەر حکومەتی بەغدا ڕاوێژی پێ بکردبام کاتێک هەوڵیدا کۆمپانیایەکی نەوتی ڕۆژئاوایی لە کەرکوک دابمەزرێنێ، ڕەتم دەکردەوە. بەڵام حکومەت ڕاوێژی پێ نەکردم. ئێستاش دەڵێم ئەگەر ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە گورگەکان پارێزگاریمان لێ بکات، ئێمە ئامادەین لەگەڵ سیاسەتی ئەمریکا لەناوچەکە ڕێکبکەوین. کەرکوک ناوچەیەکی کوردییە و کاری حکومەتی عێراق بۆ خۆماڵیکردنی نەوتەکەی، کارێکی نایاساییە"[١٠٨٦].

خۆماڵیکردنی نەوت، کاریگەریی لەسەر ڕێککەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ دروستکرد. چونکە وەک ڕۆژنامەی(لۆمۆند)ی فەرەنسی ئاماژەی پێکردووە، مستەفا بارزانی نیگەرانییەکی زۆری بەرامبەر بەو بڕیارەی حکومەتی عێراقی نیشاندا، لەبەرئەوەی وەک ڕۆژنامەکە بڵاویکردۆتەوە بارزانی دووپاتی کردەوە کە:" ئەم خاکە لەڕووی

---

1084 -F.R.U.S, 1969–1976, Volume E–4, Documents on Iran and Iraq, 1969–1972, Iraq’s Role in The Problems Of The Middle East, Washington, 2012, p.6.

١٠٨٥ –– د. سەعدی عوسمان هەروتی، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە و سەرچاوە مێژووییەکاندا، چاپخانەی موکریان، هەولێر، ٢٠١٤، ل٢١٦.

١٠٨٦ – ملا مصطفی از امریکا کمک نظامی خواست، اطلاعات(روزنامه)، ش(١٤١٣٢)، (٢٣ ژوئن ١٩٧٣)، ص٤.

مێژووییەوە کوردییە"[١٠٨٧]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا بارزانی بەردەوام بوو لەســـەر داواکارییەکانی بۆ دابینکردنی(٥/١)ی داهاتی عێراق بۆ ناوچە کوردیەکان و هاوکات پێداگربوو لەسەر پێویستی لکاندنی کەرکوک بە ناوچەی ئۆتۆنۆمی[١٠٨٨].

ســەرەڕای ئەوەش مســتەفا بارزانی لە ڕازیکردنی عێراقییەکان لەســەر پرســە ســـەرەکییەکانی وەک کەرکوک و ســـنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی و مەرج و ماوەی سەرژمێری بۆ دانیشتوانەکەی ئامانجەکەی نەپێکا. چونکە حکومەتی عێراقی بەردەوام بوو لەســەر پرۆســەی بەعەرەبکردنی ناوچە کوردییەکان، لە ڕێگای نیشــتەجێکردنی عەرەب لەم شـــوێنانە، بەتـایبەتی لە دەوروبەری کەرکوک و نـاوچەکـانی دیکەی دەوڵەمەند بە نەوت. هەروەها دەســـتیکرد بە خانەنشـــینکردن و دوورخســـتنەوەی ژمارەیەکی زۆری کرێکارانی کورد کە لە ســـەر کانە نەوتییەکانی کەرکوک کاریان دەکرد[١٠٨٩].

ســـەبارەت بەو بابەتە مســـتەفا بارزانی لە دیدارێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی (التاخی) دەڵێت:" گواســـتنەوەی ژمارەیەکی زۆری کرێکارانی کورد لە کەرکوک بۆ دەرەوەی پارێزگاکە، وە ئاگادارکردنەوەی دانیشـــتوانی ژمارەیەک لە گوندەکان لە پارێزگاکانی کەرکوک و هەولێر بۆ جێهێشـــتنی گوندەکانیان و ناچارکردنیان بە کۆچکردن بۆ ناوچەی دیکە بەبێ بوونی هیچ بیانووەکی باوەڕپێکراو، ئێمە بەدیاردەیەکی نەرێنی دەبینین و لە کاتی ئێستادا، لەگەڵ پێداویستی ڕێکارە ئەرێنییەکانی هەن سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی یەک ناگرێتەوە"[١٠٩٠].

---

1087 – TANDIS QUE LA CRISE PÉTROLIÈRE SE POURSUIT La tension s'accroît entre le régime et les autonomistes kurdes, Le Monde, 27 décembre 1972.

**1088** – F.R.U.S, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, Document (303), Memorandum From the Director of Central Intelligence (Helms) to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Secretary of State Rogers, and Secretary of Defense Laird, Washington, March 31, 1972, **p.4. سەبارەت بەداخوازی بارزانی بۆ کەرکووک و پشکی کورد لە داهاتی عێراق، بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٢١).**

١٠٨٩ – جوناثان راندل، م.س، ص١٨٩.

١٠٩٠ – التاخی(جریدە)، ع(١٥٦٦)، ٢٠ شباط ١٩٧٤، ص١.

بەم جۆرە ئاماژەکانی شکستهێنانی ڕێککەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ بەدیارکەوتن، بەڵام بارزانی ئەمجار جیاواز لە جارانی دیکە، لەم دیدارەی لەگەڵ ڕۆژنامەنووسی فەرەنسی کریس کۆچێرا، تەنها بە هێما و ئاماژەیەکی سیاسی، لە لای خۆیەوە کەرکوکی وەک پایتەختی ناوچەی ئۆتۆنۆمی دەستنیشانکرد، کاتێک لە وەڵامی پرسیارێکی ئەم ڕۆژنامەنووسە سەبارەت بەو شارەی دەبێتە پایتەختی کوردستان لەناوچەی ئۆتۆنۆمی، بارزانی گوتی:" ئەو زۆر دەوڵەمەند دەبێ(مەبەستی کەرکوک)ە"[١٠٩١]. بەڵام کاتێک چەند ساڵ تێپەڕی، ئەو ئامانجەی بارزانی نەهاتەدی و بەپیلانێکی نێو دەوڵەتی لەئاداری ١٩٧٥ کۆتایی بە شۆڕشی کورد هات و مستەفا بارزانیش وەک لە ڕۆژنامەی(لۆمۆند)ی فەرەنسیدا هاتووە، بڕیاریدا بەیەکجاری لە ڕێبەرایەتیکردنی شۆڕشی کوردی دوور بکەوێتەوە[١٠٩٢]، لەبەرئەوەی تێگەیشت لەوەی دروشمەکانی وڵاتانی زلهێز، کە بۆ بەدیهێنانی دادپەروەری و یەکسانی و هەڵگرتنی زوڵم لەسەر گەلە چەوساوەکان بەرزییان کردبۆوە و بانگەشەیان بۆ دەکرد، تەنها وێنایەکی ڕووکەشی گەمەی سیاسەتێکە، هەموو بەها مرۆڤایەتییەکان، دەکاتە قوربانی بەرژەوەندییە ئابوورییەکان[١٠٩٣]. بەو هۆیەوە ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی (ولیەم سافایر) لە وتارێکیدا لە ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز) ، هەڵویستی سیاسی وڵاتەکەی بەرامبەر بە گەلی کورد شەرمەزارکرد و نووسی:" خیانەتی ئەمریکا بەرامبەر کورد، پەڵەیەکی ڕەشە بەڕووی (نیکسون و فۆرد)"[١٠٩٤].

## باسی دووەم: بارزانی و سیاسەتی حکومەت لە بواری کۆمەڵایەتی

لەدوای سەرهەڵدانی بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد لە باشووری کوردستان، حکومەتە عێراقییەکانی یەک بەدوای یەکدا هاتن، بۆ سەرکوتکردنی ئەم بزاڤە، سیاسەتی زەوی سوتماک( الارض المحروقة) یان پیادەکرد[١٠٩٥]، لەڕێگای

١٠٩١ – م.ن، ص٤٩-٥١.

**1092** – LA RÉBELLION KURDE CONTRE BAGDAD NE REPRENDRA JAMAIS déclare le général Barzani, Le Monde, 06 mai 1975.

1093 – Kurds Betrayed, The New York Times, Mrach12.1975, p.3.

1094 – William Safire, Of Kurds and Kissinger, Carter and Conscience, The New York Times, December 19, 1977, P.31.

١٠٩٥ – بروانە: هاوکار کریم حمە شریف، س. پ، ل٢٤٦-٢٥٤.

خاپووركردن و وێرانكردنی ئاوەدانییەكانی بوونە ناوچەی شـــەڕی نێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراقی[١٠٩٦]، مستەفا بارزانی لە كاتی دانوستان و گفتوگۆیەكانی لەگەڵ حكومەتەكانی لە ســەردەمی پادشــایەتی و كۆماریدا دروســت بوون، داوای قەرەبووكردنەوەی ئەو زیـانـانەی كردووە، كە لە دەرئەنجـامی پیـادەكردنی ئەم سیاسەتە ڕووبەڕووی خەڵكی كوردستان بویەوە. سەرباری مافەكانی گەلی كورد لە داهاتی گشتی بۆ ئاوەدانكردنەوە باشووری كوردستان[١٠٩٧].

مستەفا بارزانی هەر لەسەرەتای هەنگاوەكانی لەدوای گەڕانەوەی لە سۆڤیەتەوە بۆ عێراق، بەتایبەتی لەدوای ئەنجامدانی كۆنگرەی پێنجەمی پارتی، داواكارییەكانی كوردی لە (حوزەیرانی١٩٦٠) خســـتەبەردەم حكومەتی عێراقی، كە لەیەكێـك لە خـاڵەكـانی داوای تەرخـانكردنی بودجەیەكی دیـاریكراوی كرد بۆ ئـاوەدانكردنەوەی ناوچەكانی باشووری كوردستان، بەڵام حكومەتی عێراقی تا مانگی (ئابی ١٩٦١) هیچ وەڵامێكی ئەو داواكارییەی نەدایەوە و فەرامۆشیكرد[١٠٩٨].

دوای كودەتای (٨ی شـــوباتی١٩٦٣)، حكومەتی عێراقی لە (١١ی شـــوبات) وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ دەســتپێشــخەری بارزانی بۆ ڕاگەیاندنی ئاگربەســت، دانیـا بەمافە نەتەوەییەكـانی گەلی كورد لە چوارچێوەی یەكێتی خـاكی عێراق. لەنێوەڕۆكی بڕیارەكەشــــیدا، بەڵێنیدا كار بكات بۆ ئاوەدانكردنەوەی ناوچەكانی باشـــووری كوردســتان، كە بەشـێكی زۆری بەهۆی بارودۆخی سـیاسـی ناوچەكە، ڕووبەڕووی وێرانكاری ببوونەوە[١٠٩٩].

دوای دەرچوونی ئەم بڕیارە، وەزارەتێك لە حكومەتی عێراقی بەناوی وەزارەتی ئاوەدانكردنەوەی باكوور دامەزرا، بەڵام وەزارەتەكە لە ناوێكی بێ ناوەڕۆك زیاتر نەبوو. وەك ڕۆژنـامەی خەبـات ئـامـاژەی پێكردووە، ئەم دامەزراوەیە لە (٣) كەس

---

١٠٩٦ – برناردویتمان،م.س، ص٣٣؛ بۆ ناسینی هەموو ئەو گوندانەی لە لیواكانی ( هەولێر، سلێمانی، كەركوك، مووسڵ، دیالا) لەلایەن هێزەكانی حكومەتی عێراقی لەماوەی نێوان سالآنی (١٩٦١–١٩٦٩) سوتێنراون، بڕوانە: پارتی دیموكراتی كوردستان(مەكتەبی سیاسی–٢–)، یادداشتی بارزانی بۆ كۆمەڵی نەتەوە یەكگرتووەكان، چاپخانەی خەبات، كوردستان، ١٩٦٩، ل١٥–١٧.

١٠٩٧ – رجائي فايد، أكراد العراق الطموح بين الممكن والمستحيل، دار الحرية للصحافة والطباعة والنشر، بغداد، ٢٠٠٥، ص١٠١.

١٠٩٨ – د.مەحمود عوسمان، شۆڕشی كوردستانی عێراق ١٩٦١، پارتی دیموكراتی كوردستان، مەكتەبی سیاسی، ١٩٧٠/٣/١٧، وەرگیراوە لە K21(گۆڤار)، ژ(١)، بەهاری ٢٠٠٨، ل٥٠.

1099 –NAAA1838,173/2/61, Part–1,Iraq– Political– States Kurds, 11Feb 1964, p.2.

پێکهاتبوو ئەمانیش (مەسعود محەمەد)ی وەزیر بوو، لەگەڵ سکرتێرەکەی و نووسەرێک. دوای دەست لەکارکێشانەوەی وەزیرەکە لە حکومەت، تەنیا سکرتێر و نووسەرەکە لەم وەزارەتە مانەوە[1100]. ئەمەش ڕادەی بێ بەها سەیرکردنی مافەکانی گەلی کورد بوو، لەلایەن حکومەتەکەی عەبدولسەلام عارف، کە ئامانجی تەنها چەواشەکردنی ڕای گشتی بوو، نەک چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکانی کورد.

ئەمە لە کاتێکدا بوو مستەفا بارزانی بەشێکی ئامانجەکانی شۆڕشی کوردی لە گەشەپێدان و ئاوەدانکردنەوەی دێهاتەکانی کوردستان و خزمەتکردنی خەڵکەکەی و قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانانەی لەئەنجامی بەریەککەوتنە سەربازییەکان بەریان کەوتبوو، چڕ کردبۆوە. بەو هۆیەوە هەمیشە بەشێکی گفتوگۆکانی لە دانوستان لەگەڵ شاندەکانی حکومەت و نووسراوەکانی بۆ کاربەدەستانی بەغدا بەرزی دەکردنەوە، تەرخانکردبوو بۆ دابینکردنی مەرجەکانی پێشکەوتن و گەشەکردنی کوردستان لەهەموو ڕووەکانەوە. بەو هۆیەوە سەرۆک وەزیرانی عێراق (عەبدولڕەحمان بەزاز) دوای ڕێککەوتن لەگەڵ بارزانی، لە چوارچێوەی ئەو دەستپێشخەرییەی بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد لە (٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦) خستییەڕوو، باسی لە پێویستی ئاوەدانکردنەوەی هەرێمەکانی کوردستان کرد، کە لەدەرئەنجامی پرۆسە سەربازییەکان توشی کاولکاری ببوونەوە. لەگەڵ قەرەبووکردنەوەی زیانلێکەوتووەکانی شەڕ و کارئاسانیکردن بۆ گوندنیشینەکانی بەهەمان هۆکاری پێشەوە لە سەر زێد و زەوییەکانیان دوورکەوتبوونەوە، بۆ گەڕانەوەیان بۆ ناوچەکانی خۆیان[1101].

ئەم هەنگاوەی حکومەتی عێراقی، سەرەتایەکی ئەرێنی بوو، بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچە خاپوورکراوەکانی کوردستان، بەڵام لە ئەنجامی دەست لە کارکیشانەوەی بەزاز لە حکومەت، هیچ یەکێک لەو بەڵێن و بڕیارانەی نەچوونە بواری جێبەجێکردنەوە. بەو هۆیەوە مستەفا بارزانی لە (٢٨ی تشرینی دووەمی١٩٦٦) یاداشتێکی بۆ حکومەتی عێراقی نووسی تێیدا هاتبوو:"بەپێی مادده یازدەی بەیاننامەی(٢٩ی حوزەیرانی١٩٦٦)، دەبوایە دەستەیەک بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچەی کوردی پێکبهێنرێ و پارەی پێویستی لە پلانی ئابووری بۆ تەرخان بکرێت بۆ

---

١١٠٠ – وزارة أعمار الشمال على حقيقتها، خبات(جريدة)، ع(٤٧٦)، شباط ١٩٦٥، ص٤.

١١٠١ – بروانە: الاستاذ البزاز يتلو بيان الحكومة حول سياستها في شمال الوطن، العرب(جريدة)، ع(٦١٣)، ٣٠ حزيران ١٩٦٦، ص١.

ئاوەدانکردنەوە و بەرزکردنەوەی ئاستی پرۆژەی گەشەپێدان لە ناوچەکەدا... حکومەت خۆداریی لەوە کرد و نەیدەهێشت ئەو شوێنانەی هێزە سەربازییەکان نەچوونەتە ناویان، چاودێری تەندروستی و خوێندنی سەرەتایی بیانگرێتەوە، هەرچەندە داواکارییەکانیشمان لەم ڕووەوە دووبارە کردەوە. ئێمە هیچ پێویستییەک بۆ ئەوە نابینین وا بکات سەدان هەزار هاولاتی لە چارەسەرکردن بێ بەش بکرێن و قوتابخانە لە ڕووی منداڵان دابخرێت، کە هیچ تاوانێکیان نییە، لە کاتێکدا کە میللەتان خەریکن هەسارەکان و مانگ داگیر دەکەن و ئەو هاووڵاتییانەی شوێن و خانوویان سووتێندراوە و ماڵ و حاڵیان تاڵان کراوە، یان سەرۆکی خێزانیان بووەتە قوربانی کاری توندوتیژی، قەرەبوویان بۆ نەکراوەتەوە و ئەو بێوەژن و هەتیوانەش، کە توشی پەککەوتەیی بوون، ئەوا بۆ خواست و ویستی سروشت جێ هێڵراون. ئەو ئیعتبارە نیشتمانی و مرۆییانەی لە مادەی(١١)ی بەیاننامەکەی حکومەتدا هاتوون، پاڵپێوەنەر نەبوو بۆ ڕزگارکردنی ئەوانە لەسەرما و سۆڵەی زستان و بەدبەختیی دەربەدەری و دەستکورتیی و نەداری کوشندە ڕزگار بکات"[١١٠٢].

نائومێدبوونی بارزانی لە بەڵێنەکانی کاربەدەستانی بەغدا بۆ تەرخانکردنی ڕێژەیەکی بودجەی عێراق بۆ ئاوەدانکردنەوەی باشووری کوردستان، بەتایبەتی ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش، بەو مانایە نایەت بارزانی بەو توانا ماددی و مرۆییە سنووردارەی لەبەردەستی شۆڕش بووە، لای لە خزمەتکردنی ئەو ناوچانە نەکردۆتەوە. بێگومان یەکێک لەئامانجەکانی بارزانی لە دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتییە کارگێڕییەکانی شۆڕش لەپێشتر ئاماژەمان پێکردوون، کارکردن بووە بۆ دابینکردنی پێداویستییە گرنگەکانی ئەو دێهات و شارۆچکانەی کەوتبوونە ناوچە ئازادکراوەکان و لەژێر دەسەڵاتی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراقدا بوون. ئەو ئامانجەی بارزانی لە(٢٣ی ئەیلولی١٩٦٨) لەدوای چەسپاندنی ماددەی (٢٦) لەدەستووری هەموارکراوی ساڵی ١٩٦٨ی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق تا ڕادەیەک هاتەدی، ئەو ماددەیەش تایبەت بوو بە دامەزراندنی بەشێک بەناوی (بەشی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی) بۆ

١١٠٢ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی...، (شۆرشی ئەیلول ١٩٦١–١٩٧٥)، ٢٠٢٠، ل٤٠٠.

فراوانکردنی خزمەتگوزاری تەندروستی و فێرکردن و خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە لەهەموو ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان[١١٠٣].

بەشی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی لەو پرۆژە و پلانانەی بۆ خزمەتکردنی ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش خستیەڕوو، زیاتر هەوڵیداوە شەقامی نوێ بکاتەوە و خانووی نوێ دروست بکات، سەرباری هەوڵی دیکەی بۆ کاریزلێدان و ژیاندنەوەی کانیاوەکان و دروستکردنی نەخۆشخانە و کردنەوەی بازار و باخچەی گشتی. وێڕای ئەوەی بایەخێکی تایبەتیشی دابوو بە دابینکردنی ئاو و کارەبای ناوچەکە[١١٠٤]. دواجار ئەم بەشە کارەکانی زیاتر لەبواری تەندروستی و پەروەردەدا چڕ کردەوە، بەهۆی پێویستی زۆری ناوچە ئازادکراوەکان بەو خزمەتگوزارییانە.

شیاوی باسە ژمارەی دانیشتوانی ناوچە ئازادکراوەکان لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٦١، نزیکەی (٩٩٠) هەزار کەس بووە، لەو ژمارەیە (١٧٠) هەزاریان لە دانیشتوانی گوندە سووتاوەکانی باشووری کوردستان بوون، کە لەدوای سوتاندنی (٧٥٠) گوند لەلایەن حکومەتی عێراقەوە، کۆچیان کردبووە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش. ئەمانە بەگشتی ڕووبەڕووی دۆخێکی ئاڵۆز و خراپ بوونەوە، بەهۆی بێبەش بوونیان لە تەواوی خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان. هەموو ئەو ژمارە زۆرەی خەڵک، تەنها چوار پزیشک و هەشتا برین پێچیان هەبووە، لەو چوار پزیشکە یەکێکیان مەحمود عوسمان بووە، کە تەنها بەڕێکەوت هەندێک کات کاری پزیشکی کردووە، سەرباری ئەوەش ئەو دەرمانەی هەبووە، ئەوەندە کەم بووە، بەشی(١٠%) پێویستییەکانی نەکردووە[١١٠٥].

سەبارەت بە دامەزراوەی تەندروستیش، لە هەموو ناوچە ئازادکراوەکان باشووری کوردستان، یەک نەخۆشخانەی ڕاستەقینە نەبوو. ئەوانەی هەبوون، بنکەی تەندروستی سەرەتایی بوون، هیچ ئامرازێکی پشکنینی پزیشکی تێدا نەبوو. بۆیە لەو ماوەیەدا لە ناوچە ئازادکراوەکان، بەتایبەتی لەنێوان منداڵ و مێرد منداڵان ڕێژەی

---

١١٠٣ – بڕوانە: ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان– عێراق(نووسینگەی ڕاپەڕاندن) دەستوور و یاساکان ١٩٦٤–١٩٦٥،ل٦٩.

١١٠٤ – بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەو خزمەتگوزاریانەی لەلایەن بەشی کاروباری کۆمەڵایەتی پێشکەشی دێهاتەکان کراون، بڕوانە: دەنگوباسی کوردستان(گۆڤار)، ژ(١٥)، حوزەیرانی ١٩٧٣، ل٧.

١١٠٥ – عصمت شريف وانلي، م.س، ص٣٣٩–٣٤٣.

مردن زیادی کرد[١١٠٦]. سەرەرای ئەوەی چەندین نەخۆشی لەناو دانیشتوانی ناوچەکە تەشـەنەیان کرد، وەک نەخۆشـی (مەلاریا). هەروەها نەخۆشـی (سـیل) بەشـێوەیەکی زۆر لەناوچەکەدا هەبووە. سـەرکردایەتی شـۆڕش بەو ئامڕازە سـادە و سـاکارانەی لەبەردەسـتی دابوو، زیاتر لە چوار هەزار حاڵەتی تووشـبووانی ئەو نەخۆشـیانەیان تۆمارکرد. لەلایەکی دیکە، بەدخۆراکی هۆکارێکی دیکە بوو بۆ بەرزبوونەوەی ڕێژەی تووشـــبوان بە نەخۆشـــی (ئێســـکە نەرمە) بەتایبەتی لەنێوان منداڵان. وێڕای هەموو ئەمانەش ڕاگرتنی پاک و خاوێنی و بڵاوکردنەوەی ڕێنماییە تەندروســـتییەکان بەپێی پێویســـت نەبوو. بەم شـــێوەیە تەندروســـتی گشـــتی کەوتە ژێر دۆخێکی مەترســـی بەردەوام[١١٠٧]. بێگومان هەموو ئەمانە بەهۆی ئەوەبوو حکومەتی عێراقی ئابلوقەیەکی توندی خســـتبووە ســـەر ئەو ناوچانە. بۆیە بەم شـــێوەیە خەڵکێکی زۆری تێدا زەرەرمەند بوو[١١٠٨].

لەبەرامبەر ئەم دۆخە ناهەموارە و بۆ کەمکردنەوەی مەترسییە تەندروستییەکان، مەکتەبی تەندروســـتی لەســـەر فەرمانی مســـتەفا بارزانی ســـەرۆکی ئەنجومەنی ســـەرکردایەتی شـــۆڕش، لە ناوچە ئازادکراوەکان ســـێ نەخۆشـــخانەی کردەوە. یەکەمیان لە ســـنووری هێزی کاوە[١١٠٩] کە لەلایەن دکتۆر (حیکمەت حەکیم) بەڕێوە دەچوو. دووەمیان لە گوندی (ماوەت) لە ناحیەی (خەبات) و لەلایەن دکتۆر (ئەحمەد شـالی) سـەرپەرشـتی دەکرا و سـێیەمیشـیان لە گوندی (ناوپردان) لە ناوچەی باڵەک، دکتۆر (حەسـەن کازماوی)، کە پیاوێکی عەرەبی خەڵکی بەغدا بووە، بەڕێوەی دەبرد. بەڵام ئەم نەخۆشـخانانە هەر بەناو نەخۆشـخانە بوون و بەپێی پێویسـت پێداویسـتی تەندروسـتییان تێدا نەبوو. بەڵام لەماوەی سـاڵانی (١٩٦٣_١٩٦٧) چەند پزیشـکێکی دیکە پەیوەندییان بەشـۆڕش کرد، لەمانەش (حکمەت قوسـمین)، (باقر فەیلی)، (سـەعید قرمزی تۆپراک)، (هۆشـــیار – فائق)، (تاهیر بابان). کە زۆربەیان ئەندامی حزبی

١١٠٦ – مەسعوود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی...( شۆرشی ئەیلوول ١٩٦١- ١٩٧٥)، ٢٠٠٤، ل٤٣٧- ٤٣٩.

١١٠٧ – بروانە: پارتی دیموکراتی کوردستان(مەکتەبی سیاسی-٢)، یاداشتی بارزانی بۆ کۆمەڵی نەتەوە یەککگرتووەکان لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٩دا، چاپخانەی خەبات، ١٩٦٩، ل١٨-٢٠.

١١٠٨ – اخبار من كردستان، خبات(جريدة)، ع(٤٧٥)، كانون الاول ١٩٦٤، ص٢.

١١٠٩ – هێزی کاوە: ناوەندەکەی لە بێتواتە بوو. سنووری چالاکی لە ناوچەکانی کۆیە، خۆشناوەتی، باڵەکایەتی، هەولێر، ڕەواندز دەگرتەوە. هاوکار کەریم حمە شریف، س.پ، ل٩٤.

شـــیوعی بوون، لەســـەر داخوازی مەکتەبی تەنـدروســـتی ئەرکی بەڕێوەبردنی نەخۆشخانەکانیان گرتە ئەستۆ[١١١٠].

مستەفا بارزانی ئەرکی سـەرپەرشتیکردن و چاودێری هەموو نەخۆشـخانەکان و بنکەکانی تەندروسـتی خسـتە ئەسـتۆی سـکرتێری مەکتەبی تەنفیزی، کە ئەوکاتە دکتۆر (مەحمود عوســـمان) بوو. ئەمیش لەســـەر فەرمانی بـارزانی، کاریکرد بۆ کردنەوەی چەند خولێکی تەندروســـتی بۆ برینپێچی و فریاگوزاری خێرا. ئەوەبوو لە وەرزی پایزی سـاڵی ١٩٦٨ هەر لەسـەر ڕاسـپاردە و فەرمانی بارزانی، پەیمانگایەک بەناوی (پەیمانگای پێگەیاندنی برینپێچانی شـۆڕش) کرایەوە. لەگەڵ دەرچوونی یەکەم پۆڵ، بەشـداربووان نازناوی (دکتۆری شـۆڕش)یان وەرگرت. هاوکات دوای ئەوەی بارزانی وەک باسـکرا، چەند نەخۆشـخانەیەکی لە (ناوپردان) بەناوی (نەخۆشـخانەی کوردســـتان) و لە خەبات و بێتواتە دامەزراند[١١١١]، بۆ هەر (١٢) یەکەی دیکەی هێزی سـەربازی بنکەیەکی تەندروسـتی کردەوە، سـەرەڕای ئەوەی لەهەندێک گوند، بنکەی تەندروسـتی دامەزراند، بەجۆرێک کۆی گشـتی ئەو بنکە تەندروسـتییانەی تا سـاڵی ١٩٧٣ کرانەوە، ژمارەیان گەیشتنە (٣٦) بنکەی تەندروستی[١١١٢].

لەلایەکیتر لەبەرئەوەی حکومەتی عێراقی ئابلوقەیەکی توندی لەســـەر ناوچەکانی شـــۆڕش ســـەپاندبوو وەکو لە پێشـــتر باســـمانکرد، بۆیە تەنها دەرفەت لەبەردەم ســـەرکردایەتی کورد بۆ ڕزگارکردنی خەڵکی ناوچە ئازادکراوەکان، کۆکردنەوەی کۆمەکی تەنـدروســـتی بوو لە ڕێگـای ڕێکخراوە جیهـانییە خێرخوازەکـان. لەو چوارچێوەیەدا مستەفا بارزانی لە پێناو دەسـتبەرکردنی هاوکاری و کۆمەکی مرۆیی دەرەکی، لە (ئەیلولی ١٩٦٣) نامەیەکی بۆ کۆنگرەی خاچی ســـووری نێودەوڵەتی لە (جنێف) ڕەوانەکرد، تێیدا وێنایەکی ڕوونی بارودۆخی کوردسـتانی نیشـانی ئەندامانی ئەم ڕێکخراوەدا. لەم نامەیەدا بارزانی داوای لە خاچی ســـووری نێودەوڵەتی کرد، سەردانی ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان بکەن و هاوکاری پزیشکی و خۆراک بۆ ئەو دانیشـتوانانەی لە ژێر هەڕەشـە دابوون لە ناوچەکانی باشـووری کوردســتان پێشـــکەش بکەن. بەڵام بانگەوازەکەی بارزانی هیچ ئەنجامێکی نەبوو، لەبەرئەوەی

١١١٠ – شێرزاد زکریا محمد، س.پ، ل١٥٥.

١١١١ – أخبار كردستان ( جريدة )، ع(١٣)، أواسط نيسان ١٩٧٣، ص٤.

١١١٢ – م.ن، ص٥.

حکومەتی عێراقی ڕێگربوو لە گەیشــتنی هەر جۆرە هاوکارییەک بۆ دانیشــتوانی ئەم ناوچانەی کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی شۆڕشگێرانی کورد[١١١٣].

ئەم هەوڵانەی بارزانی لەم قۆناغە نەوەســـتان و بەردەوامبوون، بەشـــێوەیەک بـارزانی لە ڕێگـای نوێنەرەکانیەوە لە ڕۆژئـاوای ئەوروپـا، بەردەوام بوو لەســـەر پەیوەنـدییەکـانی لەگەڵ ڕێکخراوە مرۆییە جیهـانییەکـان، لەم ســـۆنگەوە لەڕێگـای پەیوەنـدیی نوێنەرانی بـارزانی لەگەڵ ڕێکخراوە مرۆییەکـانـدا لە نمونەی ڕێکخراوی خاچی ســـووری نێو دەوڵەتی، توانیان لەســـاڵی ١٩٦٤ ، ســـەرباری ڕێگرییەکانی هەبوون، بڕێک یارمەتی تەندروســتی بۆ ناوچە ڕزگارکراوەکان بەدەســت بهێنن[١١١٤]. دواتریش لە نیســـانی ١٩٦٩ بەیارمەتی مەکتەبی تەندروســـتی (ڕێکخراوی خاچی سووری کوردی) لە ئەوروپا دامەزرا. ئەو ڕێکخراوە تا ڕادەیەک توانی هاوکاربێت بۆ دابینکردنی پێداویســـتییە تەندروســـتییەکان بۆ نەخۆشـــخانەکانی کەوتبوونە ناوچە ئازادکراوەکانی کوردســـتان. بۆیە توانای دامەزراوە تەندروســـتییەکان بەهۆی ئەو پێداویســـتییانەی دەســـتەبەرکران بەرزبۆوە. بەجۆرێک تەنها لەماوەی شـــەش مانگی یەکەمی ســـاڵی ١٩٦٩ وێڕای بارودۆخی شـــەڕ، نەخۆشـــخانەکانی شـــۆڕش لە ناوچە ئـازادکراوەکـانی توانیـان پێشـــوازی لە (١٠٩٧٠٥) نەخۆش بکەن، کە (٩٠) هەزار نەخۆش لە هاوڵاتی سڤیل بوون و ئەوانی دیکەش پێشمەرگە بوون[١١١٥].

بژادەیەکی دیکە لە بەردەم مســـتەفا بارزانی، لە پێناو ڕزگارکردنی دانیشـــتوانی ناوچەکانی لەژێر دەســـەڵاتی شـــۆڕش لەم دۆخە مرۆییەی ڕووبەڕوویان ببوویەوە، بریتی بوو لە پەیوەندیکردن بە وڵاتە زلهێزەکان، لە ڕێگای نوێنەرەکانی شـــۆڕش لە وڵاتـانی ڕۆژئـاوای ئەوروپا و ئەمریکا، لەم ســـۆنگەوە لە ئـایاری ١٩٦٩ بـارزانی نـامەیەکی بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکـا (ویلیـام روجەرز) نـارد و بـارودۆخی ئەو کاتەی خەڵکی کوردســـتانی لەناوچە ئازادکراوەکان باسـکرد و تیشـکی خســـتە ســـەر بـارودۆخی خراپ و نـارەحەتی خەڵـک، بەهۆی نەبوونی خۆراک وخزمەتگوزارییە تەندروســـتییەکان. لەم نامەیەدا بارزانی ڕوونیکردەوە ئەو هاوکارییانەی بەدەســـتیان

---

1113 – NAA: A1838,173/2/6/1, Part1, Iraq- Political States–Kurds, Kurds in Iraq, 2 December1963, p.258.

1114– CIA–RDP79–00927A004800110003–7,THE KURDISH WAR— ROUND FOUR, WASHINGTON, April 23, 1965,p.6.

١١١٥ – قارەمان حیدر رحمان، س.پ، ل٤٩.

دەگات، بڕێکی ئەوەندە کەمە بەشـــی پڕکردنەوەی پێداویســـتییەکان ناکات. ئەوەندە نەبێ هەندێک لە ڕێکخراوە جیهانییەکانی وەکو خاچی ســوور و مانگی ســوور بڕێک هاوکاری وکۆمەکی مرۆییان لە ڕێگای مانگی سووری ئێرانی پێشکەش کردون[١١١٦]. بەپێی زانیاری ژێدەرێک بێ، حکومەتی ئەمریکا لە وەڵامی ئەم نامەیەی بارزانیدا، لە ( ئـابی ١٩٦٩) بڕی (١٤) ملیۆن دۆلاری وەک هـاوکـاری بۆ شـــۆڕشـــی کورد ڕەوانەکرد[١١١٧]. بەڵام هیچ ســـەرچاوەیەک، لە نێوانیشـــیاندا بەڵگەنامەکانی دیکەی حکومەتی ئەمریکا، کە لەبەردەســـتی توێژەردان، باســـیان لەم هاوکارییە نەکردووە، بۆیە ئەو زانیارییە پێمان وایە جێگەی گومانە.

ســەرباری ئەمەش، لە (تشـرینی یەکەمی١٩٦٩) مســتەفا بارزانی یاداشــتێکی بۆ ســـکرتێری گشـــتی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتوەکـان یوثـانـت (١٩٦١-١٩٧١) و دامەزراوەکانی بەســـتراوە بەو دەزگا جیهانییە ڕەوانەکرد و لە کۆتایی ئەو بەشـــەی تەرخانیکردووە بۆ ڕوونکردنەوەی دۆخی تەندروســـتی لەناوچە ئازادکراوەکاندا، وێنای ســیاســەتی نادروســتی حکومەتی عێراقی کرد بەرامبەر بە گەلی کورد و لەم بارەیەوە نووســیویەتی:" لەســەرەتای شــەڕی ڕەگەزایەتیەوە کە لەســاڵی ١٩٦١ەوە هێنراوەتە ســەرمان، هەرچی قوتابخانە و تیمارگەی میری هەیە یا بەهۆی شــەڕەوە کاولکراوە، یا حکومەت خۆی دایخســتووە و مووچەخۆرەکانی لێ کێشــاوەتەوە. بەم بۆنە ڕێگـای کردۆتەوە بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشـــی بە شـــێوەیەکی بەرفراوان. نەخوێنـدەواریش بە چەشـــنێکی بێ وێنە پەرەی ســـەندووە، هەتـا ئەنـدازەی نەخوێندەواری گەیشــتۆتە (٨٥%). وای لێهاتووە هەموو ســیاســەتی عێراق هاتوتە سەر ئەوەی نەهێڵێ لە کوردستانا خوێندن بمێنێ. لەماوەی هەشت ساڵی ڕابردوودا، بەبیانووی شەڕەوە حکومەتی عێراق هەندێ کردەوەی زۆر توند و تیژی بەکارهێناوە، بۆ ئەوەی ڕیشەی لەشساخی و زانیاری لە کوردستانا هەڵکێشێ...بۆ ئەوەی ڕادەی پشــتگوێ خســتنی فەرمانڕەواکانی بەغداتان بۆ ڕوون بکەینەوە لەبارەی بایەخدان بە

---

1116 -F.R.U. S, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, Memorandum of Conversation, Kurdish/Assyrian Appeal for U.S. Assistance, Washington, June 13, 1969, p.2.

١١١٧ – ماریانا خاروداکی، م.س، ص٢٨٧.

ناوچەکەمان، هەر ئەوەندە بەسە کە بزانن لە ڕووی لەشساخییەوە حکومەت هەوینی دژی کۆلێرای لێ قەدەخە کردووین و ناهێڵێ بمانگاتێ"[1118].

سـەرەڕای ئەو هەوڵانە، وڵاتە زلهێزەکان بێ هەڵویست بوون بەرامبەر بانگەوازەکانی ڕێبەری کورد، بە بیانووی دەست وەرنەدان لەکاروباری ناوەخۆیی عێراق و بەستنەوەی پرسەکە، بە دۆخێکی نێوخۆیی. بەڵام ئەم بابەتە ڕێگر نەبووە لەبەردەم مستەفا بارزانی بۆ ئەوەی بەپشت بەستن بە توانا مرۆیی و مادییەکانی بەردەستی، کار بۆ سوککردنی دۆخی نارەحەتی ئەم خەڵکە بکات، کە لەم ناوچەیەدا ژیاون وەکو پێشتر باسکرا، هەر لە درێژەی ئەو هەوڵانەی پێشوو. مستەفا بارزانی لە ساڵی (١٩٧٣) وەک هەنگاوێکی ئەزموونی فەرمانیکرد بە ئامادەکردنی نەخۆشخانەیەکی تایبەت بە نەخۆشییەکانی (سینگ) لە چۆمان بە قەبارەی(٣٤) تەختەی نەخۆش و ئامادەکردنی ئامێری تەندروستی پێویست. هاوکات فەرمانی کرد بە چاودێریکردنی چڕی دێهاتەکان بۆ دەستنیشانکردن و دۆزینەوەی ئەو کەسانەی تووشی نەخۆشی(سیل) بوون، بۆئەوەی جیابکرێنەوە لە منداڵە بچووکەکانیان. یەکێکی دیکە لە ئەرکەکانی ئەو نەخۆشخانەیە بریتی بووە لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی منداڵان، ئەو نەخۆشییانەی ئەو کاتە بڵاوبونەوە، کە وەک پێشتر ئاماژەمان پێکرد، ببووە هۆی مردنی ژمارەیەکی زۆری منداڵ، بەتایبەتی نەخۆشی سۆریکە. لەو نەخۆشخانەیە ژووری تایبەت بە پیاوان و ئافرەتان و منداڵان هەبوو، پشکنین و دەرمانیش تێیدا بە خۆرایی پێشکەشی نەخۆش کراوە، وێڕای ئەنجامدانی نەشتەرگەری بچووک[1119].

لەدوای ڕاگەیاندنی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی لەلایەن حکومەتی عێراق لە (ئاداری١٩٧٤) و هەڵگیرسانەوەی شەڕ لە نێوان سوپای عێراقی و هێزی پێشمەرگە، سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان، بڕیاریدا بە دامەزراندنی ئەمینداریێتی گشتی تەندروستی. ئەو دامەزراوەیە کە لە کۆتایی مانگی (ئاداری١٩٧٤) دەستی بەکاروبارەکانی کرد، چەندین نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستی لە چۆمان و لە سنووری هەڵەبجە و لە ناوچەی بادینان کردەوە، هەندێک لەو دامەزراوە تەندروستییانە لەناو کەمپی ئاوارەکان، بەهاوکاری ڕێکخراوی مانگی سووری ئێرانی لەنێو سنووری ئێران کرانەوە. ئەو

١١١٨ - بڕوانە: پارتی دیموکراتی کوردستان(مەکتەبی سیاسی-٢)، یاداشتی بارزانی...، ل١٩.
١١١٩ - أخبار كردستان ( جريدة )، ع(١٣)، أواسط نيسان ١٩٧٣، ص٤.

نەخۆشـخانانە چەندین پزیشـکی بەتوانا و کارمەندانی تەندروسـتی بەئەزموونیان تێدا بوو. هەروەها نەخۆشـخانەکان، تاقیگە و هۆڵی نەشـتەرگەری و تەختی نوسـتنیان بۆ دابینکرابوو[١١٢٠].

## باسی سێیەم: کاردانەوەی بارزانی لەبەرامبەر سیاسەتی فەرامۆشکردنی ڕۆشنبیری کوردی

مەســـەلەیەکی بەڵگە نەویســـتە، هەر نەتەوەیەک مـافی ئەوەی هەیە بـایەخ بە ڕۆشـــنبیری خۆی بدات و ســـادەترین بنەماش لەو بوارەدا ئەوەیە، ڕۆڵەکانی ئەو نەتەوەیە بەزمانی دایکی خۆیان بخوێنن و بنووســن. ســەرەڕای ئەوەش لە زۆربەی ســـەردەمەکانی حکومەتە عێراقییە یەک لەدوای یەکەکان، کورد لەو مـافەی خۆی بێبەش کراوە، تەنـانەت لە هەنـدێ بـاردا حکومەتی عێراقی هەوڵیـداوە کورد لە پێشـــکەوتنی مەعریفی و ڕۆشـــنبیری بەگشـــتی بێبەش بکات. کۆمەڵێک ئامانجی لە پیادەکردنی ئەم سـیاسـەتەدا هەبووە، کە لەدیارترینیان، نیشـاندانی کۆمەڵگەی کوردی بووە، بە کۆمەڵگەیەکی دواکەوتوو لەبەردەم ڕای گشـتی جیهانی. بۆیە گەلی کورد کە لەسەردەمی پادشایەتی لە مافە ڕۆشنبیرییەکانیان بێ بەش بوون، لە دوای شۆڕشی (١٤ تەمموزی ١٩٥٨)یش لەسەر هەمان دۆخی ڕۆشنبیری و پەروەردەیی مانەوە. بە جۆرێک ژمارەی قوتابخانەکان بەڕێژەیەکی ئەوتۆ زیادیان نەکرد. هەروەها خوێندن لە زۆربەی قوتابخانەکانی باشـــووری کوردســـتان بەزمانی عەرەبی بوو، تەنیا قوتابخانە سەرەتاییەکانی سلێمانی نەبێت. ئەوە سەرباری ئەوەی گەلی کورد (کۆڕی زانیـاری) و زانکۆیەکی تـایبەت بەخۆی نەبوو[١١٢١]. قوتـابییە کوردەکـانیشـــی کە مەبەســـتیـان بەردەوامیـدان بوو بە خوێنـدنی بـاڵا، دەرفەتی گونجـاویـان بۆ نەدەرەخســـاندن. بەو هۆیەوە نێردراوەکانی کورد بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا زۆر کەم بوو. هەروەها لە کۆلێژەکان بەڕێژەیەکی کەم وەردەگیران. بەهەمان شـــێوە لە کۆلێژی ئەرکـانی ســـەربـازی، مـافی خوێنـدن بۆ قوتـابیـانی کورد بە ڕێژەیەکی سنوورداربووە[١١٢٢].

---

١١٢٠ – فلك الدين كاكەیی ، م.س، ص٧٠.

١١٢١ – عبدالخالق العامري، م.س، ص١٨٦.

١١٢٢ – عزيز الحاج، م.س، ص٢٧.

سـیاسـەتی حکومەتی عێراقی بەرامبەر ڕۆشـنبیری کوردی لە بڕیارەکانی کۆنگرەی سـێیەمی سـەندیکای مامۆسـتایان کە لەسـاڵی ١٩٦٢ لە بەغدا ڕێکخرا، ڕەنگدانەوەی ڕوونتری هەبوو. دوای ئەوەی کۆنگرە بڕیاریدا بەسـڕینەوەی وشـەی (کوردستان) لە کتێب و هاندانی نووسەر و مامۆستایانی کورد بۆ نووسین بە زمانی عەرەبی، وە هەوڵدان بۆ سـەپاندنی زمانی عەرەبی وەک زمانی خوێندن لە قوتابخانەکانی باشووری کوردستان و هەڵوەشاندنەوەی بەڕێوەبەرایەتی مەعاریفی کوردی، دوای ماوەیەکی کەم لەسـەر بڕیاری دامەزراندنی. سـەربارى هەڵوەشـاندنەوەی پرۆژەی کردنەوەی کۆلێژی پەروەردە لە کوردسـتان و ئەو ئاستەنگانەی دروستییان کرد[١١٢٣].

سیاسـەتەکانی حکومەتی عێراقی بەرامبەر مافە ڕۆشـنبیرییەکانی گەلی کورد لە عێراقدا، بەلای مستەفا بارزانی قبوڵکراو نەبووە. ئەو هەڵوێستەشیان چەندین جار بە یاداشـت و نووسـراو، لە دانوسـتانەکان لەگەڵ شـاندەکانی حکومەتی عێراقی خستووەتەڕوو، بۆ نموونە بارزانی لە (٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٦) لە یادداشتێکی بۆ هەریەک لەسـەرۆک کۆماری عێراق عەبدولڕەحمان عارف و سـەرۆک وەزیران ناجی تالیب، سـەبارەت بەو بەڵێنانەی لەبەیاننامەی (٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦) بەکورد درابوون نووسـیویەتی:" لیسـتی وەرگیراوان لە کۆلێجی سـەربازی و کۆلێجی باڵەفڕەوانی و کۆلێجی پۆلیس، بۆ ئەمساڵ ڕێژەیەکی زۆر کەم نەبێ، کوردی تێدا نییە و هەر قوتابییەک پێوەندیی بە شـۆڕشـەوە هەبووبێت، لەو کۆلێجانە وەرنەگیراوە، کەواتە چۆن کورد بۆی دەکرێت یەکسان بێت تەنانەت لە دوارۆژیشدا"[١١٢٤]. لەخاڵێکی دیکەی یاداشـتەکەدا بارزانی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە:"لە زانکۆی بەغدا هیچ بایەخ بەزمانی کوردی و کەلەپوورە فکری و شـارسـتانییەکەی کورد نەدراوە و بەبڕوای ئەو ئومێدێکیش نەبووە لەو کاتەدا بایەخ بە کردنەوەی زانکۆیەک لە باشـووری کوردستان بدەن وەک لەبەیاننامەی (٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦) بەڵێنیان داوە. سەبارەت بەو قوتابیانەش کە لەهەڵهێنجانی زانست بێ بەش بوون، لەبەرئەوەی سۆزیان لەگەڵ کێشەی گەلەکەیان بووە و ئەو یاسایانەی وەزارەتی مەعاریفیان دەرهەق پیادەکراوە،

---

١١٢٣ – دانا ئادامز شمیدت، س.پ، ل١٤٣.

١١٢٤ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی...(شۆرشی ئەیلول ١٩٦١–١٩٧٥)بگ٣،ب١، ٢٠٢٠، ل٣٩٩.

که بۆ حاڵەتی ئاســـایی بەکاردەهێنرێت و زۆرینەیان لە گەڕانەوە بۆ خوێندن بێ بەشکران"[1125].

داخوازییەکانی بارزانی بێ وەڵام مانەوە تەنانەت لەدوای گۆڕانی دەســـەڵاتی سیاسی لەبەغدا لە (١٧-٣٠ تەمموزی ١٩٦٨)، بەو هۆیەوە لەئەنجامی بێ ئومێدبوون لە حکومەت، مەلا مســـتەفا بارزانی لە ناوەراســـتی تشـــرینی یەکەمی ســـاڵی ١٩٦٩، گازاندەکانی خۆی سەبارەت بە سیاسەتە نادروستەکانی حکومەتی عێراقی بەرامبەر کورد بە شـــێوەیەکی گشـــتی و لەنێویانیشـــدا لایەنی پەروەردە و فێرکردن، گەیاندە دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لە ڕێگای نامەیەک بۆ (یۆسـانت) ی سـەرۆکی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان. لە پاشـــبەندی شـــەشـــەمی ئەو نامەیەدا، کە تایبەت کراوە بە خســـتنەڕووی بارودۆخی پەروەردە و فێرکردن لەناوچە ڕزگارکراوەکان لە دوای هەڵگیرســـانی شـــۆڕشـــی کورد لە ســـاڵی ١٩٦١، بارزانی نووســـیویەتی:" ســـیاســـەتەکانی عێراق ئامانجیان ئەوە بووە نەهێڵن خوێندەواری لە ناوچەکەدا بڵاوبێتەوە. بەڵام شـــەڕ لەماوەی ئەو هەشـــت ســـاڵەی ڕابردوودا بوو بەهۆی ئەوەی حکومەتی عێراق ڕێگە کارێکی زۆر توند و دڵڕەقانە بگرێتەبەر بۆ ریشـــەکێشـــکردنی بناغەی خزمەتگوزاریی تەندروســـتی و فێرکردن لە ڕەگەوە. لەو ســـێ ســـاڵەی ڕابردوودا، سەرکردایەتی شۆڕش توانی دووسەد قوتابخانەی سەرەتایی لەسەرتاپای ناوچە ڕزگارکراوەکاندا بکاتەوە و ئەمەش لەســـەدا پێنجی ئەوەی کە پێویســـتە لە قوتابخانە کردنەوە لە کوردستاندا پڕناکاتەوە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەزاران قوتابیی قوتـابخـانە دوانـاوەنـدییەکـان لەوانەی لە قوتـابخـانە دوانـاوەنـدییە حکومەتییەکـان وەدەرنراون، هیچ هەلێکی خوێندنیان لەناوچەکانی ئێمەدا بۆ خوێندن بۆ نەرەخســـاوە و بێجگە لەیەک قوتـابخـانەی دوانـاوەندی، کە ئەویش خۆمـان کردومـانەتەوە. یەک قوتابخانەی دواناوەندی لەهەموو کوردستانی ڕزگارکراودا نییە"[1126].

هەر لەو نامەیەی پێشـوودا بارزانی نووسـیویەتی :" شـۆڕش هەمیشـە شـەکوای لەدەســـت کەمیی هۆ و ســـنووردارییەکەی ئەو هۆیـانە دەکرد، بێ ئەوەی هیچ یارمەتییەکی لە یۆنســـکۆوە پی بگات. لەبەرئەوە هەر هەنگاوێکی کە دەیهاوێت بە نزمترین پێوانە، ســـنوورێکی کەمی هەیە، جا لەبەر ئەو بارودۆخەی وەســـفمان کرد،

---

١١٢٥ - هـ س، ل٣٩٩.

١١٢٦ - پارتی دیموکراتی کوردستان(مەکتەبی سیاسی-٢-)، یادداشتی بارزانی....، ل١٨.

بێگومـان ئەو نەوە کوردســـتانییەی ئێســـتە دەکەوێتە بەر هەڕەشـــەی حـاڵەتی نەخوێندەواری جێگیر و درێژ خایەن و زۆربەی زۆری ئەم گەلە دوور دەبێت لەو بەشــە زۆر کەمەی هەوڵی لەناوبردنی نەخوێندەواری و پتر لەیەک ملیۆن کەس لەو ناوچانەدا دەژین، کە کەوتوونەتە ژێر دەسەڵاتی شۆڕشی کوردستان"[١١٢٧].

فشـارە سـیاسـییە بەردەوامەکانی مسـتەفا بارزانی لەسـەر کاربەدەسـتانی بەغدا، لەپێناو دەسـتەبەرکردنی مافە ڕۆشـنبیرییەکانی گەلی کورد، دواجار بەشـێکی لەگەڵ ڕێککەوتنامەی ئاداری ١٩٧٠ هاتنەدی، کە بەووردی لە بەشەکانی پێشەوەی ئەم تێزە باسکراوە.

١١٢٧ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی...(شۆرشی ئەیلوول ١٩٦١–١٩٧٥)، ٢٠٢٠، ل٤٣٨

مستەفا بارزانی لە کونجێکی دوورە دەستی جیهان، دابڕاو لە هۆکار و ئامرازە پێشکەوتووەکانی پەیوەندی، بەبیر و ئایدیای کوردایەتی و باوەڕێکی جێگیر بە خود و پرسی گەلەکەی، ئاستەنگەکانی بەردەم بەستنەوەی شۆڕشی کوردی بەنێوەندە جیهانییەکانی خاوەن بڕیاری بڕی، لە ڕێگای ئەو کۆششانەی ئەنجامیدا بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی سیاسی و سەربازی بۆ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد[١١٢٨]. ئاشکرایە بارزانی لە خەباتی سیاسی و چەکداریدا، شێوازی بەکارهێنانی هێزی بۆ دەستەبەرکردنی مافی گەلەکەی گرتەبەر، بەڵام توانا سەربازییەکانی لەبەرامبەر سوپای عێراق هاوسەنگ نەبوو، بۆیە هەوڵیدا پردێکی پەیوەندی لەنێوان بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد و وڵاتانی هەرێمی و نێودەوڵەتی دروست بکات. لەبەرامبەردا ئەم وڵاتانە مەبەستیان بوو سوود لەم پەیوەندییە وەربگرن بۆ بەدیهێنانی ئامانج و بەرژەوەندییە سیاسییەکانیان و وەک کارتێکی فشار لە دژی ئەوانەی لەگەڵیاندا ناکۆک بوون بەکاری بهێنن، کە لەتەوەرەکانی داهاتوودا باسی دەکەین:

### تەوەری یەکەم: پەیوەندییەکان لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ و جیهانی عەرەبی

پێگەی جیۆسیاسی کوردستان، یەکێک بووە لە کێشە گەورەکانی بەردەم مستەفا بارزانی. بەهۆی دراوسێییەتی ئێران لەگەڵ عێراق. بارزانی ناچاربوو بکەوێتە نێو پەیوەندی سیاسی و سەربازی لەگەڵ ئەم وڵاتە. لە لایەکی تریش لەنێو وڵاتانی عەرەبیدا هەوڵیداوە سوود لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ سەرۆکی میسر جەمال عەبدولناسر وەربگرێ، بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی یەکێک لە وڵاتە عەرەبییە کاریگەرەکان، چونکە سەرۆکی میسر جیاواز لە وڵاتانی دیکەی عەرەبی کە مستەفا بارزانی و شۆڕشی کوردیان بە مەترسی دەبینی لەسەر یەکپارچەیی خاکی عێراق، پشتگیری چارەسەری ئاشتییانەی دۆزی کوردی دەکرد. وەک لێرە بەدوا باسیان دەکەین:

---

1128 – WILLIAM TUOHY, The Grizzly Old Warrior Is Optimistic, The Tuscaloosa News, feb 15 1971, p.7.بڕوانە

## باسی یەکەم: ئێران

پەیوەندییەکانی مستەفا بارزانی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئێران، بەپێی بارودۆخ و ڕووداوە سیاسییەکانی بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کوردی، لە هەڵکشان و داکشاندا بووە. لەو کاتەی بارزانی لەدوای ڕاپەڕینی دووەمی بارزان لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ ڕوویکردە ئێران و لە کانونی دووەمی ١٩٤٦ بەشداری کۆماری کوردستانی لەمەهاباد کرد[1129]، حکومەتی ئێرانی بە نیگەرانییەوە سەیری ڕۆڵی ئەم ڕێبەرەی دەکرد لە پاراستنی قەوارە کوردییەکە، دواجار لەدوای ڕووخانی کۆمارەکە لە کانونی یەکەمی ١٩٤٦، سزای لە سێدارەدانی بۆ دەرکرد، لەبەرئەوەی تا دوا سات، ڕووبەڕووی هێزەکانی ئێران بوویەوە و خۆی ڕادەستییان نەکرد تا پەڕییەوە ناو سنووری یەکێتی سۆڤیەت[1130]. ئەو کاتەشی لە سۆڤیەت بوو، حکومەتی ئێرانی بەچاوی پڕ لە گومانەوە سەیری چالاکییەکانی دەکرد، تا ئەو ڕادەی سکالای لە حکومەتی سۆڤیەت کرد، چیتر هەوڵ نەدەن سوود لە بارزانی وەربگرن و وەک فشارێک لەدژی بەرژەوەندییەکانیان بەکاری بهێنن[1131].

کاتێک مەلا مستەفا لە سۆڤیەتەوە گەڕایەوە عێراق، حکومەتی ئێرانی پێی وابوو ئەم ڕێبەرە هەڕەشەیەکی گەورەیە لەسەر داهاتووی ناوچەکە[1132]، چونکە بە بڕوای ئەوان ئەو ماوەیەی بارزانی لە سۆڤیەت ژیاوە، کەوتۆتە ژێر کاریگەریی بیروباوەڕ و ئایدۆلۆژیای کۆمۆنیستی[1133]، ئەم مەترسیانەشی لە ڕاگەیاندنەکانی بڵاوکردنەوە، تەنانەت هەوڵیدا وڵاتانی عەرەبیشی لێ ئاگادار بکاتەوە[1134]، بەڵام بارزانی بە هۆشیارییەوە مامەڵەی لەگەڵ مەترسییەکانی ئێران و وڵاتانی دیکەی دراوسێی عێراق

1129 – Nagel Joane,op.cit,p.20.

1130 –FIRAT SÖZERİ , Önceki Kaynak,S.25.

١١٣١ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٩٣١–١٩٥٨)،ل١٩٩.

١١٣٢ – بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە(٢) لە: الكورد في وثائق الارشيف الوطني البريطاني(١٩٥٨–١٩٦٩)،ج٢، ص٢١.

١١٣٣ – ئارەش ڕەئیسینەژاد، س.پ، ل١٤٩.

١١٣٤ – روزنامەهای آمریکایی می نوسیند( اعزام اکراد شوروی خاورمیانە رابە خطر می اندازد طبق گزارش خبر گزاری فرانسە)، آطلاعات(روزنامە)، ش(٩٨٨٣)، (١٣ أوريل ١٩٥٩)، ص١٣.

کرد. بەشـــێوەیەک داخوازییەکانی گەلی کوردی لە عێراق، لە بازنەی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان و دیموکراسیەت بۆ عێراق چڕکردەوە[١١٣٥].

خواستی سەرکردایەتی سیاسی کورد لە باشووری کوردستان بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی لەچوارچێوەی عێراقدا لەدوای هەڵگیرســانی شــۆڕشــی کورد لە ئەیلولی ١٩٦١، نەبووە هۆی ئەوەی مەترســییەکانی حکومەتی ئێرانی برەوێنێتەوە[١١٣٦]، بەڵکو لەلایەک دەســەڵاتدارانی ئێران هەڵگیرسـانی شـۆڕشـی کوردیان بە پلان و نەخشـەی ســـۆڤیەت دەزانی و بەو هۆیەوە زیـاتر لە پێشـــوو، کەوتنە پلان دارشـــتن بۆ ســـەرکوتکردنی. بەجۆرێک لە ســـاڵی ١٩٦٣ بەئـامـانجی کۆتـاییهێنـان بە بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد، چوونە ناو هاوپەیمانەتییەکی سەربازی نهێنی بەناوی(پرۆسەی دیجلە)، لەگەڵ حکومەتی عێراق و تورکیا و ســـوریا[١١٣٧]. بەڵام حکومەتی یەکێتی ســـۆڤیەت لە(٩ی تەممـوزی١٩٦٣) لە ڕێگـای وەزارەتـی دەرەوە ئەم هەوڵەی سـەرکۆنەکرد و هەڕەشـەی ئەوەی لەم وڵاتانە کرد، ئەگەر لە پلانەکەیان پاشـەکشـە نەکەن، دەســـتێوەردانی ڕاســـتەوخۆ لە بابەتەکە دەکات[١١٣٨]. بەو هۆیەوە حکومەتی ئێرانی لەم هاوپەیمانەتییە کشایەوە. بەم جۆرەش لەهاوینی ١٩٦٣ جەنگی کورد بووە پرســـی ســـەرەکی هەرێمەکە بەلای ئێران، وەک چۆن بۆ وڵاتە زلهێزەکانیش بووە گۆرەپانی جەنگی سارد[١١٣٩].

لەلایەکی دیکە حکومەتی ئێران پێی وابوو دۆخی باشـووری کوردسـتان تەنها لە بەرژەوەندی یەکێتی ســـۆڤیەت دایە، ئەمەش لەدژی بەرژەوەندییەکانی ئەواندایە. بەو هۆیەوە هەولّیدا جۆرێک لە تێگەیشـــتن لەگەڵ بارزانی دروســـت بکات، وەک عیســـا پژمانی ئەفســەری نووسـینگەی دەزگای هەواڵگری و ئاسـایشـی نیشـتمانی (سـاواک) لەبەغدا باسی دەکات، کە لەسەر داواکاری ئەو، شـای ئێران ستراتیژی سیاسی خۆی بەرامبەر شـــۆڕشـــی کورد گۆڕی و بڕیاریدا یارمەتی شـــۆڕشـــی کورد بدات، بەو

---

1135 –Dana Adams Schmidt, Kurds' Guerrilla Tradition Aids Rebels in War on Iraqi Army,The New York Times, September 12, 1962,p.1.

١١٣٦ – ئارەش ڕەئیسینەژاد، س. پ ، ل١٤٨.

١١٣٧ – نازناز محەمەد عەبدولقادر، س.پ، ل١٤٠.

1138 –ПОЛОЖИТЬ КОНЕЦ ИНОСТРАННОМУ ВМЕШАТЕЛЬСТВУ В СОБЫТИЯ НА СЕВЕРЕ ИРАКА, ПРАВДА, No:191(16412), 10 июля 1963, с.1.

١١٣٩ – ئارەش ڕەئیسینەژاد، س. پ ، ل١٩٥.

مەرجەی کاریگەریی لەسەر ناوچە کوردییەکانی ئێران دروست نەکات[1140]. بۆ ئەم مەبەستەش عیسا پژمان لە سەرەتای ١٩٦٣ بۆ یەکەمین جار مەلا مستەفا بارزانی لەسەر چیای (شیرین) بینی و ئامادەیی تەواوی شای ئێرانی بۆ پشتگیریکردنی کوردی عێراق ڕاگەیاند[1141]. ئەو کاتە دەزگای (ساواک) بڕێکی تا ڕادەیەکی باش تەقەمەنی دایە بارزانی و ڕێگەشیان پێدا وێستگەی ڕادیۆیەک لەسەر خاکی ئێران دابمەزرێنێ[1142]. بەڵگەنامەیەکی حکومەتی بریتانیاش لەسەر زاری سەرکردایەتی کورد پشتڕاستی دەکاتەوە، لەم ساڵەدا چەک و یارمەتی داراییان لە حکومەتی ئێران بەدەست گەیشتووە[1143]. بەم جۆرەش حکومەتی ئێران خۆی یەکلایی کردەوە بەرامبەر شۆڕشی کورد، لەمەترسی ئەوەی ئەگەر هاوکاری شۆڕشگێرانی کورد نەکات، ڕەنگە بەمەبەستی بەدەستهێنانی پشتیوانی بۆ شۆڕشەکەیان، بچنە پاڵ یەکێتی سۆڤیەت و بکەونە بەرەی دژ بە بەرژەوەندییەکانی ئێران لەناوچەکە.

سەرباری ئەم هۆکارەی لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد، حکومەتی ئێران بەچاوی هەریمایەتی لە شەڕی کوردی دەڕوانی. بۆیە کاتێک لەحوزەیرانی ١٩٦٣ شەڕ لە نێوان کورد و حکومەتی عێراقی لە ئارادا بوو، دەسەڵاتدارانی ئێران پێیان وابوو ئەم شەڕە دەرفەتێکی لەبارە بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرن، تا هەڕەشەی هەریمایەتی (عەرەبیزم) لە جێی خۆی ڕابگرن و بەرزەفتی بکەن. بۆیە لە ئەیلولی ١٩٦٣ شای ئێران پێشوازی لە مەلا مستەفا بارزانی کرد و بەڵێنی پشتگیری زیاتری پێدا، تەنانەت دوای دیدارەکە، شای ئێران فەرمانی بە (ساواک) کرد، خۆیان کۆبکەنەوە بۆ کۆمەککردنی کوردانی عێراق. لەسەر ئەم بنەمایە (ساواک) بەشی سەرەکی چەکەکانی، کە لە ئەوروپاوە ئامادەکرابوو بۆ باشووری کوردستان گواستەوە، وێڕای ئاسانکاریکردن بۆ گواستنەوەی کۆمەکیەکانی حکومەتی ئیسرائیل بۆ شۆڕشی کورد. لەهەمان کات حکومەتی ئێرانی وێستگەیەکی ڕادیۆی لە ئەلمانیاوە بۆ شۆڕشی کورد کڕی، دواتر بە قاچاغ ئاودیوی باشووری کوردستانی کرد. جگە لەمانەش چاوی لە ئاودیوبوونی کوردانی ئێران بۆ سنووری عێراق پۆشی، دوای ئەوەی بەرگری

١١٤٠ – عیسی پژمان، س. پ، ل٥٣.

١١٤١ – هـس، ل٦٠.

١١٤٢ – ئارەش ڕەئیسینەژاد، س. پ، ل١٥٤.

١١٤٣ – الكورد في وثائق الارشيف الوطني البريطاني(ج٢) ١٩٥٨–١٩٦٩، ص١٠١.

بارزانی لەبەردەم ســـوپای عێراقدا، هانی کوردانی ئەم ناوچەیەیدا بەتایبەتی ئەوانەی لەمەهاباد بوون، تا بچنە ڕیزی پێشـــمەرگە، لە بەرامبەر هێزەکانی حکومەتی عێراقی شەڕ بکەن. بەم شێوەیە لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٦٣ شۆڕشی کورد بووە توخمێکی سەرنجڕاکیشی سیاسەتی دەرەکی نا دەوڵەتییانەی ئێران لە ناوچەکە[١١٤٤].

دوای ماوەیەکی کورت، شای ئێران تا ڕادەیەک تووشی جۆرێک لە نائومیدی بوو بەرامبەر بە کورد، دوای ئەوەی بارزانی لە شـــوباتی ١٩٦٤ لەگەڵ حکومەتی عێراقی لەســەر ڕاگەیاندنی ئاگربەســت گەیشــتە ڕێککەوتن[١١٤٥]. ئەم ڕێککەوتنە شــای ئێرانی تاســـاند، تەنانەت مەترســـییەکی گەورەی بۆ دروســـتکرد، لەبەرئەوەی پێی وابوو ئەنجامی ڕاســـتەوخۆی ئاگربەســـتەکە، دەبێتە مایەی دروســـتبوونی قەوارەیەکی گەورەتری عەرەب لەسـەر سنووری ڕۆژئاوای ئێران[١١٤٦]. هەروەها ئەگەری ئەوەش هەبوو هەژموونی بارزانی باڵبکێشێ بەسەر ڕۆژهەڵاتی کوردستان. چونکە بەباوەڕی دەزگای (ســـاواک)، پێکهێنانی حکومەتی ئۆتۆنۆمی لە کوردســـتانی عێراقدا، کوردانی ئێران هاندەدا، تا ئەوانیش هەندێ سازش بە ئێران بکەن. دوای ئەوەی کوردانی ئێران پێشوازییان لە ئاگربەستەکە کرد، لەبەرئەوەی بەسەرکەوتنێکی مێژووییان بۆ هەموو کورد دەبینی[١١٤٧].

ئێران هەوڵیدا لە نزیکەوە لە هۆکاری ڕاگەیاندنی ئاگربەســـتەکە تێبگات و بەو هۆیەوە (عیسی پژمان) ی نارده لای بارزانی لە حاجی ئۆمەران تا زانیاری وەربگرێ لەســـەر هۆکاری ڕاگەیاندنی ئاگربەستەکە، بەبێ ڕاوێژکردن لەگەڵ حکومەتی ئێرانی. لە وەڵامدا بارزانی بە نێردراوەکەی حکومەتی ئێرانی گوت:" ئێمە بە دژی بەرژەوەندی ئێران کـارێکمـان نەکردووە، لەگەڵ دەوڵەتی عێراق بەدژی ئێران یەکمـان نەگرتووە. عەبدولســـەلام عارف و بەرپرســـانی دیکەی دەوڵەت کە زۆربەیان لە دۆســـتان و لایەنگرانی کوردن[مەبەستی فوئاد عارف بوو] ویستویانە لە بابەت ویستەکانمانەوە قســەمان لەگەڵ بکەن. مەبەستی ئێمە گەیشتن بە ویستەکانمانە ئەگەر ئەوان ڕاست

١١٤٤ – ئارەش ڕەئیسینەژاد، س. پ ، ل١٩٩.

١١٤٥ – سەبارەت بە هۆکارەکانی ڕازیبوونی مەلا مستەفا بارزانی بە ڕێککەوتن لەسەر ڕاگەیاندنی ئاگربەست لەگەڵ حکومەتی عێراقی لە ساڵی ١٩٦٤، بروانە: دیڤید ادامسن و جرجیس فتح الله، م.س، ص٧٠.

١١٤٦ – بروانە: نازناز محەمەد عەبدولقادر، س. پ، ل١٤٩.

١١٤٧ – ئارەش ڕەئیسینەژاد، س. پ ، ل٢٠١.

بڵێن، کە هیچ کاتێکیش ڕاســـتیان نەگوتوە و ڕاســـتیش ناکەن، چ لەوە چاکتر، ئەگەر کارێکیشـــیان نەکرد ئێمە هەر برا و هاوکار و هاویاری یەک بوین و هەین و هیچ ناکۆکیەک بەدی نایێ. هەر جۆرە ســـەرکەوتنێکیش بەدەســـت بێنین، بەر منەتی محەبەت و لوتفی شـای ئێران و بەرپرسـانی دەوڵەتی ئێرانین، سـەرەڕای ئەمانەش، پێشـــمەرگەکانیشـــمان ماندوو بوون. زۆربەی ئەوان چەند ســـاڵە بنەماڵەی خۆیان نەدیوە، بەڵکو هەڵێک بەدەســت بێ، کە ئەوان بتوانن ســەر لە ماڵ و منداڵیان بدەن و بەگیان و بیری باشـترەوە ئامادەی کارو تێکۆشـان بن"[١١٤٨]. بارزانی بەم شـێوەیە بە حکومەتی ئێرانی ڕاگەیـانـد ئەو ئـازادە لەوەرگرتنی هەر بڕیـارێـک پەیوەنـدی بە بەرژەوەندی گەلەکەیەوە هەبێ. لەبەرامبەردا پژمان دەڵێت:" نەمتوانی دژ بوەســـتم، بەڵام بەم بیانووە کە چۆن و چلۆن بێ ئاگادارکردنەوەی دەوڵەتی ئێران بۆ وتویژ لەگەڵ دەوڵەتی عێراق ڕەخنەم گرت و دژ وەســـتام". ئەو کاتە بارزانی هەســـتی بە نیگەرانی قوڵی حکومەتی ئێران کرد لەبەرامبەر ڕێککەوتنەکە و بەڵێنی پێدان، هیچ کات لە دژی بەرژەوەندییەکانیان هیچ کردەیەک ئەنجام نەدات، بەڵام ئەم بەڵێنەی بارزانی بۆ شای ئێران دڵنیاکەرەوە نەبوو، بۆیە وەک پژمان باسی دەکات شای ئێران بڕیاریدا هاوکاریەکانی بۆ کورد ڕابگرێ[١١٤٩].

لەمەش زیاتر شـــای ئێران هەوڵیدا ســـیاســـەتی پەرتکە و زاڵبە لەنێو ریزەکانی شـــۆڕشـــی کورد پیادە بکات، بەشـــێوەیەک وەک تۆلە ســـەندنەوەیەک لەســـەر ئەم هەڵویســـتەی مەلا مســـتەفا بارزانی، حکومەتی ئێرانی هەوڵیدا لە ڕێگای هاندانی بەشێکی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لەنێو پارتی دیموکراتی کوردستان، فشار لەسەر بارزانی دروســـت بکات، بۆ ئەوەی لە بڕیاری ئاگربەســـتەکە پەشـــیمان بێتەوە[١١٥٠]. ئەمەش لە وەڵامی بارزانی بۆ ژەنەراڵ پاکرەوانی ســـەرۆکی دەزگای (ســـاواک) دەردەکەوێ، کـاتێـک پـاکرەوان نوێنەری خۆی ژەنەراڵ (مەنســـور پوور)ی بە نامەیەکەوە بۆ لای بارزانی ڕەوانەکرد و بانگهێشـــتی بارزانی کرد بۆ دیداری شـــای ئێران لە تاران. بەڵام بارزانی بانگهێشـــتنامەکەی ڕەتکردەوە و گوتی:" ئێوەن هانی

---

١١٤٨ – عیسی پژمان، س. پ، ل ٦٦،٦٧.

١١٤٩ – هـ.س، ل٦٨.

١١٥٠ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی...شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١–١٩٧٥، بگ٣، ب٢، ل٢٠٣.

ئیبراهیم ئەحمەد دەدەن و لەدژی ئێمەدا دەیجولێنن، ئەگەر ئێوە هەڵوێستی خۆتان بگۆڕن و شتێکی وا دەربڕن نیشانەی نیازپاکیتان بێ و دەستی دۆستایەتیمان بۆ درێژبکەن، ئەوا ئێمەش واتان لەگەڵ دەجولێینەوە، بەڵام لێم ببورن ناتوانم بێم بۆ تاران، لێرە ئامادەم بەهەموو شادومانییەکەوە پێشوازی لە ژەنەراڵ پاکرەوان بکەم". هەربۆیە لە (٢٠ی حوزەیرانی ١٩٦٤) ژەنەراڵ پاکرەوان ناچاربوو بۆ خۆی بچێتە دیداری بارزانی لە حاجی ئۆمەران. پاکرەوان لەگەڵ خۆیدا فەرمانی لێخۆشبوونی شای ئێرانی بۆ بارزانی هێنابوو لەم سزای لەسێدارەدانەی لەدژی مەلا مستەفا دەرکرابوو لەسەردەمی کۆماری کوردستان. پاکرەوان بەڵێنی بە بارزانیدا دەست لە کاروباری نێوخۆیی پارتی و شۆڕش وەرنەدەن. بەڵام بە پێچەوانەی بەڵێنەکەی، عیسا پژمان زیاتر لە جاران خۆی لە گروپی مەکتەبی ساسی نزیک کردەوە[١١٥١].

مەسعود بارزانی کاتێک باسی ئەم جیابوونەوەیەی نێو پارتی دەکات دەڵێت:" لە دوو کەرتبوونەکەی ١٩٦٤دا، لە ڕێگەی پژمانەوە، هەڵوێستێک بۆ شا تۆمارکراوە لە هاندانی ئەو جیابوونە یان دووکەرتبوونە ناخۆشەی لە ڕیزی پارتیدا ڕوویدا و گەیشتە ڕادەی پاڵنان بە ئیبراهیم ئەحمەد بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی دوژمنانەی ئاشکرا بۆ بارزانی"[١١٥٢]. ئەم هەڵوێستەش بووە هۆی ئەوەی بارزانی ڕووبەڕوویان ببێتەوە تا دووریخستنەوە بۆ ئەم دیوی سنووری ئێرانی. پاشان دوای ئەوەی هێزەکانی ئێران چەکەکانی لێوەرگرتن، هەموویانی گواستنەوە هەمەدان. بەم جۆرەش ئێران درزێکی گەورەی لە ریزەکانی پارتی دروستکرد، بەڵام بەزیانی خۆی شکایەوە[١١٥٣]. دوای ئەوەی مەلا مستەفا بۆ ئەوەی گروپەکە لەژێر دەسەڵاتی ئێران دەربهێنێ، لێیان خۆش بوو، ئەو کاتە بەشێکیان لەسەرەتای تەمموزی ١٩٦٥ گەڕانەوە نێو شۆڕش[١١٥٤].

بەردەوامبوون و مانەوەی بارزانی لە پێگەی بەهێزی خۆی سەرباری پیلانەکانی ئێران، شای ئێرانی ناچارکرد چاو بە سیاسەتەکانی بەرامبەر مەلا مستەفا بخشێنێتەوە، بۆیە دوای ئەوەی لە تشرینی یەکەمی ١٩٦٤ شەڕ لە نێوان کورد و

---

١١٥١ – بروانە: نازناز محەمەد عەبدولقادر، س. پ ، ل١٥١،١٥٢.

١١٥٢ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد (شۆرشی ئەیلول ١٩٦١-١٩٧٥)، بگ٣، ب٢، ل٢٠٣.

١١٥٣ – ئارەش رەئیسینەژاد، س. پ ، ل٢٠٤-٢٠٥.

١١٥٤ – نازناز محەمەد عەبدولقادر، س.پ، ل١٥٣.

حکومەتی عێراقی دەستی پێکردەوە، حکومەتی ئێرانی لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٥ شەش ئۆتۆمۆبێلی پڕ لە پێداویستی بۆ شۆڕشگێرانی کورد ڕەوانەکرد[١١٥٥]، پاشان (٨) تۆپی هاوەنی عەیار (٨١) ملم و (٥٠٠) تفەنگی برنۆ و (٤) هاوەنی (١٢٠) ملم لەگەڵ بڕێکی زۆر لە فیشەک و تەقەمەنی ڕەوانەکرد و ڕێگایان کردەوە بۆ ئەوەی بریندارەکانی شۆڕشی کورد لە نەخۆشخانەکانی ئێران چارەسەر بکرێن[١١٥٦]. پاشان فەرماندەیەکی سەربازی ئێرانی بەناوی(عەلی مودەریس) لە شوباتی ١٩٦٥ بە کۆمەڵێک نەخشەی سەربازی گەیشتە کوردستان و ئامادەیی سوپای ئێرانی نیشاندا بەتۆپخانەی قورس، پشتیگری شۆڕشگێرانی کورد بکەن[١١٥٧].

حکومەتی ئێرانی بەڵێنەکەی خۆی بەرامبەر شۆڕشگێرانی کورد جێبەجێکرد و تا ڕادەیەکی باش هاوکاری ماددی و مرۆیی پێشکەشی شۆڕشی کورد کرد. ئەمیش بە ئامانجی سیاسی شاراوەی شای ئێران ، کە وەک بەڵگەنامەیەکی حکومەتی بریتانیا ئاماژەی پێدەکات، هەوڵدان بوو بۆ سوود وەرگرتن لە کارتی کورد لە دژی حکومەتی عێراقی[١١٥٨].

دواجار بەهۆی دەستپێکردنی دانوستانەکانی نێوان کورد و حکومەتی عێراقی لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٦٩، حکومەتی ئێران ڕووبەڕووی دۆخێکی جیاوازبویەوە، بەجۆرێک شای ئێران پێی وابوو لە ئەگەری ڕێککەوتنی سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراقی، هەموو پلان و نەخشە سیاسییەکانی بۆ سنووردارکردنی توانا سەربازییەکانی عێراق ئاوەژۆ دەبێت. هەربۆیە لەسەرەتاکانی ١٩٧٠ بە دەستی شێخ بابە عەلی شێخ مەحمود، بانگهێشتنامەیەکی بۆ بارزانی ڕەوانەکرد بۆ سەردانیکردنی تاران. مەلا مستەفا وەڵامی بانگهێشتنامەکەی دایەوە و لە ڕۆژی (١٥ی کانونی دووەمی ١٩٧٠) بەیاوەری شێخ بابە عەلی چووە دیداری شا. ئەو کاتە محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی هەوڵیدا لە ڕێگای گفت و بەڵێنی گەورە بە بارزانی، سەرکردایەتی کورد لە ئەنجامدانی ڕێککەوتن لەگەڵ حکومەتی عێراقی پاشگەز بکاتەوە. لە وەڵامدا بارزانی پێی ڕاگەیاند، کە ئۆتۆنۆمی لە سەرەتاوە ئامانجی شۆڕشی کورد بووە، بۆیە

---

١١٥٥ – شکیب عقراوی، م.س،ص١٦٧.

١١٥٦ – دیڤید ادامسن و جرجیس فتح الله، م.س، ص٤٨.

١١٥٧ – نازناز محەمەد عەبدولقادر، س. پ ، ل١٥٨.

1158 –NA, FCO 51/358, Research Department Memorandum the Kurdish Problem in Iraq, 1963–1971, 6 December, 1971. P.32.

ئەو ناتوانێ پشـــتگوێی بخات. بەڵام هەوڵەکانی شـــای ئێران لەگەڵ بارزانی لەوەندە کۆتایی نەهات، بەڵکو دوای گەڕانەوەی بارزانی لە تاران بۆ کوردســـتان، شـــای ئێران لەسەر هەوڵەکانی بەردەوام بوو بۆ پاشگەزکردنەوەی مەلا مستەفا لە ڕێککەوتنەکەی لەگەڵ بەغدا، کەچی هیچ ســـوودی نەبوو، لەبەرئەوەی بارزانی ئامادە نەبوو ســـازش بکات لە کاتێکدا هیچ باوەڕ و متمانەی بە شـــــای ئێران نەبوو، بەڵکو بەناچاری کەوتبووە نێو پەیوەندی ســـیاســـی و ســـەربازی لەگەڵ حکومەتی ئێراندا، بەهۆی نەبوونی پاڵپشتی دەرەکی بۆ شۆڕشی کورد[١١٥٩].

لە بەردەوامی هەوڵەکانیدا، حکومەتی ئێران لە (٤ی ئاداری ١٩٧٠) بانگهێشـــتی ئیدریس بارزانی کرد بۆ تاران، بەڵکو بتوانن لە ڕێگای بەخشـــینی هاوکاری زیاتر بە کورد، بارزانی لە ڕێککەوتنەکە پەشـــیمان بکەنەوە، کەچی ئەم هەوڵەشـــیان بێ ئاکام بوو[١١٦٠]. دواجار بارزانی لە (١١ی ئاداری ١٩٧٠) لەگەڵ حکومەتی عێراقی ســـەبارەت بە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردســـتان گەیشـــتە ڕێککەوتن. بەم شـێوەیەش هەژموونی بارزانی نەک تەنها لە باشـــوور، تەنانەت لە نێو کوردەکانی بەشـــەکانی دیکەی کوردســـتان زیادی کرد، دوای ئەوەی مســـتەفا بارزانی لە دیدارێکی لەگەڵ پەیامنێری ئاژانســـی هەواڵی عێراقی ئەوەی ڕاگەیاند، پارتی دیموکراتی کوردستان پەیوەندی بە کوردەکانی ئێرانەوە نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا گەلی کورد وەک هەر گەلێکی خەباتکەر لە پێناو مافە نەتەوەییەکانی، دەبێ ئازادی خۆی بەدەست بێنێ[١١٦١].

ئەم وتارە پێگەی بارزانی زیاتر لەجاران لەنێو کوردەکانی ئێران بەهێز کرد و لەبەرامبەردا دەســـەڵاتدارانی ئێران دڵنیابوون لەوەی بارزانی ســـازش لەســـەر مافی گەلەکەی ناکات، ئەگەر فشارەکانی سەری چەندە کاریگەر و بەهێزبن. بۆیە هەوڵیاندا میکانیزمی دیکە بدۆزنەوە بۆ ڕاکێشـــانی بارزانی بۆ نێو بازنەی ململانێیەکانیان لەگەڵ

---

١١٥٩ – نازناز محەمەد عەبدولقادر، س. پ ، ١٨٧.

1160 -F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, 267. Central Intelligence Agency Information Cable TDCS DB–315/01044–70, Israeli Aid to Kurdish Rebels, Washington, March 9, 1970, p2. سەبارەت بە گفتوگۆکانی (ساواک) لەگەڵ ئیدریس بارزانی لە ئاداری ١٩٧٠، بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٢٢)

١١٦١ – السيد البارزاني يعلن في تصريحات جديدة( الشعب الكردي في أيران لابد ان يحقق شخصيته و ينال حريته)، الثورة(جريدة)، ع(٤٧١)، ١٦ اذار ١٩٧٠، ص١.

حکومەتی عێراق، ئەمەش بە تێپەڕبوونی کات هاتەدی بەتایبەتی دوای خۆدزینەوەی حکومەتی عێراق لە جێبەجێکردنی برگە و ماددەکانی ڕێککەوتنامەی ئاداری ١٩٧٠، هەروەها هەوڵی تیرۆرکردنی مستەفا بارزانی لە ساڵی ١٩٧٢، و نزیکبوونەوەی حکومەتی عێراق لە یەکێتی سۆڤییەت، کە بەگشتی دەرفەتێکی لەباریان بۆ حکومەتی ئێران دروستکرد، جارێکی دیکە لەڕێگای نیشاندانی ئامادەیی زیاتر بۆ هاوکاریکردنی مستەفا بارزانی و هێزەکانی، دووبارە دەست لە کاروباری ناوەخۆیی عێراق وەربدات. ئەو کاتە بارزانی ڕێگایەکی دیکەی لەبەردەم نەبوو جگە لە ئەنجامدانی هاوپەیمانی لەگەڵ شای ئێران و ڕازیبوون بە وەرگرتنی یارمەتییە سەربازییەکانی، هەرچەندە متمانەی بە شای ئێران نەبوو[١١٦٢].

لەسەر ئەم بنەمایە شای ئێران هەوڵەکانی خۆی چڕ کردەوە بۆ ڕازیکردنی حکومەتی ئەمریکا بۆ پاڵپشتیکردنی شۆڕشی کورد، ئەم هەوڵەشی سەرکەوتوو بوو، دوای ئەوەی لە مانگی ئایاری ١٩٧٢ لە دیدارێکی لەگەڵ نیکسۆنی سەرۆکی ئەمریکا و هنری کسنجەری یاریدەدەری سەرۆک بۆ کاروباری ئاسایشی نیشتمانی توانی ئیدارەی ئەمریکا ڕازی بکات بەوەی پاڵپشتی شۆڕشی کورد بکەن[١١٦٣]. سەرباری ئەوەی حکومەتی ئێران بەهاوکاری ئیسرائیل هاوکارییەکانی بۆ شۆڕشی کورد زیادکرد و تەنانەت لەمانگی شوباتی ١٩٧٢ هەردوو وڵات بەیەکەوە، بڕی(١،٢٠٠،٠٠٠) دیناری عێراقی کە ئەو کات دەیکردە (٣،٦٠٠،٠٠٠) دۆلاری هاوکاری شۆڕشی کوردییان کرد[١١٦٤].

دوای هەڵکشانی هەژموونی سۆڤیەت لە ناوچەکە و پاڵپشتیکردنی لە حکومەتی عێراق، سەرکردایەتی کورد نائومێد بوو لە گەیشتن بە چارەسەرێکی ئاشتییانە بۆ دۆزەکەی. ئەو کاتە مەلا مستەفا بارزانی بە مەبەستی بەدەستهێنانی پاڵپشتی زیاتری حکومەتی ئێران بۆ کورد، لە تەمموزی ١٩٧٣ نامەیەکی بۆ محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی نووسی و لە بەشێکی نامەکەدا دەڵێت:" پێویستە ئاستی بزاڤەکەمان بەرزبکرێتەوە لە (بەرگری) بۆ ئاستی (هێرشکردن)، وە پێویستە کێشە داراییەکانمان

١١٦٢ – جیرارد جالیاند، م.س، ص٢٦١.

١١٦٣ – ئارەش ڕەئیسینەژاد، س.پ، ل٢٨٠.

١١٦٤ – ئارەش ڕەئیسینەژاد، س.پ، ل٢٨٥.

چارەســـەربکرێ، لەم قۆناغە پێویســـتیمان بە زۆرترین پاڵپشـــتی و چاودێری هەیە لەلایەن وڵاتەکەتان "[١١٦٥].

بەم جۆرە مســـتەفا بارزانی هەوڵیدا ســـوود لە تواناکانی ئێران وەربگرێتەوە بۆ هەر ڕووبەڕووبوونەوەیەکی چاوەڕوانکراو لەگەڵ حکومەتی عێراقدا. ئەم دەســـتپێشـــخەرییەی بارزانی بۆ شـــای ئێران دەرفەتێکی لەبار بوو بۆ لێدانی توانا سەربازییەکانی عێراق بۆ دوور خستنەوەی مەترسییەکانی لەسەر وڵاتەکەی. بەو هۆیەوە بڕیاریدا ئاستی پاڵپشتییەکانی بۆ مستەفا بارزانی زیاد بکات، دوای ئەوەی لەئەنجامی ڕاگەیاندنی یاســـای ئۆتۆنۆمی لە (١١ی ئاداری١٩٧٤) لەلایەن حکومەتی عێراق، پەیوەندییەکانی نێوان حکومەتی عێراق و ســـەرکردایەتی کورد گەیشـــتە بنبەست. بە پێی زانیارییەکانی ڕۆژنامەی (لویستون دەیلی سەن)ی ئەمریکی، بارزانی پێشبینی هەڵگیرسانەوەی شەڕی کرد[١١٦٦]، بۆیە لە (١٦ی ئاداری١٩٧٤) ســـــەردانی تارانی کرد و لە (١٨ی ئاداری ١٩٧٤) چاوی بە شـای ئێران کەوت و داوای چەک و زەخیرەی جەنگی بۆ پێشمەرگە کرد، وەک چەکی (دژەتانک و دژە فرۆکە)، بۆ ئەوەی بتوانێ هێرشێکی گەورە و سەرتاسەری بکاتە سەر حکومەتی عێراق. لەهەمان کاتدا بارزانی پرۆژەی ئۆتۆنۆمی پارتی دیموکراتی کوردستانی پێشکەش بە شـای ئێران کرد و داوایکرد پشتگیری بکەن بۆ ڕاگەیاندنی ئۆتۆنۆمی لەناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەســـەڵاتی شـــۆڕشـــگێرانی کورد و وردەکارییەکانی بودجەی پێویســـتی بۆ بەشـــی کارگێڕی و بەرگری و پەروەدە و تەندروســـتی خســـتەڕوو، لەم ســـۆنگەوە ڕایگەیاند ســـاڵانە پێویســـتیان بە (٦٠) تا (١٢٠) ملیۆن دیناری عێراقی هەیە[١١٦٧]. وێڕای ئەوەی

1165 - F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, (Doc: 225). Memorandum from Acting Director of Central Intelligence Walters to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Kurdish Leadership Request for Assistance from the Shah of Iran, Washington, July 26, 1973, pp.641-643. سەبارەت بە نامەکەی بارزانی بۆ شای ئێران لەساڵی ١٩٧٣، بڕوانە: پاشکۆی ژمارە (٢٣)

1166 - Rodney, Kurdish Rebel Says Iraq Is Facing an All-Out War. The Lewiston Daily Sun(newspaper), vol: (82),29/3/1974, p.19.

١١٦٧ - شۆڕشی ئەیلوول لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا، ئامادەکردن و وەرگێڕانی: وریا ڕەحمانی، تاران، ٢٠١٣، ل٤٤٥،٤٤٦.

داوای لە شـــای ئێران کرد هەوڵبدەن پشـــتگیری پرۆژەکەیان بکەن لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان[١١٦٨].

شـــای ئێران لەبارەی ڕاگەیاندنی پرۆژەی ئۆتۆنۆمییەوە، پێی وابوو پێویســـتە ڕاوێژ بە هاوپەیمانەکانی بکات، کە مەبەســـتی ئەمریکا بوو. بۆیە بە پێویســـتی زانی بارزانی پرۆژەکەی دوابخات. بەڵام لەگەڵ ئەمەشـــدا وەک وەڵامدانەوەیەکی خێرا بۆ زیادکردنی هاوکاری و یارمەتییەکانی حکومەتی ئێران بۆ شـــۆڕشـــگێرانی کورد، بڕیاریدا بڕی هاوکاریەکانی ســـاڵانەیان لە (٣٠) بۆ (٧٤) ملیۆن دۆلار زیاد بکات [١١٦٩]. ئەمەش هەوڵێک بوو بۆ دوورخستنەوەی بارزانی لە ڕێککەوتن لەگەڵ دەسەڵاتدارانی بەغدا[١١٧٠]. بەپێی زانیارییەکانی ئاژانســـی هەواڵگری ئەمریکا(CIA) حکومەتی ئێرانی لەســـەر فەرمانی شـــا، ژمارەیەکی زۆری تفەنگی (بڕنۆ) و (١٠٠٠) موشـــەکی ئاربی جی و (٧) موشەکی دژە تانک و چەند موشەکێکی دژە فرۆکەیان دەستبەجێ گەیاندە شۆڕشگێرانی کورد و بەپێی زانیارییەکانی ئەم دەزگایە، پاڵپشتی ساڵانەی حکومەتی ئێران بۆ بارزانی، زیاتر لەوەی پێشـــتر بڕیاری لەســـەر درابوو، گەیشـــتە (٧٥) ملیۆن دۆلار[١١٧١].

کاتێک بارزانی دووبارە پشـــتگیری ئێرانی بۆ شـــۆڕشـــی کورد بەدەســـتهێنایەوە، بەهێزتر لەجـاران، ڕووبەڕووی حکومەتی عێراق بوویەوە . لەبەرئەوەی حکومەتی ئێران ڕوونتر و ئاشـکراتر لە جاران پاڵپشـتی شـۆڕشـی کوردی کرد، تەنانەت شـای

---

1168 -F.R.U. S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, (Doc:242). Backchannel Message from the Ambassador to Iran (Helms) to the President's Deputy Assistant for National Security Affairs, Tehran, March 18, 1974, p.680.

١١٦٩ – بریان ڕۆبەرت گیبسن، ئەریَ کورد بوونە بەردەباز(سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا، عێراق، کورد و جەنگی سارد لە ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ تا ٢٠ی ئازاری ١٩٧٥)، و: شەفیقی حاجی خدر، هەولێر، ٢٠١٩، ل٦٠٩.

١١٧٠ – ئارەش رەئیسینەژاد، س.پ،، ل٣٦٢.

1171 - F.R.U.S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, 250. Memorandum from Director of Central Intelligence Colby to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Request by Mulla Mustafa Barzani to see Dr. Kissinger, Washington, May 23, 1974, P.694.

ئێران بۆ ڕێگرتن لە سەرکەوتنی بەغدا، سێ تیپی سەربازی زرێپۆش، دوو تیپی سەربازی پیادە و پاشان دوو لیوای پیادەی دیکەی لەسەر سنووری عێراق جێگیرکرد. هاوکات فەرمانی بە (ساواک) کرد، موشەکی دژە فرۆکە بۆ بارزانی دابین بکەن. ئیدی چەکی دژە هەوایی و تۆپی(٧٥) ملم چیایی لەسەر پشتی هێستر بارکران و گەیەنرانە دەستی پێشمەرگە[١١٧٢]. ئەوە سەرباری ئەوەی سەرباز و ڕاوێژکارانی سەربازیی ئێرانی بە جلی کوردییەوە شان بە شانی هێزی پێشمەرگە، لە (تەمموزی ١٩٧٤)ەوە لە دژی سوپای عێراقدا لە باشووری کوردستان بڵاوبوونەوە و لە (٢٣ی ئابی ١٩٧٤) دەستیان بە شەڕ کرد. پاشان ئێران لە(١١ی تشرینی دووەمی١٩٧٤) دا چەند یەکەیەکی تۆپخانە و دژە فرۆکە و موشەکی(زەوی ئاسمان-Rapier) لەناوچەکانی ژێر دەستی شۆڕشگێرانی کورد دامەزراند و بەتاڵیۆنێکی تۆپی دوورهاوێژی (١٧٥) ملمی لەسەر سنووری ئێرانەوە دەستیانکرد بە بۆردومانکردنی پێگە ستراتیژییەکانی سوپای عێراق[١١٧٣]. ئەو کاتە بارزانی لە دیدارێکیدا کە لە بارەگای خۆی لەگەڵ ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی ئەنجامیدا، ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، ئێرانییەکان سەرچاوەی سەرەکی کۆمەککردنی کوردن لە ڕووی سەربازییەوە[١١٧٤].

لەئەنجامی دروستبوونی فشاری سەربازی هەرێمی و نێودەوڵەتی لەسەر حکومەتی عێراق، دەسەڵاتدارانی بەغدا، هەوڵەکانی خۆیان چڕ کردەوە بۆ نزیکبوونەوە لە حکومەتی ئێران. دواجار لە شوباتی ١٩٧٥ بڕیاریاندا لەگەڵ حکومەتی ئێران بچنە ناو دانوستان و گفتوگۆ بۆ ڕاگرتنی پشتیوانیان بۆ شۆڕشی کورد، ئەو کاتە ڕووی ڕاستەقینەی شای ئێران بەرامبەر شۆڕشگێرانی کورد بەدیارکەوت، کە

---

١١٧٢ – عیسی پژمان، س. پ، ل٨٢

1173 -F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, (Doc:267). Briefing Memorandum from the Director of the Bureau of Intelligence and Research (Hyland) to the Under Secretary of State for Political Affairs, Iraqi Charge of Use of US Missiles in Iraq, Washington, December 16, 1974, p.728-730. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر هاوکاری ئێران بۆ هێزەکانی بارزانی، بڕوانە پاشکۆی ژمارە(٢٤)

1174 -James F. Clarity , Kurds Say Iran Arms Them and That Soviet Sends Advisers to Iraq, The New York Times, Sept. 29, 1974,p2.

سـسیاسـەتێکی دوو ڕووانەیە[1175]. تا دواجار لە (٦ی ئاداری١٩٧٥) لە کۆبوونەوەی وڵاتـانی بەرهەمهێنەری نەوت لە ڕێکخراوی ئۆپیـک لە جەزائیر، هەردوو وڵات ڕێکەوتننـامەیەکیـان واژووکرد[1176]، تێیـدا حکومەتی عێراق لەپێنـاو کۆتـایهێنـان بە شۆڕشی کورد، سازشی زۆری بۆ حکومەتی ئێران کرد، لەبەرامبەر دەستهەڵگرتنی ئەم وڵاتە لە پاڵپشـتیکردنی شـۆڕشـگێرانی کورد[1177]. لەسـەر ئەم بنەمایە دوای(٨) کاتژمێر لە ئەنجامدانی ڕێککەوتنەکە، حکومەتی ئێران دەستی بە کشانەوەی هێزەکانی کرد لە بەرەکانی شەڕ لە کوردستان و تۆپەکانی عەیار (١٥٥)ملمی خۆی گواستەوە بارەگاکانی خۆیان لەناو خاکی ئێران[1178].

دوای گەڕانەوەی شـای ئێران بۆ تاران، بانگهێشتی مەلا مستەفا بارزانی کرد و لەدیدارێکی کورتدا کە لە (١١ی ئاداری ١٩٧٥) ئەنجامدرا، شـا بە بارزانی گوت:" ئێمە ئیختلاف و مەشـاکیلی خۆمان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق کۆتایی پێ هێناوە و ئەمانەوێ لەگەڵ عێراق کە جیرانە و زۆربەی خەڵکەکەی شـیعەیە و لانی کەم دوو ملیۆن حەشـیمەتی ئەو کوردە لە هـاوڕەگەز و برایـانی ئێمەن، ئەمـانەوێ پەیوەنـدییەکی دۆسـتانەمـان هەبێ و قەراردادێکیش لە باروبـابەتەوە ئیمزا دەکرێ، لە تۆش داوا دەکەم بەهەموو بەرپرسـانی حزبی و پێشـمەرگە ڕابگەیەنێ کە لەم سـەعاتەوە شـەڕ لەگەڵ ئەرتەشی عێراق تەواو بووە و کەس حەقی نییە سەرئێشە بۆ دەوڵەتی عێراق ساز بکات. ئێمە لەمەودوا بە هیچ چەشنێک یارمەتی بە درێژە پێدانی شۆڕشی کورد ناکەین. ئەوەی پێوەندی بە ئێران و دەوڵەتی شـاهنشـاییەوە هەیە ململانێی لەگەڵ دەکەین. ئێوەش لەگەڵ ماڵباتی خۆتان و هەریەک لە سـەرکردەکانی حزبی و یا پێشمەرگە و ماڵباتیان ئەگەر بتانەوێ یان بیانەوێ دەتوانن پەنابەری ئێران بن و ژیان

---

١١٧٥ – بریان ڕۆبەرت گیبسن، س.پ، ل٣٥٠.

١١٧٦ – عیسی پژمان، س. پ، ل٩٠.

1177 - F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, THE IMPLICATIONS OF THE IRAN–IRAQ AGREEMENT, washington, may1,1975, P.767. سەبارەت بە خاڵ و برگەکانی ڕێککەوتنامەی جەزائیرلە (٦ی ئاداری١٩٧٥)ی نێوان عێراق و ئێران، بروانە پاشکۆی ژمارە(٢٥).

١١٧٨ – جیرارد جالیاند، م.س، ص٢٦٦.

و ئاسـایش و ئەمنیەتی گیانی هەمووتان دابین دەکرێ و لەهەر شـوێنێک دەوڵەتی شاهنشاهی بیەوێ جێگا و ڕێگاتان پێ دەدا"[١١٧٩].

ئەم دیدارە دوا وێسـتگەی پەیوەندییەکانی مسـتەفا بارزانی بوو لەگەڵ شـا و حکومەتی ئێران و دوای ئەوەی شـای ئێران بووە هۆی کۆتاییهێنان بە شـۆڕشـی کورد لە باشـووری کوردسـتان. دواجار شـای ئێران لە دیدارێکیدا لەگەڵ ڕۆژنامەنووسی میسری محەمەد حەسەنین هەیکەل گوتی:"بە دڵنیاییەوە پشتگیرییمان لە شۆڕشی کورد کردووە تا دوا قۆناغ ئێمە تەنها بوین لە هاوکاریکردنیان، وە کاتێک پاڵپشتییەکانمان ڕاگرت، شۆڕش کۆتایی هات"[١١٨٠]. بەدڵنیاییەوە ئەوەی شای ئێران باسی دەکات لە هاوکاریکردنی شـۆڕشـی کورد ئامانجی سـیاسـی ئێرانی لە پشـت دابوو، نەک هەوڵدان بۆ سـەرخسـتنی پرۆژەیەکی سـیاسـی بۆ دروسـتکردنی قەوارەیەکی کوردی سـەربەخۆ، لە کاتێکدا هەر لە نێو ئێراندا، چەند ملیۆن کورد هەبوو، سادەترین مافە نەتەوەییەکانیان پێ ڕەوا نەدەبینی.

## باسی دووەم: میسر[١١٨١]

سـەرکەوتنی گەلی میسـر لە ڕووخاندنی ڕژێمی پادشـایەتی لە سـاڵی ١٩٥٢، پاشکۆی حکومەتی بریتانیا، مستەفا بارزانی دڵخۆشکرد، بەهۆی پاشخانی مێژوویی نارەحەتی بارزانی لەگەڵ بریتانییەکان. ئەم حکومەتەی هۆکاری ڕاسـتەوخۆ بوو بۆ سـەرکوتکردنی ڕاپەڕینی دووەمی بارزان لە عێراق و ڕووخانی کۆماری کوردسـتان لە ئێران. بارزانی ئەمەشـی لە دیدارێکی ڕۆژنامەوانی باسـکردووە و دەڵێت:"هەواڵی

---

١١٧٩ – عیسی پژمان، س.پ، ل٩١.

١١٨٠ – محمد حسنين هيكل، مدافع أية الله( قصة أيران والثورة)، ط٦، دار الشروق، القاهرة، ٢٠٠٢، ص١٤٢.

١١٨١ – هەردوو حکومەتی سوریا و میسر لە (٢٢ی شوباتی ١٩٥٨) قەوارەیەکی سیاسییان پێکهێنا بەناوی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو. کە جەمال عەبدولناسر سەرۆک و قاهیرە پایتەختەکەی بوو. لە (٢٨ی ئەیلولی ١٩٦١) سوریا لەم قەوارە سیاسییە هاتە دەرەوە، بەڵام حکومەتی میسری پارێزگاری لە ناوەکە کرد تا ساڵی ١٩٧١، بە وڵاتی میسر گوتراوە (کۆماری عەرەبی یەکگرتوو). بەڵام ئێمە لەم باسەدا ناوە ڕەسەنەکەمان بەکارهێناوە کە (میسر)ە. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم بابەتە، بڕوانە: سليم ناصر بركات ، الوحدة السورية المصرية: مراجعة نقدية لتجديد الفكر القومي، مطبعة الإتحاد بدمشق، الجمهورية العربية السورية،١٩٩٧.

شۆڕشی ١٩٥٢ی میسرم بەدڵخۆشییەوە وەرگرت و سەرکەوتنی شۆڕشی میسر بەسەرکەوتنی هەموو گەلانی ناوچەکە دەبینم"[١١٨٢].

ئەم هەڵوێستەی مستەفا بارزانی لەبەرامبەر گەلی میسر، جگە لە هەست و دەربڕینی سیاسی، لەکاتی هێرشی سێ قۆڵی بریتانیا و فەرەنسا و ئیسرائیل بۆ سەر میسر لەساڵی ١٩٥٦، گەیشتە ڕادەی نیشاندانی ئامادەیی بۆ بەشداریکردن لە بەرگریکردن لەم وڵاتە[١١٨٣]. بارزانی ئەمەی بە بروسکەیەک لە مۆسکۆ بۆ جەمال عەبدولناسری سەرۆکی میسر ڕەوانەکرد و ڕایگەیاند، خۆی و جەنگاوەرەکانی لەگەڵیدان، ئامادەن بەرگری لە میسر بکەن. لە وەڵامی ئەم بروسکەیەدا سەرۆکی میسر وێڕای دەربڕینی سوپاسگوزاری گەلەکەی، هەڵوێستەکەی بارزانی بەگرنگ و مێژوویی وەسف کرد[١١٨٤].

ئەم هەڵوێستەی مستەفا بارزانی دەستپێکێکی گرنگ بوو بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی یەکێک لە وڵاتە عەرەبییە کاریگەرەکان لەناوچەکە، لە کاتێکدا ئەم ڕژێمەی لە میسر لەسەر دەسەڵات بوو، یەکێک بوو لە نەیار و ئاراستە دژەکانی ئیمپریالیزم لەناوچەکە، بەڵکو میسر لەم کاتەدا پاڵپشتی بەرەی ئیشتراکی بوو. بەو هۆیەوە لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی(١٤ی تەمموزی ١٩٥٨)، بارزانی لە ڕێگای گەڕانەوەی لە سۆڤیەتەوە بۆ عێراق، لە ڕۆژی (٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٨) لە قاهیرە سەردانی سەرۆکی میسر جەمال عەبدولناسری کرد. ئەوەی دوایی لەم دیدارەدا دووپاتی سوپاسگوزاری حکومەت و گەلی میسری بۆ ئەو هەڵوێستەی بارزانی کردەوە، کە لەکاتی هێرشی سێ قۆڵی لەدژی وڵاتەکەی نیشانیدا[١١٨٥]. هاوکات بە بارزانی ڕاگەیاند کە:"ڕاستیی و ڕەوایی میللەتی کورد وەکو ڕووباری(نیل) بوونی هەیە"[١١٨٦].

بەم شێوەیە پەیوەندییەکانی مەلا مستەفای بارزانی و جەمال عەبدولناسر گەیشتە دۆخێکی پێشکەوتوو، تەنانەت دەتوانین بڵێین سەرۆکی میسر بەدرێژایی ماوەی شۆڕشی کورد هەمیشە وەک پشتیوانی دۆزی کورد لە عێراق دەرکەوتووە

---

١١٨٢ – الاهرام (جريدة)، ع(٢٦٢٢٩)، ٥ تشرين الاول ١٩٥٨، ص٥.

١١٨٣ – ڕەفیق ڕەحمان مام خول، س. پ، ل٦٠.

١١٨٤ – عبدالجليل صالح موسى، جمال عبدالناصر والقضية الكوردية في العراق ١٩٥٢– ١٩٧٠، دهوك، ٢٠١٣، ص٧٠.

١١٨٥ – عبدالجليل صالح موسى، ص١٠٩–١١٠.

١١٨٦ – ڕەفیق ڕەحمان مام خول، س. پ، ل٧٣.

و داوکارییەکانی بەئاراستەی چارەسەرکردنی ئەم بابەتە بووە بەشێوەیەکی ئاشتیانە. ئەمەشــی لە دیداریکی لە (٤ی تەممووزی١٩٦٣) لەگەڵ(ئێریک رولو)ی پەیامنێری ڕۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسـی خسـتەڕوو کاتێک لە وەڵامی ڕۆژنامەنووسـەکەدا سـەبارەت بە تێڕوانینیان لەمەر پرسـی کورد لە عێراقدا گوتی:" ئەو هەمیشـە دژی جیابوونەوەیە، بەڵام کوردەکان داوای جیابوونەوەیان نەکردووە. ئەو لەگەڵ ئەوەدایە پرسی کورد لە عێراق بەشێوەیەکی ئاشتیانە چارەسەر بکرێت"[١١٨٧].

لەسـەرەتاکانی هەڵگیرسـانی شـۆڕشـی کورد، پەیوەندییەکانی سـەرۆک وەزیرانی عێراق عەبدولکەریم قاسـم و جەمال عەبدولناسـر لەو پەڕی ناتەبایی و نارێکی دابوو، بەهۆی ململانێیەکانیان لەسـەر ڕێبەرایەتیکردنی گەلی عەرەبی، بەڵام دوای ڕووخانی ڕژێمی قاسـم لە (٨ی شـوباتی ١٩٦٣) کۆمەڵێکی خاوەن بیر و ئایدیای نەتەوەیی و لایەنگیر و پابەند بە جەمال عەبدولناسر هاتنە سەر دەسەڵات لە عێراق، کە لە بەعسی و ناسـرییەکان پێکهاتبوون[١١٨٨]. ئەو کاتە دەسـەڵاتدارانی نوێی عێراق لە دوای ئەوەی لەگەڵ سـەرکردایەتی کورد لەسـەر ڕاگەیاندنی ئاگربەسـت ڕێککەوتن، پێشـنیازیان بۆ نوێنەری بارزانی جەلال تاڵەبانی کرد، کە بەمەبەستی گفتوگۆ و دانوستان لە شوباتی ١٩٦٣ لە بەغدا بوو، لەگەڵ شـاندێکی حکومەتی عێراقی سـەردانی میسـر بکات بۆ دیداری جەمال عەبدولناسـر، لەپێناو خسـتنەڕووی داخوازی سـەرکردایەتی کورد لەبەردەم سـەرۆکی میسـر، سـەبارەت بەداهاتووی کورد لە ئەگەری یەککگرتنی عێراق و سـوریا و میسـر لە قەوارەیەکی کۆنفیدراڵی عەرەبیدا، کە پرۆژەی ناسـیۆنالیستە عەرەبییەکانی ئەم وڵاتانە بوو[١١٨٩].

جەلال تاڵەبانی بە نوێنەرایەتی مەلا مسـتەفای بارزانی لەگەڵ شـاندەکەی حکومەتی عێراقی لە(٢٠ی شوباتی ١٩٦٣) سەردانی میسری کرد و لە ڕۆژی (٢٢ی شـوبات) لەگەڵ (ناسـر) لەسـەر پێگەی کورد لە هاوکێشـەی سـیاسـی عێراق دوای یەککگرتنی لەگەڵ سـوریا و میسـر لە چوارچێوەی پرۆژەی کۆنفیدراڵی عەرەبی،

1187 – ÉRIC ROULEAU, Le président Masser annonce la prochaine liquidation des camps d'internement et la libération de tous les prisonniers politiques Le Raïs appelle de ses vœux une étroite collaboration avec la France, Le Monde, 05 juillet 1963.

١١٨٨ – أمين هويدي، م.س،،ص٤٣-٩٣.

١١٨٩ – مام جەلال دیداری تەمەن ، ل٢٢٧.

کۆبوویەوە[١١٩٠]. دوای ئەم دیدارە سەرۆکی میسر سەبارەت بە دۆخی کورد لە ئەگەری پێکهێنانی ئەم قەوارە عەرەبییەدا گوتی:"جێبەجێکردنی ئۆتۆنۆمی کێشەی کورد چارەسەر دەکات"[١١٩١]. بەڵام شیکردنەوەی سەرۆکی میسر جیاواز بوو لەگەڵ شیکردنەوەی سەرکردایەتی کورد بۆ ئۆتۆنۆمی، چونکە سەرۆکی میسر لە دیدارێکی لەگەڵ پەیامنێری ڕۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسی باسی ئەوەی کرد، کە ئەو بە نوێنەری بارزانی ڕاگەیاندووە:" هیچ لاری نییە لەسەر ئەوەی کوردەکان هاوشێوەی پارێزگا میسرییەکان سەربەخۆییەکی کارگێرییان هەبێ"[١١٩٢]. لەکاتێکدا سەرکردایەتی کورد داوای شێوەیەک لە ئۆتۆنۆمی بۆ ناوچە کوردییەکان دەکرد، کە خاوەنی دەسەڵاتەکانی یاسادانان و ڕاپەڕاندنی سەربەخۆی تایبەت بەخۆی بێت[١١٩٣].

لە ڕاستیدا هەڵوێستی سەرۆکی میسر بەرامبەر بە پرسی کورد لە وتار و هەڵوێستی سیاسی زیاتر تێنەپەڕی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بارزانی هەمیشە لە هەوڵدابوو پارێزگاری لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ میسر بکات و تەنانەت زۆرکات هەوڵیداوە لە ڕێگای نامە و ناردنی نوێنەر بۆ قاهیرە، کاربکات بۆ ئەوەی ڕادەی پشتیوانی حکومەتی میسری بۆ دۆزی کورد بەرزبکاتەوە بۆ ئاستی ئەنجامدانی کردەی سیاسی کاریگەر. لەم سۆنگەوە باڵیۆزی میسر لەبەغدا (أمين هويدي) لە یاداشتەکانی خۆیدا باسی ئەوە دەکات، بارزانی چەندین نامەی کەسی بۆ سەرۆکی میسر ڕەوانە کردووە و داوای لێکردووە دەستوەردان بکات بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد لە عێراقدا[١١٩٤].

دیارە پەیوەندی دۆستانەی ڕێبەری کورد مەلا مستەفا بارزانی و سەرۆکی میسر جەمال عەبدولناسر، بۆ ماوەیەک کاریگەرییان لەسەر هەڵویستی ئەرێنی ئەوەی دوایی لەبەرامبەر دۆزی کورد هەبوو، تەنانەت لە دوای دەستپێکردنی

---

١١٩٠ – هـ.س، ل٢٣١.

١١٩١ – أمين هويدي، م.س،ص٢٠.

1192 – ÉRIC ROULEAU, Le président Masser annonce la prochaine liquidation des camps d'internement et la libération de tous les prisonniers politiques Le Raïs appelle de ses vœux une étroite collaboration avec la France, Le Monde, 05 juillet 1963.

١١٩٣ – محمود الدرة، م.س، ص٣١٠،٣١٣.

١١٩٤ – أمين هويدي، ص٣٣.

پرۆسەی سەربازی (دیجلە) لە(حوزەیرانی١٩٦٣) لە بەرامبەر بە شۆڕشی کورد[١١٩٥]، سەرۆکی میسر دانوستانەکانی بۆ دامەزراندنی یەکێتیەکی فیدراڵی لە نێوان میسر و سوریا و عێراق هەڵپەسارد و پەیوەندیەکانی نێوان قاهیرە و بەغدا چووە دۆخێکی ئاڵۆز و لێکتری دابڕاو، بەڵکو ئێزگەی قاهیرە دەستیکرد بە پشتگیریکردنی گەلی کورد و داواکانی بۆ ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی عێراقدا[١١٩٦]. لەو کاتەدا ڕاگەیاندنی میسری لە ئێزگەی ڕادیۆیی و ڕۆژنامە بەناوبانگ و پڕ فرۆشەکانیان، هەڵمەتێکی بەرفراوانیان لەدژی ڕێکارە سەربازیەکانی حکومەتی عێراق دژی گەلی کورد دەستپێکرد. بەو هۆیەوە حزبی بەعس لە(٢١ی حوزەیرانی١٩٦٣) لە ڕاگەیەنراوێکیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە ڕۆژنامەگەری میسری دوور لە بنەما نەتەوەییەکان پشتگیری شۆڕشی کورد دەکات و تەنانەت ڕۆژنامەی ئەهرامی میسری چەکدارە کوردەکان بە شۆڕشگێر و جووڵانەوەکەیان بە شۆڕش دەناسێنێ[١١٩٧].

دوای ئاسایی بوونەوەی پەیوەندییەکانی نێوان میسر و عێراق، بەهۆی دوورخستنەوەی بەعسییەکان لە دەسەڵات لە( ١٨ی تشرینی دووەمی١٩٦٣) ، سەرۆکی میسر هێشتا بەردەوام بوو لەسەر هەڵوێستی پشتگیریکردنی دۆزی کورد و لەو بارەیەوە لەساڵی ١٩٦٤ فشاری زۆری لەسەر حکومەتی عێراق دروستکرد، بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد، بەشێوەیەکی ئاشتیخوزانە[١١٩٨].

لەبەغدا شیکردنەوەی جیاواز بۆ ئەو خواستەی سەرۆکی میسر کرا. هەندێک پێیان وابوو ناسر وای دەبینێ ئۆتۆنۆمی کوردستان ئاسانکاری دەکات بۆ یەکگرتنی ناوچەکانی دیکەی عێراق لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی، بەڵام لەهەمان کات کێشە بۆ تورکیا و ئێران دروست دەکات. بەڵام لە ڕاپۆرتێکی بریتانیادا ئەوە هاتووە، ناسر مەترسی لەوە هەیە درێژەدان بە شۆڕشی کورد، ببێتە هۆی ڕووخانی عارف و گۆڕینی بە حکومەتێکی نوێ، هاوسۆزی لەگەڵ میسر لاوازتربێ. تەنانەت، مەترسی ئەوەی هەبوو ئەم دەسەڵاتە دژایەتی بەرژەوەندییەکانی ناسر بکات لە داهاتوو، بۆیە هەمیشە

---

١١٩٥ – لە بارەی ئەو کردە سەربازییە ، بروانە: رزگار محمد، عملیة دجلة: حملة الحكومة العراقية على كردستان عام ١٩٦٣، أربيل، ٢٠٠١.

١١٩٦ – شموئيل سيجف، م.س،ص٢٦١.

١١٩٧ – أمين هويدي، م.س،ص١١٤.

1198–CIA-RDP79-00927A004800110003-7, THE KURDISH WAR—ROUND FOUR, WASHINGTON, April 23, 1965, p.6.

هانی حکومەتی عێراق ئەدات، بۆ دۆزینەوەی چارەسـەرێک بۆ دۆزی کورد[1199].
ئەمەش وەک ئەم بەڵگەنامەیە ئاماژەی پێکردووە، بەمانای هاوسـۆزی و پشـتیوانی میسـر نایەت بۆ دۆزی کورد، بەڵکو دەتوانین بڵێن ناسـر لە دیدی خۆپەرسـتانەوە سـەیری دۆخەکەی کردووە، بەڵکو بتوانێ بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆی چارەسەری بکات، نەک بەرژەوەندی گەلی کورد. بۆیە هەر کاتێک ئەم حکومەتەی لە بەغدا لەگەڵ بەرژەوەندی و ئامانجەکانی ناسر یەکانگیر نەبووە، لە ڕێگای بەکارهێنانی کارتی کورد فشـاری لەسـەر دروسـتکردووە، وەک ئەم بابەتەی بەڵگەنامەیەکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە( ١٧ی کانونی یەکەمی١٩٦٣) ئاماژەی پێدەکات سـەبارەت بە داخسـتنی نووسـینگەی نوێنەرایەتی پارتی دیموکراتی کوردسـتان لە قاهیرە لەسـەر داواکاری حکومەتی عێراق. سـەبارەت بەم بابەتە شـەوکەت عەقراوی نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردسـتان بە باڵیۆزخانەی ئەمریکای لە قاهیرە ڕاگەیاندووە، لەو ماوەیەدا بەنیازی گەڕانەوەیە بۆ باشووری کوردستان، بەمەبەستی گەیاندنی نامەیەکی جەمال عەبدولناسری سەرۆکی میسر بۆ ڕێبەری کورد مستەفا بارزانی. هەرچەندە عەقراوی نیوەڕۆکی نامەکەی ئاشـکرا نەکردووە، بەڵام وەک ئاماژەیەک بۆ هەڵوێستی ناسر بەرامبەر بەکورد، دەڵێت:" ناسر هەموو داواکارییەکانی حکومەتی عێراقی بۆ داخسـتنی نووسـینگەی پارتی دیموکراتی کورسـتانی لە قاهیرە ڕەتکردۆتەوە"[1200].

لەدوای دوورخرانەوەی حزبی بەعس لە عێراق لەسـەر دەسـەڵات، حکومەتی میسـری لە حکومەتی عێراق نزیک بوویەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە ئەنجامی ناڕەزایی و فشـاری نێوەندە جیهانییەکان لە دەسـتێوەردانی سـوریا لە کاروباری ناوەخۆی عێراق، بەهۆی بەشـداریکردنی لە پرۆسـەی سـەربازی دیجلە لەبەرامبەر بەکورد، هێزەکانی سـوریا لە (٢٣ی کانونی یەکەمی ١٩٦٣) لە عێراق کشـانەوە، ئەو کاتە لەسـەر عێراق پێویسـت بوو، ئەو بۆشـاییە لە ئەنجامی کشـانەوەی هێزەکانی سوریا لەعێراق دروست بوو، بەهێزێکی دیکەی عەرەبی پڕبکاتەوە. باشترین بژاردەی

---

١١٩٩ - بروانە بەڵگەنامەی ژمارە(٢٠)، لە: شیرکو حبیب، الكورد في وثائق الارشيف الوطني البريطاني(١٩٥٨-١٩٦٩)،ص١٠٢.

1200 -Department of State, Iraq political affairs and relations: Kurdish minority 1963, December 28, 1963, p.15.

بەردەمیشـــیان لەو کاتە هێزی میســـری بوو. بڕیارەکە وابوو میســـر بەتالیۆنێک یان دووان ڕەوانەی عێراق بکات، بەمەرجی ئەوەی بەشـــداری شـــەڕی کورد نەکات، وە لەناوچەیەک دابمەزرێن دوور لە ناوچەکانی شـــەڕ لە (حەبانییە یان موسـڵ)[١٢٠١]. لەم سۆنگەوە شـاندێکی حکومەتی عێراق بەسـەرۆکایەتی سـەرۆک وەزیران تاهیر یەحیا لە (٢ی نیسانی ١٩٦٤) سەردانی قاهیرەی پایتەختی میسری کرد و داوای (٦٠٠–٧٠٠) سەربازی لە حکومەتی میسر کرد بۆ ئەوەی شوێنی هێزە سورییەکان بگرنەوە[١٢٠٢].

حکومەتی میسـر ڕەزامەندی نیشـاندا بەرامبەر ئەم داواکارییەی حکومەتی عێراق، لەهاوینی ساڵی ١٩٦٤ ژمارەیەک لە هێزە چەکدارەکانی خۆی ڕەوانەی بەغدا کرد و لە ســـەربازگەی(تاجی) لە باکووری ئەم شـــارە جێگیر کران. ئەم هەڵوێســـتەی میســـر وایکرد، کورد و عەرەب وابیبینن، ناســـر پشـــتگیری لە هەوڵەکانی حکومەتی عێراق دەکات بۆ ســـەرکوتکردنی شـــۆڕشـــی کورد. ئەو کاتە بارزانی لە نامەیەکی لە(٢٥ی ئابی١٩٦٤) بە سوپا سالاری عێراق عەبدولڕەحمانی عارف ڕایگەیاند، هەرگیز باوەر بەوە ناکات، حکومەتی میســـری هێز لەدژی شـــۆڕشـــی کورد بجولێنێ[١٢٠٣]. پێدەچێ لەبەرئەوەی هێزەکە لە ســـەربازگەی تاجی لەشـــاری بەغدا جێگیرکرا، وەک پێشـــتر ئاماژەی پێکراوە، مەبەســـتی هاوکاریکردنی ســـوپای عێراقی نەبووە لەشـــەڕەکەیاندا بەرامبەر بەکورد، بەڵکو وەک سەرۆکی میسر لە نامەیەکیدا لە ( ٥ ی ئەیلولی ١٩٦٤ ) لە ڕێگای باڵیۆزەکەیان لە بەغدا بۆ مەلا مســـــتەفا بارزانی ڕەوانەی کردووە ئاماژەی پێدەکات، کە هاتنی بەشـــێکی ســـــوپاکەی بۆ عێراق ئامانج تێیدا بەشـــداریکردنە لە مانۆڕێکی ســـــەربازی بەهاوبەشـــــی لەگەڵ ســـــوپای عێراق و هیچ ئامانجێکی نییە بەشداری پرۆسەیەکی سەربازی لە دژی کورد بکات[١٢٠٤].

هەڵوێستی ئەرێنی ڕووکەشانەی جەمال عەبدولناسر بەرامبەر بارزانی و دۆزی کورد بەو شێوەی باسکرا، بەردەوام نەبوو. بەڵکو حکومەتی میسر لە (٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٥) ڕاگەیەنراوێکیان لەڕێگای ئاژانسی هەواڵی (فرانس پرێس) بڵاوکردەوە

---

١٢٠١ – آمین هویدی، م.س، ص٢٣٤.

1202 –CIA–RDP79–00927A004800110003–7, THE KURDISH WAR—ROUND FOUR, WASHINGTON, April 23, 1965, p.7.

١٢٠٣ – بروانە: بەڵگەنامەی ژمارە(٤١) لە: شیرکو حبیب، الکورد في وثائق الارشیف الوطني البریطاني(١٩٥٨–١٩٦٩)، ص١٥٨.

١٢٠٤ – بروانە: بەڵگەنامەی ژمارە(٤٢) لە: م.ن، ص١٦٠.

و ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد، حکومەتەکەیان بەتەواوی پشتیوانی لەو هەوڵانە دەکات، کە حکومەتی عێراق بۆ پاراستنی یەکپارچەیی خاکی وڵات و سەرکوتکردنی هەموو ئەم هەوڵانەی هەن، بەئامانجی تێکدانی ســـەربەخۆیی و ئازادی و ســـەلامەتی عێراق. تەنانەت (میسـر) باوەڕی وایە ئەم هەوڵانە نەک تەنها دژی سـەروەری عێراقە، بەڵکو دژی ئاسـایشـی نەتەوەی عەرەبە بەگشـتی. ئەمەش یەکەمجار بوو حکومەتی میسـر پشـــتیوانی لە حکومەتی عێراق بکـات لەبەرامبەر بزاڤی ڕزگـاریخوازی نەتەوەی کوردی[١٢٠٥].

لەلایەکی دیکە شـەوکەت عەقراوی، نوێنەری شـۆڕشـی کورد لە قاهیرە، لە(٢٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٥) بە ئاژانسی هەواڵی (فرانس پرێس) ڕایگەیاند، دەسەڵاتدارانی میسر داوایان لێکردووە لە ماوەی چل و هەشت کاتژمێر وڵاتەکەیان بەجێبهێڵێت. لەو کاتەی عەقراوی ماوەی سێ ساڵ بوو لە قاهیرە چالاکی دیبلۆماسی بۆ بەدەستهێنانی پشـــتیوانی نێودەوڵەتی بۆ شـــۆڕشـــی کورد ئەنجام ئەدا. بەڵام لەســـەر خواســـتی دەســـەڵاتدارانی بەغدا، حکومەتی میســـر ناچـاری کرد قاهیرەی بەرەو ئەورووپا بەجێبهێڵێت. بەر لە ڕۆیشـتنی عەقراوی بە ئاژانسـەکانی هەواڵی جیهانی ڕاگەیاند، ئەو پێی وایە ئەم هەڵوێستەی حکومەتی میسر بەرامبەر بە شۆڕشی کورد "بە دوودڵیەوە ئەنجامدراوە، لەژێر فشاری توندی دەسەڵاتدارانی عێراق، کە ناڕازین لە چالاکییەکانی ئەو لە میسـر، بە ئامانجی بەدەسـتهێنانی پشـتیوانی بۆ دۆزی کورد". بەڵام باوەڕی بەوە نییە ئەم هەڵوێســـتە کاریگەری هەبێ لەســـەر تێڕوانینی جێگیری حکومەتی میســـری بەرامبەر خواســـتەکانی گەلی کورد. تەنانەت لەم بارەیەوە گوتی:" پێموایە کۆمـاری یەکگرتووی عەرەبی بەردەوام دەبێ لە پشـــتیوانیکردنی گەلی کورد بۆ گەیشتن بە ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا بە ڕێگەی ئاشتیانە"[١٢٠٦].

لەدوای بڵاوبوونەوەی ئەم هەواڵانە و گەیشـتنی ژمارەیەک لە هێزەکانی میسـر بۆ عێراق، ڕۆژنامە و ئاژانسەکانی هەواڵی هەرێمی و ڕۆژئاوایی دژی سیاسەتەکانی ناسـر بوون، کەوتنە هەوڵی ناشـرینکردنی میسـر و سـیاسـەتەکانی لە ناوچەکە. لەم

---

1205 –LA R.A.U. PARAIT SE SOLIDARISER AVEC LE GOUVERNEMENT IRAKIEN DANS SA LUTTE CONTRE LE MOUVEMENT NATIONALISTE KURDE, Le Monde, 23 octobre 1965.

**1206 - LE REPRÉSENTANT DES KURDES IRAKIENS AU CAIRE EST PRIÉ DE QUITTER L'ÉGYPTE, Le Monde, 28 octobre 1965.**

ســـۆنگەوە دوو ڕۆژنامەنووســـی ئەلمانی بەناوەکانی ( کارل برایر و بیتر لوغفیلد) لەشوباتی ١٩٦٦ سەردانی باشووری کوردستانیان کرد، بابەتێکیان لەژێر ناوونیشانی (میســـرییەکان کوردەکان کۆمەڵکوژ دەکەن)، لە گۆڤاریکی ئەلمانی بڵاوکردەوە و دەقەکەی وەک خۆی لە گۆڤاری (تەهران مســـوەری) ئێرانی وەرگێرداوەتە ســـەر زمانی فارســـی، لە بابەتەکەدا ڕۆژنامەنووســـە ئەلمانیەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، فڕۆکە میسرییەکان لەسـەرەتای (شـوباتی١٩٦٦) بەشـێوەیەکی ڕەمەکی بۆردومانی ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەســـەڵاتی هێزی پێشـمەرگەیان کردووە، لەو بۆردومانە ئاسمانیەدا، زیانی زۆر بەر ماڵ و ئافرەت و منداڵانی بێ تاوان کەوتوە. ئەمە لەکاتێکدا هەر لەم ڕیپۆرتاژەدا ، ڕۆژنامەنووســەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن ســەرۆکی میسـر جەمـال عەبـدولناســـر لەلایەک لە هەفتەی ڕابردوو لەپـاریس چـاوی بە کـامەران بەدرخان[١٢٠٧] مامۆســتای دیراســاتی ڕۆژهەڵاتی لەزانکۆی پاریس کەوت، بەڵێنی پێدا چەک و زەخیرەی جەنگی و دەرمـان، بۆ هێزە کوردیەکـانی عێراق ڕەوانە بکـات. لەلایەکی دیکە فەرمان بە فڕۆکەکانی میسـری دەکات لەتەک سـوپای عێراقدا، شـەڕی قڕکردنی کورد بکەن[١٢٠٨].

شیاوی باسە ئەم زانیارییانە تا ڕادەیەک زیادە ڕۆیی تێدا کراوە، لەبەرئەوەی ئەو کاتە شـــای ئێران لەبەرەی نەیارانی ناســـر بوو، ڕەنگە گۆرانکاری لەدەقی ڕەســـەنی ڕیپۆرتاژەکە کرابێ، توێژەر هەوڵیدا ئەم ڕیپۆرتاژە بەدەســـتبێنێ. بەڵام هەوڵەکان بێ ئەنجام بوو. ئەم تێڕوانینەش ئەو کاتە دروســـت بوو، کە بینیمـان تەنها ڕۆژنـامە ئێرانییەکان باس لە بەشـداریکردنی سـوپای میسـری دەکەن لەسـەرکوتکردنی گەلی کورد لە عێراقدا و هیچ ســـەرچاوەیەکی دیکەی نێوخۆیی و دەرەکی پشـــتگیری ئەو زانیارییانە ناکات. هەروەها لە کاتێکدا ڕۆژنامە ئێرانییەکان هەڵوێســـتی ســـوپای میسرییان زۆر توند بەرامبەر بە گەل و شۆڕشی کورد نیشانداوە وەک لە بابەتێکی گۆڤاری (ئاسـیای جوان)دا هاتووە، سـەرۆکی میسـر (٨) هەزار سـەربازی ڕەوانەی

---

١٢٠٧ – کامەران عالی بەدرخان: لە (٢١ی ئابی ١٨٩٥) لەشاری ئەستەمبوڵ لە تورکیا لەدایک بووە. لە (٤ی کانوونی دووەمی ١٩٧٩) لە نەخۆشخانەی (سان جوزیف) لە پاریس لەتەمەنی (٨٤) ساڵیدا مردووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: الامیر کامران عالي بدرخان، صدی خەبات(جریدة)، ع(٥)، أواخر شباط ١٩٧٩، ص٢.

١٢٠٨ – بڕوانە: ملاقات با گرگ کوهستان، تهران مصور(مجله)ک ش(١١٧١)،(١١ فوریه ١٩٦٦–February 11,1966)،ص١.

عێراق کردووه بۆ هاوکاریکردنی ســوپای عێراق بۆ ســەرکوتکردنی کوردەکان[١٢٠٩].
هەر لەو کاتەدا ڕۆژنامەی (اخبار الیوم)ی میسـری لە ڕۆژی (٣٠ی تشـرینی یەکەمی ١٩٦٦) لەســـەر زاری بارزانی باســی لەوە کردووە ، بارزانی بانگهێشــتی جەمال عەبدولناســر دەکات بۆئەوەی بەهانای کوردەکانەوە بێت و هاوکاریان بکات[١٢١٠].
ئەمەش هەوڵێکی سیاسی مستەفا بارزانی بووە بۆ بەدەستهێنانەوەی پاڵپشتی میسر لە دۆزی کورد، دوای ئاشکرابوونی مەرامە سیاسییەکانی ناسر لە ناوچەکە.

دواجار هەرچەندە ناســر دەمرێ ، بەڵام مەلا مســتەفا بارزانی هەوڵئەدات پەیوەنـدییەکـانی لەگەڵ ســەرۆک و حکومەتی میســر بەردەوام دەبێ، بۆ ئەم مەبەستەش دەرفەت لە ڕووداوی مردنی ناسر وەردەگرێ و لە (٢٩ی ئەیلولی ١٩٧٠) نامەیەک ئاراستەی سەرۆکی نوێی میسر ئەنوەر سادات(١٩٧٠-١٩٨١) دەکات و تێیدا دەڵێت:" ئەو هەواڵە کارێکی زۆر ناخۆشــی کردە دڵی من و هەموو نەتەوەی کورد و کۆمەڵانی پارتی دیموکراتی کوردســتان. نەتەوەی کورد و ئێمەش و عێراق تێکرا، سـەرۆکی کۆچکردوومان وەک خەباتکەرێکی سـەر بەدەرەوەبووی نەتەوەی عەرەب و ڕاسـتی و مرۆڤایەتی ناسـیوە، وەک تێکۆشـەرێکی ڕێگای پشـتگرتنی جووڵانەوەی ئازادی بەخشــی گەلان، وە لەپێناوی جێگیرکردنی ئاســایشــدا بۆ جیهان. نەتەوەی عەرەب و هەموو جیهـان، بەم کۆســتە گەورەیە یەکێکیـان لە کیس چوو لە دەرکەوتووترین پێشەوا نەمرەکان"[١٢١١]. بەم شێوەیە بۆمان ڕووندەبێتەوە، ڕاگەیاندنی ئێرانی بە نەفەسێکی دوژمنکارانە، هەوڵی ناشرینکردنی ناسری داوە و هیچ هەوڵێکی میســری لەئارادا نەبووە بۆ دژایەتیکردنی شـۆڕشــی کورد. بەشـێوەیەک هەموو ئەم هەواڵانەی ســـەبارەت بەو بابەتە لەلایەن ڕۆژنامەکانی ئێران بڵاویان کردۆتەوە، هەواڵی ڕاست نین.

---

١٢٠٩ - پیروزی پیش مرگ ها، اسیای جوان(مجله)،ش(٨)، ( ٨ ژوئن ١٩٦٦- June 8,1966)، ص١٨-١٩.

١٢١٠ - شموئیل سیجف، م.س، ص٢٧٢.

١٢١١ - برایەتی (گۆڤار)، ژ(٧)،ساڵی(١) خولی دووەم، ناوەراستی تشرینی یەکەمی ١٩٧٠، ل٣،٤.

## تەوەری دووەم: پەیوەندییەکانی بارزانی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا

### باسی یەکەم: سۆڤییەت

لە ڕاپەڕینی دووەمی بارزان کاتێک مستەفا بارزانی زانیاری پێگەیشت حکومەتی عێراق بە هاوکاری بریتانیا ئامادەباشـــی دەکات بۆ ئەوەی هێرش بکاتە ســـەر شـۆڕشـگێرانی کورد، بڕیاریدا پەیوەندی بە کاربەدەسـتانی یەکێتی سـۆڤیەت بکات لە ئێران بۆ تێگەیشـــتن لە هەڵوێســـتیان بەرامبەر بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد. ئەو کاتە (مامەند مەســـیح)ی لە (٧ی ئایاری ١٩٤٥) ڕەوانەی ڕۆژهەڵاتی کوردســـتان کرد، بۆ گەیاندنی بانگهێشـــتنامەیەک بۆ نوێنەری یەکێتی ســـۆڤیەت بۆ ســـەردانیکردنی بارزان[١٢١٢].

کاربەدەســـتانی ســـۆڤیەت پێشـــوازییان لەم بانگهێشـــتنامەی بارزانی کرد و دوو ئەفسەریان لەگەڵ مامەند مەسیح ڕەوانەی ناوچەی بارزان کرد. ئەفسەرانی سۆڤیەت لە کۆبوونەوەکەیان لەگەڵ بارزانی بەڵێنی پشـــتگیریکردنی ڕاپەڕینی کوردیاندا و داوایانکرد بۆ ئەم مەبەســـتە هەوڵەکانیان لەگەڵ کوردانی ڕۆژهەڵاتی کوردســـتان بەتایبەتی لەگەڵ کۆمەڵەی(ژ.ک) یەکبخەن. هاوکات ڕێککەوتن لەسەر دەستنیشانکردنی ڕێگای (خنێرە[١٢١٣]- دەشـــتی هیرت- مێرگەســـۆر) بۆ گەیاندنی هاوکاریەکانیان بۆ شۆڕشگێرانی کورد. ئەوە سەرباری ئەوەی بە بارزانییان ڕاگەیاند، هەرکات بڕیاریدا لەبەرامبەر ســـوپای عێراق و بریتانیا لەشـــەڕ پاشـــەکشـــە بکات، دەتوانێ بپەڕێتەوە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ئەوان پێشوازی لێ دەکەن[١٢١٤].

ئامانجی ســـۆڤیەت لەم نزیکبوونەوە لەگەڵ بارزانی، دوورخســـتنەوەی ڕاپەڕینی بارزان بوو لەبەرەی ڕۆژئاوا و خۆبەخاوەنکردنی دۆزی کورد بوو لەعێراق. لەســـەر ئەم بنەمایە هەوڵیاندا لەپەیوەندییەکانیان لەگەڵ مەلا مســـتەفا بارزانی بەردەوام بن. بۆیە هەر دوای مـــاوەیەکی کورت، بـــارزانی دیـــدارێکی دیکەی لە (خنێرە) لەگەڵ

---

١٢١٢ – مسعود بارزانی، بارزانی و ...، بگ:١(١٩٣١-١٩٥٨)،٢٠٢٠، ل١٤٥.

١٢١٣ – ناوچەیەکە لەدەڤەری برادۆست سەر بە ناحیەی سیدەکانە و هاوسنوورە لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

١٢١٤ – میهفان محمد حسين البامرني، سياسة الاتحاد السوفيتي تجاه الحركة القومية الكوردية التحررية في كوردستان الجنوبية(١٩٤٥-١٩٦٨) دراسة تاريخية تحليلية، أربيل، ٢٠٠٨، ص٨٢

ژەنەراڵێکی سۆڤیەتی بەناوی (سیامەندۆڤ)[١٢١٥] ئەنجامدا. دیارە پاڵپشتی سۆڤیەت بۆ کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، هاندەربوو بۆ ئەوەی بارزانی لەم دیدارەدا داوای پاڵپشتی سۆڤیەت بکات بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لە باشووری کوردستان. هاوشێوەی ئەم حکومەتەی لە ئازەربیجانی سۆڤیەتی دامەزرابوو[١٢١٦].

ئەم دیدارانەی بارزانی لەگەڵ فەرماندە باڵاکانی سوپای سۆڤیەت بەرهەمداربوو، چونکە بەپێی زانیارییەکانی باڵیۆزی ئەم وڵاتە لە تاران، نزیکەی (٢٠٠-٤٠٠) چەکداری کوردی ئێران، لە ڕۆژی (٢٠ی ئابی١٩٤٥) بەهاوکاری ئەوان لە سنووری عێراق-ئێران پەڕینەوە، بۆ هاوکاریکردنی شۆڕشگێڕانی کورد لە بارزان[١٢١٧].

مستەفا بارزانی باوەڕی تەواوی بەوە هەبوو، یەکێتی سۆڤیەت دەتوانێ بەشێوەیەکی کاریگەرتر لەوەی نیشانی ئەدا پاڵپشتی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد بکات، بەڵکو دەتوانێ گۆڕانکاری لە دۆخی گەلی کورد لەناوچەکە بکات و لەم بارەیەوە دەڵێت:" تەنها بە پاڵپشتی سۆڤیەت دەتوانرێ کوردستان یەکبگرێ، چونکە ئەوان بەرژەوەندییان لە دامەزراندنی حکومەتێکی سەربەخۆی کوردی لە ئێران و عێراق و تورکیا دایە"[١٢١٨].

لەسەر ئەم بیروباوەڕە، بارزانی لەدوای کۆتاییهاتنی جەنگی دووەمی جیهانی، هەوڵیدا سود لە ململانێی نێوان وڵاتانی زلهێز وەربگرێ. بەڵام بریتانییەکان بۆ لاوازکردنی، دەستیانکرد بە پیلانگێری بۆ دوورخستنەوەی سۆڤیەت لە پاڵپشتیکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی لە باشووری کوردستان، لەڕێگای چەند پروپاگەندەیەک کە لەدژی بارزانی بڵاویان کردەوە، تیایدا بانگەشەی ئەوەیان کرد، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە باشووری کوردستان فەرمانەکانی بریتانیا جێبەجێ دەکەن، ئەم پروپاگەندەیان لە ڕێگای بەکرێگیراوانی هەواڵگری بریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بڵاوکردەوە، ئەو کاتە کاربەدەستانی سۆڤیەت کەوتنە ژێر کاریگەریی ئەم پروپاگەندەیە و تا ڕادەیەک بە هەستیارییەوە مامەڵەیان لەگەڵ بارزانی

---

١٢١٥ – سیامەندوف یان (صمدوف) بەرپرس و ژنەڕاڵێک بووە لە سوپای سۆڤیەتی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و لەلایەن سۆڤیەتییەکان پێی گوتراوە پاڵەوانی (لینینگراد). م.ن، ص١٢٩.

١٢١٦ – مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ...(١٩٣١-١٩٥٨)، ٢٠٢٠، ل١٤٥.

١٢١٧ – مێهفان البامرني، م.س، ص٨٤.

١٢١٨ – أبو حسن تفرشيان،م.س، ص٢٥١.

دەکرد، لەبەرئەوەی پێیـان وابوو بـارزانی کرێگرتەی بریتـانیـایە[1219]، تەنـانەت (باقرۆف)[1220]ی سـەرۆک وەزیرانی ئازەربایجانی سـۆڤیەتی لەدیدارێکی لە (ئەیلولی ١٩٤٥) لەگەڵ شـاندێکی کوردانی ڕۆژهەڵاتی کوردسـتان، هۆشـداری پێدان باوەڕ بە بارزانی نەکەن و بەچاوی گومانەوە سەیری بکەن[1221].

دوای پەڕینەوەیی بارزانییەکان بۆ دیوی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، بارزانی هەستی بە گومانەکانی سـۆڤیەت کرد، وەک خۆی باسـیکردووە ئەو کاتەی لە ئورمیە بوون، هەوڵی زۆریداوە پەیوەندی بە سـەـۆڤیەتیەکانەوە بکات، بەڵام هەوڵەکانی بێ ئاکام بوون. لەبەرئەوەی سـەـۆڤیەتیەکان خۆیان لە پەیوەندی بەسـەـتن لەگەڵ بـارزانی دەپاراست. بۆیە بارزانی لەو کاتەدا نەیتوانی متمانەیان بەدەست بێنێ[1222]. بەڵام ئەمە دوا دەرفەت نەبوو، چونکە ئەو کاتەی لەگەڵ هێزەکەیدا لە(١١ی تشـرینی یەکەمی ١٩٤٥) چوونە مەهاباد، ڕاسـتەوخۆ لەگەڵ ژەنەراڵێکی سـوڤیەتی بەناوی (لوبوف) کە فەرمـاندەی هێزەکانی سـەـۆڤیەت بوو لە نـاوچەکە کۆبوویەوە. لەو کۆبوونەوەیەدا بارزانی هەوڵیدا هەڵسـەنگاندن بۆ هەڵوێستی سۆڤیەت بەرامبەر بارزانییەکان بکات و داوایکرد ڕێگا بە خاوخێزانەکانیان بدەن لە مەهاباد بمێننەوە، ئەم داخوازییەی بارزانی دوای تێپەڕبوونی (١٠) ڕۆژ، لەلایەن کاربەدەسـەـتانی سـەـۆڤیەت بە ئەرێنی وەڵامی درایەوە[1223].

دیارە دواجار ئەوان لە ڕاسـتی دۆخەکە تێگەیشـتن و زانیان ئەوەی دەگوترێ تەنهـا پروپـاگەنـدەی کرێگرتەکـانی بریتـانیـایە، بۆیە بڕیـاریـانـدا کۆمەکی خێزانە بارزانییەکان بکەن و لە تشـرینی یەکەمی ١٩٤٦ بڕیکی زۆری خۆراک و جلوبەرگ و تەنـانەت (١٠٠) هەزار تومەنیـان وەک یـارمەتی مرۆیی بە خـانەوادە بـارزانییەکـان بەخشی[1224].

---

١٢١٩ – عزيز الحاج، م.س، ص١٨.

١٢٢٠ – کەسێکی تورکمانی ئازەربایجانییە و لەدایک و باوکێکی شیعە مەزهەب لەدایک بووە. ئەندامی لیژنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی سۆڤیەتی بووە لەسەردەمی ستالین. بەتۆمەتی خیانەتکردن لەدەوڵەت لە نیسانی ١٩٥٦ لەسێدارەدراوە. وليم أيغلتن الابن، م.س، ص٤٥.

١٢٢١ – م.ن، ص٨٦.

١٢٢٢ – أبو حسن تفرشيان،م.س، ص٢٥١.

١٢٢٣ – مێهڤان محمد حسين البامرني، م.س، ص ص ٨٧-٨٨.

١٢٢٤ – م.ن، ص٩٢.

لەدوای کۆتاییهاتنی جەنگی دووەمی جیهانی و لە چوارچێوەی هەوڵەکانیان بۆ دەستکەوتنی جیاوکی نەوت لە باکووری ئێران، کاربەدەستانی سۆڤیەت پاڵپشتی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان کرد. لەسەر ئەم بنەمایە قازی محەمەد لە (٢٢ی کانونی دووەمی١٩٤٦) کۆماری کوردستانی لەشاری مەهاباد ڕاگەیاند و حکومەتێکی ناوچەیی پێکهێنا[١٢٢٥]. سەبارەت بە پاڵپشتی یەکێتی سۆڤیەت لەدامەزراندنی ئەم قەوارە کوردییە، بارزانی دەڵێت:" دۆخی تایبەتی نێودەوڵەتی هۆکاربوو بۆ ئەوەی روسەکان هاوکاریمان بکەن و ئێستاش روس پێویستی بە بوونی ئێمە هەیە لەناوچەکە و دەتوانین ئێمەش سودیان لێ وەربگرین بۆ کارکردن بۆ سەربەخۆیی کوردستان"[١٢٢٦]. ئەمەش بەو مانایە دێ بارزانی هەوڵیداوە بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد، بخاتە نێو هاوکێشەیەکی جیهانی لە سەرەتاکانی هەڵگیرسانی جەنگی ساردی نێوان بەرەی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات. بە ئامانجی ناساندنی پرسی کورد وەک پرسێکی جیهانی، کە کاریگەریی و سەنگی خۆی هەیە، بەشێوەیەک لەم دەربڕینەدا بارزانی بەرژەوەندی هەردوو لایەنی لە ڕێکخستنی پەیوەندی دۆستانەی نێوان کورد و سۆڤیەت نیشانداوە.

ئەم تێڕوانینەی مەلا مستەفا لە بەشداریکردنی شۆڕشگێرانی بارزان لە کۆماری کوردستان سەرچاوەی گرت، کاتێک بوونیان لەگەڵ سوپای شۆڕشگێری کوردستان، ڕەهەندێکی نێودەوڵەتی بە کۆمارەکە بەخشی، بەڵام ئەم بابەتە لایەنی نەرێنیشی هەبوو، لەبەرئەوەی کاتێک پاڵپشتیکردنی کورد لەلایەن سۆڤیەت بووە هۆی مەترسی بۆ بەرەی ڕۆژئاوا، کاریان کرد بۆ ڕووخاندنی و ئەم ئامانجەشیان لە (کانونی یەکەمی١٩٤٦) پێکا. بەو هۆیەوە بارزانی و ژمارەیەک لە هەڤاڵەکانی ڕوویانکردە سنووری یەکێتی سۆڤیەت وەکو پێشتر باسکراوە. ئەو کاتە بارزانی بەنیگەرانییەوە هەڵسەنگاندنی بۆ دۆخەکە کرد و بەشکست و پاشەکشەی سوپای سۆڤیەت لە ئێران وەسفیکرد و گوتی:" کورد شکستی نەهێناوە لەسەر دەستی سوپای ئێرانی، بەڵکو یەکێتی سۆڤیەت شکستی خواردووە لەسەر دەستی ویلایەتە یەکگرتووەکان و بریتانیای مەزن"[١٢٢٧]. ئەم دەربڕینەی بارزانی گوزارشت بوو لە

---

١٢٢٥ – ولید حمدي، م.س، ٢٤٦.

١٢٢٦ – وەرگیراوە لە: أبو حسن تفرشیان،م.س، ص٩٣.

١٢٢٧ – أدمون غریب، م.س، ص٣٣.

تێگەیشـتنی ئەم ڕێبەرە لە ملمڵانێیە نێودەوڵەتیەکان. کە بووە هۆی پاشـەکشـەکردنی سۆڤیەت لە پاڵپشتیکردنی گەلی کورد لە ئێران.

ئەم هەڵویسـتەی سـۆڤیەت بەرامبەر کۆماری کوردسـتان، هەرچەندە بارزانی نیگەران و دڵ سـارد کرد لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ مۆسکۆ، بەڵام شـەڕی بارزانی و کورد لە گەڵ ئیمپریالیزم و پاشـکۆیەکانی بوو لەناوچەکە، بۆیە ناچاربوو بەردەوام بێ لەهەوڵدان بۆ بەدەسـتهێنانی پاڵپشـتی سـۆڤیەت بۆ دۆزی کورد، بەتایبەتی دوای گەلەکۆمەکی وڵاتانی ئێران و عێراق و تورکیا بۆ سەرکوتکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد، لەسـەر ئەم بنەمایە دوای زنجیرەیەک شـەڕ لەگەڵ سـوپای ئێران، ڕوویکردە سـنووری یەکێتی سـۆڤیەت و لە (١٥ی حوزەیرانی ١٩٤٧) دوو نوێنەری خۆی ڕەوانەی بنکەی پۆلیسـی سـنووری (سـراجو)ی سـۆڤیەت کرد بۆ ئەوەی داواکاری بگەیەننە کاربەدەسـتانی ئەم وڵاتە تا وەک پەنابەری سـیاسـی قبوڵیان بکەن. بارزانی لەگەڵ نوێنەرەکانی، نامەیەکی بۆ جۆزیف سـتالین ڕەوانەکرد و لە بەشـێکی ئەو نامەیەدا نووسی:" ئێستا ئێمە (٥٠٠) بارزانی شۆڕشگێرین لەسەر سنووری یەکێتی سـۆڤییەت چەندین بریندار و نەخۆشـمان لەگەڵدایە، ئێمە پێویسـتیمان بە ئازادی هەیە وەکو هەموو گەلانی دیکەی پشـتگیریخوازانی دیموکراتی، ئێمە چاوەڕوانی هاوکاری هاوڕێ سـتالین دەکەین. ئێمە دەزانین سـۆڤیەت وڵاتێکی دیموکراتییە بۆ جوتیاران، لەسـەر ئەو بنەمایە هاتینە سـەر سـنووری یەکێتی سـۆڤیەت، وە بەهۆی ئەو بارودۆخەی تێیداینە، داواتان لێ دەکەین هاوکاریمان بکەن، بژی سـتالین و گەلی یەکێتی سـۆڤییەت". دوای ئەم نامەیە حکومەتی سـۆڤیەتی لە(١٦ی حوزەیرانی ١٩٤٧) داواکاری بارزانی قبوڵکرد و لەسـەر ئەم بنەمایە لە ڕۆژانی (١٧ و ١٨ی حوزەیرانی ١٩٤٧) بارزانی و هەڤاڵەکانی پەڕینەوە ناو خاکی سۆڤیەت[١٢٢٨].

لە پێشـتر ئاماژەکراوە بەدۆخی بارزانی و هەڤاڵەکانی لەیەکێتی سـۆڤیەت لەهەردوو سەردەمی ستالین و خرۆشۆف تا گەڕانەوەیان بۆ عێراق، کە دوو قۆناغی جیاواز لەیەکتری بوون. لەسـەردەمی سـتالین بارزانی و هەڤاڵەکانی بەدۆخێکی نارەحەت و دژوار تێپەرین لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٣)، بەهۆی سیاسەتی توندی کاربەدەسـتانی ئازەربیجان و ئۆزبەکسـتان لەبەرامبەریاندا[١٢٢٩]. بەڵام دواتر

---

1228 - FIRAT SÖZERİ , Önceki Kaynak,S.25.

١٢٢٩ - بڕوانە: مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ...(١٩٣١-١٩٥٨)، ٢٠٢٠، ل٢٣٦.

بەهاتنە سەردەسەڵاتی نیکیتا خروشوف، دۆخەکە لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٥٣- ١٩٥٨) گۆڕانکاری ئەرێنی بەسەردا هات[١٢٣٠]، دوای ئەوەی بارزانی توانی بگاتە کۆشکی کرملن لە مۆسکۆ و چاوی بە خروشوفی سەرۆکی یەکێتی سۆڤیەت بکەوێ و سەرکەوتووبێ لەبەدەستهێنانی پشتگیری سەرکردەکانی سۆڤیەت بۆ چاککردنی دۆخی شۆڕشگێرانی کورد لەم وڵاتە[١٢٣١]. بەتایبەتی دوای ئەوەی عێراق لەساڵی ١٩٥٥ چووە ناو (پەیمانی بەغدا)[١٢٣٢]، ئەو کاتە عێراق بووە بنکەیەکی لایەنگیر و هاوپەیمان لەگەڵ بەرەی ڕۆژئاوای نەیار و دژ بە سۆڤیەت و ئامانجەکانی لەڕۆژهەڵاتی ناوەراست[١٢٣٣]. بەو هۆیەوە یەکێتی سۆڤیەت دەستیکرد بە پاڵپشتیکردنی مەلا مستەفای بارزانی، وەک پاڤێل سودوپلاتۆف باسی دەکات و دەڵێت:"لەناوەراستی پەنجاکان هیچ هاوپەیمانێکمان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست نەبوو جگە لە کورد، ئەوان بەتەنها هاوپەیمانی ئێمە بوون"[١٢٣٤].

ئەم پێشهاتە سیاسییە، کاریگەریی گەورەی لەسەر سۆڤیەت دروستکرد و بەو هۆیەوە هەوڵیدا لەڕێگای مەلا مستەفا بارزانییەوە پاڵپشتی لە مافەکانی گەلی کورد و داخوازییەکانی بکات بۆ ئۆتۆنۆمی. بەتایبەتی دوای ئەوەی خروشوف لە کۆنگرەی بیستەمی حزبی شیوعی لەساڵی ١٩٥٦ ڕایگەیاند، پشتگیری لە بزاڤی ڕزگاریخوازی دەکەن[١٢٣٥]. ئەو کاتە حکومەتی سۆڤیەت لەڕێگای نوێنەرێکیەوە کە ناوی (سوسلوفSosilov)[١٢٣٦] بوو، بە مەلا مستەفا بارزانی ڕاگەیاند، حکومەتەکەی لەگەڵ

---

١٢٣٠ – عزيز الحاج، م.س، ص٢٥.

١٢٣١ – مێهفان البامرني، م.س، ص١١٩.

١٢٣٢ – پەیمانی بەغدا: ئەم ڕێککەوتنە شێوازێکی سیاسی و سەربازی بوو لەسەر بنەمای هاوپەیمانەتییەک کە هەریەک لە تورکیا و ئێران و پاکستان و عێراق تێیدا بەشداربوون و بارەگایەکەی لە شاری بەغدا بوو. بۆ زانیاری زیاتر بروانە: شیرزاد زکریا محمد، أثر حلف بغداد١٩٥٥ على الحركة التحررية القومية الكوردية، جامعة دهوک، مركز الدراسات الكوردية و حفظ الوثائق، ٢٠٠٩.

١٢٣٣ – نهاد طالب، عويد الحميدوای، العلاقات العراقية- السوفيتية ١٩٧٢- ١٩٨٠، دار المعارف الثقافية، بغداد، ٢٠١٨، ص٢٦.

١٢٣٤ – باڤل سوبوبالتوف، م.س، ص١٧.

١٢٣٥ – خالد خالد کۆچی، م.س، ص٣٤.

١٢٣٦ – میخائیل ئەندرییف سوسلوف: ساڵی ١٩٠٢ لەدایک بووە. لە ساڵی ١٩٤٧ بۆتە سکرتێری لیژنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی. لە پەیمانگای بلیخانوف( ئابووری) خوێندووە، دوای دیداری لەگەڵ بارزانی لە ئۆزبەکستان، ڕاسپێردراوە بە دیراسەکردنی دۆسیەی کوردی و ڕادەستکردنی دۆسیەکە

گەلی کورد دەوەستێ بۆ بەردەوامیدان بەخەبات لەهەموو دۆخێکدا و لەسەریدایە پاڵپشتی بکات بۆ کۆتاییهێنان بە حکومەتی نووری سەعید لە عێراق کە لایەنگیری ڕۆژئاوایە و هەوڵبدات بۆ لاوازکردنی هەژموونی ئەمریکا و بریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست لە ڕێگای دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی کە ڕێگا خۆش بکات بۆ یەکێتی سۆڤیەت بۆ فراوانکردنی دەسەڵاتی خۆی و کۆتایی بهێنێ بە هەژموونی ڕۆژئاوا لە ناوچەکە[١٢٣٧]. بێگومان ئەوەش پەرەسەندنێکی گرنگ بوو بۆ دۆزی کورد لە ناوچەکە.

لەبەرەبەیانی(١٤ی تەمموزی١٩٥٨) کودەتایەکی سەربازی لەبەغدا ئەنجامدرا و بەو هۆیەوە گۆڕانکاریەکی بنەڕەتی لەڕژێمی حوکمڕانی عێراق هاتەکایەوە و ڕژێمی پادشایەتی ڕووخا[١٢٣٨]. دیارە یەکێک لە لێکەوتەکانی ئەم گۆڕانە سیاسییە لەعێراق، بریتی بوو لە دەرچوونی ئەم وڵاتە لەپەیمانی بەغدا[١٢٣٩]. ئەم هەنگاوەش کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر هەڵوێست و تەنانەت پەیوەندیەکانی یەکێتی سۆڤیەت لەگەڵ ڕژێمی نوێی عێراق. بەو هۆیەوە سەرکردەکانی کرملن بەر لەهەموو وڵاتانی دیکە، پشتگیری و پشتیوانی دەسەڵاتی نوێی عێراقیان کرد [١٢٤٠].

سەرەڕای ئەوەش هەڵوێستی سۆڤیەت لەهەمبەر بارزانی و بزاڤی کوردی نەگۆڕا، چونکە لە دوای ڕووخانی رژێمی پادشایەتی، یەکێتی سۆڤیەت بەڵێنی پشتگیریکردنی مافە ڕەواکانی گەلی کوردی بە مستەفا بارزانیدا، بەو ڕادەی خواستەکانی کورد لە ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی عێراق زیاتر تێنەپەڕێ. ئەم هەڵوێستەی سۆڤیەت ئومێدێکی لەلای مەلا مستەفا بارزانی و سەرکردایەتی کورد دروستکرد. ئەمەش هاندەربوو بۆ ئەوەی دوای گەڕانەوەیان بۆ عێراق، بەردەوامی بە پەیوەندیەکانی بدات لەگەڵ مۆسکۆ[١٢٤١]. بەتایبەتی لەو کاتەی لەبەغدا نیشتەجێ

---

بە مەکتەبی سیاسی. لە ساڵی ١٩٤٩ بە سەرنووسەری ڕۆژنامەی براڤدا دامەزراوە و لەساڵی دواتر بۆتە ئەندامی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی و لەساڵی ١٩٥٤ بە سەرۆکی لیژنەی کاروباری دەرەوە هەڵبژێردراوە. میهفان البامرني، م.س، ص١٤٦.

١٢٣٧ – ئەفراسیاو هەورامی، س.پ، ل١٨٤-١٨٥.

١٢٣٨ – أيام لاتنسى...، ص١١٩.

١٢٣٩ – نهاد طالب، عويد الحميدواى، م.س، ص٢٩.

١٢٤٠ – د. محمد سعيد أحمد بني عايش، الانقلابات العسكرية في العراق ١٩٥٨- ١٩٦٩(دراسة في العوامل الداخلية والاقليمية والدولية، دار الكتاب الثقافي للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠١٨، ص٢٦٨.

١٢٤١ – عبدالفتاح علي البوتاني، التطورات السياسية ...، ص٧١.

بوو، هەمیشە سەردانی باڵیۆزخانەی سۆڤیەتی دەکرد و بەرپرسانی سۆڤیەتیش لە باڵیۆزخانەکە وەڵامی ئەم دەستپێشخەریانەی بارزانیان داوەتەوە بەسەردانیکردنی لەبارەگایەکەی لەم شارە[١٢٤٢].

ئەم پەیوەندییە بەهێزەی بارزانی لەگەڵ سەرکردەکانی سۆڤیەت، هۆکاربوو بۆ ئەوەی قاسم و حکومەتی عێراق بەچاوی گومانەوە سەیری بکەن، بەتایبەتی ئەو کاتەی حزبی شیوعی سۆڤیەت بە بۆنەی ساڵوەگەری شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە (٥ی تشرینی یەکەم١٩٦٠) بانگهێشتی بارزانی کرد بۆ مۆسکۆ، بەمەبەستی بەشداریکردن لە ئاهەنگەکانی ئەو پارتە، بۆ ئەم مەبەستەش فڕۆکەیەکی تایبەتیان لە مۆسکۆ بۆ گواستنەوەی بارزانی ڕەوانەی بەغدا کرد[١٢٤٣].

کاتێک بارزانی گەیشتە مۆسکۆ، چەند دیدار و کۆبوونەوەی گرنگی لەگەڵ کاربەدەستانی کرملن ئەنجامدا. لەم کۆبوونەوانە داوایکرد سەرکردەکانی سۆڤیەت هاوکاربن بۆ ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکانی نێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتی قاسم. کە بەهۆی گومانەکانی ئەوەی دوایی لە بارزانی، گرژی و ئاڵۆزی تێکەوتبوو تا ڕادەی پاشگەزبوونەوە لە جێبەجێکردنی بەشێک لەو ڕێکار و بڕیارانەی پێشتر لە بەرژەوەندی دۆزی کورد لە عێراق پەسەندی کردبوو[١٢٤٤]. سەبارەت بەم بابەتە گۆینتەر دیشنەر باس لەوە دەکات:"لە(پایزی ١٩٦٠) لێکدابڕانێکی تەواو لەنێوان بارزانی و عەبدولکەریم قاسم هەبوو، ئەوەی دوایی بارزانی تۆمەتبارکرد بەوەی لایەنگری هاوپەیمانی (سینتو–Cento)[١٢٤٥]یە. لەکاتێکدا قاسم ئەم پروپاگەندەی دەکرد، بارزانی لە مۆسکۆ لەتەنیشت نیکیتا خروشوف و سەرکردەکانی دیکەی سۆڤیەت وەستابو دەیڕوانییە مەیدانی سوور و لەگەڵ ئەواندا سەیری ئەو سەربازانەی دەکرد، کە بەبۆنەی یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەر نمایشیان دەکرد. هەرچەندە ئەم سەردانەی

١٢٤٢ – میهفان البامرني، م.س، ص١٦١.

١٢٤٣ – م.ن، ص١٧٤.

١٢٤٤ – فرهاد محمد أحمد، القضية الكوردية في العراق في أطار التنافس السوفيتي– الامريكي(١٩٤٦–١٩٧٥)، مجلة العلوم الانسانية لجامعة زاخو. ,Vol.4, No.3, December2016،ص٥٧١.

١٢٤٥ – دوای دەرچوونی عێراق لە پەیمانی بەغدا، ئەندامانی ئەم هاوپەیمانەتییە، لە (٢١ی ئابی ١٩٥٩) لە ئەنقەرە کۆبوونەوە و بڕیاریاندا لەسەر بەردەوامبوون و گۆڕینی ناوی پەیمانی بەغدا بۆ هاوپەیمانی پەیماننامەی ناوەندی– سنتۆ(Central Treaty Organization). محمود رزوق أحمد، م.س، ص١٤٣.

بارزانی دەنگدانەوەیەکی باشـــی بوو لەبواری ڕاگەیاندندا، بەڵام بارزانی لە مۆســـکۆ گەڕایەوە بێ ئەوەی ســەرکەوتنێکی کرداری ئەوتۆ بەدەســتبێنێ، هەروەها نەیتوانی چ گفت و بەڵێنێک لە سۆڤیەت وەربگرێ کە یارمەتی بدەن"[١٢٤٦].

بەم شـــێوەیە هەرچەندە مەلا مســـتەفا بارزانی نزیکەی (٤) مانگ لە میوانداری مۆســـکۆ بوو، بەڵام ســـەرکردەکانی ســـۆڤیەت هیچ هەنگاوێکی کردارییـان بۆ ئاســاییکردنەوەی پەیوەندی بارزانی و قاســم هەڵنەهێنا. ئەوەندە نەبێ ڕێنماییان کرد، کە باشترە بۆ پاراستنی گیانی کە گومانی ئەوەیان دەکرد هەڕەشەی لەسەربێ، بەغدا بەجێ بهێڵێت و ڕوو بکاتە ناوچە شـاخاوییەکانی کوردســتان. بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا بڕێکی زۆری پارەیان بۆ بارزانی ڕەوانەی عێراق کرد، وەک قەرەبووی ئەو چەکانەی لەســاڵی ١٩٤٧ ڕادەســتی حکومەتی ســۆڤیەتیان کردبوو. ســەرباری تەرخانکردنی موچەیەکی خانەنشـینی بۆ هەریەک لەم پێشـمەرگە بارزانییانەی لەگەڵ مەلا مســتەفا بوون لە سۆڤیەت[١٢٤٧].

توێژەرێک ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، بانگهێشـــتکردنی مەلا مســـتەفا بارزانی بۆ مۆسـکۆ ڕەهەندی جیاوازی هەبوو، لەمانەش سـۆڤیەت هەوڵیدا پەیامێک بە عێراق و وڵاتانی ڕۆژئاوا بدات، جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە باوەشـــی ســـۆڤیەتدایە، ئەمەش هۆشــدارییەک بوو بۆ هەموو لایەک ســەبارەت بە هەژموونی سـۆڤیەت لە عێراق[١٢٤٨].

خواســـت و ئامانجی بارزانی لەم ســـەردانەدا بۆ مۆســـکۆ، هەوڵدان بوو بۆ بەدەســـتهێنانی پاڵپشـــتی ســـۆڤیەت بۆ دۆزی کورد بەکردار نەک بەزار، لەڕێگای نزیککردنەوەیان لە قاسم و ئاوەژۆکردنی دۆخی نائاسایی و ئاڵۆزی نێوانیان. دەکرێ بڵێین لێکەوتەکانی ئەم سەردانەی بارزانی بۆ مۆسکۆ، ئەوەندە دەرهاوێشتەی نەرێنی هەبوو، ئەوەندە کاریگەریی ئەرێنی لە سەر پرسی کورد لە عێراق دروست نەکرد. بە بەڵگەی ئەوەی سەردانەکە هۆکارێکی کاریگەربوو بۆ زیاتر ئاڵۆزبوونی پەیوەندیەکانی مەلا مستەفا بارزانی و عەبدولکەریم قاسم[١٢٤٩]، کە دواجار بارزانی دوای گەڕانەوەی

١٢٤٦ – گوینتەر دێشنەر، س.پ، ل١٨٧.

١٢٤٧ – میهفان البامرني، م.س، ص١٧٤،١٧٥، ١٧٩.

١٢٤٨ – م.ن، ص ١٨٠.

١٢٤٩ – عزیز الحاج، م.س، ص٥٣.

نەیتوانی لەبەغدای پایتەخت بمێنێتەوە و ڕاستەوخۆ گەڕایەوە بارزان و پەیوەندییەکانی لەگەڵ قاسم پچڕاند[١٢٥٠].

گەڕانەوەی مەلا مستەفا بارزانی بۆ بارزان، بووە هۆی ئەوەی سەرکردایەتی سۆڤیەت کاربکات بۆ ئەوەی بارزانی ڕوو لەبەرەی ڕۆژهەڵات وەرنەگێڕێ بۆ بەرەو بلۆکی ڕۆژئاوا، بە مەبەستی بەدەستهێنانی پاڵپشتی و پشتیوانی بۆ دۆزی کورد، بۆیە هەوڵیاندا بەشێوەیەکی کردارەکی هاوکاریی دارایی پێشکەشی کورد بکەن، ئەو کاتە بارزانی بەرنامەیەکی گونجاوی دانا بۆ کڕینی چەک و زەخیرەی جەنگی. باڵیۆزخانەی سۆڤیەت لە بەغدا بووە خاڵی پەیوەندی لەنێوان مەلا مستەفا بارزانی و مۆسکۆ و لەم ڕێگایەوە پاڵپشتییە داراییەکانی سۆڤیەت گەیشتە بارزان و بەرپرسی ڕاستەوخۆش لەم پرۆسەیە سکرتێری یەکەمی باڵیۆزخانەکە (ناسکوف) بوو[١٢٥١].

دوای ماوەیەکی کەم لەگەڕانەوەی بارزانی بۆ باشووری کوردستان، شۆڕشی کورد هەڵگیرسا، هەرچەندە سەرکردایەتی سۆڤیەت لەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕ و شۆڕش نەبوون لەدژی حکومەتی عێراق و ڕژێمی قاسم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام بوون لە هاریکاریکردنی مەلا مستەفا بارزانی و شۆڕشی کورد. لەم سۆنگەوە دوای ئەوەی مەلا مستەفا بارزانی نامەیەکی بە دوو لە کەسە نزیکەکانی خۆی کە (محەمەد تابونی و فوئاد بامەرنی) بوون بۆ نوسینگەی نهێنی سۆڤیەت لە شاری بەغدا ڕەوانەکرد. داوایکرد حکومەتی سۆڤیەت هاوکاری و پشتیوانی سەربازی پێشکەش بە شۆڕشی کورد بکات. ئەو کاتە کاربەدەستانی کرملن وەڵامدانەوەی ئەرێنیان بۆ داواکارییەکەی مەلا مستەفا بارزانی هەبوو، بەشێوەیەک ڕاستەوخۆ بڕیارياندا لە پرۆسەیەکدا کە ناویان لێنا (پرۆسەی نهێنی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) بڕێک چەک و پێداویستی سەربازی بۆ کورد ڕەوانە بکەن. بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارەش چەند ئەفسەرێکی دەزگای هەواڵگریان ڕاسپارد و نزیکەی (٤٠ ) تەن لە چەک و زەخیرەی جەنگیان بە کەشتیەک ڕەوانەی سوریا کرد و لەوێشەوە بەهاوکاری کوردانی ڕۆژئاوای کوردستان گواستیانەوە ناو خاکی عێراق،

---

١٢٥٠ – مێهفان البامرني، م.س، ص١٨٤.

١٢٥١ – م.ن، ١٨٦.

بەڵام ئەم کاروانی هاوکارییە لە شـــاری (قائم)[١٢٥٢] کەوتە بەر هێرشـــی فڕۆکەکانی عێراق و تەنها یەک بارهەڵگر ڕزگاری بوو، ئەم بارهەڵگرەش گەیەندرایە بارەگای بارزانی و چەک و زەخیرەکانی ڕادەستی سەرکردایەتی کورد کرد[١٢٥٣].

یەکێتی سۆڤیەت چۆن هاوکاری سەربازی بۆ کورد ڕەوانە کرد، بە هەمان شێوە و بە قەبارەی زیاتر و گەورەتر یارمەتی حکومەتی بەغدایاندا[١٢٥٤]. بێگومان هۆکاری ئەم سـیاسـەتەی سـۆڤیەت هەوڵدان بوو بۆ دەسـتگرتن بەهەردوو بەرەی ناکۆک تـاوەکو نەچنە ژێر بـاری ســـەربـازگەی ڕۆژئـاوا و پـارێزگـاری لە هەژموونی سەربازگەی ڕۆژهەڵات بکەن لەناوچەکە[١٢٥٥].

ئاشکرایە کە هەڵوێستی یەکێتی سۆڤیەت بەرامبەر بە پرسی کورد، هاوشێوەی هەموو هێزە نێودەوڵەتییەکـانی دیکە بەســـترابویەوە بە بەرژەوەنـدییەکـانی لەگەڵ حکومەتی عێراق، بەشێوەیەک هەرکات ئەم دەسەڵاتەی لەعێراق حوکمڕانی کردووە ، نەیار و دژبێ بەرامبەر بە بەرژەوەندییەکانیان، هەوڵیانداوە بۆ فشـــار دروســـتکردن لەســـەریـدا، پشـــتگیری بزاڤی ڕزگـاریخوازی کورد بکەن[١٢٥٦]، ئەمەش پـاڤێـڵ سودوپلاتۆف خۆی باسیکردووە پێشنیازی بۆ نیکتا خرۆتشۆف کردووە سوود لە شـۆڕشـی کورد وەربگرێ و پشـتیوانی لە مەلا مسـتەفا بارزانی بکات لەدژی قاسـم، چونکە ئەو پێی وابووە ئەوەی دوایی دەرفەت و دەســەڵاتی بەهێزی هەبێت لەبەرەی ســـۆڤیەت هەڵدەگەڕێتەوە. لە بەشـــێکی ئەو باســـەدا ســـودوپلاتۆڤ دەڵێت:" کاتێک ڕووبەڕووی ئاســـتەنگ بووینەوە لەگەڵ حکومەتی قاســـم و ناســـیۆنالیســـتە میراتگرەکانی، نامەیەکمان لە بەندیخانەوە ڕەوانەکرد و تیایدا پێشنیازی ئەوەمان کرد،

---

١٢٥٢ – قەزایەکە لە پایزگای ئەنبار لە عێراق. کەوتۆتە باکووری ڕۆژئاوای عێراق بە دووری(٤٠٠)کم. نزیکە لەسنووری سوریا . بشير يوسف فرنسيس، موسوعة المدن والمواقع في العراق، ج٢، لندن، ٢٠١٧، ص١٢٠.

١٢٥٣ – مێهفان البامرني، م.س، ص١٩٠.

١٢٥٤ – فرهاد محمد أحمد، القضية الكوردية في العراق ، ص٥٧٢.

١٢٥٥ – د. هەستیار کەمال کوردی، پەیوەندییەکانی یەکێتی سۆڤێت – عێراق و کاریگەریی لەسەر باشووری کوردستان(لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری بەڵگەنامەییە)، چاپخانەی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٢١، ل٥٦.

١٢٥٦ – ويلسون ناثائيل هاول، الكورد والاتحاد السوفيتي، ت: ضياءالدين المرعب، بغداد، ٢٠٠٦، ص٢٥١.

پێویستە پەیوەندی بە بارزانی بکەن و پێشنیارەکەم قبوڵکرا و چەک ڕەوانەکرا. بەڵام هەوڵەکانمان بۆ ئەوەی کورد بکەینە هاوپەیمانێکی ستراتیژی، شکستی هێنا"[١٢٥٧].

لەسەر ئەم بنەمایە سەرکردەکانی کرملن بەهۆی ئەو گۆڕانە سیاسییەی لەدوای (٨ی شوباتی١٩٦٣) لە عێراق ڕوویدا و بەهۆی فشار دروستکردنی حزبی بەعس لەسەر حزبی شیوعی عێراقی و ڕاوەدونان و کوشتنیان، جارێکی دیکە کەوتە بەرەی پشتیوانی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد[١٢٥٨]. ئەمجارە جیاوازتر لەجاران بەشێوەیەکی ئاشکراو ڕاشکاوانە داکۆکیان لە کورد کرد و پرسی کوردیان بۆ یەکەمجار گەیاندە کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتوەکان[١٢٥٩]، ئەوە سەرباری ئەوەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ڕێگیرییان کرد لە دەستێوەردانی وڵاتانی هەرێمی لە کاروباری ناوەخۆی عێراق بۆ دژایەتیکردنی شۆڕشی کورد[١٢٦٠]. بەو هۆیەوە حکومەتی عێراق لەڕێگای نوێنەرەکەیەوە لە نیویۆرک، لە (١١ی تەممووزی١٩٦٣) یاداشتێکی نارەزایی دایە ئەنجوومەنی ئاسایش و تیادا نارەزایی دەربڕی لەبەرامبەر دەستێوەردانی سۆڤیەت لە کاروباری ناوەخۆی عێراق[١٢٦١]. بەم جۆرەش دۆزی کورد ڕەهەندێکی نێودەوڵەتی وەرگرت، لەو کاتەی وڵاتانی هەرێمی و ڕۆژئاوایی پاڵپشتی عێراقیان دەکرد و پارە و چەکیان پێدەدا، بە پێچەوانەوە یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتانی سۆشیالیستی پارەوچەکیان بۆ شۆڕشی کورد دابین دەکرد[١٢٦٢].

لەم ماوەیەدا حکومەتی عێراق هەموو ڕێکارێکی گرتەبەر بۆ دروستکردنی درزێک لە پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی کورد و یەکێتی سۆڤیەت، دواجار دەستیکرد بە بڵاوکردنەوەی پروپاگەندە لەسەر جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد و بەهاوپەیمانی

---

١٢٥٧ – باڤل سوبوبالتوف، م.س، ص١٧.

١٢٥٨ – بروانە؛ البعث تستغرب تأييد موسكو لعصابة البارزاني، الجماهير(صحيفة)، ع(١١٨)، ٢٠ حزيران ١٩٦٣، ص١.

1259 –ПОЛОЖИТЬ КОНЕЦ ИНОСТРАННОМУ ВМЕШАТЕЛЬСТВУ В СОБЫТИЯ НА СЕВЕРЕ ИРАКА, ПРАВДА, No:191(16412), 10 июля 1963, с.1.

١٢٦٠ – دينيس كوماروف، م.س، ص٧٤.

١٢٦١ – العراق يحتج الى مجلس الامن على التدخل السوفيتي، الجماهير(صحيفة)، ع(١٤٠)، ١٢ تموز ١٩٦٣، ص١.

١٢٦٢ – فرهاد محمد أحمد، القضية الكوردية في العراق ، ص٥٧٣.

سـەنتۆ وەسـفی کردن. ئەم هاوپەیمانییەی کە بەرەیەکی نەیاری دژ بوو بەرامبەر بە سۆڤیەت[١٢٦٣].

پێشـتر ئاماژەی پێکرا، پشـتگیریکردنی دۆزی کورد لەلایەن یەکێتی سـۆڤیەتەوە بەسـتراوبۆوە بە هەڵوێسـتی حکومەتی عێراق، بۆیە بەتـایبەتی دوای ئەم گۆڕانە چۆنـایەتییەی لەهەڵوێسـتی حزبی بەعس لەعێراق ڕوویـدا لە قۆنـاغی دووەمی حوکمڕانیان لەدوای کودەتای (١٧ی تەمموزی ١٩٦٨) بەرامبەر سـۆڤیەت. بووە هۆی ئاسـاییبوونەوەی پەیوەندی نێوان هەردوو وڵات. کە بەلای سـەرکردەکانی سـۆڤیەت دەرفەتێکی لەباربوو بۆ بەدیهێنانی دەسـتکەوتە سـیاسـی و ئابوورییەکانیان لەعێراق[١٢٦٤]. بۆ ڕەخسـاندنی ئەم دۆخەش پێویسـتیان بە سـەقامگیری بارودۆخی سـیاسـی و ئابووری هەبوو، بۆیە لەسـەر ئەم بنەمایە هەردوو لایەنی ناکۆکیان لەعێراق هاندا بچنە ناو گفتوگۆ و دانوسـتاندن لەپێناو سـازان و کۆتاییهێنان بەشـەڕ. هەوڵی سـۆڤیەت بۆ نزیککردنەوەی حکومەتی عێراق و سـەرکردایەتی کورد، دواجار هەردوولای لە(١١ی ئاداری ١٩٧٠) گەیاندە ڕێککەوتن[١٢٦٥].

لە دوای ڕێککەوتننامەی ئادار، فشـارەکانی سـۆڤیەت و حکومەتی عێراق لەسـەر مەلا مسـتەفای بارزانی و سـەرکردایەتی کورد بەردەوام بوون ، لەپێناو ڕازیکردنی بارزانی بە بەشـداریکردن لە حکومەتی (بەرەی نیشـتمانی)[١٢٦٦]. بەتایبەتی دوای سەردانێکی سەدام حوسێن لە (شوباتی١٩٧٢) بۆ مۆسکۆ[١٢٦٧]، هەر بۆ ئەم مەبەستە

١٢٦٣ – اللواء عارف يكشف تعاون العناصر الانفصالية الكردية مع حلف السنتو، الحرية(صحيفة)، ع(٢٦٠)، ١ أذار ١٩٦٥، ص١.

١٢٦٤– هەستیار کەمال کوردی، س.پ، ل٥٦.

١٢٦٥ – بڕوانە: جووڵانەوەی نەتەوەیی باشوری کوردستان( ١٩٦١– ١٩٨٢)،ل٤٥.

١٢٦٦ – سەبارەت بە (بەرەی نیشتمانی) بڕوانە: برایەتی (ڕۆژنامە)، ژ(٦٩)، ٢١ی ئەیلولی ١٩٧٣، ل١.

1267 – F.R.U.S, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, Memorandum From the Chief of the Near East and South Asia Division of the Central Intelligence Agency (Waller) to the Assistant Secretary of State for Near Eastern and South Asian Affairs , Intention of Kurdish Leader Al–Barzani to Approach the United States Government for Assistance; Iranian Intelligence Request for Expression of United States Government Willingness to Overthrow the Ba'thi Regime of Iraq, Washington, March 9, 1972,P.2.

حکومەتی بەعس خۆی لەسـەرکردایەتی کورد نزیککردەوە و داوای ئیمزاکردنی (گەلالەنامەی نیشـتمانی )[١٢٦٨] لێکرد. حکومەتی سـۆڤیەتیش شـاندێکی خۆی بەسەرۆکایەتی(رومانیتسیف_ Rumanytsev) ی بەرپرسی کاروباری نێودەوڵەتی لە یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤیەت، لە(٢٨ شوباتی١٩٧٢) بۆ هەمان مەبەست ڕەوانەی لای بارزانی کرد. بەڵام بارزانی لەم دیدارەدا هەڵوێستی خۆی لەبەشداریکردن لەم بەرەیە بەڕاشکاوانە بە شاندی سۆڤیەت ڕاگەیاند، کە بەشداری هیچ جۆرە بەرەیەک ناکات حزبی بەعس تێیدا خاوەن دەسەڵاتی ڕەهابێ و کورد و لایەنەکانی دیکە پاشکۆیەتی بکەن. بەڵکو بەو مەرجە بەشداری دەکات، کورد لە دەسەڵاتدا بەشدارێکی کارا بێ. ئەوە سەرباری ئەوەی پێی راگەیاندن، متمانەیان بە حزبی بەعس نەماوە، بەتایبەتی دوای هەوڵی تیرۆرکردنی[١٢٦٩]. ئەمەش ئەنجامێکی نەرێنی بوو لە دیدارەکەی بارزانی و شاندەکەی سۆڤیەت. بەو هۆیەوە هەڵوێستی ئەم وڵاتە بەرامبەر دۆزی کورد لە عێراق گۆڕانی بنچینەیی بە خۆیەوە بینی و تەنانەت دوای ئەم دیدارە بڕیاریاندا پشتگیری لە حکومەتی عێراق بکەن بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد.

هۆکاری ڕاستەوخۆی گۆڕانی هەڵوێستی سۆڤیەت بەرامبەر بە کورد دەگەڕێتەوە بۆ ئەم نەخشە پلانەی هەیانبوو بۆ بەهێزکردنی پێگەی ئابووریان لەناوچەکە، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە (٩ی نیسانی١٩٧٢)، (ڕێککەوتنامەی دۆستایەتی و هەماهەنگی) [١٢٧٠] یان لەگەڵ حکومەتی عێراق ئەنجامدا، کە ڕەهەندی سیاسی و

---

١٢٦٨ – گەلالەنامەی نیشتمانی ئەم پرۆژە سیاسییە بوو کە لەساڵی ١٩٧٢ لەلایەن حیزبی بەعس لە عێراق ئامادەکراوە بۆ پێکهێنانی حکومەتی بەرەی نیشتمانی بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم پرۆژەیە، بروانە: برایەتی (ڕۆژنامە)، ژ(٦٩)، ٢١ی ئەیلولی ١٩٧٣، ل١.

1269 - F.R.U.S, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc- 299). Memorandum from the Chief of the Near East and South Asia Division of the Central Intelligence Agency (Waller) to the Assistant Secretary of State for Near Eastern and South Asian Affairs, Washington, March 9, 1972, p.2.

١٢٧٠ – ئەم ڕێککەوتنامەیە لە (٩ی نیسانی ١٩٧٢) لەنێوان ئەحمەد حەسەن بەکر سەرۆکی عێراق و ئەلیکسی کوسجین سەرۆک وەزیرانی سۆڤیەت لە بەغدا واژووکرا. کە لە (١٤) مادە پێکهاتووە. بۆ زانیاری وەرگرتن لەسەر ماددەکانی ئەم پەیماننامەیە وەک لەیاسای ژمارە(٤٧)ی ساڵی ١٩٧٢ بە

ئـابووری جۆراوجۆری لەخۆگرت. دواتریش حکومەتی عێراق لە (١ی حوزەیرانی ١٩٧٢) بڕیاری خۆماڵیکردنی نەوت دەرکرد، بەم جۆرەش زیاتر لەجاران لە سۆڤیەت نزیکبوویەوە، چونکە بڕیارەکە لە دژی بەرژەوەندی سەربازگەی ڕۆژئاوا بوو[١٢٧١].

ئەم هەڵویستەی بارزانی، سەرباری ئاشکرابوونی پەیوەندییەکانی سەرکردایەتی کورد بە ئەمریکا و ئێران، سەرکردەکانی سۆڤیەتی هێنایە سەر ئەم باوەڕەی کە پێویستە شۆڕشی کوردی لە عێراق کۆتایی پێبهێنێ. بەو هۆیەوە لە ساڵی ١٩٧٤ توانایەکی گونجاوی سەربازییان خستە بەردەست حکومەتی عێراق بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد، ئەوە سەرباری ئەوەی هەموو پاڵپشتییەکی سەربازییان پێشکەشکردن لە نمونەی ڕاوێژکار و تەنانەت بەشداریکردنی کردارەکی لەڕێگای هێزی ئاسمانی سۆڤیەتی بۆ لەناوبردن و شکستپێهێنانی شۆڕشی کورد[١٢٧٢]. سەبارەت بەو بابەتە مستەفا بارزانی لە تشرینی دووەمی ١٩٧٤ نامەیەکی بۆ یاریدەدەری سەرۆکی ئەمریکا بۆ کاروباری ئاسایشی نیشتمانی ( کیسنجەر) ڕەوانە کرد، کە دەقەکەی لەیەکێک لەبەڵگەنامە فەرمیەکانی حکومەتی ئەمریکا بڵاوکراوەتەوە. بارزانی لەونامەیەدا نووسیویەتی:"عێراقیەکان زیاتر لە(٧) مانگ دەبێ بە پاڵپشتی تەواوی روس جەنگێکی کۆمەڵکوژی لەدژی کوردستان ئەنجام ئەدەن، وێڕای بەشداریکردنی هەزاران شارەزا و فرۆکەوانی روسی لەگەڵ ئەفسەرە سۆڤیەتییەکان. پاڵپشتی دارایی روسی و بەردەوام بونی پێدانی چەک و زەخیرە، پێشکەوتنی بەرچاوی بە عێراقیەکان و هێزە شەڕکەرەکانی بەخشیوە. بۆ نمونە ئێمە لە دوو مانگ و نیوی ڕابردوو(١٢٠٠) کوژراو بریندارمان هەبووە لەبەرەکانی شەڕ لە قەڵادزە و رواندوز"[١٢٧٣]. بەم شێوەیە دەبینین سۆڤیەت بەهەموو هێزەوە پاڵپشتی لە

---

ناونیشانی( تصديق معاهدة الصداقة والتعاون بين الجمهورية العراقية و أتحاد الجمهوريات الاشتراكية السوفياتية) هاتووە، بڕوانە: الوقائع العراقية(جريدة)، ع(٢١٢٨)، ٢٥/نيسان/١٩٧٢، ص١-٤.

١٢٧١ - سەبارەت بە دەقی بڕیاری خۆماڵیکردنی نەوت کە پشتی بە یاسای ژمارە (٦٩)ی ساڵی ١٩٧٢ بەستبوو، بڕوانە: ( تأميم عمليات شركة النفط العراق المحدودة)، الوقائع العراقية(جريدة)، ع(٢١٤٦)، ١/حزيران/١٩٧٢، ص٣-٤.

١٢٧٢ - بڕوانە: فرهاد محمد أحمد، القضية الكوردية في العراق ،ص٥٧٩.

1273 -F.R.U.S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, Memorandum From Director of Central Intelligence Colby to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Text of General Mulla

حکومەتی عێراق کرد بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد، بەتایبەتی دوای ئەوەی تێگەیشتن لەوەی شۆڕشەکە لەلایەن ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە ڕۆژهەلاتی ناوەراست پشتیوانی دەکرێ، بۆیە کەوتنە بەرەی دژ بەکورد، لەدیدارێکی بارزانی لەگەڵ ئاژانسی هەواڵی ئەسوشیتید پرس لە ئەیلولی ١٩٧٤ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، حکومەتی عێراق بە هاوکاری سۆڤیەت، هێز و توانای بەدەستهێناوە[١٢٧٤]. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانەش، سۆڤیەت لەم هەوڵەدا سەرکەوتوو نەبوو، تا حکومەتی عێراق ناچاربوو لە ئاداری١٩٧٥ سازش بۆ حکومەتی ئێران بکات لەبەرامبەر وازهێنانی لەپاڵپشتیکردنی شۆڕشی کورد.

## باسی دووەم: ئەمریکا

مستەفا بارزانی لەسەرەتای خەباتی سیاسی و چەکداری خۆیدا، لەپێناو بەدەستهێنانی پاڵپشتی نێودەوڵەتی بۆ دۆزی کورد، هەوڵی نزیکبوونەوەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا. لەبەرئەوەی وەک خۆی دەیگوت:" من (١٢) ساڵ لە سۆڤیەت ژیاوم، بەو ئەنجامە گەیشتوم کێشەی کورد لە ئەجێندای دەوڵەتی سۆڤیەتدا نیە، هەر بۆیە دەمەوێت زیاتر هەوڵ بۆ لۆبیکردن لەگەڵ ئەمریکا بدەم"[١٢٧٥]. بەڵام بەدەستهێنانی پاڵپشتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ بارزانی ئەوەندە ئاسان نەبوو، لەبەرئەوەی کاربەدەستانی کۆشکی سپی، لەدوای گەڕانەوەی بارزانی لە ساڵی ١٩٥٨ بۆ عێراق، مەلا مستەفایان وەک ئامرازێکی جێبەجێکاری ئەجێندای سۆڤیەت لە عێراق دەبینی و تەنانەت ئەوان بارزانیان بە (مەلای سۆر) وەسفکرد[١٢٧٦].

لەئەنجامی ئەمەدا بارزانی هەرچەند چەندین هەوڵی نزیکبوونەوەی لەگەڵ ئەم وڵاتەدا، کەچی هیچ یەکێک لەم هەوڵانەی سەرکەوتوو نەبوون، سەرباری ڕەوانەکردنی دەیان نامە و نوێنەر بۆ باڵیۆزخانەکانیان لە تاران و بەیروت و

---

Mustafa Barzani's Letter to Secretary Kissinger, Washington, November 2, 1974,p.720.

١٢٧٤ – کیهان (روزنامه)، ش(٩٣٧٢)، (٣ مهر ١٣٥٣– ٢٦ ئەیلول ١٩٧٤)، ص٤.

١٢٧٥ – شۆڕشی ئەیلوول لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا،ل١٧.

١٢٧٦ – ماریانا خاروداکي، م.س، ص٢٥١.

قاهیره[١٢٧٧]، تەنانەت کۆششەکانی بارزانی لەم بارەدا چەند جارێکیان گەیشتنە کۆشکی سپی[١٢٧٨]، بەڵکو لە (٣٠ی تەمموزی١٩٦٢) ڕاستەوخۆ داوای لەسەرۆکی ئەمریکا کرد، پاڵپشتی دۆزی کورد بکات[١٢٧٩]. دواتر لە (١٢ی نیسانی١٩٦٥) (شەمسەددین موفتی) و (مەسعود بارزانی) لە ڕێگای باڵیۆزخانەکەیانەوە لە تاران، پەیامی مەلا مستەفا بارزانیان بە حکومەتی ئەمریکادا و ڕایانگەیاند، کە بارزانی دەیەوێت سەرچاوەکانی نەوتی کوردستان لەلایەن کۆمپانیایەکی ئەمریکاییەوە بە ڕێککەوتنی ڕاستەوخۆ لەگەڵ کوردی عێراق بەرهەم بهێندرێت[١٢٨٠]. بەڵام حکومەتی ئەمریکا لەم ماوەیەدا سیاسەتێکی جێگیری سەبارەت بە پرسی کورد لە عێراقدا پیادە دەکرد، کە بریتی بوو لە خۆتێهەڵنەقورتاندن لە پرسی کورد و لەگەڵ ئەوەشدا بابەتەکەی وەک کێشەیەکی نێوخۆیی سەیر دەکرد[١٢٨١].

هەرچەندە هیچ یەکێک لەهەوڵەکانی مستەفا بارزانی لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦٢-١٩٧٢) بۆ نزیک بوونەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرکەوتوو نەبوون[١٢٨٢]، بەڵام هەڵکشانی هەژموونی یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٧٢ لە

---

1277 - F. R. U. S, 1964–1968, VOLUME XXI, NEAR EAST REGION; ARABIAN PENINSULA, (Doc:172), Telegram from the Embassy in Iran to the Department of State, Tehran, April 12, 1965, p.348.

١٢٧٨ - شۆڕشی ئەیلوول لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا، ل٢٢٧.

1279 - F. R. U. S, 1961–1963, VOLUME XVIII, NEAR EAST, 1962–1963, (Doc:307), Memorandum from the Department of State Acting Executive Secretary (McKesson) to the President's Special Assistant for National Security Affairs (Bundy), Washington, August 6, 1963, p666.

1280 - F. R. U. S, 1964–1968, VOLUME XXI, NEAR EAST REGION; ARABIAN PENINSULA, (Doc:172), Telegram From the Embassy in Iran to the Department of State, Tehran, April 12, 1965,p.347.

1281 -U.S. RULES OUT AID TO REBELS IN IRAQ; Asserts Assistance to Kurds Would Be Interference, The New York Times, September 10, 1962, p. 14.

١٢٨٢- بۆ زانیاری زیاتر لەسەر هەوڵەکانی مستەفا بارزانی بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ شۆڕشی کورد بروانە: مەلا مستەفا بارزانی لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا، ل٥٤-١٨٠.

ڕۆژهەڵاتی ناوەراســـت، بەهۆی نزیکبوونەوەی لە عێراق، ئەم دەرفەتەی بۆ بارزانی رەخســاند، کە دەمێک بوو بەدوای دەگەڕا. لەبەرئەوەی ئەم بابەتە مەترســی گەورەی لەســـەر هاوپەیمان و دۆســـتەکانی ئەمریکا لەناوچەکە دروســـتکرد. وەک هێنری کیســنجەری یاریدەدەری ســەرۆکی ئەمریکا بۆ کاروباری ئاســایشــی نەتەوەیی و وەزیری دەرەوەی ئەم وڵاتە لە یاداشـــتەکانی خۆیدا باســـی دەکات و دەڵێت :" سەردانی سەرۆک وەزیرانی سۆڤیەت (ئەلکسی کوسجین) بۆ بەغدا لە نیسانی ١٩٧٢، پاڵی پێوەناین چاوخشاندنەوە بە سیاسەتی خۆتێهەڵنەقورتاندن لە پرسی کورد بکەین. بەتایبەتی دوای ئەوەی لە (٩ی نیســانی ١٩٧٢) ڕێککەوتننامەی دۆســتایەتی لەنێوان عێراق و ســـۆڤیەت ئەنجام درا، ئەو کاتە پێمان وابوو ئەگەر ئەمریکاش پشـــتیوانی کورد نەکات، ڕێککەوتنەکە جەخت لەسەر پێشکەشکردنی یارمەتی سەربازی گەورە لەلایەن سـۆڤیتەوە بۆ عێراق دەکاتەوە. بەو شـێوەیە عێراق هەنگاوی دەنا بۆ ئەوەی ببێتە هاوپەیمانێکی سەرەکی سۆڤیەت لەناوچەکە...لەم بارودۆخەدا سەرۆکی ئەمریکا نیسکون لە (٣٠-٣١ی ئایاری ١٩٧٢) سەردانی تارانی کرد"[١٢٨٣].

سەردانی سەرۆکی ئەمریکا بۆ تاران و گفتوگۆیەکانی لەگەڵ شای ئێران، بووە هۆی هێنانەدی ئەم ئامانجەی بارزانی هەوڵی بۆ دەدا، چونکە شـــای ئێران داوای لە نیکســون کرد، لە پاڵپشــتیکردنی کورد هاوکاری بکات، وەک کارتێکی فشــار لەدژی حکومەتی عێراق و هەژموونی سـۆڤیەت لەناوچەکە. لەبەرامبەردا ســەرۆکی ئەمریکا بەڵێنی بەشای ئێراندا، داواکاریەکەی جێ بەجێ بکات[١٢٨٤].

دوای ماوەیەکی کورت لەدیدارەکەی لەگەڵ ســـەرۆکی ئەمریکا، شـــای ئێران لە حوزەیرانی ١٩٧٢ داوای لە هێنری کیسنجەر کرد چاوی بکەوێ بە دوو لە نوێنەرانی بارزانی، بەئامانجی ڕێکخســـتنی پەیوەندییەکانی نێوان کورد و ئەمریکا. کیســـنجەر داواکاریەکەی شـــای ئێرانی قبوڵکرد و ئامادەیی نیشـــاندا پێشـــوازییان لێ بکات. بەو هۆیەوە لە (٣٠ی حوزەیرانی١٩٧٢) ئیدریس بارزانی و مەحمود عوسـمان سـەردانی

١٢٨٣ – هنري كيسنجر، م.س، ص٥١٢.

١٢٨٤ – م.ن، ص٥١٣.

واشنتنیان کرد و لەڕۆژی (١ی تەمموزی١٩٧٢) لەگەڵ سەرۆکی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکا (ریشارد هیڵمز) و هەروەها (ریشارد کینیدی) کۆبوونەوە[١٢٨٥].

نوێنەرانی ڕێبەری کورد مستەفا بارزانی، جارێکی دیکە داوای یارمەتی و هاوکاری حکومەتی ئەمریکایان کرد[١٢٨٦]. لەلای خۆیانەوە کاربەدەستانی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکاش بەڵێنی پشتگیریکردنی شۆڕشی کوردیاندا، بەمەرجی پاراستنی نهێنی پەیوەندیەکانیان[١٢٨٧].

دوای ماوەیەکی کورت لەسەردانی نوێنەرانی بارزانی بۆ واشنتن، سەرۆکی ئەمریکا لە (١ی ئابی ١٩٧٢) فەرمانی دەرکرد بە پێشکەشکردنی یارمەتی بە شۆڕشی کورد، کە بڕەکەی بۆ ساڵی دارایی (١٩٧٣) بە (٥) ملیۆن دۆلار دیاریکرابوو. بەشێوەیەک (٣) ملیۆن دۆلار وەک هاوکاری دارایی بۆ یەک ساڵ، بۆ هەر مانگێک (٢٥٠) هەزار دۆلار بە پارەی نەختینە دیاریکرا، لەگەڵ تەرخانکردنی بڕی (٢) ملیۆن دۆلار بۆ کرینی چەک و زەخیرەی جەنگی و دەرمان[١٢٨٨].

دوای تەنها چەند ڕۆژێک، یەکەم کاروانی یارمەتی حکومەتی ئەمریکا بۆ شۆڕشی کورد لە ڕێگەی کەناڵەکانی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA) کە (١٠٠٠) تەن بوو لە چەک و زەخیرەی جەنگی و دەرمان[١٢٨٩]، گەیشتنە فرۆکەخانەی

---

1285 - F. R. U. S ,1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc:319). Memorandum of Conversation, Washington Meetings with Kurdish Representatives, Washington, July 5, 1972, p2.

1286 - F. R. U. S ,1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc:319). Memorandum of Conversation, Washington Meetings with Kurdish Representatives, Washington, July 5, 1972, p2.

1287 - Aaron Latham, Introduction to the Pike Papers, the village Voice, Vol. XXI, No.7, (the weekly Newspapers of New York), February 16, 1976, p.85.

١٢٨٨ - هنري كيسنجر، م.س، ص٥١٤.

1289 - F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc:325). Memorandum from the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger) to President Nixon,

(میهرئاباد) لە ئێران و لە ڕێگەی دەزگای هەواڵگری نیشـــتمانی (ســـاواک) گەیەندرایە دەستی سـەرکردایەتی شـۆڕشـی کورد. ئەوە سـەرباری ئەوەی بەپێی نووسـراوێکی هێنری کیســــنجەر، بارزانی هەر لەم ماوەیەدا یەکەم بڕی یارمەتی دارایی مانگەکانی تەمموز و ئابی بەدەست گەیشت[١٢٩٠].

بەشـــێوەیەکی گشـــتی پاڵپشـــتی و یارمەتییەکانی حکومەتی ئەمریکا بەدرێژایی ســـــاڵەکانی (١٩٧٣، ١٩٧٤، ١٩٧٥) بەپێی زانیاریەکانی لە ڕاپۆرتی لیژنەی(بایک)ی ئەنجومەنی نوێنەران(کۆنگریس)ی ئەمریکادا هاتووە، گەیشـــتە نزیکەی (١٦) ملیۆن دۆلار، کە بۆ ئەم بارودۆخەی کورد تێیدا بوو زۆر ســـادە و ڕەمزی بوو[١٢٩١]. لەگەڵ ئەوەدا ئەمریکـا جگە لەم بڕە هـاوکـارییە، هیچ پـاڵپشـــتی لە پێشـــنیـاز و پڕۆژە سـیاسـییەکانی مسـتەفا بارزانی نەکرد، کە لەدوای سـەرهەڵدانەوەی شـەڕ لە نێوان حکومەتی عێراق و کورد لەســـاڵی ١٩٧٤ پێشـــکەشـــی کردن، لەنمونەی ئەمانەش پڕۆژەی ئۆتۆنۆمی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو. کە بارزانی وەک جێگرەوەیەک بۆ یاســای ئۆتۆنۆمی ســنوورداری حکومەتی عێراق لە ڕۆژی (١٨ی ئاداری ١٩٧٤) پێشـــکەشـــی حکومەتی ئێران و ئەمریکای کرد[١٢٩٢]. حکومەتی ئەمریکا نەک تەنها

---

Progress Report on the Kurdish Support Operations, Washington, October 5, 1972, p.1. سەبارەت بە بڕی یارمەتییەکانی ئەمریکا بۆ بارزانی ، بروانە پاشکۆی ژمارە (٢٦)

1290 - F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc:325). Memorandum from the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger) to President Nixon, Progress Report on the Kurdish Support Operations, Washington, October 5, 1972, p.1.

1291 - Aaron Latham, Introduction to the Pike Papers, the village Voice, Vol. XXI, No.7, (the weekly Newspapers of New York), February 16, 1976, p.84.

١٢٩٢ - لە (١٦ی نیسانی ١٩٧٤) ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA) دەقی ڕاگەیاننامەیەکی تێروتەسەلی ئۆتۆنۆمی پارتی دیموکراتی کوردستانی لە زمانی عەرەبییەوە کردوە بە ئینگلیزی کە لە (١١) لاپەرە پێکهاتووە و ناردویەتی بۆ هنري کیسنجەر ڕاوێژکاری سەرۆکی ئەمریکا بۆ کاروباری ئاسایشی نیشتمانی و وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و تێیدا ئاماژەی بەوە کردوە کە پارتی دیموکراتی کوردستان پلانی ئۆتۆنۆمی کوردستانی لە وەلامی پلانە ئۆتۆنۆمیەکەی دەولەتی عێراق بۆ کوردستان بڵاوکردۆتەوە. بروانە: شۆڕشی ئەیلوول لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا، ل٤٤٨.

پاڵپشـــتی پرۆژەکەی نەکرد، بەڵکو وەڵامێکی نائومێدکەری بە بارزانی گەیاند، دوای ئەوەی بەڕێوەبەری ئاژانســـی هەواڵگری ناوەندی(CIA) ژەنەراڵ (ســـکوکروفت) ، ڕاســـتەوخۆ نوســـراوێکی بۆ هێلمزی باڵیۆزی وڵاتەکەی لە تاران نووســـی و گوتی:" پلانی مەلا مســـتەفا بۆ دامەزراندنی جۆرێک لە حکومەتی ســـەربەخۆ، بارودۆخەکە هەڵدەکشـــێنێ بۆ ســـەرووی توانا نهێنییەکانمان بۆ بەشـــداریکردن بەشـــێوەیەکی ئامانجدار. داواکارییەکانی بارزانی دەمانخاتە دەرەوەی ســـنووری پرۆســـە نهێنییەکە، بەم شـــێوەیە پاراســـتنی نهێنی پرۆســـەکە مەحاڵ دەبێت و هاوســـەنگی هێز تێک دەچێت[١٢٩٣]. تەنانەت کیســـینجەر لە (١١ی نیســـانی ١٩٧٤) بۆ ســـەرۆکی ئەمریکای نووســـی:" پاڵپشـــتیکردنی دامەزراندنی حکومەتێکی جودا لەبەرژەوەندی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نییە"[١٢٩٤]. بێگومان لەم ڕوانینە سیاسییەی حکومەتی ئەمریکا بەرامبەر بەکورد ئەوە بەدەردەکەوێ، ئەم دەســـەڵاتە تەنها بەدوای پاراســـتنی بەرژەوەندیەکانی خۆی بووە و پرسی کورد شتێک نەبووە لە ئەجێندای ئەم وڵاتەبێ، هاوشـــێوەی زلهێزەکانی دیکەی ئەو ســـەردەمە. کە تەنها بۆ شـــەرعیەتدان بە دەســـتێوەردانیان لە کاروباری ناوخۆی وڵاتان بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندیەکانیان، باسیان لەبەرگریکردن لەمافی مرۆڤ و گەلانی چەوساوە دەکرد.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەتەنها نەبوو، کە بەپێی بەرژەوەندیەکانی خۆی، پەیوەندیەکانی لەگەڵ ســـەرکردایەتی کورد هەڵدەســـوڕاند، بەڵکو ســـەختتر لەوە بۆ کورد، هەڵویســـتی شـــای ئێران بوو، لەو کاتەی وڵاتەکەی تەنها دەروازە و پێگەی ســـیاســـی بەهێزی پاڵپشـــت و پشـــتیوان بوو لە شـــۆڕشـــی کورد، لەناکاو و لە پڕێکا لە کۆبوونەوەی (زیوریخ) لە شوباتی ١٩٧٥ لەگەڵ کیسنجەر وەزیری دەرەوەی ئەمریکا

1293 - F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, 244. Backchannel Message from the President’s Deputy Assistant for National Security Affairs (Scowcroft) to the Ambassador to Iran (Helms), Washington, March 26, 1974, pp.682,683.

1294 - F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, 246. Memorandum from the President’s Assistant for National Security Affairs (Kissinger) to President Nixon, Further Support for the Kurds in Iraq, Washington, April 11, 1974, p.687.

ڕایگەیاند، بڕیاریداوە چیتر پشتیوانی لە شۆڕشی کورد نەکات، لەبەرئەوەی هەوڵ هەیە لەگەڵ حکومەتی عێراق لەسەر پرسە هەڵپەسێردراوەکانی نێوانیان ڕێکبکەوێ[١٢٩٥].

کیسنجەر بێ ئەوەی سەنگێک بۆ پەیوەندی و پابەندییە سیاسییەکانیان لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی دابنێ، لەو کاتەی بارزانی لە (٢٢ی کانونی دووەمی١٩٧٥) نامەیەکی ئاراستەکرد بۆ ئەوەی ڕەزامەندیان وەربگرێ بۆ ڕەوانەکردنی نوێنەرێکیان بۆ واشنتن، بەمەبستی ڕوونکردنەوەی بارودۆخی شەڕی کورد و حکومەتی عێراق، لە ڕۆژی (٢٠ی شوباتی١٩٧٥) وەڵامی نامەکەی بارزانی دایەوە بەبێ ئاماژەکردن بەو مەترسیانەی چاوەڕوانی شۆڕشی کوردی دەکرد و بابەتی گفتوگۆکانی لەگەڵ شای ئێرانی بۆ بارزانی نەخستەڕوو، بەڵکو بە زمانی دۆستێکی متمانەپێکراو بۆ بارزانی نووسی:" دەمەوێ بزانیت ئێمە سەرسامین بە ئێوە و گەلەکەتان و بەو کۆششانەی ئەنجامی ئەدەیت. ئەو نارەحەتییەی ڕووبەڕووی بویتەوە ترسناک بوو، من ڕێز لە هەڵسەنگاندنت بۆ دۆخی سیاسی و سەربازی دەگرم، دەتوانی دڵنیابیتەوە، کە بەهۆی گرنگی ئێوە، نامەکانت ئەوپەڕی گرنگیان پێ دەدرێ لە بەرزترین ئاستدا لەلایەن حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا "[١٢٩٦]. ئەمەش جۆرێک لە فریودان بوو، گونجاو نەبوو بۆ کەسایەتییەکی سیاسی لە نمونەی وەزیری دەرەوەی وڵاتێکی وەک ئەمریکا، کە هەمیشە بانگەشەی مافی مرۆڤ و دیموکراتیەتی دەکرد، سەبارەت بەم بابەتەش لەدوای دەرچوونی ڕاپۆرتی لیژنەی پایک، لە کۆنگریسی ئەمریکا رەخنەی توند ئاراستەی کیسنجەر کرا، بەڵام ئەوەی دوایی لە کاتی بەرگیرکردن لەخۆی گوتی:" نابێ پڕۆسەی نهێنی و کاری خێرخوازی تێکەڵ بە یەکتری بکرێت"[١٢٩٧].

دواجار بەرێککەوتنی عێراق و ئێران لە (٦ی ئاداری١٩٧٥) لە جەزائیر[١٢٩٨]، کۆتایی بەو پەیوەندییە کورتەی نێوان بارزانی و حکومەتی ئەمریکا هات، دوای دەستبەگرتنی کاربەدەستانی کۆشکی سپی لە پێشکەشکردنی هاوکاری و یارمەتییەکانیان بۆ کورد، سەرباری چەندین بانگەوازی بارزانی بۆ سەرنج ڕاکێشانی

---

١٢٩٥ – هنري كيسنجر، م.س، ص٥٢٢.

١٢٩٦ – م.ن،ص٥٢٣.

١٢٩٧ – شۆڕشی ئەیلوول لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا، ل١٠٨.

1298 –David A. Korn, op.cit.

حکومەتی ئەمریکا بۆ دۆخی نارەحەت و سەختی گەلی کورد لە عێراق، کە لەئەنجامی لێکەوتەکانی ڕێککەوتنامەی جەزائیر ڕووبەڕووی بوونەوە[١٢٩٩]. بەو هۆیەوە لەدوای بێ ئومێدبوونی بارزانی لە وەڵامدانەوەی بانگەوازەکانی، لە (١٨ی ئاداری١٩٧٥) بڕیاری ڕاگرتنی شەڕی دەرکرد. پاشان خۆی و هێزەکەی و بەشێکی زۆری ئەم خەڵکەی گەیشتبوونە سەر سنوور، پەڕینەوە ئێران[١٣٠٠]. دوای ماوەیەک بەهۆی نەخۆشکەوتنی، بەمەبستی وەرگرتنی چارەسەری، ڕوویکردە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا[١٣٠١].

دوای ڕێککەوتنامەی جەزائیری ١٩٧٥، ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا، زانیاری لەسەر پەیوەندییە نهێنییەکانی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA) و کۆشکی سپی بەتایبەتی کیسنجەر پێ گەیشت و بەو هۆیەوە بڕیاریدا لەسەر پێکهێنانی لیژنەیەک بەسەرۆکایەتی (ئۆتیس پایکOtis G. Pike)[١٣٠٢] ی نوێنەری دیموکراتەکان لە نیویۆرک. لیژنەکە لە (١٩ی کانونی دووەمی١٩٧٦) ڕاپۆرتی خۆی پێشکەشی کۆنگریس کرد و پەردەی ڕامالّی لەسەر شێوەی ئەو پەیوەندییانە و ڕەخنەی توندی لە کاربەدەستانی کۆشکی سپی گرت لەسەر ئەم پرسانەی پەیوەندییان هەبوو بەکاری نهێنی. بەتایبەتی لەم دەقەی تایبەت کرابوو بە پەیوەندیەکانیان لەگەڵ سەرکردایەتی کورد. لیژنەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد:" ئەوانەی چەک و پارەیان لە ئەمریکا وەردەگرت[مەبەستی کوردەکانە] ، کۆمەڵێکی ئیتنیکی ڕاپەریو بوون بۆ ئۆتۆنۆمی شەڕیان دەکرد لە وڵاتێکدا[مەبەستی عێراقە] کە هاوسنووری وڵاتێکی هاوپەیمانمان بوو[مەبەستی ئێرانە]... ئەو بەڵگانە کە لەدەستی کۆمیتەدان، بەڕوونی دەریدەخەن سەرۆک کۆمار و دکتۆر کیسنجەر و وەزارەتی دەرەوە هیوای

---

١٢٩٩ – بریان ڕۆبەرت گیبسن، س.پ، ل٣٠.

1300 –" LA GUERRE EST FINIE AU KURDISTAN ", DÉCLARE LE GÉNÉRAL BARZANI, Le Monde, 24 mars 1975.

1301 –David A. Korn, op.cit.

١٣٠٢ – ئۆتیس جی پایک(١٩٢١–٢٠١٤) :ساڵی ١٩٦٠ بۆتە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران(کۆنگریس)ی ئەمریکا لەسەر پشکی دیموکراتەکان. بۆ ماوەی (١٨) ساڵ لەم ئەنجومەنە ماوەتەوە. ساڵی ١٩٧٥ سەرۆکایەتی لیژنەی لێکۆلینەوەی کۆنگریسی کردوە لەسەر پرسی پەیوەندیە نهێنیەکانی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی ئەمریکا(CIA). N. R. Kleinfield, Otis G. Pike, 92, Dies; Long Island Congressman Took On C.I.A, The New York Times, Jan. 20, 2014.

سـەرکەوتنی کوردەکانیان نەدەخواست. ئەوان پێیان باشـتر بوو کوردە ڕاپەڕیوەکان تەنها تا ئەو ئاســـتە بەهێزبن، کە دژایەتی (عێراق) بکەن و ســــەرچاوەکانی وڵاتی (عێراق) بەفیرۆ بدەن، کە دراوســـێی هاوپەیمانەکەمان بوو. ئەو ســـیاســـەتەی ئێمە تەنانەت لە چوارچێوەی پرۆســـەی نهێنیشـــدا کاریگەری باش نەبوو"[١٣٠٣]. ئەمەش دانپێدادانێکی فەرمی بوو لە دامەزراوەیەکی باڵای ئەمریکا لەسـەر پێشـێلکردنی بنەما سیاسییەکانی پەیوەندییە نادەوڵەتیەکانی ئەم وڵاتە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهان بەگشتی.

دوای کەمتر لە مانگێک بەدیاریکراویش لە ڕۆژی (٢٥ی کانونی دووەمی ١٩٧٦) ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمزی ئەمریکی دەســتی گەیشــتە هەندێک لەو زانیارییانەی لە ڕاپۆرتی لیژنەی پایکدا هاتبوو، لەمانەش ڕۆژنامەکە بەر لەبڵاوبوونەوەی ڕاپۆرتەکە لە بابەتێکیدا بە نـاوونیشـــانی(ڕاپەڕیوە کوردەکان لە عێراق (٣) مـافوریـان داوەتە کیسنجەر)، ئاشکرای کرد کە:" ڕێبەری کورد مستەفا بارزانی (٣) ڕایەخی ڕۆژهەڵاتی بۆ کیسـنجەر و ملوانکەیەکی زێری بۆ خێزانەکەی (نانسـی کیسـنجەر) ڕەوانەکردووە بەبۆنەی پرۆســەی هاوســەرگیریان"[١٣٠٤]. ئەم زانیارییەش بەئامانجی ناشــرینکردنی کیســـنجەر و کارە نایاســـاییەکانی بڵاوکرایەوە، هەرچەندە بارزانی لەچوارچێوەی نەریتە کۆمەڵایەتییەکانی نێو کۆمەڵگەی کوردەواری ئەم هەڵوێستەی نواندووە.

لەلایەکی دیکە ڕۆژنامەنووســـی ئەمریکی (ویلیام ســـافیر) دوای چەند ڕۆژێکی کەم، زانیاری نهێنی زیاتری لەســـەر ڕاپۆرتەکە بەدەســـت گەیشـــت و لەڕۆژی(٥ی شـــوباتی١٩٧٦) بابەتێکی بەناوونیشـــانی ( فرۆشـــتنی نهێنی فۆرد) لە ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز بڵاوکردەوە و تیایدا دەڵێت:" یەکێک لەبەشـــەکانی ڕاپۆرتی لیژنەی پایک، کە تاکو ئێســـتاکە نهێنیە، دوو دڵی دروســـت دەکات بەشـــێوەیەکی تایبەت بۆ کۆشـکی سـپی، ئەمیش ئاشـکرابوونی کاری شـەرمەزارکەرانەیە، پێویسـتە سـەرۆک فۆرد بەرپرسـیارەتی خیانەتکردن لە گەلی کورد هەڵبگرێ...لە فرۆشـتنێکی نا مەعقول ســـەرۆک فۆرد لەســـەر بنەمای ئامۆژگاری وەزیری دەرەوە هێنری کیســـینجەر ،

---

1303 – Aaron Latham, Aaron Latham, Report The President Does Not Want You to Read, Introduction to the Pike Papers, the village Voice, Vol. XXI, No.7، February 16, 1976, p.84.

1304 –Kurdish Rebels in Iraq Gave Three Rugs to Kissinger, The New York Times, Jan. 26, 1976, P.14.

بانگەوازی هاوکاری ژەنەراڵ مستەفا بارزانی ڕێبەری کوردی فەرامۆشکرد، دوای ئەوەی شای ئێران پاڵپشتی خۆی بۆ کورد ڕاگرت"[١٣٠٥]. بەم شێوەیە سافیر دەرگای ڕەخنە و تانەگرتنی ڕۆژنامەنووسان و ڕای گشتی ئەمریکای بەڕووی کاربەدەستانی کۆشکی سپی کردەوە. بەو هۆیەوە ڕۆژنامەنووسان بەدوای ئاشکراکردنی تەواوی زانیارییەکانی ئەم ڕاپۆرتە کەوتن، تاکو دواجار (ئارون لاسام) بەشێکی زانیارییەکانی ئەم ڕاپۆرتەی دەستکەوت و لەڕۆژنامەی (The Village Voice) لە (١٦ی شوباتی ١٩٧٦) بەناوونیشانی( ڕاپۆرتی ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی کە سەرۆک نایەوێ تۆ بیخوێنیتەوە- The CIA Report The President Does not Want You To Read) بڵاوکردەوە. ڕۆژنامەنووسەکە بەپشت بەستن بەزانیارییەکانی لە ڕاپۆرتی لیژنەی بایکدا هاتبوو، ئاماژەی بەوە کرد:" ئەمریکا بەنهێنی یارمەتی کوردی داوە و پاشان بە شێوەیەکی پڕ لە شەرمەزارانە وازی لێهێناون"[١٣٠٦].

دوای بڵاوبوونەوەی ڕاپۆرتەکەی (لیژنەی پایک)، بارزانی لە حوزەیرانی ١٩٧٦ بۆ جاری دووەم بەمەبەستی چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی گەڕایەوە ئەمریکا[١٣٠٧]. لەم ماوەیەدا لەژێر چاودێرییەکی توندی دەزگاکانی ئاسایشی ئەمریکادا بوو، بەڵام دوای ئەوەی زانیاری بڵاوبوونەوەی ڕاپۆرتی پایکی پێ گەیشت، هەوڵیدا سوود لە چەند کەسایەتییەکی سیاسی وەربگرێ کە دۆست و نزیکی بوون و ئەندامی ئەنجوومەنی پیران و نوێنەران(کۆنگریس)ی ئەمریکا بوون، لەمانەش (هێنری سکووپ جەکسون)[١٣٠٨] کە نوێنەری ویلایەتی واشنتن بوو لە ئەنجوومەنی پیران

1305 -William Safire, The New York Times, Mr. Ford's Secret Sellout, Feb. 5, 1976, p26.

1306 - Aaron Latham, Report The President Does Not Want You to Read, Introduction to the Pike Papers, the village Voice, Vol. XXI, No.7, February 16, 1976, p.85.

١٣٠٧ - شۆڕشی ئەیلوول لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا، ل١١٣.

١٣٠٨ - سیناتۆر هنري جەکسون، کەسایەتییەکی بەناوبانگ و کاریگەری گۆڕەپانی سیاسی ئەمریکا بوو کە دۆستی کورد و مەلا مستەفا بارزانی بوو. جەکسۆن ساڵی ١٩٤١ تا ١٩٥٣ نوێنەری هەرێمی ٢ی واشنتن بوو لەئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمریکا و ساڵی ١٩٥٣تا ١٩٨٣ نوێنەری واشنتن بوو لەئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا. جەکسۆن ساڵی ١٩٧٢ و جارێکی دیکە لە ١٩٧٦ لەلایەن پارتی دیموکراتەوە بۆ هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری ئەمریکا کاندید کرا بەڵام هەڵبژاردنەکانی دۆڕاند. لە ئەیلولی ١٩٨٣ مردووە. هـس، ل١٠٢.

لەسەر لیستی پارتی دیموکرات و کەسایەتییەکی پارێزگاری دەستڕۆیشتوو بوو، هەروەها (جۆرج مینی)[١٣٠٩] سەرۆکی (AFL-CIO)[١٣١٠] و دوو لە ئەندامانی کۆنگریس، کە (پرۆکسمایێر)[١٣١١]و (ستیڤان سۆلارز) بوون . بۆ ئەوەی دەنگی خۆی بگەیەنێتە ڕای گشتی و نێوەندی سیاسی و کۆشکی سپی، لەپێناو دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەک بۆ هەموو ئەو ئاوارە کوردانەی بەهۆی کۆتاییهاتنی شۆڕشی کورد ڕوویان لە ئێران کردبوو. سەرباری خواستی بەشێکیان بۆ وەرگرتنی مافی پەناهەندەیی لەئەمریکا[١٣١٢]. لەگەڵ ئەوەشدا، بارزانی مەبەستی بوو فشاری سیاسی لەسەر حکومەتی ئەمریکا دروست بکات بۆ چاوخشاندنەوە بە سیاسەتەکانیان بەرامبەر بە کورد[١٣١٣].

ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمزی ئەمریکی لە (٣١ی تەممووزی١٩٧٦) لەبارەی ئەم هەوڵانەی مەلا مستەفا بارزانی لەئەمریکا ئەنجامی ئەدا نووسیویەتی:" ئەم هەفتەیە مستەفا بارزانی بەدوای بەدەستهێنانی پاڵپشتی ئەمریکا بوو. بارزانی سکاڵای ئەوەی کرد، دەسەڵاتدارانی ئێران و ئەمریکا کۆت و بەندی زۆریان لەبەردەم داناوە بۆ تێکەڵبوونەوە بە چالاکی سیاسی گشتی. بارزانی ئەمەی لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنی بە سیناتور (ریتشارد ستونRichard Stone) گوت کە نوێنەری دیموکراتەکان بوو لە فلۆریدا. (ستون) بۆ ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز ئەوەی ڕوونکردۆتەوە، پەیوەندییە

---

١٣٠٩ - جۆرج مینی: کەسایەتی کاریگەر و ناوداری گۆرەپانی سیاسی و ئابووری ئەمریکا بوو کە لەساڵی ١٩٥٥ تا ١٩٧٩ سکرتێری رێکخراوی (AFL-CIO) بوو کە گەورەترین رێکخراوی پیشەیی ئەمریکا بوو. لە (١٠ی کانونی دووەمی ١٩٨٠) مردووە. هـس، ل١٠٢.

١٣١٠ - AFL-CLO: ئەم رێکخراوە لەساڵی ١٩٥٥ دامەزراوە و لەساڵی ٢٠٠٨ نزیکەی (١١) ملیۆن کرێکار و (٥٥) ڕێکخراوی یەکێتی پیشەیی ئەندامی ئەو رێکخراوە بوونە جۆرج مینی، دۆستی مەلا مستەفا بارزانی و دۆزی کورد، یەکەم سکرتێری ئەو رێکخراوە بووە. بۆ زانیاری زیاتر بروانە: شۆڕشی ئەیلوول لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا، ل١٠٢.

١٣١١ - سناتور ئیدوارد ویلیام پرۆکسمایێر ساڵی (١٩٥٧-١٩٨٩) نوێنەری ڤیسکانسێن بوو لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا و چەند جار لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا کێشەی کوردی لە ئەنجومەنی پیران خستەڕوو. بۆ زانیاری زیاتر، بروانە: هـس، ل١١٥.

١٣١٢ - هـس، ل١٠٢.

1313 - hakan Özoğlu, Molla Mustafa BarzanI in The usa 1975–1979, University of Central Florida, United States, The Copernicus Journal of Political Studies, No. 2 (4), ISSN 2299-4335, 2013, p.203.

تەلەفۆنییەکەی لەگەڵ ژەنەراڵ بـارزانی دوو کـاتژمێری خـایـانـدووە، بـارزانی لەم پەیوەندییەدا داوایکرد، ئەمریکا فشـــار بخـاتە ســـەر دەســـەڵاتدارانی عێراق بۆ مســـۆگەرکردنی رەفتاری گونجاو لەگەڵ ئەم دوو ملیۆن کوردەی لە عێراق بوون. هەروەها بارزانی ئاماژەی بەوە کرد، هەســت بە دوو دڵی دەکات لەوەی عێراقییەکان بە زۆرە ملێ بەشـێک لە کوردەکانیان بۆ باشـووری عێراق ڕاگواسـتووە. لە درێژەی چالاکییەکانیشـــدا لە ئەمریکا بارزانی چاوی بە (هێنری م. جاکســـون Henry M. Jackson) نوێنەری دیموکراتییەکان لە واشـــنتن کەوت لەگەڵ ژمارەیەکی دیکە لە ئەندامانی کۆنگریس. هەروەها بارزانی گفتوگۆی لەگەڵ (دیل دی هان Dale De Haan) و (ئیدوارد . ئم کینیدیEdward M. Kennedy) بەڕێوەبەر و ئەندامی گروپی لیژنەی لاوەکی پەنابەران لە کۆنگریس کەوت و ســـەبارەت بە پەناهەندە کوردەکان گفتوگۆی لەگەڵ کردن. (دی هان) بە بارزانی ڕاگەیاند، حکومەتی ئەمریکا ڕەزامەندی دەربڕیوە لەســەر وەرگرتنی (١٠٠٠) کورد وەک پەناهەندە بەپێی یاســای کۆچبەران و تـا ئێســـتـاکەش ژمـارەی ئەوانەی گەیشـــتونەتە ئەمریکـا و مـافی پەناهەندەییان وەرگرتوە (٤٠٠) کەس دەبن[١٣١٤]. ئەم هەواڵە بۆ بارزانی دڵخۆشـــکەر بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا هەوڵیدا زیاتر ســـوود لەپەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ کەســـایەتییە دیارەکانی ئەمریکا وەربگرێ. لەم نێوەندەدا لەبەهاری ١٩٧٧ خاتوو (ڕۆبێرتـا کۆهینRoberta Cohen) بەڕێوەبەری کۆمەڵەی نێودەوڵەتی مـافی مرۆڤ، مەلا مستەفا بارزانی بانگهێشتی نووسینگەکەی کرد لە نیویۆرک. کۆهین لەوە نیگەران بوو وەزارەتی دەرەوە مـافی بـارزانی بۆ قســـەکردن لەگەڵ میـدیـاکـان پێشـــێلکردووە. بەو هۆیەوە کۆمەڵێک پەیامنێری هێنایە ژوورەکەی خۆی بۆ ئەوەی گوێیان لە قسەکانی جەنگاوەرە پیرە کوردەکە بێت"[١٣١٥].

لەلایەکی دیکە ولیام سـافیری ڕۆژنامەنووسـی ئەمریکی لە هاوینی سـاڵی ١٩٧٧ لەماڵی کۆلۆنێل ( ریتشـــارد کینیدی-Richard Kennedy ) چاوی بە بارزانی کەوت. سافیر دوای دیدارێکی کورتی لەگەڵ بارزانی وتارێکی بەناوونیشانی ( لەنێوان کوردەکان و هێنری کیســـینجەر و کارتەر و ویژدان) لە ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز

---

1314 – Bernard Gwertzman, Leader of Kurdish Rebels Quietly Seeking Support from the U.S., The New York Times, July 31, 1976, P.4.
1315 –David A. Korn, op.cit.

بڵاوکردەوە و لە بەشـــێکی ئەم وتارەدا نووســـیویەتی:" کێ بەرپرســـیارە لەم سوکایەتیکردنەی بە متمانەی ئەمریکییەکان کراوە. نەتەوەیەک کە تەنها ویستوویەتی بە زمانی خۆی قسە بکات و پەیڕەوی نەریتە کولتوورییەکانی بکات، وەک هەرێمێکی ئۆتۆنۆمی لەژێر ئاڵای عێراقدابێ، چی ڕەوایە بە شـێوەیەکی سـیسـتماتیک لە ڕەگەوە هەڵکەندراوە و بڵاوەیان پێکراوە... ڕۆژنامەنووســـەکە لە کۆتاییدا نووســـیویەتی مەلا مستەفا ئێستا لە ئەمریکایە، تەمەنی ٧٥ ساڵە و نەخۆشە. هەوڵئەدات سەرنجی کارتەر ڕابکێشـــێ بۆ نەگبەتی گەلەکەی و کاردەکات بۆ شـــەرمەزارکردنی تاوانەکانی عێراق لەبەردەم ڕای گشـــتی جیهانی، لەو ماوەیەدا بارزانی داوای لەســـەرۆکی ئەمریکا کردووە باسی گەلەکەی لەلای شای ئێران بکات، بەڵام کارتەر سەرقاڵە بە گوتاردان لەسـەر مافەکانی مرۆڤ"[١٣١٦]. سـافیر بەم توانجە هەوڵیداوە گوزراشـت لەسـیاسـەتی نادروستی حکومەتەکەیان بەرامبەر بە گەلانی چەوساوە بکات.

مستەفا بارزانی وێڕای هەوڵ و کۆششێکی زۆر بۆ ئاگادارکردنەوەی ڕای گشتی جیهان بەتایبەتی ئەمریکا بە پرســـی کورد و پێویســـتی ئەم گەلە بە کۆمەکردنی بۆ ڕزگاربوون لەم دۆخە هەســـتیارە ســیاســییەی ڕووبەڕووی ببویەوە، بەڵام نەیتوانی پەیژی بەرژەوەندییە سـیاسـی و ئابوورییەکانی ئەمریکا ببڕێت، کە ڕێگری گەورەیان لەبەردەم ئامانجە سیاسیەکانی دروستکردبوو. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو ئالانگەریانەی لەبەردەمیدا هەبوون نائومێد نەبوو، لە بەدەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆیی، بۆیە تا دوا ســـاتەکانی تەمەنی لەگەڵ دۆزی گەلەکەیدا مایەوە، وەک ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز لە ڕاگەیاندنی هەواڵی کۆچی دوایی ئەو ڕێبەرەدا نووســـیویەتی:" دوو کاتژمێر بەر لەمردنی ژەنەراڵ بارزانی، پەرستیارە ئەمریکیەکەی لەلای بوو، خەریکی ئەوەبوو لەسەرەمەرگیدا هەندێک خواردنی پێ بدات، کەچی بارزانی باسی دۆخ و دۆزی گەلی کوردی بۆ دەکرد، تا ئەوساتەی لە کاتژمێر (٥)ی ئێوارەدا گیانی لەدەستدا"[١٣١٧].

## تەوەری سێیەم: پەیوەندی بارزانی لەگەڵ دەوڵەتی ئیسرائیل

هەندێ لە ســـەرچاوە مێژووییەکان پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە لەمێژینەکانی مەلا مســـتەفا بارزانی لەگەڵ چەند خانەوادەیەکی جووی دانیشـــتووی کوردســـتان تێکەڵ

1316 –William Safire, Of Kurds and Kissinger, p.31.

1317 – Sven Simon, op.cit, p.13.

بەپەیوەندییە سیاسی و سەربازییەکانی شۆڕشی کورد لەگەڵ دەوڵەتی ئیسرائیل دەکەن[١٣١٨]، مەبەستیشیان ئەو پەیوەندییانەی بارزانییە لەگەڵ خانەوادەی هەریەک لە ( موشی بنیامین[١٣١٩]، میخائیل میخائیلی[١٣٢٠]، خواجا خنو[١٣٢١])، کە لەبنجدا دەگەڕێتەوە بۆ کولتووری پێکەوە ژیان و یەکتری قبوڵکردن، کە وەک بنەمایەکی ئایدۆلۆژی ئایینی لە ڕوانگەی مرۆڤ دۆستی، هەم شێخانی بارزان هەم گەلی کورد بەگشتی باوەڕیان پێ هەبووە[١٣٢٢].

بێگومان پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە دێرینەکانی نێوان کورد و جووەکانی کوردستان، تا ڕادەیەک کاریگەریی لەسەر نزیکبونەوەی حکومەتی ئیسرائیل هەبووە لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد، لەبەرئەوەی جووەکانی کوردستان دوای ئەوەی کۆچیان کرد بۆ ئیسرائیل لەدوای ساڵی ١٩٤٨ بەدواوە، جۆرێک لە پابەندییان هەبوو بەو پەیوەندییانە و توانیان وێنای چەوساندنەوەی گەلی کورد بکەن لەسەر دەستی حکومەتە عێراقییەکان، ئەمەش هاوسۆزییەکی لە ڕووی مرۆییەوە لەلای

---

1318-Michael Gunter. Rutledge Handbook …, p.236.

١٣١٩ - ئەم خێزانە لەگەڵ چەند خێزانێکی دیکەی جوو لە ناوچەی سەرکانی و مێرگەسۆر نیشتەجێ بوون کە ناوچەی هەژموونی بارزانییەکان بوو. بە چالاکی بازرگانی بەناوبانگ بوون. پەیوەندی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی هەبوو. مردخای زاکن، یهود کردستان و رؤسائهم القبليون، ت: د. سعاد محمد خضر، منشورات بنکەی ژین، السليمانية، ٢٠١١، ص٢٦٦.

١٣٢٠ - ئەم خێزانە لەناوچەی ئاکرێ نیشتەجێ بوون، پاشان چونەتە شاری شنۆ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. گەورەی ئەم خێزانە کە (میخائیل) بووە، ڕۆڵی گەورەی گێڕاوە لە پاڵپشتیکردنی مەلا مستەفای بارزانی لەڕووی سیاسی و ئابووری و لۆجستی. لەبەرامبەردا مەلا مستەفا پارێزگاری لە خۆی و خێزان و بەرژەوەندیەکانیان کردوە. م.ن، ص ٩٢-٩٤.

١٣٢١ - بەشێک لە پێکهاتەی جووەکان لە سنووری قەزای ئاکرێ ژیاون، کە بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ی حکومەتی عێراقی بەگشتی لە سنووری قەزایەکە نزیکەی (١٠٠٤) کەس بوون. لە مەڵبەندی قەزا ژمارەیان(٤٧٢) کەس بووە. بنەماڵەی خواجا خنو یەکێک بوونە لەوانەی لەنێو مەڵبەندی قەزای ئاکرێ ژیاون. ئەم خێزانە پێگەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری بەرزیان هەبووە لە ئاکرێ و ناوچەکانی دەوروبەری. دوای مردنی (یاهو خواجە خنو) لەساڵی ١٩٤٣ کە لەپەیوەندیەکی بەهێز بوو لەگەڵ بارزانی، کوڕەکانی بەردەوامیان بەم پەیوەندییە داوە لەمانەش (داود) کە لەئیسرائیل بە (دیڤید) ناسرا دواتر. لەگەڵ (ئیسحاق)ی برای، ئەمیش لەساڵی ١٩٧٦ مردوە. م.ن، ص ٩٤.

١٣٢٢ - د. محمود محمد محمود زايد، سياسة ملا مصطفى البارزاني تجاه يهود كردستان(١٩٤٣-١٩٧٩)، مجلة كلية اللغة العربية ، ع(٣٤)، القاهرة، ٢٠٢١، ص٢٩٨٩.

گەلی ئیسرائیل بەگشتی دروستکرد بەرامبەر بە دۆزی کورد لە عێراقدا، لەسەر ئەم بنەمایە ڕۆژنامەنووسی جوو (ئیتسحاق بن حوران) لە بابەتێکدا بەناوونیشانی (سەردانێکی نهێنی) لەڕۆژنامەی (مەعاریف)ی ئیسرائیلی دەڵێت:" هاوکارییە سەربازییەکانی ئیسرائیل بۆ کورد جگە لە هۆکارە سیاسییەکانی، پاڵنەری مرۆیی هەبوو"[١٣٢٣].

ئەم فاکتەرە ئەو کاتە ڕوونتر خۆی نیشان ئەدات، کاتێک ژمارەیەک لەخەڵکە جووەکانی لە پێشتر دانیشتووی کوردستان بوون، لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی کورد لە عێراقدا، لە هەندێ ناوچەی ئیسرائیل هەوڵیاندا حکومەتەکەیان هانبدەن پاڵپشتی و هاوکاری بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کورد بکات. وەک ئەو هەواڵەی یەکێک لە ڕۆژنامە ئیسرائیلییەکان بڵاویکردۆتەوە کە :" کوردەکانی قودس و تەبریا و (٣٥) لادێی دیکە، لە ساڵی١٩٦٢ لیژنەیەکیان بۆ داکۆکیکردن لە پرسی کورد بەناوی (بازنەی تاراوگەنشینانی کوردستان) پێکهێنا، داوایان لە حکومەتی ئیسرائیل کرد پشتگیری شۆڕشی کورد بکات"[١٣٢٤]. لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانین بڵێین، جووەکانی کوردستان لە ئیسرائیل تا ڕاددەیەک ڕۆڵیان لە دامەزراندنی پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و حکومەتی ئیسرائیلی هەبووە .

سەرباری ئەوە، پەیوەندییەکانی نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و حکومەتی ئیسرائیل پاڵنەر و هۆکاری سیاسی لە پشت بووە، ئەوەی پەیوەندی هەیە بە بەرژەوەندیە سیاسییەکانی ئیسرائیل، ئەفسەرێکی هەواڵگرییان بەناوی (تسوری ساغی)[١٣٢٥] کە بەشێکی کاتەکانی خزمەتی سەربازی لەگەڵ هێزی پێشمەرگەی کوردستان بووە لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦٥-١٩٧٥) لە ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان، لەدیدارێکی ڕۆژنامەوانیدا باسی دەکات و دەڵێت :" بەهۆی نزیکبوونەوەی

---

١٣٢٣ - ئیتزاک بن هۆران، سەردانی نهێنی، مەعاریفی ئیسرائیلی(ڕۆژنامە)، ژمارە(١٢١٢٨)، ١١ی ئەیلوولی ١٩٨٧، ل ١١٤.

١٣٢٤ - کۆمیتەی ئیسرائیل بۆ خەباتی کورد، مەعاریف(ڕۆژنامە)، ژمارە (٥٨٤٩)، ٣١ی تشرینی یەکەمی١٩٦٣، ل ١٩.

١٣٢٥ - تسوری ساغی کوڕی مردخای وفروما شنکینی یەهودییە. لە (٤ی ئابی ١٩٣٤) لە هرتسلیا لە ئیسرائیل لەدایک بووە. لە ساڵی (١٩٥٢) چۆتە ریزەکانی سوپای ئیسرائیلی، ئێستا ماوەو بە پلەی ژەنەراڵ خانەنشینکراوە. لەساڵی ١٩٦٥ بەئەرکی ڕاوێژکاری و ڕاهێنانی هێزی پێشمەرگە هاتۆتە باشووری کوردستان. شائوول فیبر، تسوری ساگی( شەڕەکانی من و چیرۆکەکانی تر)، بیتح تکفا، ٢٠١٧، ل ٢٢.

عێراق و میسر و سوریا لە ساڵی ١٩٦٣ لە یەکتری و پاڵپشتیکردنیان لە حکومەتی عێراق بۆ بەدەستهێنانی ناوچەی (خۆزستان/ عەرەبستان) ی ئێران، کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی عەرەب بوون. لەکاتێکدا ئەم ناوچەیە دەوڵەمەند بوو بە نەوت، تەنانەت سەرچاوەی سەرەکی داهاتی ئێران بوو. لەدۆخێکدا کە حکومەتی ئێران هاوپەیمانی ئەمریکا و دۆستی نزیکی ئیسرائیل بوو. حکومەتی ئێرانی ناچارکرد سوود لە خواستی کوردەکان بۆ ئۆتۆنۆمی لە عێراقدا وەربگرێ لە ڕێگای پاڵپشتیکردنیان لە ڕووی سەربازییەوە بەهاوکاری هاوپەیمانەکانی، بۆ دوورخستنەوەی مەترسییەکانی حکومەتی عێراق لەسەر خۆزستان و سەرقاڵکردنیان بەشەڕی کوردەکان لە باکووری وڵاتەکەی. بەو هۆیەوە ئیسرائیل بۆ پاڵپشتیکردنی ئێرانییەکان، هەوڵی خۆنزیککردنەوەی لەسەرکردایەتی شۆڕشی کورددا. سەرباری ئەوەی ئیسرائیل مەبەستی بوو سوپای عێراق لەبەرەی شەڕی باکووری عێراق سەرقاڵ بکات، تاوەکو بەشداریکردنی لەشەڕی عەرەب دژ بە ئیسرائیل سنووردار بێ"[١٣٢٦]. لە ڕاستیدا ئەم هۆکارەی دوایی ڕۆڵی سەرەکی هەبوو لە هاندانی حکومەتی ئیسرائیل بۆ پشتیوانیکردنی شۆڕشی کورد، ئەوەتا سەرۆکی دەزگای ئاسایشی نیشتمانی(موساد) باسی ئەوە دەکات و دەڵێ:" پلانی ستراتیژی سیاسی ئەم حکومەتە، لاوازکردنی هەموو ئەو حکومەتە عەرەبیانە بوو لەناوچەکەدا هەبوون بەتایبەتی حکومەتی عێراق، کە بەشداربوو لەبەرەی شەڕی عەرەب لەدژی ئیسرائیل"[١٣٢٧].

سەبارەت بە بەرژەوەندییەکانی کورد لە دروستکردنی پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ حکومەتی ئیسرائیل، مەحمود عوسمان لەدیدارێکیدا لەگەڵ ڕۆژنامەنووسێکی عێراقی ئاماژەی پێدەکات و دەڵێت:" مەلا مستەفا بارزانی بڕوای وابوو دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل، هاریکاردەبێ بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دۆزی کورد، بەهۆی پەیوەندی بەهێزی ئیسرائیل لەگەڵ ئەم وڵاتە"[١٣٢٨]. بەڵام هەموو ئەمانە بەو مانایە نایەت کە پەیوەندییەکانی سەرکردایەتی

---

١٣٢٦ – یۆگا بالیکی، ژێرزەمینییەکانی کورد، موشاف (گۆڤار)، ژمارە(٨٣٠) ١٠ی نیسانی ٢٠١٤، ل٣١.
https://www.calameo.com/read/00334192491af9eb1dcb7

١٣٢٧ - یاسر ئۆگبی، کورد سەربەخۆیی دەوێت، مەعاریفی ئیسرائیلی (ئۆنلاین)، ٢٠١٧/٢٥/٠٩.
https://www.maariv.co.il/news/world/Article-600390

١٣٢٨ – فائق شيخ علي، محمود عثمان يكشف لـ(الوسط) القصة الكاملة للعلاقات الكردية الاسرائيلية، الوسط(مجلة)، ع(٢٩٨)، ١٢-١٩ تشرين الاول ١٩٩٧، ص٢٩.

کورد لەگەڵ حکومەتی ئیسرائیلی لەسەر ئاستی کەسی بووە. نەخێر، بەڵکو دروست ئەوەیە پەیوەندییەکە لەنێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد بەگشتی و حکومەتی ئیسرائیل بووە[١٣٢٩].

سەبارەت بە هەڵویستی مستەفا بارزانی لەبەرامبەر دەستپێشخەری ئیسرائیل بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی سیاسی و سەربازی لەگەڵ شۆڕشی کورد، نووسەرێکی عێراقی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە:" سیاسەتی حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق و ئەم شەڕە خوێناوییەی ڕووبەڕووی گەلی کورد ببویەوە و هاوکات گورزە بەئازارەکانی بەر گەلی کورد کەوت بەگشتی و بارزانییەکان بەشێوەیەکی تایبەتی، پاڵنەربوو بۆ مەلا مستەفای بارزانی بەدوای هاوپەیمان بگەڕێ بۆ ئەوەی پشتیوانی لە دۆزەکەی بکەن و پاڵپشتی هەوڵەکانی بن، بۆ ڕووبەرووبوونەوەی سیاسەتی حکومەتە عێراقییەکان. هاوکات چاوەڕوانکراو نەبوو ئەم هاوپەیمانی و پاڵپشتییە بۆ سیاسەتەکانی لەلای حکومەتە عەرەبییەکان بدۆزێتەوە، کە بەئاشکرا هەڵوێستی دژایەتیکردنی جوڵانەوەی کوردییان دەردەبڕی جگە لە میسر و لیبیا، کە هەڵوێستی وەک یەکیان هەبوو، بەڵام ئەمانیش تەنها لە دەربڕینی هاوسۆزی زیاتر سەبارەت بە جوڵانەوەی گەلی کورد، هیچ پاڵپشتییەکی کردارەکیان نەبوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەی لەگەڵ حکومەتی عێراق"[١٣٣٠]. لەسەر ئەم بنەمایە مێژوونووس جوناثان راندل پێی وایە:" پەیوەندی ئیسرائیل لەگەڵ شۆڕشی کورد بەلای مستەفا بارزانییەوە جێگەی بایەخ نەبووە، لەبەرئەوەی ئەگەر تەنها تروسکایەکی بچووکی هیوا هەبوایە، کە عەرەب هەندێک لەمافەکانیان پێ دەبەخشن، ئەو دەستبەرداری ئەم پەیوەندییە دەبوو"[١٣٣١].

دەکرێ بڵێین ئامانجی بارزانی لە پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل هەوڵ بووە بۆ دروستکردنی هاوسەنگی هێز، نەک دروستکردنی بەرەیەکی نەیار و دژ بەرامبەر بەعەرەب. بەپێچەوانەوە بارزانی سەرباری ئەوەی لاری نەبوو لەسەر خواستی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد بۆ پەیوەندی بەستن لەگەڵ ئیسرائیل، بەڵام دواتر دەبینین لەم شەڕ و ناکۆکیانەی عەرەب لەگەڵ ئیسرائیل، هەموو کات لەبەرەی

١٣٢٩ – صلاح الخرسان، م.س، ص١٥٥.

١٣٣٠ – د. كاظم حبيب، م.س، ص٣٦٣.

١٣٣١ – جوناثان راندل، م.س، ص٢٥١.

عەرەب و موسڵمانان دابووە و پشتگیری دۆزی گەلی فەلەستینی کردووە و تەنانەت لەدیدارێکی لەگەڵ کەسایەتی سیاسی لوبنانی کەمال جنبلات دەڵێت:" ئێمە هەمیشە حکومەتی عێراقمان ئاگادار کردۆتەوە لەسەر ئەوەی ئامادەین هەموو گەلی خۆمان بخەینە شەڕ لەپێناو فەلەستین"[١٣٣٢]. لەکاتێکدا بارزانی ئەم هەڵوێستەی لە دید و باوەڕێکی ئایینی سەرچاوەی گرتبوو وەک پاڵپشتیکار لەدۆزی گەلێکی موسڵمانی چەوساوە. بەڵام دید و هەڵوێستی عەرەب بەرامبەر بە پرسی کورد لە عێراق پێچەوانە و تەنانەت دژ بووە. سەرباری ئەمەش بارزانی بە کردار لە دوو بۆنەدا لەکاتی شەڕی عەرەب و ئیسرائیل لە ساڵەکانی ١٩٦٧ و١٩٧٣ لە نێو خەباتی ڕزگاریخوازی کوردیدا ئەم هەڵوێستەی خۆی بەرجەستەکرد، لەڕێگای ڕاگەیاندنی ئاگربەست لەبەرامبەر سوپای عێراق، بۆ ڕەخساندنی بوار و دەرفەت لەبەردەمیان بۆ بەشداریکردنیان لەپاراستنی خاکی عەرەب لەشەڕەکەیان دژی ئیسرائیل، کە لەدرێژەی ئەم بابەتەدا باسی دەکەین.

کامەران بەدرخان(١٨٩٥-١٩٧٨) یەکێک بووە لەو کەسایەتییە سیاسییە کوردانەی پەیوەندی باشی لەگەڵ کاربەدەستانی سیاسی ئیسرائیل هەبووە، لەپێناو ڕوونکردنەوە دۆزی کورد و داواکاری و پێداویستی بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کوردی لە باشووری کوردستان، لە (١ی نیسانی ١٩٦٣) سەردانی ئیسرائیلی کرد و لەگەڵ سەرۆکی حکومەت (دیڤید بن غوریون) و وەزیری دەرەوە(جولدا مائیر) و سەرۆکی ئەرکان (تسفی زامیر) و سەرۆکی ژووری هەواڵگری سەربازی(مائیر عمیت) کۆبویەوە، بەمەبەستی بەدەستهێنانی پاڵپشتی ئیسرائیل بۆ پرسی کورد[١٣٣٣].

سەرباری ئەم هەوڵە کەسییانەی بەدرخان ئەنجامی ئەدا، هاوکات کاریکردووە بۆ نزیککردنەوەی ئەندامانی سەرکردایەتی کورد لە کاربەدەستانی ئیسرائیلی و لەم سۆنگەوە لە حوزەیرانی ١٩٦٣ سوودی لە سەردانی جەلال تاڵەبانی بۆ پاریس وەرگرت و دیدارێکی بۆ ڕێکخست لەگەڵ شەمعون پێرس(١٩٢٣-٢٠١٦)ی بریکاری وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل[١٣٣٤]. هەرچەندە تاڵەبانی ڕەتیکردۆتەوە چاوی بە پێرس

---

١٣٣٢ – کردها، مشکل عراق، اطلاعات(روزنامه)، ش(١٤١٤١)، ٣ جولای ١٩٧٣، ص٦.

١٣٣٣ – شلومو نكديمون، الموساد في العراق و دول الجوار( انهيار الامال الاسرائيلية والكردية)،ت: بدر عقيلي، دار الجليل للنشر والدراسات والابحاث الفلسطينية، عمان، ١٩٩٧، ص٩٣.

١٣٣٤ – صلاح الخرسان، م.س، ص١٥٥.

کەوتبێ[١٣٣٥]، بەڵام مەحمود عوسـمان لەسـەر زاری کامەران بەدرخان ئەو زانیارییە دەگوازێتەوە، کە تاڵەبانی ئەم دیدارەی ئەنجامداوە[١٣٣٦]، تەنانەت مەسـعود بارزانیش هەمان زانیاری پشت ڕاست دەکاتەوە[١٣٣٧].

هەوڵەکانی بەدرخان بۆ نزیکبوونەوەی حکومەتی ئیسـرائیل لە دۆزی کورد، لەگەڵ ئامانج و ستراتیژی سیاسی ئیسرائیل یەکانگیربوو، بەو هۆیەوە حکومەتی ئیسـرائیل بڕیاریدا ئاستی پەیوەندییەکانی لەگەڵ شـۆڕشـی کورد بەرزبکاتەوە بۆ ئەنجامدانی پەیوەندی ڕاسـتەوخۆ لەگەڵ ڕێبەری کورد مسـتەفا بارزانی و سـەرکردایەتی شـۆڕش، نەک بە تەنها لەگەڵ کامەران بەدرخان. لەم سـۆنگەوە ئاژانسی یەهودی لە بەهاری ١٩٦٣ چالاکوانێکی خۆی لە شاری بەغدا بە ناوونیشانی ڕۆژنامەنووس بەناوی(سافر رؤوفين شيلواح) ڕەوانەی ناو چیاکانی کوردستان کرد بەمەبەستی دروسـتکردنی پەیوەندی لەگەڵ سـەرکردایەتی شـۆڕشـی کورد. لەم سـەردانەدا ناوبراو دوو دیداری لەگەڵ مسـتەفا بارزانی و ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان ئەنجامدا. لە دیدارەکانیدا دەستپێشخەریکرد بۆ ئەنجامدانی پەیوەندی لەنێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و حکومەتی ئیسرائیل و داوایکرد بارزانی نوێنەرێکی خۆی ڕەوانەی لای ئیسـرائیلیەکان بکات[١٣٣٨]. بەم شـێوەیە پەیوەندییەکانی سـەرکردایەتی کورد و حکومەتی ئیسـرائیل لەحوزەیرانی ١٩٦٣ دەستیان پێکرد[١٣٣٩]. بەڵام سەیر ئەوەیە دوای چەند ڕۆژێک بەدیاریکراویش لە (٢٥ی حوزەیرانی ١٩٦٣) حکومەتی عێراق زانیاری پێگەیشـت حکومەتی ئیسـرائیل هاوکاری جۆراوجۆری بە مەلا مسـتەفا بارزانی بەخشـیوە. بارزانی سـوودی لەم پروپاگەندەیە وەرگرت و ئەمەی بەدەرفەتێک زانی بۆ ئەوەی داوای هاوکاری و کۆمەکی لە حکومەتی ئیسـرائیل بکات. ئەو کاتە ئیبراهیم ئەحمەد لیسـتێکی داواکاری شۆڕشگێرانی کوردی ئامادەکرد و تیایدا داوای (١٠) هەزار تفەنگ و بازوکا و راجیما و مین و بۆمب و دەزگای پەیوەندی و پارەی کرد، هەروەها داوایکرد ئیسـرائیل هاوکاریێ بۆ ڕاهێنانی پێشـمەرگە لەسـەر تەقاندنەوەی مین و بەکارخسـتنی ئێزگەی

---

١٣٣٥ – مام جەلال دیداری تەمەن...، ل٢٥٧.

١٣٣٦ – فائق شيخ علي، م.س، ص٢٩.

١٣٣٧ –مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ...، ٢٠٢٠،ل٢١٤.

١٣٣٨ – جوناثان راندل، م.س، ص٢٥١.

١٣٣٩ –مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ...، ٢٠٢٠،ل٢١٤.

ڕادیۆیی. دوای گەیشـــتنی ئەم داواکارییانە لە (١٨ی تەممووزی١٩٦٣) یەکەم کاروانی چەکی ئیسرائیلی گەیشتە بارەگای سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لە حاجی ئۆمەران، کە بریتی بوو لە (١٠) تۆپی دوورهاوێژی بازوکا لەگەڵ زەخیرەکەی[١٣٤٠].

لەدوای کۆتاییهاتنی کۆنگرەی دامەزراندنی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستانی عێراق لە تشرینی یەکەمی ١٩٦٤، عیسمەت شەریف وانلی پێشنیازی بۆ بارزانی کرد، ڕێگەی بدات ســـەردانی ئیســـرائیل بکات بۆ بەدەســـتهێنانی پاڵپشـــتی ســـیاســـی و ســـەربازی. دوای ئەوەی مســـتەفا بارزانی لاری نەبوونی لەســـەر پێشـــنیازەکەی وانلی نیشـــاندا. ئەوەی دوایی لە (٢٤ی کانونی یەکەمی ١٩٦٤) بە نوێنەرایەتی شـۆڕش سـەردانی ئیسـرائیلی کرد و نامەیەکی مسـتەفا بارزانی لەگەڵ خۆیدا بۆ کاربەدەســـتانی ئەم وڵاتە برد[١٣٤١]، لە ســـەردانەکەیدا ناوبراو لەدوای ئەنجامدانی چەند دیدار و کۆبوونەوەیەک لەگەڵ بەشـێک لە لێپسـراوانی حکومەتی ئیســـرائیل لەمانەش ســـەرۆک وەزیران لیڤی ئەشـــکول (١٩٦٣-١٩٦٩) و جێگری وەزیری بەرگری (شـــەمعون پێرس) و چەند لێپســـراوێکی دیکەی ئیســـرائیل، چەند بابەتێکی خستەڕوو لەمانەش داواکاری بۆ ناردنی هاوکاری بۆ شۆڕشی کورد، وەک هاوکاری سەربازی لە دابینکردنی پێداویستیەکانی چەک بەتایبەتی تۆپ و ڕەشاشی قورس و هەروەها هاوکاری دارایی و دەرمان. وێڕای ئەوەی داوایکرد، حکومەتی ئیسرائیل هەوڵبدات پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ شۆڕشی کورد ببەستێت[١٣٤٢].

لەدوای ســـەردانەکەی وانلی، لیڤی ئەشـــکولی ســـەرۆک وەزیرانی ئیســـرائیل کۆبوونەوەیەکی بە ئامادەبوونی (غولدا مائیر)ی وەزیری دەرەوە و ژەنەراڵ (ئیسحاق رابین)ی ســـەرۆکی ئەرکانی ســـوپا و ژەنەراڵ (مائیر عەمیت) ســـەرۆکی مۆســـاد ئەنجامدا. لەم کۆبونەیەدا حکومەتی ئیســـرائیل بڕیاریدا، هاوکاری زیاتری ســـەربازی پێشـکەشـی شـۆڕشـی کورد بکات. لەدوای چەند ڕۆژێک فڕۆکەیەکی ئیسـرائیلی لە جۆری (ستارتوکروز) بڕێک چەکی بۆ شۆڕشی کورد هێنا، کە بریتی بوو لە (تفەنگ و بازوکا و بۆمب و مین)، کە بڕەکەی (٩) تەن دەبوو. فڕۆکەکە لە تاران نیشـــتەوە و

---

١٣٤٠ – جوناثان راندل، م.س، ص١٥٦.

١٣٤١ – شلومو نكديمون، م. س، ص١١٢.

١٣٤٢ – عصمت شريف وانلي، من مذكرات عصمت شريف وانلي، مؤسسة ژين، السليمانية، ٢٠١٤، ص٣٨.

هاوکارییەکان لەڕێگای دەزگای (ساواک)ەوە گواستەوە بۆ شۆڕشگێرانی کورد. ئەو کاتە مەلا مستەفا بارزانی بەنامەیەک وەڵامی هاوکارییەکەی حکومەتی ئیسرائیلی دایەوە و نووسی:" زۆربەی لایەنەکان بەڵێنیان پێداین چەکمان پێبدەن، بەڵام هیچیان نەکرد، تەنها ئیسرائیل بەڵێنیدا و بەڵێنەکەی جێبەجێکرد"[١٣٤٣].

حکومەتی ئیسرائیل گرنگی زۆری بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ شۆڕشی کورددا بۆ سەرقاڵکردنی سوپای عێراق و ڕێگری لێکردنی لە پاڵپشتیکردنی وڵاتانی عەرەبی. بۆیە کاریکرد بۆ گەشەپێدانی ئەو پەیوەندییە تا ئاستی ڕێکخستنی پەیوەندی ستراتیژی و لەم چوارچێوەیەدا بڕیاریدا یەکەم نێردراوی ئیسرائیل ڕەوانەی بارەگای شۆڕش بکات لەو ناوچەیەی لەژێر دەسەڵاتی شۆڕشگێرانی کورد بوو. سەرۆکی دەزگای مۆساد(مائیر عمیت) یەکێک لەگەورە ئەفسەرانی دەزگاکەی هەڵبژارد کە (دیڤید کمحی) بوو، بۆ ئەوەی زانیاری وورد لەسەر ڕێبەری کورد مستەفا بارزانی کۆبکاتەوە و لێکۆڵینەوە لە ژێرخانی شۆڕشی کورد بکات و لە داواکاری شۆڕشگێرانی کورد تێبگات. نێردراوەکەی حکومەتی ئیسرائیل لە (٥ی ئایاری ١٩٦٥) گەیشتە کوردستان و لەیەکەم دیداریدا بۆ ماوەی (٧) کاتژمێر لەگەڵ بارزانی کۆبوویەوە. لەم کۆبوونەوە بارزانی داوایکرد ئیسرائیل هاوکاری بکات بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا. هەروەها داوای لە (کمحی) کرد وێنای تەواوی بارودۆخی ناوچەکە بۆ حکومەتی ئیسرائیل بگوازێتەوە، بۆ وەرگرتنی زانیاریش داوایکرد (کمحی) خۆی سەردانی ناوچەکان بکات بۆ دیراسەکردنی پێداویستییەکانی شۆڕشی کورد. دوای گەیشتنی ڕاپۆرتەکەی (کمحی) بەدەستی کاربەدەستانی ئیسرائیل، دەزگای مۆساد بڕیاری ڕەوانەکردنی شارەزایانی سەربازیدا بۆ کوردستان[١٣٤٤].

یەکەم نێردەی حکومەتی ئیسرائیل کە لەدوو کەس پێکهاتبوون یەکێکیان ئەفسەرێکی سوپای ئیسرائیلی بوو بەناوی ( تسوری ساغی ) لەگەڵ کارمەندێکی دەزگای (مۆساد) بەناوی (ماکی ئیفرون) کە بەمەبەستی ئەنجامدانی کاری وەرگێری زمان لەگەڵ ئەفسەرە ئیسرائیلییەکە بوو، لە مانگی ئابی ١٩٦٥ گەیشتنە بارەگای بارزانی لە حاجی ئۆمەران. بەپێی زانیارییەکانی (ساغی)، کە لەدیدارێکی لەگەڵ

١٣٤٣ - صلاح الخرسان، م.س، ص١٥٨.
١٣٤٤ - م.ن، ص١٥٩.

ڕۆژنامەنووسـێکی ئیسـرائیلی لە ڕۆژنامەی (مەعاریف) خسـتویەتیەڕوو، ناوبراو ڕاسـتەوخۆ دەسـتیکردووە بە کردنەوەی خولێکی مەشـق و ڕاهێنانی پێشـمەرگە بۆ ئاشـناکردنیان بە شـێوازی بەرگری کلاسـیکی لە شـەڕی پیادە، بە پشـت بەسـتن بە توانای نیشانەشکێن (قناص)ی کورد. ئەوانەی توانایان هەبوو لە دووری (٨٠٠) مەتر ئـامـانجیـان بپێکن. وێڕای کـارکردن بۆ بەرزکردنەوەی توانـای جەسـتەیی و شـارەزاکردنیان لەسـەر بەکارهێنانی موشـەکی هاوەنی عەیار (٨١) و (١٢٠) ملم. پاشـان لەدوای تەواوکردنی ئەم خولە، کە ماوەی سـێ مانگ بەردەوام بوو، لەسـەر داوای (سـاغی) بەشـێک لەم پێشـمەرگانە بۆ ئەنجامدانی مەشـق و ڕاهێنان لەسـەر تەقەمەنی ڕاسـتەقینە (الذخيرة الحية) بە دوو فڕۆکەی هێزی ئاسـمانی ئیسـرائیل لە ئێرانەوە گوازرانەوە بۆ شـاری حەیفا و لە میوانخانەیەکی بچووکی ئەم شـارە نیشـتەجێ کران و دواتر بەهاوبەشـی لەگەڵ سـوپای ئیسـرائیل لە ئوردوگایەکی سـەربازی لە نزیک شـارۆچکەی (دالية كرمل)[١٣٤٥]مەشـق و ڕاهێنانی دیکەیان بۆ ڕێکخرا و پاشـان گەڕێندرانەوە ئێران و لەوێشـەوە گوازرانەوە باشـووری کوردستان[١٣٤٦].

لەسـەرەتای ئایاری ١٩٦٦ سـوپای عێراق هێرشـی کردە سـەر ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، ئەو کاتە وەک (ساغی ) باسـی دەکات، هەوڵیداوە یارمەتیدەربێ لەپلانی بەرگری سـەرکردایەتی شـۆڕش بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سـوپای عێراق[١٣٤٧]. بەڵام مەسـعود بارزانی ئەو زانیارییە بەنادروسـت وەسـف دەکات و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە تەنها یەک ئیسـرائیلیش بەشداری ئەو شەڕە و هیچ شەڕێکی نەکردووە لەباشووری کوردستان[١٣٤٨]. دواجار هێزەکانی پێشـمەرگە توانیان لە (١٢ی ئایاری١٩٦٦) سـوپای عێراق تێکبشـکێنن و

---

١٣٤٥- شارۆچکەیەکی عەرەبی دروزییە، کەوتۆتە بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری حەیفا. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: روضة غنايم، حيفا في الذاكرة الشفوية(أحياء و بيوت و ناس )، المركز العربي للابحاث و دراسة السياسات، بيروت، ٢٠٢٢، ص١٣٢.

١٣٤٦ - ئەو پەرشوتارە ئیسرائیلییەی کە لە ژێر زەویدا ڕاهێنانی بە کوردەکان کردووە، مەعاریفی ئیسرائیلی (ئۆنلاین)، ٢٠١٦/٢٨/٠٢.
https://www.maariv.co.il/news/military/Article.528116?utm_source=whatsapp

١٣٤٧ – هەمان سەرچاوە.

١٣٤٨ –مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ....، ٢٠٢٠،ل٢١٥.

زیانێکی زۆری گیانی و مادییان لێ بدەن. بەپێی زانیارییەکانی (ساغی) لەئەنجامی ئەم سەرکەوتنە ئەو کاتە دوو ئەفسەری سوپای عێراق بە ئۆتۆمۆبێلێکی جۆری (جێب) ئالای سپییان هەڵکرد و ڕوویانکردە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە و ڕاپانگەیاند ئەوەی بارزانی داوای بکات ئامادەنە گفتوگۆی لەسەر بکەن[١٣٤٩]. ساغی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، بارزانی لەم دەرفەتەی بۆی ڕەخسا، مەبەستی بوو سەربەخۆیی ڕابگەیەنێ. بەڵام جێبەجێی نەکرد. دوای دوو ڕۆژ شاندێکی حکومەتی ئیسرائیل کە پێکهاتبوون لە دیڤید کرون(١٩١٥-٢٠٠١)، حاییم لیفکوف(١٩١٦-١٩٩٨)، ئەریک ریغیف(١٩٣٣-١٩٦٨) سەردانی بارەگای بارزانییان کرد لە باشووری کوردستان. شاندەکە لەدیدارەکەیان لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی، بەڵێنی پاڵپشتی و هاوکاری زیاتری حکومەتەکەیان بە سەرکردایەتی کورددا و هەر ئەم کاتە لەگەڵ بارزانی ڕێککەوتن لەسەر پێدانی چەک و دامەزراندنی نەخۆشخانەیەکی مەیدانی و ڕەوانەکردنی چەند پزیشکێک لە ئیسرائیلەوە بۆ باشووری کوردستان[١٣٥٠].

دوای ماوەیەکی کورت بەدیاریکراویش لە (١٨ی ئەیلولی ١٩٦٦) شاندێکی دیکەی حکومەتی ئیسرائیل سەردانی ناوچەی حاجی ئۆمەرانی کرد، کە پێکهاتبوو لە (ئارییە ئەلیاب) ناسراو بە (لوبا) جێگری وەزیری بازرگانی و پیشەسازی و ئەندامی کلێسەی ئیسرائیلی، لەگەڵ چەند پزیشک و کارمەندێکی تەندروستی، لەگەڵ خۆیاندا نەخۆشخانەیەکی مەیدانیان بۆ شۆڕشگێڕانی کورد هێنابوو، وەک دیاری حکومەتی ئیسرائیل. ئەمانیش هەریەک لە موقەدەم (ئەبراهام تەدمور) فەرماندەی نەخۆشخانەکە و بەڕێوەبەری کارگێری و دکتۆر (ئەورلی ئیسرائیل فرند) و دکتۆر (بسیج یسجل) و دکتور (دوف ئیتسکوفیتش) لەگەڵ دوو پەرستیاری سەربازی کە (موشیە ئەرییل) و (شەمعون ئەفرات) بوون[١٣٥١]. سەرباری ئەوەی هەر لەساڵی ١٩٦٦ دەزگای مۆسادی ئیسرائیلی هاوکاری شۆڕشگێرانی کوردییان کرد بۆ دامەزراندنی (دەزگای پاراستن)، کە دامەزراوەیەکی هەواڵگری بوو بۆ بەدەستهێنانی هەواڵ و زانیاریی لەسەر سوپا و حکومەتی عێراق و جموجۆلە سەربازییەکانیان، پێکهات[١٣٥٢].

---

١٣٤٩ – شلومو نکدیمون، م. س، ص١٦١.

١٣٥٠ - ئەو پەرشوتارە ئیسرائیلییەی کە لە ژێر زەویدا ڕاهێنانی بە کوردەکان کردووە، مەعاریفی ئیسرائیلی (ئۆنلاین)، ٢٠١٦/٢٨/٠٢.

١٣٥١ – صلاح الخرسان، م.س، ص١٥٩.

١٣٥٢ – جوناثان راندل، م.س، ص٢٥٣.

بەتێپەڕبوونی کات پەیوەندیەکانی حکومەتی ئیسرائیل لەگەڵ سەرکردایەتی کورد گەشـەی کرد، بەڵام بارزانی ڕێگەی نەدا ئەم پەیوەندییە هیچ کات لەسـەر حیسـابی شـەڕی عەرەب و ئیسـرائیل بێت، بەڵکو بەر لەوەی شـەڕی عەرەب و ئیسـرائیل لەساڵی١٩٦٧ هەڵبگیرسێ، شاندێکی حکومەتی عێراق لەڕۆژی(٥ی حوزەیرانی١٩٦٧) سـەردانی بارزانی کرد و داوایان لێکرد هێزێکی پێشمەرگە لەگەڵ سـوپای عێراق بۆ شەڕی ئیسرائیل ڕەوانە بکات، هەرچەندە بارزانی ئەو داواکارییەی حکومەتی عێراقی ڕەتکردەوە سەبارەت بە بەشداری پێشمەرگە لەتەک سوپای عێراق بۆ شەڕکردن لە دژی ئیسـرائیل، بەڵام لەهەمان کاتدا بەڵێنی ئەوەی پێدان ئاگربەسـت ڕابگەیەنێ، تاکو سوپای عێراق لەشەڕی ئیسرائیل دەگەڕێتەوە[١٣٥٣]. تەنانەت بارزانی وەک لە هەواڵێکی ڕۆژی (١٥ی تەمموزی١٩٦٧) ڕۆژنـامەی(لۆمۆنـدی) فەرەنسـییەوە هـاتووە، لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی ئەلتاخی لە بەغدا، هـاودەنگی کورد و عەرەب لە ململانێی عەرەب و ئیسـرائیل پشـتڕاسـت کردەوە، دوای ئەوەی بە بروسـکەیەک بۆ سـەرۆکی عێراق عەبدولڕەحمان عارفی نووسـی: "ئێمە پێمان وایە کە خاکی عێراق هی ئێمەیە، گەلی عێراق گەلی ئێمەیە، لە خۆشگوزەرانی و لە ناخۆشیدا یەکگرتووین". زیـاتر لەمەش بـارزانی بۆ عـارفی ڕوون کردەوە کە:" ئەوان لە تەنیشـت برا عەرەبەکانیانەوە دەوەسـتن لەو دەسـتدرێژییەی، کە ئەوان بەرکەوتەی بوون وە لە هەر دەستدرێژییەکی دیکەی داهاتوودا هەمان هەڵوێستیان دەبێ"[١٣٥٤].

ئەم هەڵوێسـتەی بارزانی کاریگەری لەسـەر پەیوەندیەکانی لەگەڵ حکومەتی ئیسرائیل دروست نەکرد، تەنانەت دوای یەک ساڵ بەدیاریکراویش لە نیسانی ١٩٦٨ مەلا مستەفا بارزانی سـەردانی ئیسـرائیلی کرد و لەگەڵ ژمارەیەک لە بەرپرسـانی باڵای ئەم وڵاتە کۆبوویەوە[١٣٥٥]. بەو هۆیەوە حکومەتی ئیسرائیل دوای ئەم سەردانەی بارزانی، هەوڵی زیادکردنی پشـتیوانیەکانیدا بۆ شـۆڕشـی کورد و لەم سـۆنگەوە بڕیـاریـدا مـانگـانە بڕی(٥٠) هەزار دۆلار کە بەرامبەر بەدینـاری عێراقی پـارەیەکی

١٣٥٣ – ابراهيم فيصل الانصاري، أيام لاتنسى ....، ص٣٥٢.

1354 – LE LEADER DES NATIONALISTES KURDES D'IRAK SE SOLIDARISE AVEC LES ARABES CONTRE L'" AGRESSION " ISRAÉLIENNE, Le Monde, 15 juillet 1967.

١٣٥٥ ـ ئیتزاک بن هۆران، سەردانی نهێنی، مەعاریفی ئیسرائیلی(ڕۆژنامە)، ژمارە(١٢١٢٨)، ١١ی ئەیلوولی ١٩٨٧، ل ١١٤.

ڕەمزی بوو، وەک هاوکاری دارایی پێشــکەش بەســەرکردایەتی شــۆڕشــی کورد بکەن[١٣٥٦]. ســەرباری ئەوە حکومەتی ئیســرائیل ژمارەیەک لەو چەکانەی لە شــەڕی عەرەب و ئیســرائیل لەســاڵی ١٩٦٧ دەســتی بەســەرداگرتبوو، بە هێزە کوردییەکانی بەخشی[١٣٥٧].

ئاشکرایە هەموو ئەو یارمەتییانەی ئیسرائیل بە کوردی دەدا لە پێناو لاوازکردنی عێراق بوو بە پلەی یەکەم، بۆیە گفتوگۆ و دانوســتانەکانی ســەرکردایەتی شــۆڕشــی کورد لەگەڵ حکومەتی عێراق لە ســـەرەتاکانی ســـاڵی ١٩٧٠، حکومەتی ئیســـرائیلی توشــی جۆرێک لە نائومێدی کرد، لەبەرئەوەی کۆتاییهاتنی شــەڕ لە ناوەخۆی عێراق، بەمانای دەســت والابوونی ســوپای عێراق بوو بۆ شــەڕی ئیســرائیل، بۆیە لە (٤ی ئاداری ١٩٧٠) چەند ڕۆژێک بەر لە واژووکردنی ڕێککەوتننەکە لەنێوان مســـتەفا بارزانی و ســـەدام حوســـێنی جێگری ئەمینداری گشـــتی ئەنجومەنی ســـەرکردایەتی شۆڕش لە عێراق، بەرپرسی ژووری موساد لە ئێران بەهاوبەشی لەگەڵ سەرۆکی ئاژانســی ئاســایشــی نیشــتمانی ئێران(ســاواک) لەگەڵ ئیدریس بارزانی کۆبوونەوە و بەپێی ئەو زانیارییەی لە بەڵگەنامەیەکی حکومەتی ئەمریکادا هاتووە، ئیســـرائیلیەکان داوایان لە ئیدریس بارزانی کرد لە گفتوگۆیەکانیان لەگەڵ حکومەتی عێراق پاشەکشە بکەن، لە بەرامبەردا بەڵێنی ئەوەیـان پێدا چەکی قورس وەک تۆپی دوورهـاوێژ و موشەکی دژە تانک و فڕۆکەیان بۆ دابین بکەن، سەرباری زیادکردنی بڕی هاوکارییە داراییەکان[١٣٥٨].

بێگومان ئیدریس بارزانی نەیتوانی ئەو بەڵێنەیان پێبدات بەبێ ڕاوێژکردن بە مەلا مســتەفا و ســەرکردایەتی شــۆڕشــی کورد، مەلا مســتەفا بارزانیش پێشــتر داواکاری هـاوشـــێوەی لە شـــــای ئێران لێکرابوو بەڵام ڕەتیکردبۆوە[١٣٥٩]، بۆیە لەبەرامبەر داواکاریەکەی ئیســرائیل هەمان هەڵوێســتی نواند. بە بەڵگەی ئەوەی ڕێککەوتنامەکەی

---

١٣٥٦ – شموئیل سیجف، م.س، ص٢٦٦.

١٣٥٧ – کمال مجید، م.س، ص٥١.

1358 – FOREIGN RELATIONS OF THE UNITED STATES, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, 267. Central Intelligence Agency Information Cable TDCS DB, Israeli Aid to Kurdish Rebels, Washington, March 9, 1970.p.1–3.

١٣٥٩ – نازناز محەمەد عەبدولقادر، س.پ، ل١٨٧.

له (١١ی ئـاداری١٩٧٠) لەگەڵ حکومەتی عێراق واژووکرد. بەو هۆیەوە دەزگـای ئاسایشی نیشتمانی ئیسرائیل (موساد) بڕیاریدا ئەو ڕاهێنەر و ڕاوێژکارە سەربازییە ئیسرائیلیانەی هاوکاری پێشمەرگەی کوردستانیان دەکرد لە باشووری کوردستان لەگەڵ ئەو نەخۆشـخانە گەڕۆکەی بەشـۆڕشـی کوردیان بەخشـی بوو، بگوازنەوە ئێران[١٣٦٠].

دوای ئەوەی حکومەتی عێراق ڕێککەوتننـامەی ئـاداری١٩٧٠ی بەرە بەرە فەرامۆشـــکرد و نەچووە ژێر باری جێبەجێکردنی بڕگە و ماددەکانی، هەڵوێســـتی سیاسی بارزانی گۆڕانکاری بەسەرداهات بەرامبەر بە حکومەتی عێراق، بەو هۆیەوە جاریکی دیکە پەیوەندیەکانی لەگەڵ حکومەتی ئیسرائیل دەستپێکردەوە. لەم سۆنگەوە وەک پێشـتریش ئاماژەمان پێکرد و بەپێی زانیاری بەڵگەنامەیەکی حکومەتی ئەمریکا، هەردوو لایەنی ئیســـرائیل و ئێران بەهەماهەنگی یەکتری بڕی(١٢٠٠،٠٠٠) دیناری عێراقی کە دەیکردە (٣،٦٠٠،٠٠٠) دۆلاری ئەمریکی وەکو هاوکاری دارایی پێشکەشی سەرکردایەتی کورد کرد، دوای ئەوەی حکومەتی عێراق ئەو برە هاوکارییەی ڕاگرت، کە بۆ موچەی پێشمەرگە و پێداویستییەکانی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد ڕەوانەی دەکرد[١٣٦١].

دامەزراندنەوەی پەیوەندی سـیاسـی سـەرکردایەتی کورد لەگەڵ حکومەتی ئیســـرائیل، هـاندەربوون بۆ ئەوەی مەلا مســـتەفا بـارزانی بۆ جـاری دووەم لە( ئەیلولی١٩٧٣) سـەردانی ئیسـرائیل بکاتەوە و دیداری سـیاسـی لەگەڵ سـەرۆک وەزیران و وەزیری بەرگری و گەورە بەرپرسـانی دیکەی سـیاسـی و سـەربازی ئیسرائیل ئەنجام بدات. لەم سەردانەیدا بارزانی توانی پاڵپشتی حکومەتی ئیسرائیل بۆ شـۆڕشـی کورد بەدەسـت بێنێتەوە. دوای ماوەیەکی کەم لەم سـەردانەی بارزانی بۆ ئیســـرائیل بەدیاریکراویش لە تشـرینی یەکەمی ١٩٧٣ شـەڕی عەرەب و ئیســـرائیل دەستی پێکردەوە، بەڵام بارزانی هیچ هەڕەشەیەکی لەسەر یەکپارچەیی خاکی عێراق

---

١٣٦٠ – د. ابراهيم السامرائي، العراق البلد العربي الذي نخره السياسيون ١٩١٤-٢٠٠٣، دار المعتز للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠١٥، ص ٢٨٠.

1361 –F.R.U. S, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, 267. Central Intelligence Agency Information Cable TDCS DB, Israeli Aid to Kurdish Rebels, Washington, March 9, 1970.p.1–3.

دروست نەکرد، بەڵکو بەپێچەوانەوە پشتیوانی خۆی لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی ڕاگەیاند و فەرمانی بە هێزەکانی پێشـــمەرگە کرد هیچ جۆرە ڕووبەڕووبوونەوەیەک لەگەڵ سوپای عێراق ئەنجام نەدەن[١٣٦٢].

ئەم هەڵوێستەی بارزانی هەرچەندە دژ بە بەرژەوەندییەکانی ئیسرائیل بوو، بەڵام ئیسرائیلییەکان بەردەوام بوون لەسەر هەڵویستی پشتگیریکردن و پشتیوانیکردن لە شۆڕشی کورد، بۆیە کاتێک لە ئاداری ١٩٧٤ شەڕی نێوان کورد و حکومەتی عێراق دەستیپێکردەوە، حکومەتی ئیسرائیل دەستیکردەوە بە کۆمەککردنی شۆڕشگێرانی کورد، لە ڕووی دابینکردنی ڕاهێنەر و ڕاوێژکاری سەربازی و گواستنەوەی بڕێکی چەکی قورس لەو چەکانەی کە لەشەڕی عەرەب و ئیسرائیل دەستیان بەسەردا گرتبوو بۆ شۆڕشی کورد[١٣٦٣]. کە بەپێی زانیارییەکانی هێنری کیسنجەر ئەو چەکانە بەهاکەیان دەگەیشتە نزیکەی (٢٨) ملیۆن دۆلار[١٣٦٤].

پەیوەندییەکانی حکومەتی ئیسرائیل و سەرکردایەتی کورد بەردەوام بوو، تا دوا ساتەکانی کۆتایهاتنی شەڕ لە باشووری کوردستان لە ئاداری ١٩٧٥. دوا ئەوەی لەگەڵ ئەم پێشهاتە سیاسی و سەربازییە، پەیوەندیەکانی حکومەتی ئیسرائیل لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد پچڕا. هۆکارەکەشی پەیوەندی هەبوو بە ڕێککەوتنی حکومەتی ئێران لەگەڵ حکومەتی عێراق لەئاداری ١٩٧٥ لە جەزائیر. دوای ئەم ڕێککەوتنە ئێران سنوورەکانی لەسەر کورد داخست، ئەو کاتەش ئەم وڵاتە تەنها دەروازە بوو بۆ گەیاندنی هاوکاری و کۆمەکیەکانی ئیسرائیل بۆ ناوچە کوردییەکانی باشووری کوردستان[١٣٦٥].

---

١٣٦٢ – شلومو نكديمون، م. س، ص٢٧٤–٢٧٥.

١٣٦٣ – حديث أخر مع "اليعيزر تسفرير" رئيس الموساد في كردستان و لبنان وإيران، برنامج(حديث آخر) ،قناة(i24NEWS) عربية.١٢ مارس٢٠١٨.
https://www.youtube.com/watch?v=Iv6mYIU8vgA

١٣٦٤ – هنري كيسنجر، م.س،ص٥١٤.

١٣٦٥ – حديث أخر مع "اليعيزر تسفرير" رئيس الموساد في كردستان لبنان وإيران، برنامج(حديث آخر) ،قناة(i24NEWS) عربية.١٢ مارس٢٠١٨.
https://www.youtube.com/watch?v=Iv6mYIU8vgA

محمود عوســـمان پێی وایە پەیوەندیەکانی ســـەرکردایەتی کورد بە حکومەتی ئیسرائیل ئەوەندە کاریگەریی نەرێنی لەسەر شۆڕشی کورد هەبوو، ئەوەندە سود و قازانجی پێ نەبەخشـــی، لەبەرئەوەی بەدرێژایی ماوەی ئەو پەیوەندییە حکومەتی ئیسرائیل بڕێکی سنووورداری هاوکاری بەشۆڕشی کورد بەخشی، سەرباری ئەوەی لەدوای کۆتاییهاتنی شـــەڕ، وێڕای ئەو داخوازییانەی هەبوون لەلایەن ســـەرکردایەتی کورد، بەڵام بێ هەڵویســـــت بوون بەرامبەر بەم دۆخەی ڕووبەڕووی گەلی کورد بویەوە. بەم جۆرەش کۆتـایی بە پەیوەنـدیەکـانی نێوان ســـەرکردایەتی کورد و حکومەتی ئیسرائیل هات[١٣٦٦].

---

١٣٦٦ – فائق شيخ علي، م.س، ص٢٩.

## ئەنجامەکان

دوای لێکۆڵینەوەی وورد لە ڕۆڵی مستەفا بارزانی لە پێشەوایەتیکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی لەماوەی نێوان سالآنی (١٩٤٣- ١٩٧٩)دا، گەیشتینە ئەم چەند ئەنجامەی خوارەوە:

١. مستەفا بارزانی لە لای ژمارەیەک لە زانایانی ئاینی بارزان و موسڵ و ناسریە و پردێ و سلێمانی، زانستی ئایینی خوێندوە و مۆڵەتی لە تەفسیر و فەرموودەدا وەرگرتووە. دواتر لە یەکێتی سۆڤیەت لە ئەکادیمیای سەربازی و پەیمانگەی سیاسی کۆمۆنیستی مۆسکۆ، پەرەی بە توانا سەربازی و سیاسییەکانی داوە. ئەوە لە کاتێکدا شارەزای چەند زمانێکی بیانی بووە، لە نمونەی زمانەکانی فارسی و تورکی و عەرەبی و روسی. هەموو ئەمانە، بە پێودانگی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەی بارزانی تێیدا ژیاوە، لە ئاماژە سەرەکییەکانی ڕۆشنبیریی تاک بوون.

٢. مستەفا بارزانی داهێنەری هزری نەتەوەیی کوردی نییە، بەڵکو ئەو هزری نەتەوەیی لە شێخانی بارزان و شۆڕشگێرانی کوردی پێش خۆی وەرگرتوە و گەشەی پێداوە.

٣. مستەفا بارزانی هەرچەندە خاوەن پاشخانی (ئایینی) و (هۆزایەتی) بووە، بەڵام لە ڕێبەرایەتیکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردیدا، پەیامی بەرگری و داکۆکیکردنی لە مافی گەلەکەی، لە دەرەوەی ئەو چوارچێوانەدا بووە. بۆیە دەکرێ خەباتی ئەم ڕێبەرە بە پرۆژەیەکی نیشتمانی و لەچوارچێوەی بیر و فەلسەفەی کوردایەتی وێنا بکەین.

٤. مستەفا بارزانی تێگەیشتنی بۆ ئەو بزاڤە ڕزگاریخوازە نەتەوەییە هەبووە، کە لە بیری سیاسی نوێ خراوەتەڕوو، بەبێ ئەوەی کاریگەریی هیچ ئایدۆلۆژیایەکی لەسەربێ، تەنانەت لەم ئایدۆلۆژیا نەتەوەییەی گوزارشتە لە سیاسەتی بورجوازی ناوەند، دوور بووە. بەشێوەیەک ڕێبەرایەتی بارزانی هیچ لە تایبەتمەندییە کلاسیکییەکانی تێدا بەرجەستە نەبووە، ئەمەش وا دەکات ئەو ڕێبەرە وەک ڕێبەرێکی سیاسی نیشتمانی ببینین.

٥. مستەفا بارزانی کاتێک ڕێگای خەباتی سیاسی هێمنانەی بۆ نەمایەوە، پەنای بردە بەر ڕاپەڕین و شۆڕش، ئەو مەبەستی بووە گەلی کورد لە ژیانی سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیری عێراقدا بەشداربکرێ. هەروەها ئامانجی بووە لە ولاتەکەی خۆیدا ئازادی حزبایەتی و ڕۆژنامەوانی و هەڵبژاردن هەبێ. قوتابخانە و نەخۆشخانە و ڕێگاوبان و کارگە لە کوردستان بکرێتەوە. ئەم داخوازی و داواکارییانە، ئاماژەی ڕوونن بۆ نوێخوازی و گۆڕانکاری بنچینەیی، کە لەم بزاڤەی مستەفا بارزانی ڕۆڵی پێشەوایەتی تێدا بینی، بەشێکیان هاتنەدی.

٦. لە قۆناغی نوێی سیاسی دوای جەنگی دووەمی جیهانیی، مستەفا بارزانی توانی بناغەیەکی نوێ بۆ بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کوردی دابنێ، دوای ئەوەی بە هاوکاری کەسایەتی و پارت و ڕێکخراوە کوردییەکان، ڕێبەرایەتی ئەم بزاڤەیان خستە ئەستۆی پارتێکی سیاسی، جیاواز لەو جووڵانەوانەی ڕێبەرە ئایینی و هۆزایەتییەکان پێشڕەوییان دەکرد. بە شێوەیەک بزاڤە نوێیەکە توانی سنووری بەرتەسکی ناوچەیی ببڕێت و سەرکەوتنی شۆڕش و بەرخودانی کورد لە باشووری کوردستان، بکاتە ئومێدی هەموو گەلی کورد و بەمەش هەنگاوەکانی یەکخستنی خەباتی نەتەوەیی دەستپێکرد و تا دوا ساتەکانی تەمەنی ئەم ڕێبەرە، دەستبەرداری نەبوو.

٧. لە مێژووی هاوچەرخدا، مستەفا بارزانی دامەزرێنەری هێزی سەربازی ڕێکخراوی نیشتمانی کوردە. دوای ئەوەی جیاوازییە کۆمەلایەتییەکانی کاڵ کردەوە، لە ڕێگای بەشداریپێکردنی سەرجەم پێکهاتەکانی کوردستان لە خەبات و بەرخودانددا.

٨. جگە لەڕێبەرایەتیکردنی بزاڤی چەکداری، مستەفا بارزانی ڕۆڵێکی بەرچاویشی هەبوو لەگەشەپێدانی بیری نەتەوەیی لای گەلەکەی، هزری بارزانی لەڕووی کۆمەلایەتییەوە جەختکردنەوەی بووە لەسەر بوار ڕەخساندن بۆ پێشکەوتنی زمان و ڕۆشنبیری کوردی. لەڕووی سیاسییەوە گەلالەکردنی مافە سیاسییەکانی کورد بوو، بۆ بەشداریکردن لە دامەزراوە سیاسییەکانی دەوڵەت. لەڕووی ئابوورییشەوە داواکردنی پشکی کوردی بوو لە داهاتی عێراق. ئەم داواکارییانەش تێزی نوێ بوون، بەڵکو جیاوازبوون لەگەڵ ئەو تێزانەی لە شۆڕش و ڕاپەرینەکانی دیکەی کورد خرابوونە ڕوو.

٩. بارزانی مەبەســـتی بوو ڕاگەیاندن وەک ئامرازێک بۆ گەشـــەپێدانی هزری نەتەوەیی بەکاربێنی، بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە، دەســـتپێشـــخەریکرد بۆ دامەزراندنی یەکەم ئێزگەی ڕادیۆیی لە مێژووی شـــۆڕشـــەکانی کورد لە باشووری کوردستان، کە پێشتر هیچ شۆڕش و ڕاپەڕینێک، خاوەنی دەزگای پەخشـــی ڕادیۆیی تایبەت بەخۆی نەبووە. هاوکات بارزانی هاوکاربوو لە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی (برایەتی)، کە یەکەم ڕۆژنامەی ســیاســی کوردبوو، بە شێوەیەکی ڕۆژانە بڵاوکرایەوە. سەرباری ئەوەی لە دەرئەنجامی گرنگیدانی بارزانی بە ڕۆژنامەگەری کوردی، ڕۆژنامەکانی شـــۆڕش، بوونە یەکێک لە ســـەرچاوەکانی هەواڵ بۆ ئاژانســـە بیانییەکان. ئەوە ســـەرباری ئەوەی ڕووبەرێکی فراوانی ئازادیان بۆ بەرهەمی ئەدەبیە شـــۆڕشـــگێڕەکانی کورد تەرخانکرد و لەم ڕێگەوە توانیان پەرە بە ئەدەبی بەرگری بدەن.
١٠. مستەفا بارزانی کاریگەریی هەبووە لەسەر ووشیاری وهۆشمەندی نەتەوەی کورد لەهەرچوار پارچەی کوردستان.
١١. بارزانی بووە ناسنامەی گەلی کورد لە دەرەوەی وڵات.
١٢. هەوڵەکانی حکومەتی عێراق بۆ لێدان و لاوازکردنی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد لەڕێگای پیادەکردنی ســـیاســـەتگەلێکی دوژمنکارانە، لەمانەش پەیڕەوکردنی ســیاســەتی پەرتکەوزاڵبە بەشــێوەیەکی گشــتگیر لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی، لە هەندێ کاتدا کاریگەری نەرێنی لەسەر ڕەوتی بەرەوپێشەوەچوونی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد دروستکرد، بەڵام نەیتوانی بیوەستێنێ. سەرەڕای ئەوەش لە هەندێ کاتدا پێگەی مەلا مستەفای بارزانی بەهێزتر بوو، بەو ڕادەی وەک زۆرێک لەبەڵگەنامەکانی حکومەتی بریتانیا و ئەمریکا لەســـاڵی ١٩٧٤ ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە، کە لە دوای هەڵگیرسانەوەی شەڕ لەنێوان کورد و حکومەتی عێراق، نزیکەی هەموو گەلی کورد لە باشـــووری کوردســـتان، پشتگیری مەلا مستەفای بارزانیان کرد.
١٣. دیارە پەیوەندییە سیاسییەکان لەسـەر ئاسـتی دەرەوە جا دیبلۆماسـی بن یان هەوڵی ناســاندن و پەیداکردنی پشــتیوانی بۆ دۆزی کورد، بۆ مســتەفا بارزانی ئامانجێکی لە پێشـــینەیی بووە، بۆ ئەوەی ئەم پرســـە لە خانەی کێشـــەیەکی نێوخۆیی لەگەڵ حکومەتی عێراق دەربهێنێ و بیخاتە چوارچێوەیەکی فراوانتر. بەڵام بەرژەوەندی باڵای زلهێزەکان و وڵاتانی خاوەن ســـەنگ و بڕیاری

سیاسی، پەرژینێکی گەورەبوون لەبەردەم هێنانەدی ئەم ئامانجە، وەک ئەوەی بارزانی دەیویست و کاری بۆ دەکرد.

١٤. لەدوای گەڕانەوەی لە یەکێتی سۆڤیەتەوە بۆ عێراق لە ساڵی ١٩٥٨، مستەفا بارزانی ڕوویکردە بەرەی ڕۆژئاوا بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەمەش لەبەر (سێ) هۆکار:

آ) پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لەسەر بنەمای تیۆری سیاسی ستالین، پێشکەشکردنی پاڵپشتیی بۆ بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلانی مەرجدار کردبوو بە بوونی جوگرافیا و ئابوورییەکی هاوبەش، کە هیچ یەکێک لەمانە بەهۆی دۆخی دابەشکراوی کوردستان لە بزاڤی ڕزگاریخوازی کورددیدا بەرجەستە نەدەبوون.

ب) هەردوو وڵاتی بەهێزی دراوسێی عێراق کە (ئێران و تورکیا) بوون، هاوپەیمانی بەهێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوون.

ج) مستەفا بارزانی، هێز و توانای ئەمریکای کاریگەرتر بینیوە بە راورد بە هەر لایەنێکی دیکە.

١٥. مستەفا بارزانی خواستی زۆری بۆ بەدەستهێنانی پاڵپشتی ئەمریکا هەبوو، لە ڕێگەی نوێنەرەکانی شۆڕشەوە بەڵێنی دەستکەوت و جیاوگی ئابووری بەم حکومەتە دا. بەڵام بەڵێنەکانی بارزانی لەلایەن حکومەتی ئەمریکا فەرامۆشکران، لەبەرئەوەی بزاڤەکەی مستەفا بارزانی ڕێبەرایەتی کرد، خاوەن ئامانجی ئۆتۆنۆمی بوو، ئەم پرۆژەیەش، نەبووە جێگەی متمانە و پاڵپشتی هێزێکی نێودەوڵەتی وەکو ئەمریکا، چونکە نەیدەتوانی هیوای دەستکەوتی ئابووری لەسەر دروست بکات، بەڵکو بزاڤەکە لە ئەگەری سەرکەوتنی، نەدەبووە خاوەن ئابوورییەکی سەربەخۆ، بەم جۆرەش نەیدەتوانی بەرژەوەندی ئەمریکا دابین بکات، لە کاتێکدا ئۆتۆنۆمییەکەی داوای دەکرد، لە چوارچێوەی سیستەمی سیاسی عێراقدا بوو.

ئاڵۆزی بارودۆخی نێودەوڵەتی و ئاڵانگەری جوگرافیای سیاسی لەو کاتەدا، لەوە قورستربووە شۆڕشی کوردی بتوانێ باڵی بۆ ڕابگرێ. ئەمەش فاکتەرێکی کاریگەربوو لەسەر بە ئەنجام نەگەیشتنی هەوڵەکانی مستەفا بارزانی بۆ دروستکردنی قەوارەیەکی کوردی لەچوارچێوەی عێراقدا.

## یەکەم/ بەڵگەنامەکان

### آ- بەڵگەنامە بڵاونەکراوەکان:

#### ١) بەزمانی عەرەبی

- بەڵگەنامەکانی( خانەی کتێب و بەڵگەنامەکان/ د.ک.و) بەغدا

- البلاط الملكي، (٣١١/٤٣٣٣)، أوراق متفرقة، البارزانيون(١٩٤٣_ ١٩٤٩)، الحكومة العراقية، دائرة مديرية الشرطة العامة، تقرير مفتش الشرطة عن الملا مصطفى البارزاني الى وزارة الداخلية. قلم الحركات، العدد(٣٩٨٣)، التاريخ(١٩٤٣/١٢/١٤).
- البلاط الملكي، (٣١١/٤٣٣٣)، أوراق متفرقة، البارزانيون (١٩٤٣-١٩٤٩)، متصرفية لواء أربيل، ألى وزارة الداخلية، المرقم(٤٣٨)، ١٩٤٣/١٢/١٨.
- البلاط الملكي، (٣١١/٤٣٣٣)، أوراق متفرقة، البارزانيون (١٩٤٣-١٩٤٩)، متصرفية لواء أربيل، ألى وزارة الداخلية، الموضوع: ملا مصطفى البارزاني،المرقم(٤٥١)، ١٩٤٣/١٢/٢١.
- البلاط الملكي، (٣١١/٤٣٣٣)، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)، تقرير عام و موجز عن حركات بارزان سنة ١٩٤٥، كتاب رقم (د/٢٠٥/١/١٥) في ١١ كانون الثاني ١٩٤٦. الحكومة العراقية، وزارة الدفاع، دائرة أركان العامة(شعبة الحركات).
- البلاط الملكي، (٣١١/٤٣٣٣)، أوراق متفرقة/ البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)، تقرير معاون مدير الشرطة العام، الادارة، الى مدير الشرطة العام. ٨ نيسان ١٩٤٦.
- البلاط الملكي، (٣١١/٤٣٣٣)، أوراق متفرقة/ البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)، وزارة الداخلية(شعبة الحدود)،م.ع/٤٩٠٦/١/١٩٤٩.
- البلاط الملكي، (٣١١/٤٣٣٣)، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)،الحركات البارزانية الاولى من ١٩٣٢/٧/١٥ ألى ١٩٣٢/٦/٢٢.
- البلاط الملكي، (٣١١/٤٣٣٣)، أوراق متفرقة/البارزانيون(١٩٤٣-١٩٤٩)،مقدمات هروب الملا مصطفى البارزاني من السليمانية.
- البلاط الملكي، (٣١١/٤٣٣٤)، مخابرات-الاكراد (١٩٢٢- ١٩٥٨).
- البلاط الملكي، (٣١١/٧٣٧)، المفوضية العراقية قي طهران،١٩٤٦-١٩٤٩، تسليم الملا مصطفى البارزاني، العدد(٦٥١)،١٩٤٦/١٢/٣٠.

- البلاط الملكي،(٣١١/٧٣٧)، البلاط الملكي، المفوضـــــية العراقية في طهران(١٩٤٦-١٩٤٩).قنصلية العراق الملكية، تقرير، الرقم(٣٣/١/٣)، ١/ مارت/١٩٤٧، ص٣.
- البلاط الملكي، (٣١١/٧٣٧)،المفوضية العراقية قي طهران،١٩٤٦-١٩٤٩،
- البلاط الملكي، (٣١١/٧٣٧)، المفوضـــــية الملكية العراقية بطهران، أنباء عن أيران، الرقم(١٦٠/١/٢)، في ١٩٤٨/٥/٣٠.
- البلاط الملكي، (٣١١/٧٣٧)، وزارة الخارجية، الدائرة السـياسـية، الشـعبة الشـرقية، رقم الكتاب:٤/٣١٣٣، ١٠/تشرين الاول/١٩٤٨.
- البلاط الملكي، (٣١١/٧٣٧)، المفوضـــــية الملكية العراقية بطهران، القضـــية الكردية في أيران، الرقم(١٤٨/٩/٢)، في ١٩٤٩/٤/١٨.
- الجمهورية العراقية، مديرية شــــرطة لواء اربيل(القلم الســـــري)، العدد(٣١٨)، التاريخ:١٩٦١/٢/١٨.

**٢) به زمانى ئينگليزى**

- **بەڵگەنامەكانی (ئەرشیفی نیشتمانی/ NA) لەندەن:**

- FCO 17/1237, Problem of Kurds in Iraq, British Embassy Moscow, The Kurdish Problem, 25 March 1970.
- FCO 51/191, Research Middle East (The Kurdish Problem in Iraq 1963-1971), 1971.
- FCO 51/191, Research Middle East (The Kurdish Problem in Iraq 1963-1971),1971.
- FCO 51/358, 1974, Research Middle East: Iraq- Soviet Relations 1968-1973, 12 December 1974.
- FCO 51/358, Research Department Memorandum the Kurdish Problem in Iraq, 1963-1971, 6 December, 1971.
- FCO 67/243, Baid on Kirkuk, 17 March 1969.
- FCO 67/243, Sabotage Threat to Iraq Oil Production, 4 March 1969.
- FCO 67/243, Sabotage Threat to Iraq Oil Production, 6 March,1969.
- FCO 67/243, Shelling Cuts Oil Out Put by Half, 6 March 1969.
- FCO 8/ 2318, British parliamentary and public opinion on the Kurdish sitvation in Iraq ،The Iraq government is once more waging war against Kurdistan. 22 July 1974.
- FCO 8/2308, Kurds in Iraq (Rebellion And Self Rule In Iraqi Kurdistan 1974), United Kingdom, 1974.

- **بەڵگەنامەكانی (ئەرشیفی نیشتمانی ئوسترالیا/NAA) سدنی:**

- A1838,173/2/61, Part-1, Iraq- Political- States Kurds, 11Feb 1964.

- A1838,173/2/6/1, Part1, Iraq- Political States-Kurds, Kurds in Iraq, 2 December1963.
- A1838,173/2/61, Part-1, Iraq- Political- States Kurds, 8 Feb 1963.
- A1838,173/2/61, Part-1, Iraq- Political- States Kurds, Research Department Memorandum, The Kurdish Problem in Iraq 1958-1963, London, August13, 1963.

٣) بەزمانی تورکی

- **ئەرشیفی دەستەی ئەرکانی سوپای تورکیا/(GNKUR)**

- ATAŞE Arşivi, ATAZB 9.1733, D 139, F 1-21, şifre halli Diyari Bekir Erzincan Üçüneli Ordu müfettigligine, KOL: KLS. LODOS 22/ FIH. 1-21.
- ATASE ARŞİVİ, A9.1733, D 139, F 1-21, şifre halli Diyari Bekir Erzincan Üçüneli Ordu müfettigligine, KOL: KLS. LODOS 22/ FIH. 1-35.

ب/ بەڵگەنامە بڵاوکراوەکان و کتێبە بەڵگەنامەییەکان

– بەڵگەنامە بڵاوکراوەکان

**١) بەزمانی کوردی**

– نامەی مستەفا بـــــــــارزانی بۆ مەسعود محەمەد سەبارەت بە دۆخی قوتابییەک. لە کتێبخانەی ڕۆژنامەنووس (عەبدوڵلا زەنگەنە) پارێزراوە.

**٢) بەزمانی ئینگلیزی**

- **دەزگای هەواڵگری نیشتمانی ئەمریکا**

- CIA / (FOIA) /ESDN (CREST): 03003301, Central Intelligence Bulletin - 1958/10/15, Iraq — Separatist sentiment increasing among Kurds despite Barzani's avowal of loyalty to regime.
- CIA / (FOIA) /ESDN (CREST): 06232625, CENTRAL INTELLIGENCE BULLETIN - 1958/10/29. https://www.cia.gov/readingroom/search/site/06232625.
- CIA / 312/01101-72, Intention of Kurdish Leader Al-Barzani to Approach the United States Government for Assistance; Iranian Intelligence Request for Expression of United States Government Willingness to Overthrow the Ba'thi Regime of Iraq, Washington, March 9,1972. https://www.cia.gov/readingroom/document/0005715730.
- CIA / 741503699, Helms to Scowcroft re Mulla Mustafa Barzani and Dr. Uthman, March 1974. https://archive.org/details/HelmstoScowcroftreMullaMustafaBarzaniandDrUthman741503699/page/n1/mode/1up.
- CIA /RDP81M00980R002000090053-3, Jack Anderson, How the Abandoned Kurds Lost Out, 2004. https://www.cia.gov/readingroom/document/cia-rdp81m00980r002000090053-3.

- CIA /(FOIA) /ESDN (CREST):02000194, Iraqi Regime Acting against Communist, Central Intelligence Bulletin - 1961/02/13. https://www.cia.gov/readingroom/document/02000194.
- CIA /173-7-14-7, TEXT OF GENERAL MULLA MUSTAFA BARZANI'S, LETTER TO SECRETARY KISSINGERWASHINGTON, November 2, 1974. https://www.cia.gov/readingroom/document/loc-hak-173-7-14-7.
- CIA /RDP79T00889A000900040001-6, Iraq Under Baath Rule, 1968-1976, November1, 1976. https://www.cia.gov/readingroom/document/cia-rdp79t00889a000900040001-6.
- CIA /RDP79T00975A004000230001-1, CENTRAL INTELLIGENCE BULLETIN, 1958-10-08. https://www.cia.gov/readingroom/document/cia-rdp79t00975a004000230001-1.
- CIA/RDP79-00927A004800110003-7, THE KURDISH WAR--ROUND FOUR, April 23, 1965. https://www.cia.gov/readingroom/document/cia-rdp79-00927a004800110003-7.

• **وەزارەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا**

- Department of State, Iraq political affairs and relations: Kurdish minority 1963, December 28, 1963, p.15.
- F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc: 319). Memorandum of Conversation, Washington Meetings with Kurdish Representatives, Washington, July 5, 1972.
- F. R. U. S, 1961–1963, VOLUME XVIII, NEAR EAST, 1962–1963, (Doc:307), Memorandum from the Department of State Acting Executive Secretary (McKesson) to the President's Special Assistant for National Security Affairs (Bundy), Washington, August 6, 1963. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1961-63v18/d307.
- F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc: 325). Memorandum from the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger) to President Nixon, Progress Report on the Kurdish Support Operations, Washington, October 5, 1972. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76ve04/d325.
- F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, (Doc: 267). Briefing Memorandum from the Director of the Bureau of Intelligence and Research (Hyland) to the Under Secretary of State for Political Affairs, Iraqi Charge of Use of US Missiles in Iraq, Washington, December 16, 1974. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d267.
- F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, (Doc: 244). Backchannel Message from the President's Deputy Assistant for National Security Affairs (Scowcroft) to the Ambassador to Iran (Helms), Washington, March 26, 1974.

https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d244.
- F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, (Doc:246). Memorandum from the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger) to President Nixon, Further Support for the Kurds in Iraq, Washington, April 11, 1974.
https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d246.
- F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, (Doc: 225). Memorandum from Acting Director of Central Intelligence Walters to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Kurdish Leadership Request for Assistance from the Shah of Iran, Washington, July 26, 1973.
https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d225.
- F. R. U. S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, (Doc:286), Paper Prepared in the Office of Current Intelligence, Central Intelligence Agency, THE IMPLICATIONS OF THE IRAN–IRAQ AGREEMENT, washington, may1,1975.
https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d286.
- F.R.S. U, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc: 267). Central Intelligence Agency Information Cable TDCS DB, Israeli Aid to Kurdish Rebels, Washington, March 9, 1970.
https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76ve04/d267.
- F.R.S. U, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972,(Doc:303), Memorandum From the Director of Central Intelligence (Helms) to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Secretary of State Rogers, and Secretary of Defense Laird, Washington, March 31, 1972.
https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76ve04/d303.
- F.R.S. U,1969–1976, VOLUMEXXVII, IRAN; IRAQ,1973–1976. ,(Doc: 264), Memorandum from Director of Central Intelligence Colby to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Text of General Mulla Mustafa Barzani's Letter to Secretary Kissinger, Washington, November 2, 1974.
https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d264.
- F.R.S.U, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc: 275), Central Intelligence Agency Information Cable, Indication of Soviet Disappointment with the Government of Iraq, Washington, August 24, 1970.
https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76ve04/d275.
- F.R.S.U, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc:292). Airgram 222 From the Embassy in Lebanon to the Department of State, Request from Mustafa Barzani for Clandestine Contact with USG, Beirut, July 16, 1971.

https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76ve04/d292.
- F.R.S.U, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc:302). Memorandum from the Director of Central Intelligence (Helms) to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Secretary of State Rogers, and Secretary of Defense Laird, Washington, March 29, 1972.
https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76ve04/d302.
- F.R.S.U, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc- 299). Memorandum from the Chief of the Near East and South Asia Division of the Central Intelligence Agency (Waller) to the Assistant Secretary of State for Near Eastern and South Asian Affairs, Washington, March 9, 1972.
https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76ve04/d299.
- F.R.S.U, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc -301). Memorandum from Harold Saunders of the National Security Council Staff to the President's Deputy Assistant for National Security Affairs, Washington, March 27, 1972.
https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76ve04/d301.
- F.R.S.U, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, (Doc -304). Memorandum from Andrew Killgore of the Bureau of Near Eastern and South Asian Affairs, Department of State to the Assistant Secretary for Near Eastern and South Asian Affairs (Sisco), Kurdish Appeal U.S. Assistance, Washington, April 3, 1972.
https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76ve04/d304.
- F.R.S.U, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, (Doc:222). Backchannel Message from the Ambassador to Iran (Helms) to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Tehran, July 9, 1973. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d222.
- F.R.S.U, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, Backchannel Message from the Ambassador to Iran (Helms) to the President's Deputy Assistant for National Security Affairs (Scowcroft), Tehran, March 18, 1974. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d67.
- F.R.S.U, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, Backchannel Message from the Ambassador to Iran (Helms) to Secretary of State Kissinger, (Barzani's letter to Secretary Kissinger), Tehran, April 17, 1974. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d247.
- F.R.S.U, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, Memorandum from Director of Central Intelligence Colby to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Mulla Mustafa Barzani's Requests for Additional Assistance, Washington, March 21, 1974. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d243.

- F.R.S.U, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, Telegram from the Interests Section in Baghdad to the Department of State, Baghdad, Kurdish Autonomy Conflict. Ref: Baghdad, April 11, 1974. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d245.
- F.R.S.U, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, U.S. Attitude toward the Kurds, Washington, July 27, 1973. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d226.
- F.R.S.U,1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, (Doc:233), Memorandum from the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger) to President Nixon, Increased Assistance to the Kurds, Washington, September 6, 1973. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d233.
- F.R.S.U,1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, Memorandum from the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger) to President Nixon, Continued Covert Support for the Kurds, Washington, March 29, 1973. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d207.
- F.R.S.U,1969–1976،VOLUME XXVII, IRAN;IRAQ, 1973–1976, Memorandum From Director of Central Intelligence Colby to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Request by Mulla Mustafa Barzani to see Dr. Kissinger, Washington, May 23, 1974. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d250.
- F.R.S.U,1969-1979, Iraq-Iran (1973-1976), Telegram from the Interests Section in Baghdad to the Department of State, Baghdad, April 11, 1974.
- F.R.U. S, 1969–1976, VOLUME E–4, DOCUMENTS ON IRAN AND IRAQ, 1969–1972, Memorandum of Conversation, Kurdish/Assyrian Appeal for U.S. Assistance, Washington, June 13, 1969. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76ve04/d259.
- F.R.U. S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, (Doc:242). Backchannel Message from the Ambassador to Iran (Helms) to the President's Deputy Assistant for National Security Affairs, Tehran, March 18, 1974. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d242.
- F.R.U.S, 1961–1963, VOLUME XVIII, NEAR EAST, 1962–1963, (Doc:174), Circular Airgram From the Department of State to Certain Posts, Washington, March 2, 1963. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1961-63v18/d174.
- F.R.U.S, 1969–1976, VOLUME XXVII, IRAN; IRAQ, 1973–1976, (Doc:250). Memorandum from Director of Central Intelligence Colby to the President's Assistant for National Security Affairs (Kissinger), Request by Mulla Mustafa Barzani to see Dr. Kissinger, Washington, May 23, 1974. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1969-76v27/d250.

- F.R.U.S,1964–1968, VOLUME XXI, NEAR EAST REGION; ARABIAN PENINSULA, (Doc:172), Telegram From the Embassy in Iran to the Department of State, Tehran, April 12, 1965. https://history.state.gov/historicaldocuments/frus1964-68v21/d172.

### ٢- كتێبە بەڵگەنامەییەکان:

- **بەزمانی کوردی**

- ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان- عێراق(نووسینگەی ڕاپەڕاندن) دەستوور و یاساکان ١٩٦٤-١٩٦٥، ئا: ئاری فاروق نانەکەلی، هەولێر، (٢٠١٧).
- بارزان و زێبار لەبەڵگەنامەکانی عوسمانی دا ١٢٦٧-١٣٣٨ک/١٨٥١-١٩١٩ز، بگ٤، ئا: دکتور نەوزاد یەحیا باجگر، و: ئاشتی ڕەحمان، بڵاوکراوەکانی زانکۆی جیهان(خانەی بەڵگەنامەکان)، هەولێر، (٢٠١٨).
- جووڵانەوەی نەتەوەیی باشووری کوردستان( ١٩٦١- ١٩٨٢)لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا، ئا: شەریف عەلی، و: پاسار شێرکۆ، دهۆک،(٢٠٢١).
- د. ئەفراسیاو هەورامی، مستەفا بارزانی لە هەندێک بەڵگەنامە و دۆکیومێنتی سۆڤیەتدا ١٩٤٥-١٩٥٨، دەزگای ئاراس، هەولێر، (٢٠٠٢).
- د. بورهان حاتەم گۆمەتاڵی، مستەفا بارزانی لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی عێراقدا(١٩٤٧-١٩٧٠)، هەولێر،(٢٠٢٢).
- دیدار عوسمان، مێژووی بارزان لەشێخ عەبدولسەلامی یەکەمەوە تا کۆتایی ژیانی شێخ عەبدولسەلامی دووەم لەژێر ڕۆشنایی بەڵگەنامەکانی دەوڵەتی عوسمانی دا، پێداچوونەوە: نعمەت شەهاب کەوانی، دەزگای فەرهەنگی هونەری و ڕاگەیاندنی ڕێژیار، هەولێر، (٢٠٢١).
- ڕاپەڕینەکانی بارزان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی هەردوو حکومەتی فەرەنسا و بریتانیادا ١٩٣١-١٩٤٩، و. لە فەرەنسییەوە: د. نەجاتی عەبدوڵڵا، دەزگای چاپ و بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، (٢٠١٠).
- شۆڕشی ئەیلوول لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا، ئامادەکردن و وەرگێرانی: وریا ڕەحمانی، تاران، (٢٠١٣).

- کەمال مەزهەر، کورد و کوردســـــتان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بریتانیادا،بگ١، چ٢، ئـا: عەبدوڵڵا زەنگەنە و شەهلا تاهیر حەیەیدەری،چاپخانەی گرین گڵۆری، لوبنان، ٢٠٠٩؛ ب٢، هەولێر، (٢٠١٤).
- کوردو کوردســـــتان لەبەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی فەرەنســـا و بریتانیادا ١٨٧٩-١٩٦٣، و: نەجاتی عەبدوڵڵا، هەولێر، (٢٠٢١).
- لەبەڵگەنامەکانی پارتی دیموکراتی کوردســـــتان ١٩٤٦_١٩٦٣، ئامادەکردنی: سـدیق سـاڵح- رەفیق سـاڵح، زانکۆیا دهۆک و بنگەی بەڵگاندن و لێکۆڵینەوەی ژین، دهۆک،(٢٠٢١).
- محەمەد عەلی ســـوڵتانی، بارودۆخی ســــیاســـی، کۆمەڵایەتی و مێژوویی عەشـــیرەتی بارزان، و: کامبیز ئیبراهیم زادە(زەردەشـــت موکردیانی)، مهاباد، (١٣٩٩ش) .
- مســـعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بگ:٣،، ب: ١، شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١-١٩٧٥،هەولێر، (٢٠٠٤).
- ___________، بـارزانی و بزووتنەوەی رزگـاریخوازی کورد(١٩٣١-١٩٥٨)، چاپخانەی خەبات، دهۆک، (١٩٩٨)، هەولێر، (٢٠٢٠).
- ___________، بـارزانـی و بـزووتـنەوەی رزگـاریـخـوازی کـورد، بـگ٢(١٩٥٨-١٩٦١)، دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، (٢٠٢٠).
- _____________بـارزانـی و بـزووتـنەوەی رزگـاریـخـوازی کـورد، بگ٣،ب١(١٩٦١-١٩٧٥)، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، (٢٠٢٠).
- مەلا مســـــتەفا بارزانی لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا، و: وریا ڕەحمانی، دەستەی ئینسکلۆپیدیای پارتی دیموکراتی کوردستان، هەولێر، (٢٠٢٣).

- **بە زمانی عەرەبی:**

- **د. عبدالفتاح علي البوتاني، الحركة القومية الكوردية التحررية( دراســـات و وثائق)، دهوك، (٢٠٠٤).**
- **___________، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية( ملاحظات تاريخية و دراسات أولية)، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، أربيل، (٢٠٠١).**

- **د. وليد حمدي، الكرد و كردستان في الوثائق البريطانية(دراسة تاريخية و ثائقية)، مطابع سجل العرب، (١٩٩٢).**
- **د.نوري عبدالحميد العاني،د. علاء جاسم محمد الحربي، د. أحمد ساجر جاسم، د.محمد عويد الدليمي،د. جهاد مجيد محي الدين، كامل جواد عاشور، تاريخ الوزرارات العراقية في العهد الجمهوري (١٤تموز ١٩٥٨– ٧ شباط ١٩٥٩)، ج ١، بغداد، (٢٠٠٠).**
- **عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج٦، مطبعة العرفان، صيدا، (١٩٥٣).**
- **الكورد في وثائق الارشيف الوطني البريطاني(ج٢) ١٩٥٨–١٩٦٩،أعداد و ترجمة: شيركو حبيب،القاهرة، (٢٠١٩).**

- **به زمانى فارسى:**

- محمد على سلطانى، اوضاع سياسي اجتماعى تاريخى ايل بارزان، به انضمام دكتر اسماعيل اردلان، اسرار بارزان ١٣٢٥ شمسى، سازمان اسناد و كتابخانه ملى جمهوري اسلامى ايران، تهران، (١٣٨٣).

دووەم/چاپكراوە فەرمييەكان:

**أ/ ياسا و مەرسومە دەركراوەكان:**

- الدستور المؤقت، الوقائع العراقية(جريدة)، ع(٢)، السنة الاولى، ٢٨ تموز (١٩٥٨).
- قانون الاصلاح الزراعي رقم(١١٧) لسنة ١٩٧٠، الوقائع العراقية(جريدة)، ع(١٨٨٤)، ١٩٧٠/٥/٣٠.
- قرار(٢٨٨) في الوقائع العراقية، العدد(١٨٦٣)، ٤ نيسان (١٩٧٠).
- قانون المجمع العلمي الكردي، الوقائع العراقية،ع(١٩١٧)، ٨ أيلول (١٩٧٠).
- ( تصديق معاهدة الصداقة والتعاون بين الجمهورية العراقية و أتحاد الجمهوريات الاشتراكية السوفياتية) . الوقائع العراقية(جريدة)، ع(٢١٢٨)، ٢٥/نيسان/ (١٩٧٢).
- (تأميم عمليات شركة النفط العراق المحدودة)، الوقائع العراقية(جريدة)، ع(٢١٤٦)، ١/حزيران/(١٩٧٢).

**ب- چاپكراوە حكومييەكان**

- الجمهورية العراقية، منشورات وزارة الاعلام، قانون الحكم الذاتي لمنطقة كردستان، السلسلة الوثائقية(٣٣)، ١٩٧٤، قانون رقم (٣٣) لسنة (١٩٧٤).

- الجمهورية العراقية، القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة(١٩٦٨-١٩٧٧)،مج١،مطبعة العاني، بغداد، (١٩٧٩).

**سێیەم/ چاپکراوە حزبییەکان:**

**أ/ بەزمانی کوردی**

- پارتی دیموکراتی کوردستان(مەکتەبی سیاسی-٢)، یاداشتی بارزانی بۆ کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٩دا، چاپخانەی خەبات، (١٩٦٩).
- پارتی دیموکراتی کوردستان(مەکتەبی سیاسی)، کێشەی زەوییە کشتوکاڵییەکان لە کوردستانی عێراقدا، دیراسە ژمارە(١٨)، چ١، لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی دیراسات و توێژینەوە، هەولێر، (١٩٩٦).

**ب/ بەزمانی عەرەبی**

- دستور مجلس قيادة الثورة لكردستان العراق (بشكله المعدل) كما اقره الاجتماع الرابع للمجلس في ٢٣/ايلول/١٩٦٨، مطبعة خبات، كوردستان، (د.س).
- الحزب الديمقراطي الكوردستاني، طريق الحركة التحررية الكردية، التقرير السياسي المصادق عليه من قبل كونفرانس الحزب المنعقد في اب ١٩٧٦ وقد اقره المؤتمر التاسع للحزب الديمقراطي الكردستاني المنعقد في تشرين الثاني (١٩٧٩).

**چوارەم/ ڕۆژنامە و گۆڤارەکان**

**ا) ڕۆژنامەکان**

**١- بەزمانی کوردی**

- برایی: پارتی دیموکراتی کوردستان/ بەغدا.
  - ژ(٨)، ١٩٦٧/٥/٦.
  - ژ(٧٥)، ١٩٦٧/٧/١٥،
  - ژ(١٦)، ساڵی یەکەم، ١٩٦٧/٩/٢.
- برایەتی: پارتی دیموکراتی کوردستان / بەغدا
  - ژ(٥)، ١٩٦٧/٦/٣.

- ژ(٦)، ساڵی دوو، ١٩٧١/١٠/٢٤.
- ژ(٦٩)، ٢١ی ئەیلولی (١٩٧٣).

- دەنگی کورد- صوت الاکراد: ڕۆژنامەی سیاسیی کوردیی سەربەخۆیە/ بەغدا.
  - ع(٣)،١٢ اذار(١٩٦٠).
- خەبات: ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان/ بەغدا.
  - ژ(١٧٧)، ١ی ئاداری (١٩٦٠).
- خەباتی کوردستان: (پارتی دیموکراتی کوردستان)/ نهێنی.
  - ساڵی ١، ژ(٣)، مایسی (١٩٥٧).
- ڕزگاری: لقی چواری پارتی دیموکراتی کوردستان/ سلێمانی
  - ژ(٥)، ٢/ئاب/١٩٦٧.
- ژین: ڕۆژنامەیەکی کوردی و ئەدەبی و کۆمەڵی بووە، لە شاری سلێمانی دەرچووە.
  - ژ(١٤١١)، ١٩٥٨/١٠/٢.
  - ژ(١٥٠٧)، ١٩٦٠/٢/١.
- کوردستان: حزبی دیموکراتی کوردستان- ئێران / مەهاباد.
  - ژ(٢٣)، ٦ ئاداری (١٩٤٦).
  - ژ(٢٧)، ٢٥ی ئاداری (١٩٤٦).
- کوردستان: پارتی دیموکراتی کوردستان- نهێنی
  - ژ(١)، ١٩٦١/٣/٤.
- مەشخەل: لقی(٣)ی کەرکوکی پارتی دیموکراتی کوردستان/ (شاخ)
  - ژ(٢)،١٩٦٩/١/١.
- هاوکاری:ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی گشتییە- بەغدا
  - ژ(٦)،١٣ی شوباتی (١٩٧٠).
  - ژ(١٠)، ساڵی (١)، شەممە ٢١ ئاداری (١٩٧٠).

**ب/ بەزمانی عەرەبی**

- أتحاد الشعب: الحزب الشيوعي العراقي/ بغداد
  - ع(٣٠)، ٢ أذار (١٩٥٩).

- أخبار كردستان: الحزب الديمقراطي الكردستاني/ ( سري )
  - ع(١٣)، أواسط نيسان (١٩٧٣).
- الانوار : دار الصياد للصحافة والطباعة والنشر/ (بيروت).
  - ع(١٥٣٩)، ٣ أذار (١٩٧٩).
- الزمان: جريدة يومية سياسية مستقلة /بغداد
  - ع(٧٣٤٠)، ٢٤ ايلول (١٩٦١).
- الاهرام : دار الاهرام للنشر /القاهرة.
  - ع(٢٦٢٢٩)، ٥ تشرين الاول (١٩٥٨).
  - ع(٣٠٤٠٧)، ١٩٧٠/٣/١٢.
  - ع(٣٠٤٠٩)، ١٩٧٠/٣/١٤.
  - ع(٢٠٩٧٨)،١٩٧١/١٠/٤.
- الثورة: دار الثورة للنشر و الطباعة/ بغداد
  - ع(٧٠٧)، ٢٤ أيلول (١٩٦١).
- الثورة: حزب البعث العربي الاشتراكي- قيادة قطر العراق/بغداد
  - ع(٤٧١)، ١٦ أذار (١٩٧٠).
- الجماهير: دار الجماهير/ بغداد
  - ع(١١٨)، ٢٠ حزيران (١٩٦٣).
  - ع(١٤٠)، ١٢ تموز (١٩٦٣).
- الجمهورية: دار الجماهير للصحافة/ بغداد
  - ع(٧٠٤)، ١٢ أذار (١٩٧٠).
  - ع(٢٠٠٤)، ٢٧ نيسان (١٩٧٤).
- الحرية: جريدة سياسية اسبوعية عربية- بغداد
  - ع(٢٦٠)، ١ أذار (١٩٦٥).
- خبات: الحزب الديمقراطي الكردستاني/ بغداد.
  - ع(١٤١)، ١٩٦٠/١/٩.
  - ع(١٦٧)، ١٠ شباط (١٩٦٠).
  - ژ(٢٢٥)، ٢٤ى ئايار (١٩٦٠).
  - ع(٢٩٨)، ٢٦/اب/١٩٦٠،

- ع(٣٢٦)، ٣٠/٩/١٩٦٠.
- ع(٤٦٥)، اوائل نيسان(١٩٦٢).
- ع(٤٦٨)، تشرين الاول (١٩٦٢).
- ع(٤٦٧)، أوائل أيلول (١٩٦٣).
- ع(٤٧٠)، ايلول (١٩٦٣).
- ع(٤٧٢)، تشرين الثاني(١٩٦٣).
- ع(٤٧٤)، تشرين الثانى (١٩٦٤).
- ع(٤٧٥)، كانون الاول (١٩٦٤).
- ع(٤٧٦)، شباط (١٩٦٥).
- ع (٤٩٥)، أذار (١٩٦٧).

• الدستور: الشركة الاردنية للصحافة والنشر/(عمان- الاردن)
  - ع(١٠٤٨)، ١٢ اذار (١٩٧٠).
  - ع(١٠٦٨)، ١ نيسان (١٩٧٠).

• الرأي : المؤسسة الصحفية الاردنية/(عمان)
  - ع(١٢٩٧)، ٧ أذار (١٩٧٥).

• رزگارى : پارتى دموكراتى كورد عراق.
  - ع(١٧ و ١٨)، كانون ٢ و شباط (١٩٤٨).
  - ع(٢)، تشرين الاول (١٩٤٨).

• الشعب : دار التضامن/ بغداد
  - ع(٤٧)، ١١ حزيران (١٩٦٣).

• صوت الاحرار: جريدة يومية سياسية- بغداد
  - ع(٨٠٦)، ٢٥ ايول (١٩٦١).

• صوت كردستان: فرع الاول لحزب الديمقراطي الكردستاني- دهوك/ سري
  - ع(٣)، كانون الثانى (١٩٦٨).

• العرب: دار الجاحظ للطباعة والنشر/ بغداد
  - ع(٥٥٣)، ٢٠ نيسان (١٩٦٦).
  - ع(٦٠١)، ١٦ حزيران (١٩٦٦).
  - ع(٦١٣)، ٣٠ حزيران (١٩٦٦).

- الفجر الجديد: جريدة يومية سياسية مستقلة. طبعت بمطبعة(السجل)– بغداد
  - ع(١٣٢٥)، ٢٠حزيران (١٩٦٦).
- المنار : جريدة يومية سياسية– (بغداد)
  - ع(٣٥٤٥)، ٢٩ تشرين الاول (١٩٦٦).
- النهار: جريدة سياسية يومية تصدر في لبنان..
  - د.ع، ١٩٧٤/٥/٩،

**ج/ بەزمانی فارسی**

- ارس: تاران
  - ش(٧٧)، (١٠ اوربل (١٩٤٧).
- اطلاعات: دەزگای چاپەمەنی ئیتلاعات/ تاران.
  - ش(٨٦٩٦)،٣١ مارس (١٩٤٩).
  - ش(٩٨٨٣)، (١٣ أوريل (١٩٥٩).
  - ش(١١٩٩٣)، ١٩٦٦/٦/٤.
  - ش(١٣٦١٢)،(٢ اكتبر (١٩٧١).
  - ش (٩٨٨٠)، ٩ ابريل (١٩٤٩).
  - ش(١٣٧٥٧)، (٢٨ مارس (١٩٧٢) .
  - ش(١٤١٣٢)، (٢٣ جون (١٩٧٣)،
  - ش(١٤١٤١)، ٣ جولای (١٩٧٣).
  - ش(١٤٤٩٥)، ٢٨ اكوست (١٩٧٣).
- كيهان : دەزگای رۆژنامەوانی کەیهان– تاران.
  - ش(٦٩٤٨)، ٣ اكتبر (١٩٦٦)،
  - ش(٩٣٧٢)، (٢٦ ئەيلول ١٩٧٤).
  - ش (٩٥٤٦)، ٣ می (١٩٧٥).
- مردم : ئۆرگانی پارتی مەردومی ئێرانییە/ تاران
  - ش(١٩٦)، ٢٩/ اكوست /١٩٧٤.

د/ بەزمانی عیبری

- **מעריב**:المعاريف: ڕۆژنامەیەکی سیاسی میانڕەوە/ تەلئەبیب.
  - גיליון(1343)،(24 באפריל)(1959)..
  - ( גיליון2657،(21 בדצמבר (1962).
  - ( גיליון2701(11,בפברואר (1963).
  - ( גיליון2817،(2ביולי)(1963).
  - גיליון(5849)،31באוקטובר (1963).
  - ):גיליון12128،(11 בספטמבר (1987).
- **דבר** : دافار:ڕۆژنامەیەکی سـیاسـی کرێکارانە، ئاراسـتەیەکی ئیشـتراکی ناسیۆنالیستی هەیە لە تەلئەبیب دەردەچێ.
  - (12926)،8 בינואר (1967).
  - 20 לוחמים כורדים הוצאו להורג בעיראק، (No:15008) ، 11יוני (1974).

ه/ بەزمانی ئینگلیزی

- The New York Times (New York),
  - BORDER CLASH IN IRAN; Kurdish Group Is Being Slowly Pushed Toward Frontier,March 24, (1947.)
  - IRANIANS ENCIRCLE BARZANI TRIBESMEN, June 16, 1947.
  - BARZANI TRIBE IN RUSSIA; Fugitives from Iraq Battled Armies of Three Countries, June 20, 1947.
  - BARZANI FOLLOWERS RETURN, April 9, (1959).
  - 100 Towns Reported Destroyed in Kurds' Revolt Against Kassim, April 24, (1962).
  - U.S. RULES OUT AID TO REBELS IN IRAQ; Asserts Assistance to Kurds Would Be Interference, September 10, (1962).
  - DANA ADAMS SCHMIDT, Kurdish Chief Follows Policy of Strength, September 11, (1962).
  - DANA ADAMS SCHMIDT, Kurds' Guerrilla Tradition Aids Rebels in War on Iraqi Army, September 12, (1962).
  - DANA ADAMS SCHMIDT, Kurd Chiefs Leaving Mountains for Peace Meetings in Baghdad, February 18, (1963).
  - DANA ADAMS SCHMIDT, Kurds Threaten To Resume Fight, March 2, 1963.
  - DANA ADAMS SCHMIDT, IRAQ PUTTING OFF KURD'S DEMANDS; Delay on Autonomy Move Causes Western Concern Kurdish Chief Impatient Arab Support Pledged, April 14, 1963.
  - DANA ADAMS SCHMIDT, Iraq Resumes War with Kurds; Demands Surrender in 24 Hours, June 11, (1963).

- DANA ADAMS SCHMIDT, Iraqi Troops Driving on Kurdish Rebels' Centers, June 13, (1963).
- IRAQI-KURD PEACE STILL IN BALANCE; Barzani Says Future Rests on Arif's Promises, March 1, (1964).
- A KURDISH LEADER MAINTAINS ALERT; Aide to al-Barzani Criticizes Truce with Iraqi Regime, March 2, (1964).
- DANA ADAMS SCHMIDT, Kurds Expect Iraqis to Resume War in spring, March 8, (1965).
- QUARREL REPORTED SPLITTING KURDISH LEADERS IN IRAQ, March 23, (1966).
- THOMAS F. BRADY, Kurdish Accord Believed Likely, June 22, (1966).
- THOMAS F. BRADY, Kurds' Mistrust of New Regime Said to Slow Pacification Plan, September 25, (1966).
- BAGHDAD SAYS KURDISH CHIEF MEETS WITH IRAQI PRESIDENT, ,October 29, (1966).
- THOMAS F. BRADY, KURDS AND IRAQIS RESTIVE IN PEACE; They Shun War but Argue Over Their '66 Agreement, March 21, (1968).
- THOMAS F. BRADY ,specia,New Rift Reported Between Baghdad and Kurds; Link to Rumors of a Plot to 'Liberate Syria' Seen Nationalist Group Believes Baghdad Marks Time, August 19, (1968).
- KUDISH UNREST UNABATED IN IRAQ, March 30, (1969).
- JAMES F. CLARITY, Kurds Say Iran Arms Them and That Soviet Sends Advisers to Iraq, Sept. 29, (1974).
- KURDS BETRAYED, Mrach12.(1975).
- ERIC PACE, Leader of Kurdish Revolt Says That Fighting in Iraq Is Ended, 23 March, (1975).
- BERNARD GWERTZMAN, Leader of Kurdish Rebels Quietly Seeking Support from the U.S, July 31, (1976).
- WILLIAM SAFIRE, Mr. Ford's Secret Sellout, Feb. 5, (1976).
- KURDISH REBELS In Iraq Gave Three Rugs to Kissinger, Jan. 26, (1976).
- WILLIAM SAFIRE, Of Kurds and Kissinger, Carter and Conscience, December 19, (1977).
- BARZANI, A KURD LEADER, Buried in Northwest Iran, March 6, (1979).
- SVEN SIMON، MUSTAFA BARZANI KURDS' LEADE DIES، March 2, (1979).

- The times News: is a British tower built in 1785 in London
  - WILLIAM SAFIRE, Of Kurds and Conscience, Des 16, (1976)
- The Lewiston Daily Sun : Published in Lewiston, Maine. Established in 1893
  - RODNEY, Kurdish Rebel Says Iraq Is Facing an All-Out War. Vol: (82), (29/3/1974).

